رۆمان

# ئەو دەمەی گەشتم بە عومەر رضي الله عنه

ئەدهەم شەرقاوی

وەرگێڕانی:
ئازاد عەبباس گڵێجاڵی

## پێناسی کتێب

- ناوی کتێب: ئەو دەمەی گەشتم بە عومەر
- بابەت: رۆمان
- نووسەر: ئەدهەم شەرقاوی
- ناوی وەرگێڕ: ئازاد عەبباس
- دیزاین: ناوەندی ڕێنوێن
- ژمارەی چاپ: یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٨٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٣٨٣)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێ دراوە.





ناوەندی ڕێنوێن

0751 140 8868 - 0750 126 9689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە ( ٦٦ )

گەورەم عومەر!

ئەم نامەیە پێشکەش بە تۆ،

لە خۆتەوە پێشکەش بە خۆت،

دەزانم تۆ هێندە گەورەیت، نەک لە کتێب،

لە گشت کتێبخانەکانیش گەورەتری،

بەڵام چیبکەم؟

هەر ئەوەندەم لە دەست دێت و، دیاریی شوانەوێڵەکانیش

ئاڵەکۆکە،

ئا لەم وەرزی بەهارەدا

ئەم ئاڵەکۆکەم بۆ تۆ بێ!

بە هومێدم لێم وەربگری.

"ئەگەر لە دوای من پێغەمبەر هەبووایە، ئەوا عومەر پێغەمبەر دەبوو."

### پێغەمبەری ئیسلام

ـــــ "ئەگەر سبەی، خوا لێی پرسیت: 'بۆچی دوای خۆت، عومەرت کرد بە خەلیفە؟' چی دەڵێی؟"
- دەڵێم: "خوایە! باشترین بەندەی تۆم کردووە بە خەلیفە!"

### ئەبوو بەکری صدديق

- "ئیمانهێنانی سەرکەوتن، کۆچەکەشی سەرکەوتن و خەلافەتیشی ڕەحمەت بوو."

### عەبدوڵلای کوڕی مەسعود

"وُجودُهُ وَ جُودهُ بحرٌ خِضَم — منه ، لذا تلاطمت نيل الحكم
ألمْ يقُلْ جبريلُ ياخيرَ البَشَر! — لِيبكِ الاسلامُ على موتِ عمر؟
نَدْ نعدَ نُنعدِ لشأنِ البــاني — وَدَعْ هَــوى هَمّازٍ أو لمّاز"

### مەولەوی تاوگۆزی

به ڕوشدی حەزرەتی مەحبوبی وەهھاب خەلیفەی ثانی یەعنی (ابن خطاب)
خەلافەت بوو بە تەشریفی عومەر ئەو عەبایێ بوو عەدالەت ، هاتە بەر ئەو
لەسەر باش گەر نەبوو ئەحکامی جاری نیدایی ئەلجەبەل چۆن گەییە ساری
دەفەرمووێ ئەو کەسەی خەیرول بەشەر بوو لە دوی من گەر نەبی بووبا عومەر بوو

**هەژاری موکریانی**

ـ "موسڵمانبوونی عومەر، خاڵی وەرچەرخانی مێژووی ئیسلام بوو."

**تۆماس ئارنۆڵد**

ـــ "عومەری کوڕی خەتتاب کەسێکی بێوێنە بوو، ڕۆڵێکی سەرەکیی بینی لە بلاوەپێکردنی ئایینی ئیسلاما."

**د. مایکڵ هارت**

ـــ "لە سەردەمی عومەرا، حوکوومەتی ئیسلامی لە ئەمارەتەوە گۆڕا بۆ هێزێکی نێودەوڵەتی."

**مەوسوعەی بەریتانی ساڵی ۲۰۰۹**

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

خوێنەری هێژا و بەڕێز! بیستبووم کاک حەکیمی خاوەنی کتێبخانەی ڕێنوێن، زۆر سوورە لەسەر وەرگێڕانی کتێبی "عندما إلتقيت عمر بن الخطاب" نەمدەزانی بۆ؟! دوایی وەڵامەکەت گیر دەکەوێ!

قسەکردن لەسەر زاتێکی وەک حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب، بوێرییەکی گەورەی دەوێ، نەک لەناو مێژووی ئیسلاما، بەڵکو لەناو هەموو مێژوودا، پیاوێ وەک حەزرەتی عومەر زۆر بەکەمی و ئەگەر بشڵێم: لەوانەیە دەست نەکەوێ. زیادە ڕەویم نەکردووە، جا کەسایەتیەکی ئاوا گەورە، مرۆڤ هەرچەندی لەسەر بنووسێ و بخوێنێتەوە، هێشتا کەمە! بەڵام عەرەب دەڵێ: "ما لا يوجد كله لا يترك جله." دیسان دەڵێن: "خير الكلام ما قل و دل." نووسەری لاو و بەڕێز، کاک ئەدهەم شەرقاوی یەکێکە لەو نووسەرانەی فەلەستین کە لە تەمەنی لاویدا ناوبانگی پەیدا کردووە، بەرهەمی زۆر و پاک و پوختەی هەیە، یەک لەو بەرهەمانە کتێبی "عندما إلتقيت عمر بن الخطاب"ـە کە بەڕاستی کتێبێکی بێوێنەیە، من خۆم بەش بە حاڵی خۆم، زۆر حەزم لە خوێندنەوەی ژیاننامەی پیاوە ناودارەکانە، چێژی لێ وەردەگرم، بەڵام سوێندتان لەسەرم نییە، ئەوەندەی چێژم لەم کتێبە وەرگرت، تەنها لە یەک کتێبی ترم وەرگرتووە، ئەگەر خۆت بیخوێنیتەوە و سەرنجی بدەی و بەپەلە هەڵینەپرووزێنی، دەزانی بۆچی وا دەڵێم؛ بەڵام دیسان یەک دوو خاڵت پێ دەڵێم:

یەکەم: ئەگەر تۆ دەست بە خوێندنەوی ژیننامەی هەر کەسێک بکەی، لە پێشەوە دەبینی کە یەک-دوو لاپەڕەی هەر بە باسی ئەوەوە کوژراوە کە فڵان ڕۆژ و فلان مێژوو لە دایک بووە، ناوە ڕاستەقینەکەی ئەمەیە و ئەوە نییە، باوکی ناوی ئەوەیە و دایکی ئەمە، هۆزەکەی ئەوە و تیرەکەی ئەمە...

من وا هەست دەکەم کە ئەو جۆرە شتانە، هەموو کاتێک پێویست نەبن، کە وتت حەزرەتی عومەر، ئیتر تەواو! بۆچیمە هۆزەکەی ناوی چییە؟ باپیرە هەرەگەورەکەی کێ بووە؟ دایکی دایکی ناوی چی بووە؟

من دەمەوێ خۆی بناسم! بزانم ئەو عومەرەی کە ناوبانگی هەر چوار قوڕنەی ئەم دونیایەی تەنیوە، چی کردووە؟ بۆ وا بەناوبانگە؟

دووەم: لە نووسینەوەی کتێبێکی مامناوەندیدا نەک پێویست ناکا، بەڵکو ناکرێ ورد و درشتی بەسەرهاتی کەسێکی بەناوبانگ بنووسرێتەوە، بەڵکو دەبێ لایەنە گرنگەکانی ژیانی ئەو کەسە بخرێتە پێش چاو، لە ئەمڕۆدا کە دادگەری بووە بە ئەفسانە، وا باشە زیاتر لایەنی دادگەریی حەزرەتی عومەر باس بکرێ، با خەڵکی ئاسایی بزانێ کە ئیسلامی دوێنێ، وەک بە ناو ئیسلامەکەی ئەمڕۆ نەبووە، با بزانن کە ڕیشەی دادگەری لەناو ئایینی ئیسلامەوە هاتووەتە دەرێ، پیاوانی وەک عومەر پەروەردەیان کردووە، با گەورەکانیش ئەگەر فیسیان[1] بەریدان و خوێندیانەوە، کەمێک خەجاڵەتی بیانگرێ؛ ئەوانیش بزانن کە دونیا وەک کورد دەڵێ: "پێچی مێزەرە و زوو کۆتایی دێی و دەڕوا." بەڵکو کەمێک بە خۆیانا بچنەوە و شەرم بیانگرێ و چاو لە حەزرەتی عومەر بکەن و کەمێک خۆیان بەرەو باشە بگۆڕن!

جا، من وادەزانم کاک ئەدهەمیش هەر ئەوەی مەبەست بووە، بۆیە هەر لە سەرەتای کتێبەکەوە چووەتە ناو باسەکان، ئیتر باسێک لە ناو و بنەماڵە و خێڵ و... ئەمانە ناکات، بە کورتی و بە پوختی، وێنای حەزرەتی عومەری کردووە.

من بەش بەحاڵی خۆم، وا دەزانم ئەم کتیبە هەرچەندە لە قەبارەدا گەورە نییە و یەک بەرگە، بەڵام بەقەد کتێبێکی سێ-چوار بەرگی، حەزرەتی عومەری بە خەڵک ناساندوە، وا تێدەگەم تۆیش بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە؛ هەمان بیروڕای منت بۆ دروست دەبێ!

ئەمە لایەک، لایەکەی تر، خوێندنەوەی مێژوو و بەسەرهاتی کەسێک بە شێوەی نووسینەکانی کۆن، کەمێک مرۆڤ ماندوو دەکات، وشکە، بەڵام ئەم شێوە نووسینەی کاک ئەدهەم کە وەک ڕۆمانێک خۆ دەنوێنێ و بە خەیاڵ گەشتووە بە حەزرەتی عومەر، شتە ڕاستە دوور لە خەیاڵەکان باس دەکا، تام و چێژێکی تایبەتی داوە بە کتێبە، بڕوا دەکەن یا نا کەیفی خۆتانە، بەس بە خوا من لەو ماوەیەی کە خەریکی

---

[1] فیس: خۆبەگەورەزانین، تکبر

وەرگێڕانەکەی بووم، وام دەزانی هەر بەڕاستی خۆم لە خزمەت حەزرەتی عومەرام، کاتێکیش کە تەواوم کرد، تێر گریام؛ وام دەزانی تازە بە تازە، ئا ئێستا حەزرەتی عومەر شەهید کراوە. ئەمجا زانیم بۆچی کاکە حەکیم ئەوەندە سوورە لەسەر وەرگیرانی ئەو کتێبە، وەڵلاهی ناهەقی نەبوو.

پێم خۆشە یەک خاڵی بچووکیش باس بکەم، ئەویش ئەوەیە: وەرگێڕانی کتێب بۆ ئەوە نییە خوێنەر فێری وشە بکا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ناوەڕۆکی ئەو شتەی وەریدەگێڕی، بگەیەنی. ئیتر گرنگ نییە تا چەندە وشەکان ڕێک وەک خۆی وەرگێڕاوە، بۆ نموونە من لەم کتێبەدا هەندێ دەستەواژەم بەکار هێناوە کە لەوانەیە لەناو عەرەبا هەر نەبێ، یان جاری وا هەیە مەفهوم و ناوەڕۆکی بابەتەکەم نووسیوە، نەک وەرگێڕانی دەقە بەبێ کەم و زیاد، وا دەزانم وەرگێڕانی دەق بەبێ کەم و زیاد، تۆزێک وەرگێڕان قورس و وشک دەکا، لەوانەیشە وانەبێ، بەڵام ئیتر هەرچۆن بێ؛ گرنگ ئەوەیە مەفهوم و کاکڵەی ئەو شتە بگەیەنیت.

خوێنەری خۆشەویس! من هەرچی بڵێم هەر پێشەکیە و ناوەڕۆک نییە، بۆیە لەمە زیاتر کاتت ناگرم، بۆ ئەوەی زوو دەست بکەی بە خوێندنەوەی کتێبەکە و، چێژی ڕۆحیی لێ وەربگری، هیوادارم منیش توانیبێتم بەباشی وەریبگێڕم، ئەگەر باش بوو، ئەوە فەزڵی خوای گەورەیە، ئەگەریش خراپ بوو، ئەوا تەنیا ناوچاوی خۆم دەگرێتەوە.

والسلام.

براتان

**ئازاد عەبباس کلێجاڵی**

**گوندی قەرەگۆڵی حاجی جەزا**

خوێنەری ئازیز! هەندێ وشەی کوردی لەم کتێبەدا هەیە، لەوانەیە لای هەندێ خوێنەر ماناکەی ڕوون نەبێ، ئەو کەسانە دەتوانن لەم لاپەڕەیەدا ماناکەی بدۆزنەوە:

| وشە و ماناکەی | وشە و ماناکەی |
| --- | --- |
| ئاتاج: هەژار و نەدار، موحتاج | خەلە: دەغڵ ودان، خەلەوخەرمان |
| ئارخەیان: خاترجەم، دڵنیا | دارا: دەوڵەمەن، زەنگین |
| ئاریشە: دژوار، موشکیلە | دزێو: ناحەز، ناشیرین |
| ئاوەز: عەقڵ | دەرەتان: ڕێگەچارە |
| بلەژنانی: پیاوێک کە ئاکار و دەدای ژنانە لە خۆی دەربێنێ | ڕۆژی سەڵا: قیامەت، پەسڵان |
| بنکڵێشە: چونە ناو فکر و دەرون | ڕەفتەنی: ئەو کەسەی کە بۆ دواجار دەڕواو ماڵئاوایی دەکا، تاراو |
| بەرپێوار: نادیار، غەیب | زەنگین: دەوڵەمەن، دارا |
| پڵیشاو: لەبەریەکچو، پان و فلڄ بوو | سەردولکەبێژ: ئەو ژنانەی لە تازیەدا مردوو دەلاوێننەوە |
| پەسن: وەسفکردن بە چاکە | سەنسەنە و تەنتەنە: جەلال و شکۆی پاشایانە |
| پۆزشهێنانەوە: داوای لێبوردن، بیانووی بەجێ | شەنگڵەبەرەکەتە: دوو دانە بەر یان میوەی پێکەوە نووسراو |
| تاقەت کردن: شاردنەوە | فەتەرات: بەڵاو موسیبەت، چۆرتم |
| تالووکە: پەلە، عەجەلە | عوززا، لات، مەنات، هوبەل: ناوی بتەزلەکانی شاری مەککە |
| تراویلکە: سەراب | کرێت: ناحەز، نەهاش و خراپ، دزێو |
| تژی: پڕ، لێوانلێو | کەمەندکێش: ڕاکێشانی کەس بە هۆی عەشقەوە |
| تۆرەمە: وەچە، بنەماڵە | |
| توتوو: بەتوتوو: بەهیچ جۆرێک | |
| تەکووز: ڕێکوپێک | |
| پیرەک: پیرەژن | |

جووقەوار: گیان لەبەر

جەغزی بەتاڵ: بازنەی بەتاڵ

جەفەنگلێدان: گەپ و گاڵتەکردن

چتۆ: چۆن چۆنی

چاڵەڕەش: زیندان، سجن

چلۆسک: داری نیوە سووتاوی بە گڕ

حەوسەڵە: تاقەت، سەبر و پشوو

خاترجەم: دڵنیا، بێخەم

خوسپ: زەم، بە خراپە باسی کەسێ کردن

خەشم: تووڕەیی

گلێرکردنەوە: کۆکردنەوە

گۆری: بەقوربانبوون

گێچەڵ: ئاژاوە

لە منت کەوێ: قوربانت بم، ئافەرین

لاشیپانە: لای خوارەوەی چوارچێوەی دەرگا

مرخخۆشکردن: تەماحتێکردن

مکوڕ: سووربوون لەسەر کارێک

ناحەز: ناخۆشەویس

وەج: حورمەت، ڕێز

یاو: نەخۆشی تا.

۞ ۞ ۞

پێش هەموو شت:

لە دوور ڕا هات...

بەژن و باڵای هێندە بەرز بوو، دەتگوت خزمی دار چنارە...

هێند پتەو بوو، دەتگوت پارچەی کەژ و کێوە...

دەستی چەپی گالۆکێکی پێ گرتبوو، بۆ وەی نەبوو خۆی بە گۆچان ڕاگیر بکا، وەها دەیچەقاند بە خاکا، وەك بیەوێ سووڕی زەوی بووەستێنێ...

ڕیشی پڕ و ماش و برنج، تاڵی ڕەشی هێندە ڕەش بوو، وەک ڕەشیی بەردە ڕەشەکە... سپیەکەی هێندە سپی بوو، وەك پشتەماڵی حاجییان...

پۆشاکی هێندە کۆنە بوو، دەتگوت عارەبی هەژارە...

دەموچاوێکی نوورانی و ناوچاوی گەش، سیمای وەك گۆڕەپانی جەنگ لێکردبوو. دەزانی بۆ؟! بریسکەی هەردوو چاوانی، دەتگوت تیشکی تیژی خۆرە کاتێ لە مەیدانی جەنگا لە شمشێری دەبان دەدا...

ئا لەم ڕەنگە کەم کەس هەبوو، مرۆڤێکی وەها نەبوو هەموو جارێ لە وێنەی ئەو بەدی بکەی...

هەرچی پەسن و مەدحی هەبوو، نوێنەری چیرۆکێك بوون، بگرە چەند چیرۆکی جیا جیا...

وردە وردە لێم نزیك بوو، گەشتە لای من، ویستم پرسیاری لێ بکەم: "قوربان تۆ کێی؟!"

بەڵام پیاو و مەردی وا هەن، هێندە بە سام و هەیبەتن، مرۆی بە غیرەتی دەوێ لەلایان لێو بترەکێنێ و گفت و لفتی ناو دڵی خۆی ئاشکرا کا...

ئەویش پیاوێکی ئاوا بوو...

بە سەر سامی لە جێگەی خۆم وەك بت وەستام...

چاوم زاق زاق سەیری سیما و باڵای دەکرد، هەزار و یەك بیر و خەیاڵ هرووژمیان کردە نێو مێشکم، لەپڕ دەنگی پڕ لە سۆز و زەلاڵی ئەو، منی بە ئاگا هێناوە...

ـ "کاکە سڵاو!"

دەنگی وەکوو سەر و سیمای بە هەیبەت بوو، بەڵام پڕ سۆز، وەکوو دەنگی دایکێ ڕۆڵەی بیماری خۆی بلاوێنێ، وەکوو دەنگی صەلای نوێژی بەیانی بوو...

زۆر بەپەلە هاتمە دەنگ:

ـ "سڵاو سەرچاو!"

لێمی پرسی: "تۆ خەڵکی کوێی؟"

گوتم: "ئەزبەنی عەرەبم."

گوتی: "عەرەب لقی زۆرە، کامەیانی؟"

ــ "لەو عەرەبەم شان و شەوکەتیان نەماوە... لەو عەرەبەم سەربەرزیی جارانیان نەما... لەو عەرەبەم لەسەر سفرەی ناپیاوانن، لە نانی خۆیان تێر نابن... بێ زەحمەت تۆ ناوت چییە؟"

ـ "عومەری کوڕی خەتتابم... عومەری پیاوی مەیدانم.... ئەو عومەرەم ئاهم بە گیانی نیوگیانی دادگەریدا هێنایەوە... ئەو عومەرەم ڕێز و حورمەت و شەرەفم بۆ سیاسەت گەڕاندەوە... ئازایەتیم دا بەوانەی بێکەس و تەنیا و بێنەوان... هیوام دا بە ئەو کەسانەی هیوابڕاو، دەستە و ئەژنۆ دانیشتبوون... ئەو عومەرەم یەکسانیم زۆر بە یەکسانی دابەش کرد و دیل و یەخسیریش بەشیان بوو... ئەو عومەرەم هەرچی پیاوی هەرچی و پەرچی و ناپیاو هەیە، بۆ ساتێکیش لە بەردەمما نەیانتوانی خۆڕاگرن... ئەو عومەرەم بووم بە مەرگی بیری پوچی ئاغایەتی و بەرتیل و گەندەڵی و تیرۆر... ئەو عومەرەم حوکوومەتم خستە سەرێێ، سوپای بەهێزم دروستکرد... فارسم شکاند... ئیمپراتۆرم جێ لەق کرد... هاوڕێ و دڵسۆزی پێغەمبەرﷺ... چی لەسەرووی دۆستایەتیی پێغەمبەرە، تا پیاو شانازیی پێ بکا؟!... کام نەژاد و تۆرەمەیە هێند دۆستایەتی پێغەمبەر، مایەی شانازیی مرۆڤە و خاوەن ڕێز و خۆشەویسە؟..."

بەڵێ کاکە! ئەو عومەر بوو، ئەو عومەرەی هیچ چیرۆکی لە پشت نەبوو، خۆی چیرۆك بوو...

ئەو عومەرەی پرسیاری مێژوی لێ دەکرا... نەك لەبەر ئەوەی هادار[1] بوو، لەبەر ئەوەی خۆی مێژووەکەی دروست دەکرد... من لە خزمەت عومەردا بووم، بۆیە بە دەرفەتم زانی... ویستم چیرۆك لە زاری چیرۆك ببیسم... ویستم ببم بە پەرجووناس، پەرجوو لە پەرجوو[2] ببیسم... مەبەستیشم مێژوو نەبوو، تەنیا مەبەستم عومەر بوو...

لە پاش ئەمە:

عومەری کوڕی خەتتاب بەڵگەیەکی زۆر نەمرە، تا بزانین دینی ئیسلام مرۆڤ چۆن پەروەردە دەکا... چۆن ستەمکاری نیوەڕۆ دەکا بە تەرکە دنیایەك، لەسەر بەرماڵی شەونوێژی بە جێ دێڵێ... جاف دەکاتە شارستانی، بێهێزیش وا بە هێز دەکا کە دیکتاتۆر ئەڕوخێنێ.

هەر ئەو پیاوەی سەر لە بەیان بە هەویری خورمای خۆیان خودای بۆ خۆی دروست دەکرد، پاشان ئێوارە لە برسا بە دوو قەپاڵ هەموی دەخوارد، سەیرکە بزانە چی لێهات؟

هات ئەو دارەی کە یاوەران لە سێبەریا پەیمانیان بە پێغەمبەردا، لە بن بڕی! دەزانی بۆ؟ نەوەك کەسێ مەیلی دڵی بۆ ئەو دارە بجولێت و کەمێك لە خۆشەویسی خۆی جیاتی خودا، بە دار بدا.

هەر ئەو پیاوەی لە ماوەی چاو تروکانا تووڕەیی خۆی بە سەر ئەو کەسەدا دەڕشت کە بیگوتا: "الله نەبێك هیچ کەسێتر خودا نییە،" بزانە ئیسلام چی لێکرد!

---

[1] هادار: ئاگادار، خەبەردار

[2] پەرجوو: موعجیزە

دەیگوت: "خوایە! زۆر دەترسم لەلای فورات حوشتری بار پێی بخلیسکێ وك لە پەسلانا بەرۆکی من بگری بڵێی: 'عومەر! کام بوو ڕێگا و بانت؟' "

عومەر لە تەمەنا لاو بوو، بیست و شەش بەهاری دیبوو، پێغەمبەری ئیسلام بە دڵ نزای دەکرد: "خوایە ئەم دینە بە هێز کەی، بەو کەسەی لات خۆشەویسە، بە عومەری کوڕی خەتتاب، یاخود عەمری کوڕی هیشام." نزا بۆ عومەر گیرا بوو، ئا بەم شێوە چیرۆك هاتە دروست بوون و دەستی پێکرد.

نزای حەزرەت چەند خاوێن بو! عومەر لە تاریکی کوفرا دەخاتە نێو ڕۆشنایی دین، لە گۆماوی پەستی و کەمی دەیباتە لوتکەی سەروەری! لە دارونەدوەی دەردێنێ، بۆ دارولئەرقەمی دێنێ.

بەڵێ وایە، گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێ، هەرکەس کاتی خۆی باش بووبێ، ئێستەیش باشە، لەسەردەمی نەفامیدا هەرکەس باش بوو، لە کاتی موسڵمان بوونا باشتریش بوو.

ئەو عومەرەی لەسەردەمی نەزانیدا نیشانەی گەورەیی تیا بوو، لەسەردەمی دینی ئیسلام بوو بە پیاوێکی هێند مەزن، چاك و خراپ، هەق و ناهەق، دروست و چەوت، گەنم و مرۆر[1]، هەموی وەکوو خۆی دەناسی، هەموو شتی تەتڵە دەکرد[2]، جوان دەیبژنی، باش و ناباشی جیا دەکرد.

عومەری دەمی نەفامی ئامادە بوو ببێ بە عومەری فاروق، کێ وەك ئیسلام ئامادەیە و باش دەتوانێ مرۆڤەکان لەسەر ڕا دابڕێژێت و باشیان بکا؟!

ئیسلام دژی سروشتی هیچ کەسێ نییە، ئیسلام سروشت خاوێن دەکا، داب و نەریتی هیچ قەومێك لەناو نابا، جەلای دەدا[3]، عومەر لە کاتی ئیسلاما وا خاوێن بوو، وا جەلا بوو، تا هەتایە مێژوو جارێکیتر عومەر هەرگیز بە دووچاو نابینێ.

---

[1] مرۆر: دەنکێکی تاڵە لەناو گەنمدا

[2] تەتڵەکردن: هەڵتەکاندنی دەغڵ بۆ پاکبوونەوە.

[3] جەلادان: پاککردنەوەی شتێك تا بریسکەی لێ دێ.

ئیسلام هات و کوفری عومەری لەناو برد، کەسایەتی عومەری وەك خۆی هێشتەوە، تەنانەت بەری بۆ شل کرد تا بە عەقڵی نوێ و جوانەوە دەست بە کار بێ. ئەو کەسەی لەسەر نەفامی زۆر شێلگیر بوو، لە کاتی ئیسلام شێلگیرتر، بەڵام ئەمجارە جیاوازە، شێلگیر لەسەر حەق پەرەستی؛ شێلگیرە بۆ فریاڕەسی.

ئەو کەسەی زۆر بە ئازادی و بێ ترس و لەرز شانازیی بە کوفر دەکرد، ئێستایش هەروا زۆر ئازادە و ترس و لەرزی لەلا نییە، دیسان خەریکی شانازی، بەڵام ئەم جار شانازی بە ئایین دەکا.

لەوانەیە پرسیارێکت بۆ بێتە پێش بە خۆت بڵێی:

ئێمە هەردەم وتومانە دینی ئیسلام دژی سروشتی خەڵك نییە، بەڵکو خاوێنی دەکات و دژی خدەی[1] کەسیش نییە، بەڵکو تەنیا جەلای دەدا، چاك دەشزانین ئەو توند و تۆڵیەی عومەر بووی، سەردەمی نەفامیش هەیبوو، بەڵام ئەو کات بۆ مەبەستێکی تر بوو، ئێستادش بۆ مەبەستێکی تر، ئەو نەرمونیانییەی لەسەردەمی ئیسلاما بووی، کوا لە پێشا بۆچی نەیبوو؟ هەر ئەو نەبوو کارێکی وای بە خزمەکانی خۆی کرد با بە دەواری نەکردبێ، هەر لەبەر ئەوەی ئیسلام بوون؟! تەنانەت خزمی زۆر نزیك بەر شاڵاوی توڕەیی عومەر دەکەوت وك بەزەیی بە کەس نەدەهات، ئیتر کوا سروشتی عومەر لەو کاتەدا نەرمونیانیی تێدا بوو؟

تۆ ئازادی لەم پرسیارە، بەڵام پرسەکەت ناجێیە! بڵێ بۆچی؟ ئەم پرسیارە وا دەردەخا توندوتۆڵی و نەرمونۆڵی دژی یەکن، بەڵام لە ڕاستا وانییە، توندوتۆڵی و نەرمونیانی دوو ئاکاری لێك ساچاون،[2] دەکرێ هەردوو لە یەك کەسدا کۆ ببنەوە، دژە وشەی نەرمونیان: دڵڕەقیە، نەك توندوتۆڵ. عومەریش لە کاتی خۆیدا توندوتۆڵ بوو، نەك دڵڕەق بێ، بەڵام هێندە توندوتۆڵ بوو، خەڵکانێك وایان دەزانی کە دڵڕەقە.

ئێ خۆ عومەر خۆی لێرەیە، مادەم وایە، بۆ لەبارەی عومەر بڵێین؟ با هەموومان بە گوێی خۆمان لە زاری خۆی شت ببیسین، ئێمە وتمان نامانەوێ باسی بکەین، دەمانەوێ لێی ببیسین.

---

[1] خدە: خوو

[2] لێک ساچاون: پێکەوە سازاون

بۆیە ڕوو لە خودی پێشەوا عومەر دەکەم و، لێی دەپرسم:

- دەنگوباسی تۆ و لەیلای کچی حەنتەمەم بیستووە قەزیە چییە و چۆنە؟

- ئێی کوڕی خۆم! ئەو دەمانەی لە مەککە بووین، من هێشتا موسڵمان نەبووم، بەڵام لەیلا- کە خزمی نزیکی من بوو- خوا ڕێنوێنیی کردبوو، موسڵمان بوو. پێغەمبەریش فرمانی دابوو بە یاوەرانی لە مەککەوە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە. لەیلایش خۆی ساز کردبوو بۆ کۆچ کردن. ڕۆشتم بۆ لای، کۆڵ و باری ئامادە بوو. وتم: دەتەوێ کۆچ بکەی؟

وتی: بەڵێ، زەوی هەر زەوی خودایە، لێرە ئێوە ئەزیەت و ئازارمان دەدەن. لێ ناگەڕێن بۆ خۆمان بە ئازادی بژین، دەڕۆین بزانین خوا چی دەکا، تا ئەو کاتەی ڕێگا چارە و دەرەتانێکمان گیر دەبێ.

منیش وتم: خواتان لەگەڵ.

- بە ڕاست گەورەم! دوایی لەیلا ئەم باسەی بۆ عامر دەگێڕایەوە، دەزانی چی گوت؟

- نا، چی گوت؟!

- گوتی: لە ژیانی خۆم هەرگیز هێندەی ئەمڕۆ ئاوا عومەرم نەدیوە، زۆر لەسەر خۆ و نەرمونیان!

بەو قسەی من، زنجیرەی خەیاڵی عومەر بۆ ئەو کاتە گەڕایەوە و، بە دڵ ئاواتی دەخواست ئەو سەردەمە پیاوێکی موسڵمان بایە، بۆیە زۆر زوو ئەو زنجیرەم پس پس کرد و هاتمە دەنگ و گوتم:

- ئەی دەزانی عامر چی وت؟

- نا، ئەو چی گوت؟

- وتی: لەیلا! وادیارە قرمت[1] لە موسڵمان بوونی عومەر خۆش کردوە؟!

---

[1] قرمخۆشکردن: ئارەزوولێبوون، دڵپێخۆشبوون

وتی: بەڵێ.

عامر وتی: ئەیهو لەیلا-ئیسلام کوجا و عومەر کوجا-تا بەردەکەی ماڵی خەتتاب نەیەت و خۆی تەسلیم نەکا، عومەر نابێ بە موسڵمان.

پاشان بە پەلە پرسیارێکم هێنایە پێش، وتم:

- قوربان تۆ ئەو ڕۆژە چۆن ئەوەندە دڵنەرم بوی، خۆ تۆ، تۆ بووی؟!

- ڕۆڵە! پیاوی جوامێر لە کاتی دۆستی و دوژمنی، هەر جوامێرە. ئەو کەسانەی لە کاتی دوژمنایەتی هەق ناڵێن و دەیشارنەوە، بە ناو پیاون، ئەو کەسانەی سۆزو بەزەیان بەرابەر خزمان نییە، کەی مرۆڤن؟

- مادەم وایە ئەی دوژمنایەتی لە پای چی بوو؟

- من دژایەتی بیروبۆچونم دەکردن، نەک دژایەتی خودی خۆیان، خۆ من ئەبوو سوفیان نەبووم دەوڵەمەن بم، بانگەشەی ئایینی تازە ترسی بۆ سامانم هەبێ. وەکوو خاڵە ئەبوو جەهلیش نەبووم، زۆر بە خەستی لەگەڵ تیرەی عەبدولمەناف لە پێشبڕکێ و پێش پێشان بم، ئەبوو جەهل هەردەم دەیوت: "ئێمە و تیرەی عەبدولمەناف هەسکە هەسکی ئەوەمانە پێش بکەوین، ئەوان ماڵدارو نانبدەن، ئێمەیش نان و ماڵمان بۆ گشت کەسێ کراوەیە. ئەوان بەخشندەو دەستباون، ئێمەیش هەروا. ئەوان یارمەتی خەڵک دەدەن، ئیمەش یارمەتیدەری خەڵکین. وەک دوو سواری نێو مەیدانین، بزانین کێ سەردەکەوێ؟ ئەوان دەڵێن: 'ئێمە پێغەمبەرێکمان هەیە لە ئاسمانەوە نیگای بۆ دێت، ئێمە چیبکەین؟! ئیمان بێنین؟ بڵێین وایە؟! هەرگیز شتی وا ڕوو نادا وك ماقوڵ نییە!'

من وەکوو وەلیدش نەبووم، خۆی زۆر بە گەورە بزانێ و موحەممەد ﷺ بە گچکە سەیر کا، وا بزانێ تەنها ئەو قابیلەتی ئەوەی هەیە لە ئاسمان ڕا نیگای بۆ بێت، وەلید دەیکوت: ﴿لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾ الزخرف: ٣١

'ئەوە بۆ ئەو قورئانەیە دانەبەزێنرا بۆ سەر پیاوێکی مەزنی دوو شارەکەی مەککە و

تائیف؟' مەبەستی لە پیاوی گەورەی شاری مەککە، خودی خۆی بوو؛ مەبەستی لە پیاوی گەورەی شاری تائیفیش، عەمری کوڕی عومەیری سەقەفی بوو.

من وەک عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیش وا نەبووم چونکە دەیگوت: 'واز لە موحەممەدﷺ و عەرەب بێنن، ئەگەر عەرەب موحەممەدیان کوشت، ئەوا ئێمە رزگار دەبین، ئەگەر موحەممەدیش سەرکەوت، ئەوە خۆ ئەویش عەرەبە، سەرکەوتنی سەرکەوتنی هەموومانە.'

من تەنیا دژی بیروبۆچونی ئیسلام بووم، ئەو ئیسلامە کاروباری قورەیشی وەک خۆی نەهێشت، نێوان خەڵکی وەک خۆی نەما، کوڕ لەلایەک باوک لەلایەکی تر و برا لەم سەر ئەویتریان لەو سەر دەبوو."

- قوربان تۆیەکی وا ژیر و لێزان، چۆن زوو درکت بەوە نەکرد ئیسلام ڕاستە؟ تۆی وا ژیر و خاوەن ئاوەز، چۆن خۆت بە خورمای ماڵی خۆت بتت دروست دەکرد و، سەرلەبەیانی سەجدەت بۆ دەبرد و ئێوارە دەتخوارد؟!

- کوڕی خۆم! ئێمە ژیر و ئاوەزدار بووین، بەڵام هیدایەتمان نەبوو، ئەو ئاوەزەی هیدایەتی لەگەڵ نەبێ، وەک ئەسپێکی سەرەڕۆ و شێت وایە، خاوەنەکەی چاری ناکا و ملی سوارەکەی دەشکێنێ، ئێمە بە ژیری و ئاوەزی خۆمان سەرکردایەتیی خەڵک ناکەین. هیدایەت نوورێکە، خوا دڵی خەڵکی پێ ڕۆشن و ڕووناک کردۆتەوە. زۆر کەس دەزانم لە ژیری زۆر لە عومەر لە پێشترن، بەڵام ئەو ژیری و ئاوەزە لە ئاگری نەپاراستوون، زۆر کەسیش هەن سادە و هەژار، بەڵام خودا دڵی بۆ ڕووناک کردوون و ئیمانێکی وایان هەیە، بۆ خەڵکانێکی زۆر مەزن بوون بە چرا.

عومەر هەروا باسی هیدایەتی بۆ من دەکرد، لەو دەمەدا بیرم لەو کەسانە دەکردەوە بەناو بۆشایی ئاسمانا گەشت دەکەن و دەچنە سەر مانگ و زۆر شوێنی تر، یان ئەو پزیشکانەی کەوا نەشتەرگەری بۆ خەڵکی دەکەن و ئەو هەمووە وردەکاریەی نێو لەشی مرۆڤ دەبینن، کەچی ئیمانیش ناهێنن! بەڵێ، قسەی عومەر ڕاستە، ئەم مەسئەلە پەیوەستیی بە دڵی مرۆڤەوە هەیە، پەیوەندیی بە ژیری نییە.

باسەکەمان باسی هیدایەتی خوا بوو، بۆیە منیش ئەو باسەیەم بە هەل زانی، وتم:

ـ قوربان! باسی ئەو ساتەم بۆ بکە موسڵمان بووی!

ـ ئەو ساتە، ساتێک بوو لە ئاسمانا بۆم نووسرابوو، لە زەویدا جێبەجێ بوو. من زۆردار بووم، موسڵمانان هیچ کات بڕوایان وا نەبوو عومەر ئیمان بهێنێت و بچێتە نێو ڕیزی ئەوان، بەڵام پێغەمبەری ئیسلامﷺ مەلەفی قەزیەی عومەری لە زەوی ڕا بۆ ئاسمان گواستەوە، هەردوو دەستی بەرز کردەوە، پاڕایەوە، فەرمووی: "خوایە! ئەم ئیسلامە بەهێز بکە، بە موسڵمان بوونی یەک لەم دووانە: یان عومەری کوڕی خەتتاب، یان عەمری کوڕی هیشام." ئیتر ئەو نزا و پاڕانەوە بۆ من گیرا بوو. ڕۆژێک پێش ئەوەی موسڵمان بم، بیستم کە پێغەمبەر دۆعایەکی وای کردووە، ئەویش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودم بیست، ئا لەو ڕۆژەدا بینیم ئەبوو جەهل لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەدا، خستیە سەر خۆڵ و خاک و لێدانی کرد، منیش بە دڵ بەزەییم پیا هاتەوە و، دەستم بۆ ڕاکێشا تا هەڵبسێ... عەبدوڵڵا وتی: "سوێند بە خودا! تۆ لە عەمر باشتری، وا دەزانم دۆعای پێغەمبەرت بۆ بکەوێتە کارو ئیمان بێنی!" بەڵام گوێم بە قسەی عەبدوڵڵا نەدا و ڕۆشتم. دوایی زانیم ئەو نزایەی لە ئەرزا بکرێ و بۆ ئاسمان بەرز بێتەوە، چی دەکات و چۆن گیرایە!

ئەو شەوە هەتا بەیانی بیرم لە پێغەمبەر دەکردەوە، بیرم لە قورەیش دەکردەوە، چییان لێهاتوە. بڕیارم دا سبەی بچم بیکوژم، دوایی بچم خۆم تەسلیمی بەنی هاشم بکەم تا لە جیاتی پێغەمبەرا بمکوژنەوە، خوێنی پیاوێک هەر پیاوێکە... ئیتر مەککە دەچێتەوە دۆخی جاران. بۆ بەیانی، دەستم دایە شمشێرەکەم، وتم: "دەبێ ئەو کارەی بڕیارم لەسەر داوە، هەر بیکەم و لێی پەشیمان نەبمەوە. لە ڕێگەدا گەشتم بە نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای عەدەوی، ئەم نوعەیمە لە ترسی خزمەکانی خۆی بە پەنامەکی موسڵمان بوو، نوعەیم لە منی پرسی:

ـ عومەر، ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

ـ دەڕۆم موحەممەد دەکوژم، ئەو کەسەی وا قورەیشی تێکدا بە سەر یەکا، ڕەخنە لە ئایینی باب و باپیرانی ئێمە دەگرێ، هەر دەیکوژم!

ـ سوێند بە خودا! تۆ تێک چویت و خۆیشت نازانی چی دەکەی، ئەگەر موحەممەد بکوژی، هۆزی عەبدولمەناف چۆن دەهێڵن بە زیندوویی لەسەر خاکا بمێنیت و بۆ خۆت بژیت؟! ئەی بۆ ناڕۆی بۆلای خزمەکانت چارەی دەردی ئەوان بکەی؟

ـ کام خزمانم؟

ـ فاتمەی خوشکت، ئامۆزاکەت، هەم زاواتە هەم ئامۆزا، وەڵا ئەوانیش ئیمانیان بە موحەممەد هێناوە و موسڵمان بوون!

نوعەیم بۆیە ئەوەی بە من گوت، تا شەڕی من لەسەر پێغەمبەری خودا کەم بکات و، لەنێوان دوو بەڵاو ئازار، ئەوەی هەڵبژارد کە ئێشی کەمتر دەبێ. نە ئەو زانی، نە من زانیم ماڵێکم پێ پیشان دەدا بە کافری تێی دەچم و، بە دینداری لێی دێمە دەر!

بە تووڕەیی بەرەو ماڵی فاتمەی خوشکم و سەعیدی زاوام ڕێکەوتم. لە نزیک دەرگای ماڵەکەیان، گوێم لە دەنگی خەبیابی کوڕی ئەرەت بوو قورئانی بۆ دەخوێندنەوە، زۆر بە توندی دام لە دەرگا و، هاوارم کرد بیکەنەوە!

خەبباب یەکسەر خۆی شاردەوە، سەعید دەرگای بۆ کردمەوە، چوومە ژوور و وتم: 'ئەو ورتە ورتە چی بوو؟'

فاتمە وتی: 'من گوێم لە هیچ نەبوو، من و سەعید پێکەوە دەدواین و باسی ڕۆژمان دەکرد.'

بەڵام ئەم وەڵامەی فاتمە بۆ من قابیلی قەبوڵ نەبوو، وتم: 'بووی بە دوژمنی گیانی خۆت و، بڕوات بە ئیسلام هێناوە؟' فاتمە کڕ و بێدەنگ و بێ وەڵام. لەوی

نەتروکاند و هیچی نەگوت! ئەمجار ڕووم کردە هەردووکیان وتم: 'وا بزانم خۆتان لە خشتە بردەوە و موسڵمان بوون؟ ئایینی باب و باپیرانتان واز لێهێنا؟'

سەعید وتی: 'عومەر! ئەی ئەگەر ئایینی تۆ ڕاست نەبێ و، ئەو ئایینە تازە ڕاست بێ، تۆ چی دەکەی؟'

من بەرگەی ئەو قسەم نەگرت، تا هێزم بوو زللەیەکی زلم لێدا، فاتمە هەستا من لە سەعید دوورخاتەوە، لەویشم دا، خوێن بە سەر و چاویا هاتە خوارەوە. فاتمە بە دەم خوێن سڕینەوە و بە تووڕەیی وتی: 'بەڵێ کاکە! من موسڵمانم، چیت لە دەس دێ، درێغی مەکە!' منی جێهێشت، ڕۆشت لە جێگاکەی خۆی دانیشت. هەرگیز فاتمە بەوجۆرەیە بەرانبەر بە من نەوەستابوو، دەمبینی خوێن بە سەر و چاویا دەهاتە خوار، دڵم بۆ فاتمە زۆر سووتا، پێش ئەوەی قسە بکەم، چاوم بەو لاپەڕەیە کەوت کە لە منیان شاردبوویەوە، وتم: 'ئێوە ئەمەتان دەخوێندەوە؟ ئادەی بمدەرێ سەیری بکەم!'

فاتمە وتی: 'تۆ مرۆڤێکی پیسی، ئەم قورئانە نابێ دەستی مرۆڤی پیس بەریکەوێ، هەستە و پاک پاک خۆت بشۆرە.' ئەوە یەکەم جار بوو کەوا هەست بە پەستی شیرک و زەلیلی موشریکەکان بکەم. ئەو فاتمەیەی کەوا هەرگیز بەرانبەر من ڕانەوەستابوو، ئێستە دەنگی بە سەر منا بەرز دەکات و بە من دەڵێ: 'بەڵێ کاکە! من موسڵمانم، چیت لە دەس دێ، درێغی مەکە!' نایەڵێت دەستم لە پەڕە کاغەزێک بدەم.

هەستام خۆم شوشت، لاپەڕەکەم لێ وەرگرت و خوێندمەوە.

- قوربان! کام سوورەتەی تیا نووسرابوو؟ ئەو دەمانەی دەتخوێندەوە هەستت چۆن بوو؟ چیت بە خۆت وت؟

- سوورەتی تاهای تێدا بوو. هەر لە سەرەتاوە، ئەگەر ئەو سوورەتەم دیبا، بەرەو ئیسلام ڕایدەکێشام، بەڵام ئیدی هەموو شتێک بە قەزا و قەدەرە، ئەو ئایەتانەی لەسەر دڵم زۆر کاریگەر بوو، دەتگوت پاچە و خۆشەویسی هوبەل و لات لەسەر دڵم

هەڵدەکەنێ و فڕەی دەدا و لە جێگەیان خۆشەویسی خوای تاقانە ئەنەخشێنێ، ئەو خودایەی کە خاوەن و داهێنەرە، وەک گزنگی بەیانی بوو؛ تاریکایی شەو ڕامالێ و دونیا ڕۆشن بکاتەوە. بەلێ، سەرەتای سوورەتی تاهای تیا بوو، هەموو شتێک کە من بمەوێ تێدا هەبوو، ئەو قورئانە لەگەڵ پێغەمبەرا قسە دەکا و بیرو باوەڕی مرۆڤ وەک پۆلا قایم دەکا، باسی پێغەمبەر موسا دەگێڕێتەوە، ورە دەداتە بەر ئەوانەی دەیانەوێ دەست بەکار بن. وام دەزانی من لە جێگەی موسام، بە خۆم وت: بۆ منیش دەست پێ نەکەم؟

ـ قوربان باسی ئەوەم بۆ بکە کە ئەو ئایەتانە چیان بە سەر هێنای، لەنێوان قسەکردن لە تەک پێغەمبەرێکا و گێڕانەوەی باسی پێغەمبەرێکی ترا، هەستت چۆن بوو؟

ـــ ﴿ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿١﴾ ﴾ طه ، ئەی پێغەمبەر ﷺ، ئێمە ئەو قورئانەمان دانەبەزاندوە تا تۆ تووشی خەم و پەژارە ببیت . تەماشا بکە چ گفتوگۆیەکی ئارام و دڵنیا کەرەوەیە! من خۆم زمانپاراوم و باش لە ڕەوانبێژی تێدەگەم، دەزانم مەبەستی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە ئێمە بۆیە بۆمان ناردووی، هەتا دڵنیا و ئارخەیان و ئارام بیت. ئەمجا تێگەشتم چۆن پێغەمبەر ﷺ و هاوەلانی بەرابەر ئەو هەمووە ئێش و ئازارانەی کە دەدران، ئەونە خۆڕاگر و پشوو درێژ بوون. ئێمە جەستەی ئەوانمان ئازار دەدا و وامان دەزانی بە ئازاردانی جەستەیان، دەتوانین لە ئایین و بیروبڕوای خۆیان وەریانبگێڕینەوە و دڵیان بە دەست بێنینەوە. لە ڕاستیا، ئەو دلانە لە ئاسمانەوە تژی و پڕ کرابوون لە موژدە و مزگێنی و ئێش و ئازار بە قەد سەرە نینۆکێ کاری تێ نەدەکردن، ئێمە وامان دەزانی ئەگەر جەستەیان بە دەست بێنین، دڵیشیان بە دەست دێنین، بەلام دوایی تێگەشتم ئەو کەسەی گیان و دڵی بە دەست هێنراوە، سەد جار جەستەشی هی تۆ بێت، تازە تۆ ناتوانی تاقە سەجدەیەکی پێ ببەی. پێغەمبەر ﷺ ڕێک وای کردبوو، ئەو دڵ و

دەرروونی کۆیلە و هەژارانی بە دەست هێنـابوو؛ ئەو کـۆیلانەی کە موسـڵمان بـوون، خوا تاشراوەکانی قورەیشیان لا بچووک بووبوویەوە، ئاغاکانیشیان کە سەجدەیان بـۆ ئەو خوا سووک و چرووکانە دەبرد، زۆر لە خوا تاشراوەکان سووکوسەلیمتر بووبوون. من باسی خۆڕاگری و ئارخەیانیم کرد، ونبووی خۆم دۆزیەوە، ئەو خـودا تاشـراوانە کە لە دار و بەرد تاشـرابوون، ئێمەیـان بـۆ ژیـان جێهێشـتبوو، هەرچییـان بـویٚ بە ئـێمەی بـکەن، ئـێمەیش هەرچیمـان ویسـت بەوانـی بکەیـن، بەڵام ئێسـتە دۆخەکە جـۆریکی تـرە، خـوایەکی ڕاسـتەقینە و بەسـۆز، وەک بتەکـان نیـیە، ئەوە خـوایەکە هەموو شتێکی دروست کردووە، ئەو ئێمە کۆدەکاتەوە و دەیەویٚ تووشـی نـاڕەحەتیی ئێش و ئازار نەبین. دەی کێ واز لەم خوا ڕاسـتەقینە دەهێنـێ و پەنـا دەبـاتە بەر خوای لە دار و بەرد داتاشراو؟

- ئەی دواتر چی قوربان؟

ـــ دوایـی ئـایەتی ﴿إِلَّا تَذۡكِرَةً لِّمَن يَخۡشَىٰ﴾ هـات. "یـاد خـەرەوەیە بـۆ ئەو کەسـانەی کە لە لێپرسـینەوەی پەروەردگـار دەترسـن." لێـرە خـراپە و وشـکایی و بێهەستی شیرکم بۆ دەرکەوت. سۆز و بەزەییـی ئیمـانم بـۆ دەرکەوت. بە قـامچی لێماندەدان، بۆ ئەوەی نانی نێوچـاوانی ئەوان ئـێمە بیخـۆین، بە سـەر وردە بەردی گەرم و داخی مەککە پاڵمان دەخسـتن بـۆ ئەوەی پشـتیان بسـوتێنین، قورئـانەکەش نافەمەرمووێ: ئەوان چیان بە ئێوە کرد وایان لێبکەنەوە، نافەرمووێ: پاڵیان بـخەن، بیـانبرژێنن، لێیانــدەن، بەڵکــو دەفەرمــووێ: ﴿تَذۡكِرَةً﴾ "یــادخەرەوە،" چەنــد ئامۆژگاریەکی جوانە، چەند وشەیەکی پڕ سۆز و هەستە، چەنـد نەرمونیـانە! ئەمە کاری لە پێشینەی پێغەمبەر بوو. ئێمە وامان دەزانی ئەو لە بەر پۆست و دەسەڵات وا دەکـا، ویسـتمان بـیکەین بە دەوڵەمەنـدترین کەسـی عەرەب، بـۆ ئەوەی واز لە بانگەوازەکەی بێنێ. وامان دەزانی بۆ ژن وا دەکا، ویستمان جوانترین و شـیرینترین کچـی عەرەبـی پـێ بـدەین، بەڵام بەو مەرجەی واز بێنـێ. وامــانزانی داوای

سەرۆکایەتی دەکا، ویستمان بیکەینە سەرۆک، بەڵام واز بێنیّ. وامانزانی داوای پلە و پایە دەکا و بای ئاغایەتی لە سەریەتی، ویستمان کلیلی ماڵی خودای بدەینە دەست، بەو مەرجەی دانیشیّ و واز بێنیّ. دوایی بۆم دەرکەوت نەخێر، ئێمە لە کویّ و ئەو لە کویّ. ئەو تەنیا ئەرکی سەرشانی جێبەجیّ دەکا، ڕاسپاردەیە و پەیامی خۆی دەگەیەنێت، کلیلی دڵی کەسی بەدەست نییە، ناتوانیّ سەربەخۆ هیدایەتی خزمە نزیکەکانیشی بدات، ئەو تەنیا پێغەمبەرە. پێغەمبەر، پێغەمبەری ئەو کەسەیە کە کلیلی هەموو دڵەکانی بە دەستە، هیدایەتی هەموو کەسێکی بەدەستە.

- دوایی چی قوربان؟

- دوایی ئەم ئایەتەم خوێندەوە ﴿ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ ٱلْأَرْضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلْعُلَى ﴾ "قورئان لە لایەن زاتێکەوە دابەزیوە کە زەوی دروست کردووە و ئاسمانە بڵندەکانی بەدیهێناوە." ئا لێرە، بە تەواوی ئەنگی و شورەیی شیرکم بۆ دەرکەوت، هەیاران! ئێمە تا ئێستا چیمان پەرەستیوە؟ بت! ئەمە جیاوازیی نێوان دروستکەر و دروستکراوە، خۆمان بە پارەی خۆمان بەندە و کۆیلە دەکڕین، دوایی پێیان دەڵێین: "بتێکمان بۆ دروست بکە با نوێژی بۆ بکەین و بیپەرەستین." خوایەک کە بەندە و کۆیلەکان دروستی بکەن، چتۆ خوایەکە؟ خوای ڕاستەقینە خاوەنی هەموو شتێکە و هەموو شتێکی دروست کردووە؛ ئەو زەویەی لەسەری دەژین، ئەو ئاسمانەی بەبیّ ستوون لەسەر سەرمان ڕاوەستاوە؛ ئەمە جیاوازییەکی نێوان خوایەکی ناتەوان و خودای توانایە، جیاوازیی نێوان خوایەکی دروستکراو و خوایەکی دروستکەرە. بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە، دەزانی ئەو هەمووە شتەی کە دەیبینی خوای هەیە. ئەو پارچە بەردانەی کە دەمانپەرەستن، لەوە لاوازترن کە شتێکی زۆر سادەیش دروست بکەن. ئیتر چۆن ئەم دووانە وەک یەک تەماشا بکرێن و بپەرەسترێن؟ چۆن دروستکەرو دروستکراو وەک یەکن؟ چۆن ئەو دار و بەردەی ناوی خوایان لیّ نراوە

و کەڕو لاڵن، وەک ئەو خوایەن کە دەفەرمووێ: "من نامەوێ تووشی ناخۆشی و ناڕەحەتی بیت"؟

- دوایی چی قوربان؟

- دوایی ئایەتی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ﴾ "دەسەلاتی خوای میهرەبان زاڵە بە سەر عەرشا،" خوا پێت دەفەرمووێ کە ئاسمانەکان و هەر حەوت چینی زەوی ئەو دروستی کردوون، ناشفەرمووێ: خوای خاوەن هێز، خوای دەسەلاتدار، بەڵکو دەفەرمووێ: "خوای میهرەبان،" بەڵێ میهرەبان، هەرچەند تۆڵە دەسەنێتەوە و تۆڵە سەندنەوەی بەدەستە، هەرچەند نەخۆشی و ڕزق و ڕۆزیی بە دەستە، هەرچەند مردن بە دەست ئەوە، بە سەر عەرش، ئەو عەرشە دوورە، لە عەرشەوە فرمانەکانی خوای میهرەبان دێتە خوارەوە و جێبەجێ دەکرێ، ئەو عەرشە دوورە، بەڵام سۆزی خوا زۆر نزیکە، دەیەوێ پێت بفەرمووێ: هەرچەند عەرش دوورە، بەڵام خوای عەرش هەمیشە لەلای تۆیە، ئاگای لێتە، دەیەوێ دڵنیاییت پێبدا، نایەوێ ترس بخاتە دڵتەوە، دەیەوێ لێی نزیک بیتەوە، نایەوێ لێی ڕاکەی، دەیەوێ چەندە لێی دەترسی، لەوە زیاتر خۆشت بوێ!

- ئەی دوایی چی قوربان؟!

- دوایی ئایەتی ﴿لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ﴾ دێت، خوا دەفەرمووێ: "هەرچی لە ئاسمانەکان و لەسەر زەوی و لەژێر زەویدا هەیە، هەر هەمووی هی ئەوە." پێت دەفەرمووێ: من ئاتاجی تۆ نیم، دەوڵەمەندم لەگەڵ ئەوەیشدا تۆم دەوێ، وەرە بۆ لام، هەرچی فریشتەی سەر ئاسمانەکانە هەناسە هەڵمژین و هەناسەدانەوەی هەر هەموویان هەر زیکرو یادی خوایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا تۆی دەوێ، دەیەوێ هیدایەتت بدات و ڕێی ڕاستت نیشان بدات، ئەوەیش لە بەر خۆت نەک لەبەر خۆی. ئەگەر تۆ کافر بی، هیچ لە دەسەلاتی خوا کەم ناکات؛ موسڵمانیش بیت، هیچ لە دەسەلاتی خوا زیاد ناکات. کەوابوو

دەوڵەمەنترینی دەوڵەمەنەکان، زەنگینی ڕاستەقینە ئێمەی هەژارو ئاتاجی دەوێ. خاوەن هێزی ڕاستەقینە ئێمەی لاواز و بێهێزی دەوێ. دروستەکەرو بەدیهێنەر، ئێمەی دروستکراو و بەدیهێنراوی دەوێ. ئیتر چ شەرەفێک لەمە گەورەترە؟ چ سەروەرییەک ئەوەندە سەروەرە؟ چ میهرەبانێک ئەوەندە میهرەبانە؟!

- دوای ئەوە چی قوربان؟

ـــ دوایـی ئـایەتی ﴿ وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى ﴾ دێت، خوا دەفەرمووێ: "بە ئاشکرا قسە بکەیت(یان بە نهێنی.) بە ڕاستی خوا هەموو شتێکی پەنهان و لە پەنهانیش پەنهانتر دەزانێ." بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە، بۆم ڕوون بوویەوە کە ئەم ئایینە بۆچی وا پەرەی سەندووە. ڕۆژێک پیاوێ لە ئەشکەوتی حیرائەوە دێتە خوارەوە و، وەک ئاگر بکەوێتە گیانی پوش و پەڵاش، ئاوا کەوتە گیانی کوفرەوە. ئەوە خوایەکی هەیە کە هەموو شتێک دەزانێ و هیچی لێ پەنهان نابێ، تەماشای نێو دڵ دەکا، هەر دڵێک خێر و چاکەی تیابێ بەرەو لای پێغەمبەرەکەی کەمەندکێشی دەکا. ئیتر زانیم تۆرەمە[1] و بنەماڵە و نەسەب هیچ ڕۆڵێکی نییە. هۆکاری ئەوەم بۆ دەرکەوت کە بۆچی بیلال زۆر زوو موسڵمان دەبێ و ئەبوو جەهل و عوتبە هەر ڕادەکەن و زیاتر لە خوا یاخی دەبن، ئەمە چیرۆکی دڵ و ڕووناکایی ناو دڵە، نەک لاشە و جەستەیەک کە ڕەق و وشک وەک بەرد و گڵە، ئەمە چیرۆکی ڕۆح و گیانە، نەک چیرۆکی بنەماڵە و کەسوکاری ئەم زەمانە. ئەو کێشانەیەی خوای میهرەبان خەڵکی پێ دەکێشێ، هەمان کێشانە نییە کە قورەیش خەڵکی پێ دەکێشا. دواییش تێگەیشتم کە خوا دەفەرمووێ: "هەموو شتێکی پەنهان دەزانم." ئەمە هەڕەشە نییە و ترساندنێک لە ئارا نییە. هەرچەند بە ڕواڵەت وایە، بەڵام وا نییە، خوا نافەرمووێ: ئەی موحەممەد لێم بترسە! من پەنهانەکانیشت وەک شتە ئاشکراکان دەزانم، نەخێر! ئەمە میهرەبانییە، گفتوگۆیەکە

---

[1] تۆرەمە: ڕەچەڵەک، بنەچە

مرۆڤ ئاسوودە و دڵنیا دەکا. خوا دەیەوێ بفەرمووێ: من وەک چۆن بە ئاشکراکانت دەزانم و پشتیوانیت لێ دەکەم، بە هەمان شێوە نهێنییەکانیشت دەزانم و پشتیوانتم، دڵت ڕادەگرم و ئارخەیانت دەکەم، ئەگەر ئەو خەڵکە لە گوێیان کردی، بەدەمتەوە هاتن، ئەوا منیش زیاتر چالاکت دەکەم، ئەگەریش بە دەمتەوە نەهاتن و بە گوێیان نەکردی، ئەوا منیش دڵنیاییت پێ دەبەخشم و سەبوریت دەدەم بۆ ئەوەی ماندوو نەبی، خوا دەیەوێ بفەرمووێ: خەفەت مەخۆ! تەنانەت ئەو ئێش و ئازارانەی کە بە زمان باسیان ناکەی، من پێی دەزانم و دەرمانی دەکەم، دەزانم لە دڵەوە چەند خەفەت بۆ ئەو خەڵکە دەخۆی ، دەزانم چی لەناو دڵتا گوزەر دەکا: دڵنیاییت پێ دەبەخشم.

- دەی قوربان چیتر؟!

— دوایی ئایەتی ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴾ م خوێندەوە. خوا دەفەرمووێ: "زاتی الله خوداییکە، جگە لە ئەو هیچ کەس بۆ پەرەستن نابێ و ناوە هەرە پیرۆزەکان هەر بۆ ئەون." ئا لێرە بوو کە بتە زلەکانی قورەیش هەر هەموویان وە بەر گورزی خوا کەوتن و هیچ نرخێکیان لەلای خەڵکی بۆ نەمایەوە، خۆشەویسی خودای خاوەن هێز و دەسەڵات و، خودایەکی درۆینەی لە دارو بەرد تاشراو لەنێو هیچ دڵێکا کۆ نابنەوە، کەس ناتوانێ ئیمان بە هەردوو لا بێنێ. بە خۆم وت: "تۆ ناتوانی خودای خەتتابی باوکت و، خوای موحەممەد بە یەکەوە بپەرستی، ئەم کارەیە هاوبەشی و شەریکایەتی هەڵناگرێ، خوا پێویستی بەوە نییە هاوبەشی بۆ بڕیار بدەن. ئەو خوایەکە، یەک دانەیە و یەکتاپەرەستیی لێم دەوێ، خوا دەیەوێ جل و بەرگی پیسی شیرک و بتپەرستی لە خۆم ڕامالم و خۆم خاوێن و پاک کەمەوە، چۆن لەنێو یەک دڵ تاریکایی و ڕۆشنایی بە یەکەوە کۆ دەبنەوە؟! کوفرو ئیمان لەناو یەک دڵ؟! زۆر مەحاڵە، خوا یەک خوایە و هیچ شەریک و هاوەڵێکی قەبوڵ نییە، بەڵام هوبەل خوای درۆینەی قورەیشەکان شەریکاتی قەبوڵ

دەکا، پێی سادەیە یان هەر نازانێ کە مەنات و لات و عوززا هاوبەشی خودایی ئەون، بەڵێ ئەمە نیشانەی بێهێزی و لاوازیی بتەکانی نێو مەککەیە. خوای مەزنیش لە ئێمە داوا دەکات کە لە تەک خۆشەویسیی ئەوا، خۆشەویسی هیچ شتێکی تر کۆ نەکرێتەوە، جگە لە ئەو هیچ کەسێک و هیچ شتێ بە خوا نەزانین."

- ئەی قوربان دواتر چی ڕووی دا؟!

- دواتر ئایەتی ﴿ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴾ م خوێندەوە، خوا دەفەرمووێ: "ئاخۆ بەسەرهاتی موسات بۆ هاتوە؟" ئەم ئایەتە گوێچکەو دڵ و گیانت بەرەولای خۆی ڕادەکێشێ، خۆی دەزانێ باسی موسات نەبیستووە، تۆ هیچ کاتێ چاوت بە موسا نەکەوتوە، بەڵام ئەوە ئەدەبێکە خودای مەزن بە کاری دەهێنێ، خۆ ئەگەر خوا بیفەرمووبا: گوێ بگرە لە بەسەرهاتی موسا، تۆ نایزانی با بۆت بگێڕمەوە، ئەوە تەواو ڕاست بوو. خۆ ئەگەر بیفەرمووبا: تۆ بەسەرهاتی موسا نازانی، دەی گوێ بگرە با بۆت بڵێم، دیسان ئەوەیش هەر ڕاست دەبوو، بەڵام خودا زۆر بە سۆز و میهرەبانی و ئەدەبەوە پرسیار دەکا و پێی دەفەرمووێ: "ئایا بەسەرهاتی موسات بۆ هاتوە؟" منیش لەبەر ئەوەی هەتا ئەو کاتە باسی موسام نەبیستبوو، زۆر حەزم دەکرد زوو پێی بگەم و بیخوێنمەوە، تا بزانم بەسەرهاتی موسا چی بوو؟ پاشان با بزانم بۆچی خوا لێرە تەنیا ناوی موسا دەبا؟خاڵی هاوبەشی عومەر و موسا چییە؟ بۆچی وام هەست دەکرد خاڵێکی هاوبەشمان هەیە؟!

- ئەی دوایی چی قوربان؟

- دوایی ئایەتی ﴿ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴾ - م خوێندەوە، خوا دەفەرمووێ: "ئەو کاتە کە موسا ئاگرێکی دی و، بە ماڵ و خێزانەکەی گوت: 'لێرە مەجوڵێن، من ئاگرێکم بەدی کرد، بەشکوو لەوێ چڵۆسکێکتان بۆ بهێنم، یان هەر لەوێ کەسێکم بۆ شارەزایی دەسکەوێ.' " بەڵێ، ئەمە خاڵی هاوبەشی نێوان عومەر و موسا بوو، هەردوو بۆ

شتێک دەگەڕاین لە دونیادا کەڵکی لێ وەربگرین، بەڵام شتێک بەدوای ئێمەدا دەگەڕا کە لە ئاخیرەت و پەسڵان[1] بە کەڵکمان بێت، موسا لەو سارا چۆڵەدا بۆ ئاگرێک دەگەڕا و بەرەو ئاگرێک دەڕۆیشت، بەڵام بە نوورەوە هاتەوە. عومەر بۆ کوشتنی پێغەمبەر دەگەڕا، وەک ئاگرەکە، بەڵام بە نووری ئیمانەوە گەڕایەوە. هەردوو بۆ ئاگر دەگەڕاین، بە نوورەوە گەڕاینەوە.

- دواتر چی ڕووی دا قوربان گیان ؟

- دوایی ئەو ئایەتانەم خوێندەوە کە دەفەرمووێ ﴿ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴾ خـــــوا دەفەرمووێ: " ئەو کاتەی گەیشتە ئاگر بانگی لێکرا: 'ئەی موسا ! من، منم پەروەرندەی تۆ، پێڵاوەکانت داکەنە، تۆ وای لەناو شیوی پیرۆزی "توِوا"دا. هەر خۆم تۆم دەسنیشان کرد، دەی گوێ لە ڕاسپێریم بگرە.' "

تۆ تەماشا ئەو گوفتارە چەن شیرینە! من خۆم تۆم هەڵبژاردووە! لەنێو هەزاران و زیاتر مرۆڤی سەر ئەم زەویە، خودا موسای هەڵبژارد و داوا لە موسا دەکا کە گوێ لە سرووش و وەحی بگرێ! ئا لەو کاتە، هەستێکی وا منی داگرت، وام دەزانی خودای گەورە داوا لە من دەکا گوێی بۆ بگرم، نەک لە موسا. خودای گەورە منیشی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی ئیمان بهێنم، لەناو ئەو هەمووە خەڵکەی شاری مەککە و پیاو ماقوڵانی دارونەدوە، منی دەستنیشان کردووە، وەک چۆن موسای لە مەدیەنەوە هێنایە شیوی تووا، بۆ ئەوەی گوێ لە سرووش بگرێ؛ ئاوا منیشی هێنایە ماڵە خوشکم تا ئیمانی پێ بهێنم. ئەوە یەکەم چێژی ئیمان بوو کە من چەشتم، بەڵام هێشتاش موسڵمان نەبووبووم، وەک چۆن موسا یەکەم تامی پێغەمبەرایەتی لە تووادا چەشت و هێشتا ئاڵای پێغەمبەرایەتیشی هەڵنەگرتبوو، ئەوە چێژی هەڵبژاردن بوو، ئەوەی منی هەڵبژاردووە پیاوماقوڵێکی قورەیشی نییە تا بێگارێکم پێ بکا، ئەوە

[1] پەسڵان: ڕۆژی زیندووبوونەوە

خوایە، خودای مەزن هەڵیبژاردم بۆ ئەوەی کاری قیامەتیم پیا بدا. هەر ئا لەویا بڕیارم دا هەچ کارێکم بۆ دیاری بکا، بێ دوودڵی یەکسەر بیکەم. دوایی زانیم ئەو پیاوەی کە من بۆ کوشتنی دەگەڕێم، ئەو دەستە و دوعایە و، لە خوا داوا دەکا کە هیدایەتی من بدا.

ـ ئەی گەورەم دواتر چی ڕووی دا؟!

ـــ دواتـــر ئـــایەتی ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ﴾ ـــم خوێندەوە، خوا دەفەرمووێ: "ئەمن خودام، جگە لە من خوای تر نییە. سا تۆ هەر من بپەرستە و نوێژیش بکە، تا وە بیر خۆتم خەیتەوە."

پێش کەمێک خوای گەورە زۆر بە ڕاشکاوی بۆی باس کردین کە ئەو خوایە، بەدیهێنەرەی گشت شتێکە، دەسەڵاتدار و بەهێزە، خەڵک دەمرێنێ، خەڵک دەژیێنێ، ئەمانە هەمووی باوەڕ بوو، داوای هیچ کارێکی نەکرد، ئەوا ئێستا پێمان دەفەرمووێ: باوەڕ هێنان بەبێ تێکۆشان و کارنەکردن سوودی نییە. ئەو دەیەوێ نوێژی بۆ بکەین، ئەو دەیەوێ تەنیا سەجدە بۆ ئەو ببەین، نەک بۆ بت و دار و بەردی تاشراو. تەنانەت ئەو ڕازی نابێ سەجدە بۆ پێغەمبەران و فریشتەکانیش ببرێ، ئەو دەیەوێ ڕوو لە ماڵەکەی بکەین و نوێژ دابەسین و بڵێین: اللە اکبر، هەموو دونیا پشت گوێ بخەین، ئەو لە هەموو شتێ گەورەترە؛ گەورەترە لەو شتانەی کە تۆ لێیان دەترسی، لەو کەسانەی خۆشت دەوێن، لە نەخۆشی، لە لەشساغی، لە خەم، لە خەفەت، لە دارایی. گوفتاری هێندە شیرینە، دڵت پێش زمانت قسەکانی دەخوێنێتەوە. ڕکوعی بۆ دەبەی بۆ ئەوەی بەرز بیتەوە، سەجدەی بۆ دەبەی بۆ ئەوەی ببی بە خاوەن ڕێز و پلە و پایە. بەڵێ، بەندایەتیکردن بۆ خودا، ئەوە ئازادی هەرە گەورە و ڕاستەقینەیە، بەندایەتیکردن بۆ غەیری خودا، کۆیلایەتی و خۆگچکەکردن و سەرشۆڕیە، بەندایەتی کردن بۆ غەیری خودا، مەرج نییە تەنیا وەک بتپەرستی بێ: گوێڕایەڵیی زاڵم، گوێگرتن لە ئارەزوو و هەوەس، گوێنەدانە

کاری چاکە، ئەمانە و سەدانی تری وەک ئەمانە، هەمووی بەندایەتیکردنە بۆ غەیری خوا.

- ئەی دوای ئەوە چی، ئەی گەورەم؟!

- دوایی ئایەتی ﴿إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ﴾ ـسم خوێنـدەوە، خـوا دەفەرمـووێ: "ڕۆژی سەلا ها لە ڕێدا[1]. من دەمەوێ ئەو ڕۆژەیە جارێ ئاشکرا نەبێ و بیشارمەوە، بۆیەش دێت بۆ ئەوەی هەرکەسێ بە گوێرەی کرداری خۆی لە دونیـادا پاداشتی بدرێتەوە. دەی ئاگـادار بە، کەسێ کە خۆی باوەڕی بە قیـامەت نیـیە و شوێن ئارەزووبازیی خۆی کەوتـوە، ڕێت لـێ نەگرێ لە باوەڕهێنـان بە ڕۆژی قیـامەت؛ تۆیش بەو هۆیەوە بە هیلاکا بچی."

بەڵـێ قیـامەت هەیە، حیسـاب و کیتـاب هەیە، کێشـانە و تـرازوو، دەفـتەر و نووسراو، ئاشکرابوونی نهێنـی، هەمـوو ئەنـدامەکان دێـنە زمـان، ئەم دونیـایە تەنیـا ئەزموونە، هەوڵدانێکی زۆر کەم بۆ مانەوەیەکی هەتاهەتایی لە بەهەشتا یا لە ئـاگر. ئێسکی پواو وەک جاری جاران چاک دەبێتەوە، گۆشتی ڕزیو و پلیشاو هەمووی وەک جاری جاران خۆش دەبێتەوە. ئێمە وامان دەزانی چەرخ و خولی ڕۆژگار کاریگەریی هەیە و زیندووبوون و مراندن ئەو دەیکا، بەڵام وا نییە. ئەو چەرخ و خـولەش وەک هەموو شتی تر هەر سـەبەبە و دەسـتکردی داهێـنەری هەرە گەورەیە، ئەم چەرخ و خولەش هەر تـاقی کـردنەوەیەکە و بەس[2]. دوایـی زانـیم کە ئەو موسـڵمانانە چـۆن بەرگەی ئەو هەمووە ئێش و ئازار و ژانەیان گرتووە کە بە دەست ئێمەمانان تووشی

---

[1] ها لە ڕێدا: ئەوەتا بەڕێوە

[2] مامۆستا هەژار لە خەییامی هەژارانەدا دەفەرمووێ:

"وەبزانە جیهان بە ئارەزووی تۆ دەگەڕێ    ئەم چەرخ و خولەی هەمووی بە فووی تۆ دەگەڕێ
وەبزانە کە سەد ساڵی ژیای پاشان چی    مەرگێکە لەسەر ڕێگە، لە دوی تۆ دەگەڕێ."

هاتبوون. خودای مەزن پێش ئەوەی هەنگاوی ئەوانە توند و تۆڵ بکا، دڵی ئەوانی توند و تۆڵ کردبوو. ئەها خوا دەفەرمووێ: "ئەو ئارەزووبازەی کە خۆی بڕوای بە قیامەت نییە، ڕێت لێ نەگرێ!" خوای گەورە پێغەمبەر و موسڵمانانی ئاگادار دەکردەوە لەوەی کە ئێمەمانان بتوانین ڕێیان لێ بگرین، دڵی دەدانەوە. ئا لەبەر ئەوە ئێمە هەرچەند بەهێز بووین، هەر دۆڕاین؛ ئەوانیش هەرچەند ژمارەیان کەم بوو و لاواز بوون، بەڵام هەر سەرکەوتن.

- ئەی قوربان پاش ئەمە چیت فەرموو؟

- وتم: ئەوە قورەیش لەم قورئانە هەڵدێن؟ ئا موحەممەدم پێ نیشان بدەن.

- دوایی چی قەوما؟

- کە خەبباب گوێی لەم قسەیە بوو، خۆی ئاشکرا کرد و هاتە دەر و پێی وتم: "عومەر مزگێنم بدەرێ، هیوام وایە ئەو دۆعایەی کە پێغەمبەر ﷺ شەوی پێنج شەممە کردی، بۆ تۆ گیرا بووبێ، پێغەمبەر ﷺ دۆعای کردو فەرمووی: 'خوایە بە موسڵمان بوونی یەکێک لەم دووانە: عومەری کوڕی خەتتاب یان عەمری کوڕی هیشام، ئایینی ئیسلام بەهێز بکە.' ئەوە دووەم جار بوو ئەو قسەیە ببیسم."

- ئەی قوربان دوایی چیت کرد؟

ڕۆشتم بۆماڵی ئەرقەم. حەمزە و تەڵحە لە بەر دەرگا ڕاوەستابوون. حەمزە سێ ڕۆژ بوو موسڵمان بووبوو، ئەو خەڵکانەی کە لەوێ بوون، منیان بینی و حەمزە نەبێ هەموویان ترسان، ئەو پیاوێکی زۆر بوێر و دلێر بوو، کە خەڵکەکەی بینی ئاوا ترساون وتی: "بەڵێ! ئەمە عومەرە، ئەگەر خوا چاکەی عومەری بوێ، ئەوە موسڵمان دەبێ، ئەگەر نا زۆر بە ئاسانی لە کۆڵ خۆمانی دەکەینەوە."

دام لە دەرگا، پێغەمبەر ﷺ خۆی دەرگاکەی بۆ کردمەوە، یەخەی گرتم، زۆر بە توندی بەرەو لای خۆی ڕایکێشام، فەرمووی: "خوایە! هیدایەتی عومەری کوڕی خەتتاب بدەی، خوایە بە موسڵمان بوونی عومەر ئایینی ئیسلام بەهێز بکەی!"

- ئەی قوربان تۆ چیت فەرمو؟
- پێم وت: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەر و نێردراوی خوای.
- ئەی قوربان بۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی نای فاروق؟
- ئەوە هەر موسڵمان بووم، یەکسەر وتم: قوربان! ئێمە ئەگەر بمرین یان بژیین، هەر لەسەر هەق نیین؟ فەرمووی: "بەڕێ وەڵڵا! بمرن و بژین، ئێوە لەسەر هەقن و ڕاستن!"

منیش وتم: دەی بۆچی وا خۆمان حەشار بدەین و بترسین؟! سوێند بە خوا! دەبێ بە ئاشکرا بچینە دەر و موسڵمان بوونی خۆمان ڕابگەیەنین، بووینە دوو ڕیز و چوینە دەرەوە، حەمزە پێشڕەوی ڕیزێک و منیش پێشڕەوی ڕیزەکەیتر. قوڕەیشییەکان ئێمەیان بینی و لە داخا وەک قیر ڕەش داگەڕان، خەم و خەفەت وەخت بوو بیانتەقێنێ، ئیتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی لێنام فاروق، یانی جیاکەرەوەی هەق و ناهەق لە یەکتری.

- ئەی قوربان دوای ئەوە چیت کرد؟
- یەکەم کارێک کردم ئەوە بوو: ڕۆشتم بۆ ماڵی ئەبوو جەهل، دام لە دەرگا. هات و دەرگای کردەوە، وتی: "ها خوشکەزا! چۆنی؟ چۆن هاتووی بۆ ئێرە؟" منیش وتم: "هاتووم پێت بڵێم: من باوەڕم بە موحەممەد هێناوە و موسڵمان بووم!" لە داخا بە توندی دەرگاکەی پێوەدا و وتی: "دەک بە ناخێری گیانت بۆ خۆت و هەواڵت!"
- ئەی قوربان تۆ بۆ وات کرد؟ خۆ تۆ ئەبوو جەهلت دەناسی؟!
- بەڵێ! من بە خۆمم وت: هێی عومەر! چۆن بە ئاشکرا کافر بوویت، دەبێ ئاواش بە ئاشکرا موسڵمان بیت. بۆیەش چومە بەردەرگەی ماڵی ئەبوو جەهل؛ چونکە ئەو خزمم بوو، خاڵم بوو، دەمزانی چەندە دژی ئیسلامە. دوای ئەوەی ئەبوو جەهل دەرگای لێ داخستم، ڕۆشتم پرسیارم کرد وتم: "لەم شاری مەککەیە، کێ دەم نەوێستاوترین کەسە؟" وتیان: "جەمیلی کوڕی مەعمەر، ئەوە قسە لە دەمیا ڕاناوەستێت و، یەکسەر هەموو خەڵکی پیا دەگەیەنێت." ڕۆشتم بۆلای جەمیل، وتم:

"جەمیل بەینی خۆمان بێ، دەزانی من موسڵمان بووم؟" سوێند بە خوا یەک وشەی لە دەم نەهاتە دەر، یەکسەر ڕای کرد و، منیش بە دوایا، ڕۆشت بۆ دارونندەوە، پڕ بە دەمی خۆی قیڕاندی و هاواری کرد: "کورە خەڵکینە! عومەری کوڕی خەتتاب وازی لە دین هێناوە."

منیش وتم: کورە وەڵڵا درۆ دەکەی، موسڵمان بووم.

ـ ئەی قوربان ئا لەو ساتەدا خەڵک چیان کرد؟

ـ هەموویان هاتن لە منیان دەدا و منیش لەوانم دەدا. خاڵە ئەبوو جەهلم هات و وتی: "هۆ خەڵکینە! ئاگادار بن، عومەر لەژێر ئەمانی منایە و، نابێ کەس لێیبدا!" ئیتر وازیان لێ هێنام.

ـ ئەی قوربان پێت خۆش بوو ئەبوو جەهل ئەمانی دای؟

ـ کورە نەوەڵڵا پێم خۆش نەبوو. پێم ناخۆش بوو موسڵمانەکان لێیان بدرێ و من لێم نەدرێ.

ـ ئەی قوربان چیت کرد؟

ـ ڕۆشتم بۆلای خاڵە ئەبوو جەهلم، لە پەنای کەعبەدا دانیشتبوو، وتم: "خاڵە! گوێت لێمە؟" وتی: "گوێم لێتە!"

وتم: من نامەوێ لەژێر پەنای تۆدا بم!

وتی: وامەکە!

وتم: وەڵڵا وا دەکەم، ئەو پەنادانەم ناوێ!

وتی: کەیفی خۆتە!

ئیتر بەردەوام لێم دەدرا و لە خەڵکم دەدا، تا بە تەواوی موسڵمان بوونم دەنگی دایەوە و هەموو خەڵک زانییان.

ـ ئەی قوربان باسی کۆچکردنی خۆتم بۆ بکە لە مەککەوە بۆ مەدینە، وام بیستووە جگە لە تۆ، کەس بە ئاشکرا کۆچی نەکردووە!

ـ کەس بە ئاشکرا کۆچی کردووە یان نا، ئەوە خوا دەزانێ. هەرکەسەو بە گوێرەی زرووفی خۆی هەڵسوکەوت دەکا، مەرج نییە هەر کەس بە ئاشکرا کۆچی کردبێ، لەو کەسە باشتر بێ کە بە نهێنی کۆچی کردووە. خۆ پێغەمبەرﷺ و ئەبوو بەکر بە نهێنی کۆچیان کرد، دەی ئەوان لە کوێی من، لە کوێ؟

ـ دەی قوربان باسی کۆچەکەم بۆ بکە!

ـ ئەو ڕۆژەی بڕیاری کۆچکردنم دا، شمشێرەکەم کردە ملم، کەوانەکەم کردە شانم، چەند تیرێکم بە مشت گرت و بەرەو لای کەعبە ڕۆشتم. دەورووبەری کەعبە لەگەڵ خەڵکدا جمەی دەهات، حەوت جار بە دەوری کەعبەدا سووڕامەوە و تەوافم کرد. لە مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمیشا دوو ڕکات نوێژم کرد. دوایی بە دەنگی بەرز بانگی خەڵکەکەم کرد و وتم: "دەک ئێسکتان خواتەوە! هەر کەس دەیەوێ دایکی ڕۆڵەڕۆی بۆ بکا، هەرکێ دەیەوێ منداڵەکەی هەتیو ببێ، هەر کەس دەیەوێ ژنی بێوەژن بکەوێ: با بێتە پشت ئەو دۆڵەوە، من کۆچ دەکەم بۆ مەدینە، کێ خۆی بە پیاو دەزانێ بێت بەرم پێ بگرێ."

ـ ئەی قوربان کەس هات؟

ـ کورە نەوەڵلا حەدیان چییە.

ـ ئەی قوربان بە تەنیا بەرەو مەدینە ڕۆشتی یان هاوڕێت بوو؟

ـ هاوڕێم هەبوو.

ـ کێ بوو قوربان؟

ـ من و عەییاشی کوڕی ڕەبیعە و هیشامی کوڕی عاص ڕێککەوتنمان کردبوو کە لە پشت بەرزاییەکانی مەککەوە یەک بگرین و کۆچ بکەین. وا ڕێککەوتین کە هەرکەسێ بەیانی لەوێ نەبوو، ئەوە یانی گیراوە و با ئەوانی تر بڕۆن. من و عەییاش ئامادە بووین، بەڵام هیشام گیری کردبوو. ئیتر ئێمە بەرەو مەدینە ڕۆشتین.

ـ ئەی قوربان عەییاش بۆچی دوای ئەوەی گەشتە مەدینە گەڕایەوە بۆ مەککە؟

- کاتێ گەشتینە مەدینە، لای خێڵی بەنی عەمر لە قوبا لاماندا، خاڵە ئەبوو جەهل و خاڵە حارسم هاتن بۆلای عەییاش، عەییاش لە دایکەوە برایان بوو. پێغەمبەریش هێشتا کۆچی نەکردبوو هەر لە مەککە بوو. ئەبوو جەهل و حارس بە هیشامیان وت: "دایکمان سوێنی خواردوە شانە نەکا بە سەریا تا تۆ نەبینێتەوە. لە بەر خۆرەتاو دانیشتووە و دەڵێ: 'ناچمە بەر سێبەر تا عەییاش نەیەتەوە.' " ئیتر عەییاش دڵی بۆ دایکی سووتاو گەڕایەوە بۆ مەککە.

- ئەی تۆ چیت کرد قوربان؟

- بە عەییاشم وت: "کورە عەییاش! بە خوا ئەوانە دەیانەوێ لە خشتەت بەرن، بە خوا ئەگەر سپێ بداتە سەری دایکت ناچار دەبێ شانەی بکا، ئەگەر گەرما تینی بۆ بێنێ، بێدەنگ ڕا دەکاتە بەر سێبەر."

- ئەی عەییاش چی کرد؟

- عەییاش بە منی وت: "قەیناکە لەگەڵیان دەچمەوە، با دایکم هێور بێتەوە و منیش هەنێ سەروەت و سامانم هەیە دەیهێنم و دێمەوە."

- ئەی تۆ چیت پێ وت قوربان؟

- وتم: "کورە بە خوا تۆ دەزانی من یەکێکم لە دەوڵەمەنەکانی قورەیش، نیوەی سامانەکەم بۆ تۆ، بەڵام نەچیتەوە."

- ئەی قوربان قەبوڵی کرد؟

- نە، ڕازی نەبوو.

- ئەی دوایی چیت کرد؟

- عەییاش لەسەر ڕۆشتنەوە سوور بوو، منیش وشترێکی چاکم هەبوو، دام بە عەییاش وتم: "با ئەم وشترەت پێ بێ، وشترێکی خێرا و گوێڕایەڵە، ئەگەر هەستت کرد فێڵت لێ دەکەن بۆی دەرچەو خۆت نەجات بدە."

- ئەی دوایی چی ڕووی دا؟

- عەیباش لەگەڵیان ڕۆشتنەوە، لە ڕێگەدا ئەبوو جەهل پێی وتبو: "برا! وشترەکەم زۆر مانوە بۆ لە پاشکۆی خۆتەوە سوارم ناکەی؟" عەیباش وتبووی: "باشە."
عەیباش وشترەکەی یخ[1] دابوو، هەر کە وشترەکە یخی خواردبوو، بە هەردووکیانەوە شاڵاویان بردبووە سەر عەیباش و دەست و پێیان بەستبووەوە، بردیانەوە بۆ مەککە و بەناو خەڵکدا گەڕاندیان وتیان: "کورە خەڵکینە! ئەوە ئێمە برا بێعەقڵەکەی خۆمان ئاوا گرت و هێنامانەوە، ئێوەیش بڕۆن کەسوکارە بێعەقڵەکانی خۆتان بێننەوە."
- ئەی قوربان تۆ چۆنت زانی ئەبوو جەهل و حارس دەیانەوێ فێڵ لە عەیباش بکەن؟

- کوڕی خۆم! هەرکەس هەر ئەو شتانە ببینێ کە بە چاوی سەر دەبینرێن، ئەوە ئەو کەسە کوێرە. من بە درێژایی ژیانم فێڵم لە کەس نەکردووە، نەیشمهێشتوە هیچ کەسێ فێڵم لێ بکات، بۆیە قسەی ئەبوو جەهل و حارس کاری لە من نەکرد، باش دەمزانی ئەگەر گەڕانەوەی عەیباش بۆ مەککە خێردار بووایە، ئەبوو جەهل نەدەهات بە دوایا. ئەبوو جەهل خاڵی من بوو؛ باش دەمناسی، تەنیا بۆ ئەوە هاتبوو بەر بە ئیسلام بوونی بگرێت، ئەبوو جەهل فێڵاوی بوو، هەتا مردنیش هەروابوو.
- ئەی قوربان ئەگەر ئەبوو جەهل و حارس ڕاستیان بکردایە، ئەوە ئەو کاتە چۆن دەبوو؟
- گوێ بگرە ڕۆڵە! بزانە چیت پێ دەڵێم: سوێند بە خوا! ئەگەر باش باشێک بمزانیایە ڕاست دەکەن، ڕای خۆمم نەدەگۆڕی، گوێڕایەڵیی خودای مەزن لە سەروو گوێڕایەڵیی هەموو کەسێکەوەیە، ئەو کەسە دایک بێ یا باوک یان هەر کەسێکی تر، ئەگەر خەتتابی باوکی من بەو جۆرە سوێنی خواردبا، ئەو سوێندەم بە ئەرزا دەدا و دەمشکاند و بە گوێم نەدەکرد و بەرەو مەککە نەدەگەڕامەوە. ئێمە قورئان فێری کردووین مافی خودا لە سەروو هەموو مافێکەوەیە، ڕازیبوونی خودا پێش، ڕازیبوونی

[1] یخ: خەواندنی وشتر، دانیشاندنی وشتر

هەمـوو کەسـێکە، ئەمەیـش یەکەم جـار نەبـوو کە موسـڵمانێک لەنێـوان ئـایین و گوێڕایەڵیی دایک و باوکێکی کافردا سەرێشک بکرێ.

- ئەی جاری یەکەم کێ بوو؟ چۆن بوو؟

- جاری یەکەم سەعدی کوڕی ئەبوو وەقاس بـوو، چیـرۆکەکە ئـاوا بـو: "سـەعد یەکێک بـوو لەو کەسـانەی هەر لە سـەرەتای هـاتنی ئیسـلامدا بـڕوای هێنـا، پێش ئەوەی نوێژ لەسەر موسڵمانان فەرز بکرێ، تەمەنی حەڤدە سـاڵ بـوو، ئەبـوو بەکـر پێی وت موسڵمان ببێ و، ئەویش داواکەی پەسەند کرد، دایکی سەعد ناڕازی بـوو، سەعد لە تەک دایکیدا زۆر زۆر میهرەبان بوو، زۆر گـوێڕایەڵی دایکـی بـوو، دایکـی وتی: "ئەگەر موسڵمان بی و، پاشگەز نەبیەوە، ئەوا نە نان دەخۆم نە ئـاو." سـەعد وتی: "دایکە گوێ بگـرە! سـوێند بە خـودا! ئەگەر هەزار گیانـت تیـابێ، دانە دانە هەمووی دەرچێ، واز لەم ئایینە ناهێنم." پاش ئەوەی دایکی ئومێدبڕاو بوو، دەسـتی کردەوە بە خواردن و خواردنەوە. خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾

لقمان: ١٥ واتە: "ئەگەر (باوك و دایکت) ئەویەڕی هەوڵیان دا لەگەڵت، بـۆ ئەوەی شتێ بکـەیت بـە هاوبەشـی مـن کـە هـیچ زانیارییـەکت پێـی نییـە، ئـەوە گوێڕایەڵییان مەکە، بەڵام لە دنیادا زۆر بەچاکی هاوڕێیەتییان بکە و شـوێن ڕێگـای کەسێك بکەوە کە بە دڵسۆزی گەڕاوەتەوە بۆ لای مـن، (لـەدوا ڕۆژدا) گەڕانـەوەتان تەنها بۆ لای منە: ئینجا هەواڵتان دەدەمێ بەو کردەوانەی کە کردوتانە."

- ئەی قوربان بۆچی بە عەیاشت وت: "نیوەی سامانم بۆ تۆ بـێ؟!" بـۆ تەنهـا ئامۆژگاریت نەکرد؟

- ئامۆژگاریکردنیش چـاکە و سـەدەقەیە، بەڵام کـڕینەوەی بیروبـاوەڕی برایەکـی هاوئایینم بە نیوەی سامانەکەم، نەک هەر زەرەر نەبوو، بەڵکو قـازانجێکی گەورەیـش

بوو. ڕۆڵە نەتبیستووە: "چڵکی دەستە ماڵی دونیا،" سامان ژیان پێش دەخا، بەڵام ژیان نییە. جا بیشزانە جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەوەی تۆ خاوەنی سامان بی لەگەڵ ئەوەدا کە سامان خاوەنی تۆ بێ، سەروەت و سامان خزمەتکارێکی باشە، بەڵام گەورە و ئاغایەکی تا بڵێی خراپە، خوای گەورە سەروەت و سامانی بۆ خزمەتکاری داناوە، نەکەی هەرگیز سەروەت و سامان بکەی بە گەورەی خۆت.

ـ بە خوا قوربان ئەم ئامۆژگاریە زۆر بەسوودە، ئەگەر هەموو کەس وەک تۆ سەیری سەروەت و سامانیان بکردایە، هەموو کەس خۆشبەخت و ئارام و ئاسوودە دەبوو.

ـ ڕۆڵە ئەم هەمووە خەڵکە، هەرچەند بە لەش و لار زۆربەیان لە یەک دەچن، بەڵام لە ژیری و ئاوەزا کەمتر لە یەک دەچن، ئایین و کاروبار و بۆچوون و کردەوەیان زۆر لە یەکتر جیاوازە.

ـ بە خوا! قوربان، من وا دەزانم کە خوای گەورە هەق و ڕاستگۆیی بە تەواوی خستۆتە سەر دڵ و زمانت، قوربان ئەو خەڵکە بۆچی لە یەک ناچن و ئاوا لە یەکتر جیاوازن؟

ـ ئەوە پەیوەندیی بە میزاج و دروستبوونی خەڵکی هەیە.

ـ چۆن چۆن قوربان بۆم ڕوونکەوە؟

ـ خودای مەزن باوکە ئادەمی لە مشتێ گڵی زەوی بەدیهێنا، ئەو مشتە گڵە گڵی هەموو شوێنێکی تیابوو، نەوەی ئادەم وەکوو گڵن، سوور و سپی و ڕەش و بۆر و... پیس و پاک و وشک و نەرم و... ئاوا هەمە جۆرەی تیایە.

ـ ئەوە لەبەر ئائەمەیە تۆ و ئەبوو بەکر لە ئیماندا وەکوو یەکن، بەڵام میزاج و تەبیعەتتان لێک جیاوازە؟

ـ تۆ هەر باسی ئەبوو بەکر مەهێنە ناو، ئەبوو بەکر نە لە ئیمان نە لە میزاج وەک کەس نییە، ئیمانی ئەو وەکوو پۆڵا و بگرە لە پۆڵایش ڕەقتر و بەهێزترە، ئەو دڵەشی هێندە نەرمە وەکوو دایکێکی بەسۆزە.

- قوربان مەبەستت ئەوەیە لە یەک گڵن، بەڵام وەک چۆن ئەو مشتە گڵە، گڵی هەموو جێگایەکی زەوی تیا بوو، ئێوەیش ئاوا تەبیعەت و میزاجتان لێکتر جیاوازە؟

- بەڵێ... بەڵێ، من وا دەزانم ئەو گڵی کێڵگەی بەرکەوتووە، مێو دەڕوێنێ، بەخشندەیە، گژوگیا زۆر جوان سەوز دەکا، گڵێکی نەرمونیانە، کێلانیشی زۆر ئاسانە. وا دەزانم منیش لە گڵی چیاکانم، گڵی چیا بەخشندەیە، گیا سەوز دەکا، بەڵام ڕەقە، من و ئەبوو بەکر ئاوەهاین، ئەو زۆر نەرمە، منیش ڕەقم، هەموو خەڵکی. تەنانەت پێغەمبەرانیش وەکوو یەک نین، جیاوازییان تێدا هەیە.

- قوربان پێغەمبەرەکانیش؟!

- با پێت بڵێم: نموونەیەکت بۆ دێنم تا جوان لە من تێبگەیت و حاڵی ببی.

- دەی زوو قوربان لەشم هەمووی کردووە بە گوێ.

- ڕۆژی بەدر لە دوای ئەوەی شەڕ کۆتایی پێهات، خودای مەزن سەرکەوتنی بە ئێمە بەخشیبوو، کۆمەڵێکی زۆرمان بە دیل و یەخسیر گرتبوو، پێغەمبەریش ﷺ هیچ دەقێکی قورئانی لەلا نەبوو، چۆن مامەڵە لە تەک دیل و یەخسیر بکا، بۆیە ڕاوێژی پێکردین، فەرمووی: "چی بکەین؟" ئەبوو بەکر وتی: "قوربان! ئەو دیلانە هەموویان عەشیرەت و خزم و کەسووکاری خۆتن، دەست پێشخەر بە، داوای تەوبەیان لێ بکە، بەڵکو پەشیمان ببنەوە و تەوبە بکەن و، خودای مەزن لێیان خۆشبێ. منیش وتم: "نەخێر قوربان! ئەوانە گشتیان کافرن، تۆیان لە شاری مەککە دەرکرد، پێیان وتی: 'درۆزنی!' با لە گەردنیان بدەین، هەرهەموویان بتۆپێنین!"

پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئەوەی یەک وشە بفەرمووێ، هەستا تەشریفی بردە نێو خێوەتەکەی، خەڵکی بوونە دووبەرەوە، بەرەیەکیان دەیانگوت: "پێغەمبەر بە قسەی ئەبوو بەکر دەکات،' بەرەکەیتر دەیانوت: "بە قسەی عومەر دەکا..." دوایی تەشریفی هاتە دەر فەرمووی: "خودای مەزن دڵی هەندێ کەس وا نەرم دەکا لە نەرمیش نەرمترە، دڵی هەندێ کەسیش وا توند دەکا لە بەردیش توندترە، ئەی

ئەبوو بەکر تۆ! ڕێک وەکوو ئیبراهیم وای، (خودا باسی ئیبراهیم دەکا کە) دەیفەرموو: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ إبراهيم: ٣٦ واتە: 'سا هەرکەسێ شوێنی من کەوت، ئەوە ئەو کەسە لە خۆمە، هەرکەسێکیش لێم یاخی بوو، ئەوسا ئەتۆ خەتا بەخش و دلۆڤانی.' وەک عیسا وای (خودا باسی عیسا دەکا کە دەیفەرموو ): ﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ المائدة: ١١٨ واتە: 'گەر بتەوێ ئازاریان دەی؛ بەندەی خۆتن، گەر بشتەوێ لێیان خۆشبی خۆت دەزانی و هەر بۆ خۆتی کە دەستەڵاتت بە دەستە و لەکارزانی.'

عومەریش ڕێک وەکوو نوحە (خوا دەفەرمووێ) نوح دەیفەرموو: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ نوح: ٢٦ واتە: 'خوایە! لەم سەر هەردە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن، جووقەواریان[1] لێ مەهێڵە.' وەکوو موسای (خودا باسی موسا دەکا کە) دەیفەرموو : ﴿رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾ يونس: ٨٨ واتە: 'خودای گەورە! ماڵیان لێ تەرت و توونا کە، دڵیان پتر ڕەق و ڕەش کە، با هەرگیز باوەڕ نەهێنن؛ هەتا جەزرەبەی زۆر بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن.' " کوڕم! ئێستاکە دەزانی ئیمان چۆن خەڵکی وەک برا لێ دەکات و کۆیان دەکا؟ بەڵام تەبیعەت و میزاج لە یەکتری جیایان دەکا؟!

- بەڵێ قوربان! ئەوە بۆیە ئەو خەڵکیە هەرچەن بیروباوەڕیان لە مەڕ خودا وەک یەکتر بێ، بەڵام هێشتا لە ڕاوبۆچونی ئایینی وەکوو یەک نین؟

- بەڵێ ڕاستە، بەڵام تەنیا لە ئایینیدا ئاوا نییە، لە کاروباری دونیاشدا هەر ئاوایە. تاقیکەوە، بڕۆ بۆلای دە- پانزە پیاو، دانە دانە پێیان بڵێ: "ژنەکەم زۆر دەبۆڵێنێ و بەرسەرمدا هاوار دەکا و قسە دەکا." بزانە لەو پانزە کەسە، چەند ڕای

---

[1] جووقەوار: گیانلەبەر، ذي روح

جیاوازت گیر دەبێ؟ ئا ئەو کاتە باش دەزانی ئەو خەڵکانە لە چەند جۆرە گڵ دروست بوون. یەکیان ئێژێ: "خەتای خۆتە، ئەوەندە نازت پێداوە سواری ملت بووە، ئەگەر هەر لە یەکەم جاردا چاوت لێ سوور بکردایە، نەیدەوێرا ئاوا بکا!" جا بزانە! ئا ئەم کەسە لە گڵێکی ڕەق و پتەو دروست کراوە. یەکێکی تر دەڵێ: "ژنان هەروان، زوو هەڵدەچن، بزانە لە چ کارێکت تووڕەیە، واز لەو کارە بێنە. ژنان هەموویان ئاوەهان، هەموو ماڵێک ژنێکی وای تێدا هەیە، ڕۆژێ خۆشی و ڕۆژێ ترشی، لێی بگەڕێ، ژیانی خۆت هەرگیز تێک مەدە، سبەینێ خۆی چاک دەبێ." جا بزانە ئەم کەسەیە لە گڵێکی زۆر بەڕێز و بەخشندەیە، هەر دەبەخشێ و هیچی ناوێ. یەکێکی تریان پێت دەڵێ: "ئەوەندە ڕەق مەبە بشکێی، نەرمیش مەبە با نەتگوشن، چوست و چالاک و وریابە و، ڕەشۆی ماڵداری بگرە دەست، سنوورێکی بۆ دابنێ با پێ لە بەڕەی خۆی زیاتر ڕانەکێشێ، بەڵام هەرگیز بیرت نەچێ، ژنیش وەک تۆ مرۆڤێکە، گشت مرۆڤێ تووڕە دەبێ و هێور دەبێ، بیمۆچێنە[1] و مەیشکێنە." جا بزانە، ئەم جۆرەیان لە گڵێکە لەنێوان دوو گڵی پێشوو.

دیسان برۆ ئەو خەڵکانە تاقیکەوە، بڵێ: "براکەم میراتم پێ نادات و هەمووی بۆ خۆی بردووە." ڕاوێژ بە چەند کەسێ بکە... یەکێ دەڵێ: "سامان و گیان وەکوو یەکن، هەرگیز لەو مافەی کە هەتە واز نەهێنی، بە دەستی خۆت، هەقی خۆتی لێ بستێنە؛ وای نیشاندە بیری بەلایدا نەچوبێ." باش بزانە، گڵی سروشتی ئەم پیاوە، لە گڵێکە هەر وەردەگرێ و هیچ نابەخشێ، هەموو شتێ لە پێناو بەرژەوەندی بەکار دێنێ. یەکێکی تریان پێت دەڵێ: "قەینا تۆ وەکوو هابیل بە، هابیل بە قابیلی دەوت: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَ ﴾ المائدة: ٢٨ ئەگەر تۆیش دەستم بۆ درێژ بکەی کە بمکوژی، من دەست لە تۆ ناکەمەوە تۆ بکوژم.' دونیا هەمووی بەجێ دێڵین، ئێمە هەموو بە کار و کردەوەی خۆمان بەرەو

---

[1] بیمۆچێنە: ئامۆژگاریی بکە

قیامەت دەڕۆین و، کەس ماڵی خۆی ناباتە نێو قەبری خۆی. خودای مەزن بە گوێرەی دەوڵەمەنی و هەژاری لێپرسینەوە ناکا، نافەرمووێ مادەم فلانەکەس هەژار بووە، بیخەنە نێو دۆزەخەوە، مادەم فلانەکەس دەوڵەمەن بوو؛ بەهەشتیە. زۆر سپاسی خودا دەکەم ماف خوراوم ماف خۆر نیمە." جا بزانە! ئەم ئینسانە لە گڵێکە کە باشترین جۆری گڵە، ئەو گڵێکە بە ڕواڵەت لەسەر ئەرزە، بەڵام لە ڕاستیدا لە بەهەشتە. سێیەم کەسیان بە تۆ دەڵێ: "لە مافی خۆت قەت خۆش نەبی، دڵی براکەیشت ڕابگرە، گفتوگۆی لەگەڵدا بکە، هەم ماڵەکەت وەربگرەوە و هەم دڵی ئەویش ڕابگرە. باسی مافی برا بکە، بە قیامەت بیترسێنە، ئەگەر وەک پیاو هاتە پێشەوە، ئەوە هەم میراتت دەس دەکەوێ و هەم براکەت زویر ناکەی. ئەگەر بە گوێیشی نەکردی، بڕۆ لای دادوەر سکاڵای لە دژ تۆمار بکە؛ جا ئەو کاتە میراتەکەت بە دەست بخە و ئیتر برا زیز دەبێ یان نە بە تون و تەوەس." جا ئەم کەسە لەو گڵەیە کە لەنێوان هەردوو جۆری پێشودایە، هەندێ نەرمی و هەندێ ڕەقی تیا دەبینرێ.

- بەڵێ قوربان وەک دەفەرمووی هەر ئاوایە، بەڵام قوربان تۆ و ئەبوو بەکر چەند خاڵێکی هاوبەش و نزیکتان هەیە، ئەو باسانەی ئەبوو بەکر کە تۆ کردت هەمووی وایە، بەڵام من هێشتا زیاترم لە تۆ دەوێ، من دەزانم ئەم هاوبەشییەی نێوان جەنابت و جەنابیان لە سروشت و تەبیعەتی خۆتانەوە سەرچاوەی وەرگرتووە. هەندێ شتی ئێوە وەکوو یەکە، گەورەم! ئەم خۆهەڵقورتێنییەم لێ وەرگرە و وەڵامم بدەرەوە.

- باشە کوڕم چی دەپرسی لێم بپرسە.

- ئەو جیاوازییەی نێوان تۆ و ئەبوو بەکر، جیاوازیی سروشت و تەبعە، نەک جیاوازیی نێوان ئیمان، ڕێک وەک ئەو جیاوازییەی لەنێوانی ئیبراهیم و عیسا لەلایەک و موسا و نوح لەلایەکی تر. ئەی ئەبوو بەکر هەموو کاتێک هەر وا نەرم نیان بوو؟ هەرگیز توڕەیی یان توندی ڕووی تێ نەدەکرد؟

- هەرچەند بەراورد لەنێوان ئیمانی پێغەمبەراندا ڕەوا نییە، بەڵام ئیمانی هیچ کەسێ هێندەی ئیمانی ئەبوو بەکر بەهێز نییە. سوێند بە خودا! ئەبوو بەکر پلەیەک لە سەرووی هەموو مرۆڤەکانەوە بوو، پلەیەک لە دوای پێغەمبەران. نە من و نە غەیری من لە ئیماندا ناگەین بە ئەبوو بەکر. لە مەڕ سروشت و تەبعەوە، ئەو کەسێکی هەتا بڵێی نەرمونیان و بەسۆز بوو، هەتا مردنیش هەروابوو، بەڵام هەرکات پێویستبایە، ئەم مرۆڤە دڵۆڤان و زۆر بەسۆزە، وەک شێری بێشەڵان دەبوو، هێند توند دەبوو کەس نەدەگەیشت بە جێ پێیدا. ئەو کاتانەی ئێمە لاواز دەبووین، ئەو بەهێز بوو. ئێمە نەرم، ئەو زۆر زۆر توند، ئەو ماوەیەی خەلیفە بوو، زۆر شتی ئەومان بۆ دەرکەوت کە هیچ کاتێ تەسەوڕمان لێ نەدەکرد.

- چۆن... چۆن قوربان؟

- با بۆت بڵێم، ئا ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، خەڵکی هەموو وەک تێک چووبن، ئاوەها بوون. ئەو خەفەتە هێند مەزن بوو، کەس نەیدەتوانی شانی بداتە بەر، من خۆم بە ناو مزگەوتدا دەهاتم و دەچووم، دەمگوت: "هەرکەس بڵێ پێغەمبەر مردووە، بەم شمشێرە لێی دەدەم، دەیکوژم؛ پێغەمبەر نەمردووە، وەکوو موسا بۆ گفتوگۆ بۆلای خودا ڕۆیشتوە و ماوەیەکی تر دێتەوە، ئەو کەسانەی کەوا دەڵێن: 'ئەو مردوە،' دەمکوت دەبن. ئەبوو بەکر لە ماڵی خۆی بەرەو ماڵی پێغەمبەرﷺ وەڕێکەوت، ڕۆشتە ماڵی دایە عایشە، نێوچاوانی پێغەمبەری ماچ کرد و وتی: 'بە زیندویی و بە مردویی چەندە پاکی!' دوایی هاتە مزگەوت، من هەروا شمشێرەکەم هەڵدەسووڕاند، هەڕەشەم لەو کەسانە بوو کەوا دەڵێن: 'پێغەمبەر وەفاتی کردووە...' ئەبوو بەکر وتی: 'عومەر دانیشە!' دوایی پڕ بەدەم هاواری کرد: 'هۆ خەڵکینە! ئەو کەسانەی موحەممەدیان دەپەرست، ئەوا موحەممەد وەفاتی کرد، ئەو کەسانەیش کە خوا دەپەرستن، خودا نەمرە و هەرگیز نامرێ!' دوایی ئەو ئایەتەی قورئانی خوێندەوە کە دەفەرمووێ:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ ۚ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا ۗ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ آل عمران: ١٤٤ واتە: 'موحەممەد ﷺ تەنها پێغەمبەرێک نەبووە وەفات بکات، بێگومان پێغەمبەرانی پێش ئەمیش(وەفاتیان کردووە.) ئایا ئەگەر وەفاتی کرد یان کوژرا و شەهید بوو، ئێوە پاشگەز دەبنەوە و هەڵدەگەڕێنەوە؟! خۆ ئەوەی هەڵبگەڕێتەوە و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە هەرگیز زیان بەخوا ناگەیەنێت، لە داهاتوویەکی نزیکدا خوای گەورە پاداشتی سپاسگوزاران دەداتەوە.' دوای ئەوەی ئەبوو بەکر ئەو ئایەتەی خوێندەوە، بەهۆش خۆم هاتمەوە و دەتگوت هەرگیز ئەو ئایەتەم نەبیستووە، ئیتر بۆم ڕوون بوییەوە: بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ بە ڕاستی وەفاتی کردووە!"

ئا لێرەدا کەسایەتی بەهێزی ئەبوو بەکر دەردەکەوێ. بۆ من دەرکەوت کە نەرمونیانی و توندوتۆڵی دژی یەک نین، میهرەبانی و خۆڕاگری دژی یەک نین، خۆ ئەگەر تەماشای تەبیعەت و سروشتی من و ئەبوو بەکرت کردبایە، دەبووا ئەو باوەڕی بە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ نەکردایە و، من ئەوم هێور بکردایەتەوە، بەڵام بە عەکسەوە، ئەو عومەرەی کە زۆر توندوتیژ بوو، ئەو ڕۆژە ڕووخا، ئەو ئەبوو بەکرەی کە زۆر نەرمونیان بوو، وەک چیا خۆی ڕاگرت. مرۆڤ ئا لەو کاتانەدا دەناسرێ، جاری واهەیە، بە گومان وا دەزانی فلانەکەس زۆر توندوتیژە، بەڵام دوایی دەردەکەوێ کە زۆر نەرم نیانە، بە پێچەوانەیش مرۆڤی بە ڕواڵەت نەرمونیان، سەیر دەکەی توند وتیژە. بەڵێ، ئەبوو بەکر ئاوابوو، کەسایەتیەکی تێر و تەواو، ئەو کاتانەی کە کاتی نەرمونیانی بوو، ئەو نەرمونیان و، ئەو کاتانەیەی کە کاتی توندوتۆڵی و توندوتیژی بووایە؛ توندوتۆڵ و تیژ دەبوو.

- ڕەحمەتی خوا لە ئەبوو بەکر، چ کەسایەتیەکی تەواو کامڵ بوو!

- بەڵێ، بە خوا وا بوو.

- بە خوا قوربان! تۆ زۆر گەورەی، زۆر بە سەیری باسی ئەبوو بەکرت کرد، ئەمە ڕاستگۆیی و نەجابەتی جەنابت دەردەخا.

- کوڕی خۆم! مرۆڤی گەورە هەر گەورەیە، کەس بە خراپ باسکردنی مرۆڤی مەزن، مەزن نابێ. مرۆڤی بەڕێز و مەزن ئەو کەسەیە کە مرۆڤە بەڕێز و مەزنەکان نیشانی خەڵک بدات.

- ئەی قوربان! باسی تر هەیە کە کەسایەتی ئەبوو بەکر دەربخات و خەڵک پێی وابێ کە زۆر نەرمونیانە، کەچی توندوتۆڵ و تیژ بێ. یان پێیان وابێ واز لە شتێک بهێنێ، کەچی ئەو سوورتر بێ؟

- کورە ئەوە بەڕاستتە؟! ئەرەوەڵلا شتی وا ڕووی داوە ئەبوو بەکر دڵی نەرم نەبووە، ئەگەر بە سەر کێدوا بهاتایە، نەرم دەبوو؛ ئەبوو بەکر. ئەبوو بەکر بوو! دەبوو چۆن بێت ڕێک ئاوابوو.

- دەی قوربان بۆم باس بکە، بزانم چییە و چۆنە؟

- دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ، ئەبوو بەکر بوو بە خەلیفە، عەرەب بوو بە سێ بەشەوە، بەشێکیان لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە و نەگۆڕان، بەشێکیان گەڕانەوە سەر ئایینە پووچەکەی باوک و باپیرانیان، بەشەکەیتر بە موسڵمانی مانەوە، بەڵام دەیانگوت زەکات نادەین! ئەبوو بەکر کۆی کردینەوە و پرس و ڕاوێژی پێکردین. زۆربەمان تەنانەت منیش پێمان وابوو واز لەوانە بێنین کە زەکات نادەن بۆ ئەوەی ئەوانیش وەک بەشی دووەم، پشت لە ئایینی ئیسلام نەکەن تا ئەو کاتەی دڵیان بە تەواوی لەسەر ئایینی ئیسلام دادەمەزرێتەوە و دواتر زەکات بدەن. بەڵام ئەبوو بەکر ئەم ڕایەی پەسەند نەکرد، وتی: "شەڕیان لەگەڵ دەکەم." ئەم بڕیارەی ئەبوو بەکر پێچەوانەی سروشت و تەبعی ئەو بوو، ئەو نەرمونیان بوو، بەڵام بۆچونەکەی توند بوو. منیش لەگەڵ ڕایەکی نەرمدا بووم، کەچی سروشت و تەبعم توندوتیژ بوو، مەسەلەکە پێچەوانە بووبوویەوە، ئەبوو بەکری دڵنەرم و میهرەبان، توندوتیژ بووبوو؛ عومەری توندوتیژ، نەرم و نیان بووبوو.

- ئەی تۆ چیت کرد قوربان؟

- من بەردەوام دەچووم بۆلای ئەبوو بەکر و هانم دەدا بۆ ئەوەی لە ڕاکەی پەشیمان ببێتەوە، دەمگوت: "تۆ چۆن شەڕ لەگەڵ کەسانێکدا دەکەی کە شایەتومانیان هێناوە؟ مەگەر تۆ نازانی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: 'فرمانم پێکراوە شەڕ لە تەک کافراندا بکەم تا شادە دێنن و دەڵێن: لاالـه الا اللـه، شادەیان هێنا، ئیتر خوێن وماڵیان لەسەر من حەرام دەبێ و نابێ لەگەڵیاندا بجەنگم، مەگەر بۆ هەقێکی شەرعی و ئیسلامیی نەبێ، ئیتر حیساب و کتابیشیان لای خودایە.' "

- ئەی ئەو چی دەفەرموو؟

- پێی دەوتم: "بەخوا هەرکەس جیاوازی بخاتە نێوان نوێژ و زەکاتەوە لە تەکیدا دەجەنگم، زەکات مافی خەڵکە، بە خوا ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕەشۆی وڵاخێکیان لە زەکاتدا دابێ، دەبێ ئێستەیش بیدەن، ئەگینا بۆی دەجەنگم."

- ئەی دوایی چی ڕووی دا؟

- من بەردەوام لێی دەپاڕامەوە نەجەنگێ، دەمویست خوێنی کەس نەڕژێ، ئەبوو بەکر تووڕە بوو، یەخەی گرتم و وتی: "کوڕەکەی خەتتاب! ئەوە تۆ بۆ لە سەردەمی جاهیلیدا توندوتیژ بوویت و، ئێستە ئاوا نەرمونیان و ترسونۆکی؟"

- ئەی دوایی چی ڕووی دا؟

- خوای گەورە دڵی منیشی وەک دڵی ئەبوو بەکر لێکرد، زانیم ئەو لەسەر هەقە و ڕاستە. ئەو ڕۆژە بۆم دەرکەوت کە ئیمانی ئەبوو بەکر بەرابەر ئیمانی هەموومان و بگرە زیاتریشە.

- کەوابێ ڕاکەی ئەبوو بەکر ڕاست و دروست بوو.

- بەڵێ بێگومان! ئەو سەردەم و کاتە ڕێک ئەو ڕایەی ئەبوو بەکری دەویست، کارمان بە ڕای هەرکەسێکی تر بکردایە، تێک دەشکاین و دەڕووخاین. بە خوا ئەگەر ڕوحمی خوا و پاشان ئەو سووربوونەی ئەبوو بەکر لەسەر ڕاکەی خۆی نەبایە، ئەوا مێژوو دەگۆڕا، پەلەکانی کاتژمێر بەرە و دوا دەهاتنەوە، سەردەمی نەفامی دەگەڕایەوە؛ فیتنە و فەساد دەستی پێ دەکردەوە. ئەو تێگەشتنەی ئەبوو

بەکر، بوو بە چرا بۆ ئیسلام. ئەو غیرەتەی ئەبوو بەکر و ڕاگرتنی ئەو کاتە وەک سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، ئەوە هەڵوێستێکی جوامێرانە بوو؛ ئەو هەڵوێستە هەڵوێستێک بوو کە خوای گەورە بە ئەبوو بەکری بەخشیبوو. دوای سۆزی خوا، جوامێریی ئەبوو بەکر بوو، ئایینی ئیسلامی ڕاوەستاو کرد. هەموومان، تەنانەت مێژوو شایەتیی ئەوەماندا کە هەڵوێستی مەردانەی ئەبوو بەکر بوو کە ئایینی بەرابەر بەو هەمووە هەڵگەڕانەوە و شەڕوشۆڕە ڕاوەستاند، ئەو هەڵوێستە وەک هەڵوێستی پێغەمبەران بوو.

- پرسێک ماوە لێت بپرسم، شتێکی تر خاڵی هاوبەشە لەنێوان تۆ و ئەبوو بەکردا، حەز دەکەم وەڵامەکە لە خۆت ببیسم و پشتگوێی نەخەم، دواتر دەمەوێ باسی خۆت، لە خۆت ببیسم!

- چییە کوڕم، بیڵێ!

- وەڵلا باسی سەقیفە[1] و بەیعەتدان بە ئەبوو بەکرە، ئەو ڕۆژە چی ڕووی دا؟ چۆن ئەبوو بەکر بوو بە خەلیفە؟

- دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، خزمە نزیکەکانی خەریکی شۆردن و کفنکردنی بوون، من و ئەبوو بەکر لە مزگەوت بووین، کەسێک هات و وتی: "ئەنصاریەکان ڕۆشتون بۆ سەکۆی بەنی ساعیدە، دەیانەوێ خەلیفەیەک بۆ موسڵمانان هەڵبژێرن." ئەو کارە نەدەبوو ئێمەی تیا بەشدار نەبین، بۆیە یەکسەر بانگی ئەبوو بەکرم کرد و باسەکەم بۆ گێڕایەوە؛ بڕیارماندا ئێمەیش بچین بزانین چی دەکەن؟"

بە ئەبوو بەکرم وت: "لەگەڵمدا وەرە، با بچین بۆلای برا ئەنصاریەکانمان."

ڕۆشتین، لێیان نزیک بووینەوە، گەشتین بە دوو پیاوی زۆر بەڕێز و چاکی ئەنصاری، وتیان: "براکانمان بۆ کوێ دەچن!"

وتمان: "دەمانەوێ بچین بۆلای برا ئەنصاریەکانمان."

---

[1] سقیفە : سەکۆ، کەپر

وتیان: "نا مەچن، نزیکیان مەبنەوە، بڕۆن بە دەم کاری خۆتانەوە."

منیش وتم: "وەڵڵا دەبێ بچین"

ڕۆشتین، گەشتینە سەکۆی بەنی ساعیدە، پیاوێکیان تیا بوو چاکەتێکی لە بەرا بوو. وتم: "ئەمە کێیە؟"

وتیان: "سەعدی کوڕی عوبادە."

وتم: "ئەوە چییەتی؟"

وتیان: "ئەوە یاوی[1] هەیە، تەواو پەکی خستووە."

دانیشتین، زۆری پێ نەچوو، وتەبێژەکەیان هەستا بۆ قسەکردن، سپاس و ستایشی خوای کرد، دوایی وتی: "ئێمە ئەنسارڕوڵڵاین، سوپای ئیسلامین: ئێوەی کۆچەریش کۆمەڵێکن لێرەن، دەبێ کاروباری ئیسلام بە دەست ئێمەوە بێ، ئێمە خۆمان خەڵکی ئەم شارەین." وەڵامێکم پێ بوو ویستم قسە بکەم، ئەبوو بەکر وتی: "عومەر لەسەرخۆ بە!"

پێم ناخۆش بوو قسەی ئەبوو بەکر بشکێنم؛ بێدەنگ بووم. ئەبوو بەکر هەستاو دەستی کرد بە قسەکردن. سوێند بە خوا هەرچی لە دڵمدا بوو، ئەبوو بەکر بە زیادەوە هەمووی وت، دوایی وتی: "برا ئەنصاریەکان! بە خوا هەر پەسنێکی ئێوەم دابێ، کەمی هەیە و زیادی نییە. بە خوا ئێوە لەوە زۆر زیاترن من باستان بکەم، بەڵام کاروباری خەلیفایەتی دەبێ قورەیشی بەڕێوەی ببا، پێغەمبەر ﷺ خۆی کۆچەری بوو، دەبێ جێگرەکەیشی هەر کۆچەری بێ. من خۆم بە خەلیفایەتی ئەم دوو پیاوە ڕازیم ئێوە یەکێکیان هەڵبژێرن.

دوایی دەستی من و ئەبوو عوبەیدە ی جەڕاحی بەرز کردەوە. ئەو ڕۆژە ئەبوو بەکر هەرچی وت، هەمووی بەلامەوە پەسەند بوو، تەنیا ئەوە نەبێ کە منی دەسنیشان کرد بۆ خەلیفایەتی، ئەوەیان پێم ناخۆش بوو و، وتم: "سوێند بە خوا! پێم خۆشە لە گەردنم بدرێ بەڵام پێش ئەبوو بەکر نەکەوم."

---

[1] یاو: تا

پیاوێکی ئەنصاری هەستا و وتی: "دەی با دوو خەلیفەمان هەبێ، یەک لە ئێمە و یەک لە ئێوە."

منیش وتم: "دەی بەخوا! ئەوە یەکەم هەنگاوی دووبەرەکی و ناکۆکی دەبێ. ناکرێ، دەبێ تەنیا یەک کەس خەلیفە بێت. کاکە سەعد تۆ خۆت گوێت لێ نەبوو کە ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: 'سەرکردایەتی بۆ ئێمەی قورەیشییە و، وەزیرایەتی بۆ ئەنصارەکانە؟' "

بەخوا سەعد زۆر ڕاستگۆ بوو، بەڵام هیچی نەوت، چاوەڕێ بوو بزانێ چی ڕوودەدا.

ئەبوو بەکر بە منی وت: "عومەر دەستت بێنە، با بەیعەتت پێ بدەم."

منیش بە ئەبوو بەکرم وت: "تۆ لە من باشتری و شایانتری."

وتی: "تۆ لە من بەهێزتری."

وتم: "هێزم هەموو بۆ تۆیە، نابێ دوای پێغەمبەرﷺ پلەوپایەی کەس لە پلەوپایەی تۆ بەرزتر بێت. تۆ لە کاتی کۆچدا، لە ئەشکەوتدا، لە خزمەت پێغەمبەردا بووی، ئەو ئایەتەی کە دەفەرمووێ: ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ﴾ مەبەستی خوا تۆ و پێغەمبەرەﷺ، پێغەمبەرﷺ لە کاتی نەخۆشیدا تۆی کردە پێش نوێژ، تۆ لە هەموو کەسێک لە پێشتر و شیاوتری."

دوایی دەستی ئەبوو بەکرم گرت و، بەیعەتم پێ دا. ئیتر هەرچی لەو شوێنەدا بوو، هەموویان بە یەکدەنگ بەیعەتیان پێ دا. بۆ بەیانی، ئەبوو بەکر چووە سەر مینبەر و، منیش لە خوارەوەی وەستام، وتم: "هۆ خەڵکینە! وا دیارە خوای گەورە باشترین کەسمانی دەستنیشان کردووە بۆ ئەوەی ببێ بە خەلیفە، هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەرﷺ، ئەو کەسەی کە لە ئەشکەوتەکەدا لە خزمەتیا بوو، باشترین کەس بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارتان، دەی هەستن بەیعەتی پێ بدەن. ئیتر هەموو هەستان و بەیعەتیان پێدا.

- کەوابوو ڕۆژی سەکۆکە کە بەناوبانگە، ئا بەو جۆرە بووا ئەی باشە قوربان بۆچی ئەنصاریەکان چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد تا لە کفن و دفنی پێغەمبەرﷺ دەبنەوە، پاشان خەلیفە دیاری بکەن؟!

- ئەنصارەکان مەبەستیان ئەوە نەبوو کە لە دونیادا بەش و پلەوپایەیان هەبێ، ئەوان دەیانزانی کە بەڕێوەبردنی ئایین و وڵات، بەبێ سەرکردە و گەورە بەڕێوە ناچێ، ئەگەر خەڵکی سەرکردەیەکی ئازا و لێهاتویان نەبێ، لە کتوپڕێکدا هەرکەس بۆ خۆی و پشێوی ڕوو دەدا — خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖ ﴾ الأنبياء: ٣٧ واتە: "مرۆڤ ئەوەندە بە پەلە و تاڵووکەیە[1]. (هەر دەڵێیت) لە پەلە و تاڵوکە دروستکراوە."

ئەو پرسیارەی تۆیش بەجێیە، دەبوو زۆر پەلە نەکەن تا ئێمەیش هەموومان ئامادە دەبین، بەڵام قەزاوقەدەر وابوو.

- باشە ئەوان بۆ پێیان وابوو لە ئێوە زیاتر لایەقی فەرمانڕەوایین؟

- ئەوان لەو ڕوانگەوە سەیریان دەکرد کە خۆیان خەڵکی شارەکەن و ئێمە وەک میوان واین، هەرچەندە ئایینی ئیسلام هەموومانی کردبووە برا و ئەو من من و تۆ تۆیەی کە لە سەردەمی نەفامیدا هەبوو، نەمابوو، بەڵام خاوەن ماڵ هەر خاوەن ماڵە. ئەوان لەو ڕوانگەوە خۆیان بە شیاوتر نەدەزانی کە بڵێن: "ئێمە لە ئێوە باشترین." هەر تەنیا لەبەر ئەوە بوو کە خۆیان خەڵکی شارەکەن و دەبێ ئەوان بەڕێوەبەریش بن. دوای ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەرمانﷺ بۆ باسکردن کە دەبێ سەرکردایەتی لەنێو قورەیشدا بێ، ئیتر هیچ ناڕەزایەتیەکیان دەرنەبڕی و، بێدەنگ بەیعەتیان بە ئەبوو بەکردا. خوای گەورە لە ئەنصاریەکان ڕازی بێ، ئەوان یەکەم کەس بوون، بوونە پاڵپشتی ئیسلام. یەکەم کەس بوون بەیعەتیان دا، نە لەبەر دونیا پاڵپشی ئیسلام بوون و نە لە ڕوی لاوازیەوە بەیعەتیان دا، بەڵکو تەنیا مەبەستیان ڕەزامەندی خوا بوو.

---

[1] تاڵووکە: هەشتاو، هەڵپە، سەرپێ، لەز

- ئەی ئەبوو بەکر دەستی گرتی و ویستی بەیعەتت پێبدا، بۆ ڕازی نەبووی؟

- چونکە ئەبوو بەکر لە من باشتر بوو، لە هەموومان شیاوتر بوو، ئەو یەکەم پیاو بوو کە موسڵمان بووبوو، هاوڕێ و هاوسەفەری پێغەمبەرﷺ بوو، دووەم کەسی نێو ئەوشکەوتەکە بوو؛ نهێنیپارێزی پێغەمبەرﷺ بوو. ڕاستە پێغەمبەرﷺ خۆی هیچ کەسی بۆ خەلیفایەتی دیاری نەکرد، بەڵام ئەو خۆی لە کاتی نەخۆشیدا ئەبوو بەکری بۆ بەرنوێژی دیاری کرد، ئیتر چۆن من بە خەلیفایەتی ڕازی بام؟ بە خوا هەر شیاوی ئەوبوو.

- ئەی بۆچی ئەبوو بەکر فەرموبووی تۆ لە من بەهێزتری؟

- ئەبوو بەکر تەمەنی شەست و یەک ساڵ بوو، زۆر کەسێکی لەسەرخۆ و نەرمونیان بوو، دەیشیزانی کە کاروباری خەلیفایەتی ناڕەحەتە و ئارێشەی[1] زۆرە. لە هەمان کاتدا خەلیفایەتی تەکلیفە نەک تەشریف. ئەو لەوە دەترسا، بەو تەمەنەوە و بەو نەرمونیانییەی کە هەیبوو، نەتوانێ خەلیفایەتی بەڕێوە ببا. بەڵێ، ئەوە ئەبوو بەکرە، کەسێکی دوورەپەرێز لە هەموو شتێکی دونیایی، تەنانەت لە سەرکردایەتی کە هەموو کەس حەزی لێیەتی. بەخوا! ئەبوو بەکر پیاوی خوا بوو، بۆ خوا ژیا، لە پێناوی خوادا وەفاتی کرد.

- ئەی قوربان! بۆچی ئەنصاریەکان وتیان: "با دوو خەلیفە هەبێ، یەک لە ئێمەو یەک لە ئێوە؟"

- ئەوە بە ڕای من بۆ دوو هۆکار دەگەڕێتەوە، یەکەمیان، پێم وتی، ئەوان خەڵکی مەدینە بوون، پێیان وابوو دەبێ خەلیفە خەڵکی شارەکە بێ. دووەم هۆکار، ئەوەبوو کە هەر لە کۆنەوە هۆزەکانی عەرەب پێیان وابوو دەبێ کاروباریان خۆیان بەڕێوەی ببەن و نابێ غەیری خۆیان —هەرچەند ئازاتر و لێهاتوتر بێ— ببێ بە سەرکردەیان. ئێ خەڵکیش بە گوێرەی عادەت و دابونەریتی خۆی ڕەفتار دەکا.

---

[1] ئارێشە: گرفت، کێشە

ئێمە وتمان: "ئیسلام دابونەریتی سەردەمی نەفامی دەشواتەوە و باوەڕی پێی نییە،" بۆیەیش ئەوان بە سینگێکی فراوانەوە بەیعەتیان بە ئەبوو بەکر دا و، وەک چۆن پشت و پەنای پێغەمبەر ﷺ بوون، ئاوا بوونە پشت و پەنا بۆ ئەبوو بەکریش؛ لەگەڵ ئەبوو بەکردا جیهادیان کرد، فرمانەکانی ئەبوو بەکریان جێبەجێ دەکرد، کەسیان لاریی لە سەرکردایەتیی ئەبوو بەکر نەبوو. ئەوان کەسانێک بوون کە فرمانەکانی خوا و پێغەمبەرت بە بیریان بهێنایەتەوە، یەکسەر پێی ڕازی دەبوون.

- ئەی دوایی چۆن خەلافەت بەر تۆ کەوت؟

- ئەبوو بەکر وەسیەتی کرد من بکرێم بە خەلیفە.

- ئەی قوربان خەلیفایەتی بە وەسیەتکردن دەبێ؟

- خەلیفایەتی بریتیە لە بەڵێندانێک لەنێوان سەرکردە و خەڵکیدا. خەلیفە بەڵێن دەدا کە کاروباری خەڵک بەڕێوە ببا، فرمانەکانی خوا جێبەجێ بکا، ڕەچاوی بەرژەوەندیی گشتی بکا، سەروەت و سامانی گشتی بە هەدەر نەدا و بە دادپەروەری دابەشی بکا، هەوڵ بدا ئاسایش و ئەمنی قەومی دابین بکا، دادگەر بێت، سوپای تێر و تەواوی هەبێ — بۆ بەرگری. خەڵکەکەیش گوێڕایەڵ بن، لە کاتی خۆشی و ناخۆشی لەگەڵ خەلیفەدا بن، لە فرمانە چاکەکاندا بە گوێی بکەن و درێخی نەکەن. نابێ لە کار و فرمانێکدا کە پێچەوانەی فرمانی خوایە، لە گوێی بکەن. کەوابوو خەلیفایەتیی من بە وەسێتی ئەبوو بەکر نەبوو، بەڵکو بە ڕەزامەندیی خەڵک بوو. ئەوان بەو وەسیەتەی ئەبوو بەکر ڕازی بوون و، بە دڵ و گیان و ڕەزامەندیی خۆیان، بەڵێن و بەیعەتیان بە من دا.

- ئەی قوربان ئەبوو بەکر خۆی بڕیاری دابوو کە تۆ خەلیفە بیت؟

- سەرەتا ئەبوو بەکر بڕیاری نەدابوو، ئەو باش بیری لەو کارە کردبوویەوە، پرس و ڕاوێژی کردبوو، دوایی بە گومانباشیی خۆی، منی بە شیاو زانی.

- پێش ئەوەی تۆ ئاگادار بکا، چی کرد؟

- ئەبوو بەکر پێش وەفاتی، پانزە ڕۆژ نەخۆش بوو، هەستی کردبوو کاتی مردن نزیک بووەتەوە، بۆیە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفی بانگ کردبوو، بە عەبدوڕڕەحمانی وتبوو: "باسی عومەری کوڕی خەتتابم بۆ بکە؟!"

ئەویش وتبووی: "دەی قوربان خۆت لە من باشتری دەناسی!"

ئەبوو بەکر وتبووی: "بەڵێ! بەڵام پێم خۆشە لە دەمی کەسێکی تر باسی عومەر ببیسم."

عەبدوڕڕەحمان وتبووی: "بە خوا قوربان! زۆر لەوە باشترە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە."

دوایی بانگی عوسمانی کوڕی عەففانی کردبوو و پێی وتبو: "باسی عومەرم بۆ بکە."

عوسمان وتبووی: "قوربان! تۆ باسی عومەر بۆ ئێمە بکە!"

ئەبوو بەکر وتبووی: "پێم خۆشە لە دەمی تۆوە بیبیسم."

عوسمان وتبووی: "بەخوا زۆر لەوە باشترە کە دەردەکەوێ."

ئەبوو بەکر وتبووی: "خوات لێ ڕازی بێ، بە خوا ئەگەر وازت لێ بهێنایە، وازم لێ نەدەهێنای."

- قوربان ئەو قسە یانی چی ؟

- مەبەستی ئەوەبوو کە عوسمانیش شیاوی خەلیفایەتیە، ئەگەر عوسمان منی بە دڵ نەبایە، ئەوە ئەبوو بەکر ئەوی دەست نیشان دەکرد بۆ خەلیفایەتی.

- ئەی قوربان ئەبوو بەکر لەناو ئەو هەمووە خەڵکەدا، تەنیا پرس و ڕاوێژی بەو دوانە کرد؟

- نەخێر، ئەو ڕاوێژی بە کۆمەڵێ کەسی موهاجیری و ئەنصاری کرد، لەوانە: سەعیدی کوڕی زەید، ئوسەیدی کوڕی خوزەیر، پێی وتبوون: "ڕاتان چییە لە بارەی عومەرەوە؟"

ئوسەید وتبووی: "دوای تۆ لە هەمووومان باشترە، بە چاکە ڕازیە و بە خراپە ناڕازی، نهێنییەکانی لە ئاشکراکانی باشترە، کەس وەک ئەو شیاوی خەلیفایەتی نییە؛ کەسێکی بەهێزە."

- ئەی ئەوانی تر چییان وتبوو؟

- هەر ئەوەی کە ئوسەید وتبووی.

- ئەی هەموویان بەو وەسیەتەی ئەبوو بەکر ڕازی بوون؟ ڕای هەموویان وەک ڕای عوسمان و عەبدوڕڕەحمان و ئوسەید بوو؟

- نەخێر، ڕای هەموو کەس وەک یەک نییە، هەرکەسە و تێبینی و بیروبۆچوونی تایبەت بە خۆی هەیە. هەندێکیان منیان هەم لە سەردەمی پێغەمبەر و هەم لە سەردەمی ئەبوو بەکردا دەناسی، دەیانگوت: "زۆر توندوتیژە." مەبەستیان ئەوە بوو کە ئەم عومەرە هیچبەدەستە، ئاوا توندوتیژە؛ باوکە ڕۆ! ئەی ئەگەر کاربەدەست بێ؟!

- ئەی ئەوانە چییان کرد؟

- دوو ڕۆژ پێش وەفاتی ئەبوو بەکر چووبوون بۆ لای، پێیان وتبوو: "تۆ دەزانی عومەر چەند توندوتیژە! ئەگەر خوا لێپرسینەوەی لێکردی بەرابەر ئەو وەسێتە، چی وەڵامی خوا دەدەیتەوە؟"

ئەبوو بەکر وتبووی: "دامنیشێنن!..."

ئەو لەسەر جێ کەوتبوو، دایاننیشاند وتی: "ئەوە ئەمترسێنن خوا لێپرسینەوەم لەسەر عومەر لەگەڵدا بکا! بەخوا! هەرکەس زوڵم بکا تا بنەگوێی زەرەر دەکا و لە ژێری دەرناچێ، دەڵێم: 'خوایە! باشترین کەسم بۆ خەلیفایەتی دیاری کرد!' خوایە خۆت ئەم قسەیەم ڕاگەیەنە!"

ـ ئەی قوربان دوای ئەوەی ئەم دەنگوباسەت بیست، هەستت بەرابەر ئەو کەسانە چۆن بوو؟

- کوڕم! خۆ من هەوڵم بۆ خەلافەت نەدابوو تا لێیان زویر بم. بە خوا ئەوان هەوڵیان دابوو ئەو ئەرکەم لە کۆڵ بکەنەوە کە خۆم لێی هەڵدەهاتم، ئەگەر من خەلیفایەتیم ویستبا، ئەو ڕۆژەی کە ئەبوو بەکر لەسەر سەکۆکە پێی وتم: "دەستت بێنە بەیعەتت پێ بدەم،" هەر ئەو ڕۆژە دەبووم بە خەلیفە. دواتر کەی ڕەوایە من ڕک و کینەم لە کەسێک بێت، هەر لەبەر ئەوەی ڕای خۆی لە مەڕ منەوە دەرخستووە! من خۆم دوای ئەوەی کرام بە خەلیفە، پێم وتن: "ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت عەیب و عارەکانم بە دیاری بۆ دەهێنێتەوە." ئەمە قسەی من بوو لە کاتی خەلیفایەتی، دەی ئەگەر کەسێکی ئاسایی بام، قسەی لەوە زیاترم دەبوو؟

- قوربان تۆ کاتی خۆی بۆیە بە خەلیفایەتی ڕازی نەبووی؛ چونکە ئەبوو بەکرت لە خۆت بە شیاوتر دەزانی.

- دەی باشە خۆ ئەمە مانای وا نییە ئەگەر ئەبوو بەکر مرد، ئیتر من حەزم لە خەلیفایەتی دەبێ. کوڕم! مرۆڤی واریع و خۆپارێز ئەوەیە خۆی لە کاروبارێک دوور بخاتەوە کە ترسی ئەوەی لێی هەبێ نەتوانێ بە باشی بەڕێوەی ببا. بەخوا! منیش دەترسام خەلیفایەتی باش بەڕێوە نەبەم، بۆیە پێم خۆش نەبوو بکرێم بە خەلیفە.

- ئەی دواتر چی ڕووی دا؟

- ئەبوو بەکر دیسان بانگی عوسمانی کردبوو، فەرمووبووی: "چیت پێ دەڵێم بینووسە."

عوسمان وتی: "چی بنووسم؟"

ئەبوو بەکر وتی: "بنووسە بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان، ئەمە کۆتا وەسێتی ئەبوو بەکری کوڕی ئەبوو قوحافەیە، لە کاتێکدا خەریکە دوا مەنزڵی دونیا بەجێ دەهێڵێ و خەریکە بەرە و یەکەم مەنزڵی قیامەت وەڕێ بکەوێ؛ ئەوقیامەتەی کە تێیدا کافر بڕوا دەهێنێ و تاوانبار دڵی پڕ دەبێ لە یەقین و درۆزن واز لە درۆ دەهێنێ. ئەوا من عومەری کوڕی خەتتابم وەک خەلیفە دەست نیشان کرد. گوێڕایەڵی بن و فرمانەکانی جێبەجێ بکەن. منیش بۆ ڕەزامەندیی خوا و

پێغەمبەری خوا و ئایینی ئیسلام و بۆ خۆم و بۆ ئێوەیش لە چاکەکردن دریغیم نەکردووە. ئەگەر عومەر دادپەروەر بوو، ئەوا گومانەکەی من پێکاویەتی و بەڕاست دەرچووە، ئەگەریش وا نەبوو، ئەوە هەرکەس خراپەکەی لە ئەستۆی خۆیدایە، منیش جگە لە خێر و چاکە هیچی ترم مەبەست نەبووە، خۆ من ئاگاداری بەرپیواران[١] نیم. ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ ناهەقانیش زۆر پێناچێ لەوە دەگەن کە سەرەنجام بۆ کوێ دەچن. سڵاو و میهرەبانی خوای گەورە بڕژێ بە سەر هەموو لایەکتاندا."

پاشان نووسینەکەی مۆر کرد.

- ئەی دوای ئەمە چی ڕووی دا؟

- ئەبوو بەکر بە عوسمانی وت: "ئەم نووسراوە ببە و، بڕۆ بزانە خەڵک پێی ڕازین؟"

عوسمان ڕۆشت و بە خەڵکی وت: "خەڵکینە! ئێوە بەیعەت و بەڵێن دەدەن بەو کەسەی کە لەم نووسینەدا ناوی هاتووە؟"

هەرهەموویان وتیان: "بەڵێ! ئێمە ڕازین..."

دواتر عوسمان نووسراوەکەی کردەوە و بۆ خەڵکی خوێندەوە. خەڵک هەموو بە یەکدەنگ بەیعەتیان پێدام و، ئاوا کرام بە خەلیفە.

- کەوابوو پێش ئەو نووسراوە و دوای نووسراوەکەیش، ئەبوو بەکر باسی خەلیفایەتی لای تۆ نەکردبوو؟

- نەخێر پێش نووسراوەکە باسی هیچی لای من نەکردبوو، بەڵام دوای ئەوەی خەڵک بەو نووسراوە ڕازی بوون، چوومە خزمەتی ئەبوو بەکر و وتم: "ئەبوو بەکر! من پێویستم بە خەلیفایەتی نییە و حەزم لێی نییە..."

ئەبوو بەکر وتی: "عومەر گیان! خەلیفایەتی پێویستیی بە تۆیە!"

---

[١] بەرپێوار: غەیب

- مەبەستی چی بوو؟

- مەبەستی ئەوە بوو بە من بڵێ: من لەبەر ئەوە تۆم دەسنیشان نەکردووە پێویستت پێی بێت، بەڵکو من وا دەزانم کە تۆ شیاوترین کەس بیت بۆ ئەو کارە. ئەبوو بەکر هەمیشە وابوو، بەخشندەییی ئەو، تەنیا بۆ ڕەزامەندیی خوا بوو. گیردانیشی[1] هەر لەبەر ڕەزامەندی خوا بوو، هەر لەبەر ئەوە بوو وەرگرتنی خەلیفایەتیم بەلاوە ئاسان بوو. بڕیارم دا بچم بە ڕێی پێغەمبەر و ئەبوو بەکردا، هەرچەند هەرگیز ناگەم بەوان. پێغەمبەری ئیسلام هیچ پێغەمبەرێکی تر پێی ناگا. چ جای عومەر؛ ئەبوو بەکریش ئەوەندەی پێم بکرێ وەک ئەو دەبم، جا ئەگەر بە تەواوی وەک ئەو نەبم ئەوا بە گوێرەی توانا، عەرەب دەڵێ: "هەرچی هەمووی دەس ناکەوێ، واز لە هەمووی ناهێندرێ."

- ئەی قوربان لە کۆتا دیدارتدا لەگەڵیدا، هیچ وەسیەتێکی بۆ کردی؟

- بەڵێ.

- چی بوو؟

- وتی: "عومەر لێم نزیک بەرەوە." منیش لێی نزیک بوومەوە و، وتی: "من دەتکەم بە خەلیفە. ئەی عومەر! ئامۆژگاریت دەکەم هەمیشە ترسی خوات لە دڵدا بێ. عومەر! ئەوەیش بزانە خوای گەورە هەندێ داوای لە شەودا هەیە، لە ڕۆژدا وەریان ناگرێ و؛ هەندێ داوای لە ڕۆژدا هەیە، لە شەودا وەریان ناگرێ. جا بزانە، هیچ کارێکی سوننەتت لێ وەرناگیرێ تا فەرزەکانت بە تەواوی بەجێ نەهێنابێ. ئەو کەسانەی کە لە قیامەتدا تای ترازووی چاکەیان قورس دەبێ، ئەوە بە شوێنکەوتنی ڕاستی قورس بووە. ئەو تای ترازووەی کە تەنها ڕاستی پێ دەکێشرێ، مافی خۆیەتی کە قورس بێ. ئەو کەسانەیشی کە لە قیامەتدا تای ترازوویان سووکە، ئەوە بە هۆی شوێنکەوتنی لارەڕێ و ناڕەواوە سووک بووە. ئەو تای ترازووەیش کە

---

[1] گیردان: مەنع، ڕێگریکردن

تەنها ناڕەوایەتی پێ دەکێشرێ، مافی خۆیەتی کە سووک بێ. خوای گەورە بۆیە باسی بەهەشتیەکان بە چاکە دەکا؛ چونکە چاک بوون(تای ترازوی چاکەیان قورستر بووە،) ئیتر ئەویش چاوپۆشی لە خراپەکانیان دەکا. هەرکات باسی ئەو بەهەشتیانەت کرد بڵێ: 'زۆر دەترسم من یەکێک نەبم لەو کەسانە!' خوای گەورە لە هەندێ ئایەتدا باسی سۆز و بەزەیی خۆی دەکا و، لە هەندێ ئایەتی تردا باسی سزا و خەشمی خۆی دەکا؛ ئەوەیش لەبەر ئەوەی بەندەکانی هەم لێی بترسین و هەم هیوایشیان پێی هەبێ. لە هەق زیاتر، هیچی تر لە خوا چاوەڕوان ناکرێ، کەس بە دەستی خوای گەورە ناخرێتە نێو فەتەرات و بەڵاوە. ئەگەر ئەم ئامۆژگاریانەی منت وەرگرت، ئەوا هیچ بەرپێوار و نادیارێکت هێندەی مردن خۆش ناوێ و، هەرگیز ناتوانی مردن بێهێز و دەسەڵات بکەی."

- بە خوا قوربان ئەم ئامۆژگاریانە، ئامۆژگاریی کەسێکی ڕەفتەنییە[1]. مرۆڤ ئەو کاتەی کە پشت لە دونیا دەکات و خەریکە بەرەو قیامەت بارگە و بنە بپێچێتەوە، لە هەموو کاتێ زیاتر ڕاستگۆیە. ئەبوو بەکر بە درێژایی ژیانی هەر ڕاستگۆ بووە، چ جای ئەو کاتانە. بەڵام قوربان پێت ئاساییە چەند پرسیارێکت لە مەڕ ئەو وەسیەتە لێ بکەم؟

- بۆ نا؟ دەی کوڕم چیت لە دڵدایە بپرسە.

- بۆچی ئەبوو بەکر وەسیەتەکەی بە "ئەی عومەر! ئامۆژگاریت دەکەم هەمیشە ترسی خوات لە دڵدا بێ" دەست پێکرد؟

- چونکە دەیزانی وەرگرتنی دەسەڵات تاقیکردنەوەیەکی زۆر سەختە، زۆربەی خەڵک لەو تاقیکردنەوەیەدا دەرناچن، کابرای دەسەڵاتدار هێز و پارەی لە بەردەستدایە، خەڵک بەرابەر دەسەڵاتدار لاواز و بێهێزن، زۆر کەمن ئەو کەسانەی کە پارە و هێزیان هەبێ و نەبنە تاغوت، ئەبوو بەکر ویستی بەبیرم بێنێتەوە کە خوای گەورە ئاگاداری هەموو کارەکانم دەبێ، لێم دەڕوانێ بزانێ لە کاتێکدا لە

---

[1] ڕەفتەنی: ئەو کەسەی کە بۆ دواجار دەڕوا.

لوتکەی دەسەلاتدام چی دەکەم، ئەو پارە و سامانەی لە بەردەستمە چۆنی بەکاردێنم و خەرجـی دەکەم، چـۆن لە تەک ئەو خەڵـکەی لەژێـر دەسـتمدایە دەجـولێمەوە. دەسەلاتدار شیاوترین کەسە کە بیترسێنی و خوای وەبیر بهێنیتەوە، چونکە جگە لە خوا کەس لە دەسەلاتدار مەزنتر نییە. خەڵک بۆیە لە دەسەلاتدار دەترسێ، چـونکە هێزی هەیە. بۆیە خۆی لە دەسەلاتدار نزیک دەکاتەوە، چونکە سەروەت و سـامانی هەیە، بەلام خودی دەسەلاتدار هیچ کەسێکی لەو مەزنتر نییە تا لێی بترسێ، هـیچ سەروەت و سامانێک بە ئەندازەی ئەو سەروەت و سـامانە نـابێ کە لەژێـر دەسـتی ئەودایە تا خۆی لێ نزیک بکاتەوە. ئەبوو بەکـر ویسـتی هەمیشـە خـودام لە بیـردا بێت و لێی بترسم و، لە هەموو کار و وتارێکمدا وا بزانم خوا دەبینم .

ــ ئەی مەبەسـتی لە "خـوای گەورە هەنـدێ داوای لە شـەودا هەیە، لە ڕۆژدا وەری ناگرێ؛ هەندێ داوای لە ڕۆژدا هەیە، لە شەودا وەری ناگرێ" چی بوو؟

ـ ویستی پێم بلـێ: نەکەی بە گـوێرەی ڕەفتـار و کـرداری خەڵـک هەڵسوکەوت بکەیت و دینی خۆتت لە بیر بچێ، تۆیش بەندەیەکی لە بەنـدەکانی خـوا، خـوای گەورە هەنـدێ کـار و پەرستشـی لەسـەرت فەرز کـردووە، نەکەی لەبەر کاروبـاری خەلافەت، ئەو فەرزانە لە بیر بکەی. ویستی پێم بلێ: ئاگاداری نـوێژ و ڕۆژوەکـانم بم، خەڵک لەسەر ئایینی دەسەلاتدارە، ئەگەر دەسەلاتدار چاک و پاک و لە خواترس بوو، خەڵکیش وا دەبن. ئەگەر تێکۆشـەر و خەباتکـار بـێ، خەڵکیش تێکۆشـەر و خەباتکار دەبن. ئەگەر هەمیشە بیری قیامەتی لە دڵدا بێ، ئەوانیش بیری قیامەتیان لە دڵدا دەبـێ. ئەگەریـش گەنـدەڵ و فەسـادکار بـێ، زۆربەی ئەوانـیش گەنـدەڵ و فەسادکار دەبن. سەرکردە ناوی خۆی بە خۆیەوەیە وەک سەری گەل وایە، گەلـیش وەک جەستە وان، سەرکردە بەرەو هەرکـوێ و هەرچـۆن بـڕوات، جەسـتەیش بەرەو ئەو شوێنە و بەو جۆرە دەڕۆن.

- ئەی مەبەستی لە "هیچ کارێکی سوننەتت لێ وەرناگیرێ، تا فەرزەکانت بە تەواوی بەجێنەهێنابێ" چی بوو؟

- ویستی پێم بڵێ کە لای خوا هیچ کار و کردەوەیەک بە ئەندازەی ئەو کار و کردەوانە خۆشەویس نین کە خۆی لەسەر بەندەکانی فەرز کردووە، هەر بەندەیەک سوننەتەکان بکات و فەرزەکان پشت گوێ بخا، ئەوە تەنیا خۆماندووکردنی بۆ دەمێنێتەوە، خۆ ئەگەر فەرزیش و سوننەتیشی ئەنجامدا، ئەوە نووری عەلا نوورە و هەرچی خێر هەیە، هەمووی دەسگیر بووە. ئەگەر کەسێک بە قەستی، ڕۆژێک ڕۆژووی ڕەمەزانی خوارد و نەیگرت، یانزە مانگ بەڕۆژوو بێ، جێگەی ئەو یەک ڕۆژە ڕۆژووەی ڕەمەزان پڕ ناکاتەوە. ئەگەر نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکا، خێری لە شەونوێژی سەرتاسەری شەو زیاترە. ئەگەر هەزار سەدەقە بدات، بە ئەندازەی زەکاتێک خێری نییە، هەرچەندە سەدەقەکانیش زۆر لەو زەکاتە زیاتر بێ، چونکە سەدەقە سوننەتە، بەڵام زەکات فەرزە. ویستی پێم بڵێ کە خوای گەورە هەندێ شتی لەسەر سەرکردە فەرز کردووە، ئەگەر ئەو شتانە نەکا و هەرشتێکی تر بکا، بێسوودە، ئەگەر سەد جار لە فەرزەکە زیاتریش بێ. خوای گەورە فرمانی کردووە کە داهات بە یەکسانی لەنێوان خەڵکدا بەش بکرێت، ئەگەر سەرکردە ئەو داهاتەی بۆ خۆی برد و، دوایی زۆر لەوە زیاتری کردە خێر، بێسوودە و تاوان و گوناه نەبێ هیچیتری گیر نابێ، چونکە مافی بە خاوەن ماف نەداوە؛ ئەوە وەک ئەوە وایە مافی خەڵکی بخوات و دوایی بەخشندەیی بکا!

- ئەی مەبەستی لە "خوای گەورە لە هەندێ ئایەتدا باسی سۆز و بەزەیی خۆی دەکا و، لە هەندێ ئایەتی تردا باسی سزا و خەشمی خۆی دەکا؛ ئەوەیش لەبەر ئەوەی بەندەکانی هەم لێی بترسن و هەم هیواشیان پێی هەبێ، لە هەق زیاتر هیچی تر لە خوا چاوەڕوان ناکرێ، کەس بە دەستی خوای گەورە ناخرێتە نێو فەتەرات و بەڵاوە" چی بوو؟

- مەبەستی ئەوە بوو کە قورئان ئەوەندەی یەکدی ترس و هیوا، ئەڤین و خۆفی باس کردووە، چونکە ئەگەر هەر باسی ترسی کردبا، دڵی باوەڕداران لە ترسا دەتۆقی و زەندەقیان دەچوو؛ خواپەرستی وەک بێگاریی ئاغایەکی زاڵمی لێ دەهات. ئەگەریش تەنیا باسی هیوا و ئەڤینی کردبا، خواپەرستی وەک کاری ئەو کۆیلەیەی لێ دەهات کە خاوەنەکەی ئەونە بەسۆزە، کۆیلەکەی ئیستیغلالی ئەو سۆزەی کردووە و گوێ بە فرمانەکانی نادا. خوا دەیەوێ بەندەکانی لێی بترسن و خۆشیشیان بوێ، لێی بترسن و چاوەڕوانی پاداشتیشی لێ بکەن. خوا دەسەڵاتی هەموو جۆرە سزادانێکی هەیە، کەچی باسی لێبووردەیی و سۆزی خۆیشی دەکا، لەگەڵ ئەوەی کە زۆردارە، خاوەن سۆزیشە، ئەو دەیەوێ بەدەم ترس و خۆشەویسیەوە بەندایەتی بۆ بکەین، خوا پێی خۆشە لێی بترسین، پێی خۆشە خۆشمان بوێ.

- قوربان ئەمە کۆتا دیدار و گفتوگۆ بوو لە تەک ئەبوو بەکردا، ئەی سەرەتای خەلیفایەتیت چۆن بوو؟

- یەکەم ڕۆژی خەلیفایەتیم چومە سەر مینبەر، سپاس و شوکری خوام کرد، دوایی وتم: "بیستوومە خەڵکانیک لە توندوتیژیی من دەترسن، وتویانە: 'عومەر، پێغەمبەر مابوو توندوتیژ بوو، لە سەردەمی خەلیفایەتی ئەبوو بەکر توندوتیژ بوو، باوکە ڕۆ ئەی ئەگەر خۆی سەرکردەبێ چی؟!'

"خەڵکینە! ئاگادار بن، ئەو توندوتیژیەم زۆر زیاتر دەکەم، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی لەڕێلادەرن و تەعەدا لە موسڵمانان دەکەن. هەرچی موسڵمان و پیاوی چاک و بێوەی هەیە، ئەوە من لە هەموو کەس زیاتر لەگەڵیاندا نەرمونیان دەبم، من ناهێڵم هیچ کەس زوڵم لە هیچ کەس بکا، سەری زاڵم لە بەرد دەدەم، بە پێ دەچمە سەر سەری، تا تەوبە دەکات و دان بە هەقا دەنێت، لەگەڵ ئەوەیشدا سەرم دەخەمە بەر پێی ئەو کەسانەی چاک و چاکەکارن.

"خەڵکینە! ئێوە چەند مافێکتان بە سەر منەوە هەیە با پێتان بڵێم:

من بۆم نییە باج و خەراج و داهاتی ئێوە بە هەدەر بدەم، دەبێ بەو جۆرەی سەرف بکەم کە خوا پێی خۆشە. ئەو مافەتان هەیە کە هەر دەستکەوت و داهاتێکم هاتە دەست، بە باشی و یەکسانی پێتان ببەخشم. ئەو مافەتان لەسەر من هەیە بە هومێدی خوا ژیان و گوزەرانتان باشتر بکەم. ئەو مافەتان لەسەر من هەیە کە نەتانقەوتێنم و نەتانخەمە تەنگانە و ناڕەحەتیەوە. ئەو مافەتان لەسەر من هەیە کە بە هومێدی خوا بەرگریتان لێ بکەم و نەهێڵم دوژمن بە سەرتاندا زاڵ بێ. ئەو مافەتان لەسەر من هەیە کە لە کاتێکدا لە جەنگدان و لە ماڵ و منداڵتان دوورن، نەهێڵم ماڵ و منداڵ و خێزانەکانتان بێناز بن، تا خۆتان دەگەڕێنەوە.

دەی ترسی خواتان لە دڵدا هەبێ و هاوکار و یارمەتیدەرم بن. هاوکار و یارمەتیدەرم بن؛ چاکەم نیشان بدەن و فرمانم بە چاکەکاری پێ بکەن، دەستم بگرن مەهێڵن هەرگیز خراپە بکەم، ئامۆژگاریم بکەن.

ــ قوربان بڕوام پێ دەکەی، ئەگەر بڵێم ئەم وتارەی جەنابت لە ناخەوە هەژاندمی؟!

- بەڵێ بڕوات پێ دەکەم بەڵام بۆچی هەژای؟ چاوەڕێی هیچ شتێکی تر بووی؟

- هەنێ لەو قسانە ئاسایی بوون، چونکە تۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە هەقی لەسەر دڵ و زمانت داناوە. تۆ بڕوا هێنانت بە پێغەمبەر خراوەتە نێو دڵەوە، لەمەودوا باسی وتارەکەت دەکەین، بەڵام قوربان ڕێگەم بدە با سەرسامی خۆم دەربڕم.

- سەرسامی؟!

- بەڵێ قوربان سەرسامی!

- بەسەرسامی لە چی؟

ـــ لە ســەرەتای وتــارەکەت، دوای ئەوەی سپاســی خــوات کــرد و پەســنی پێغەمبەرت دا، بە شێوەیەکی گشتی ڕووت لەو خەڵکە کرد و قسەت بۆ کردن، دوایی ئاڕاستەی قسەکانت گۆڕی و تایبەتت کرد بەو کەسانەی لە توندوتیژیەکەت دەترسان.. تۆ لەسەر توندوتیژیی خۆت سوور بووی، من وا گومانم برد بڵێی ئیتر توندوتیژ نابم، کەچی سوور بووی!

- تۆ چاوەڕوانی ئەوە بووی کە بەو خەڵکە بڵێم: خەڵکینە! بیستوومە هەندێکتان لە توندوتیژیی من ترساون و وتوتانە: "لە سەردەمی پێغەمبەردا عومەر توندوتیژ بوو، ئەبوو بەکر مابوو وا بوو، باوکە ڕۆ دەبێ ئێستە چۆن بێ ئەوان نەماون و خۆی سەرکردە و هەمەکارەیە؟!" خەڵکینە ئاگادار بن! ئەوا من وازم لە توندوتۆڵی و توندوتیژی هێنا؟

- ئەی بۆ قوربان؟ بۆ وات نەوت؟

ـــ ڕۆڵە! ئەو دەسەڵاتدارەی کە لاواز و بێ سام و هەیبەتە، ناتوانێ باش کارەکانی بەڕێوە ببا. هێزدارەکان بێهێزەکان دەکرێننەوە، بێکەس و دەرەتانەکان دەترسێنرێن. من دەبوو هەر لە یەکەم ڕۆژی دەسەڵاتمدا هۆشداری بدەمە بەهێزەکان، بۆ ئەوەی بیری خراپ نەکەنەوە، لاوازەکان دڵنیا بکەمەوە کە کەس ناتوانێ زوڵم و زۆریان لێ بکا، خەڵک هەموو یەکسانن کەس لە کەس پیاوتر نییە، بەهێز لای من کەسێکە کە لەسەر هەق بێت، ئیتر کەیفی خۆیەتی بە جەستە و سامان لاوازە یا نە. لاواز لای من، ئەو کەسەیە کە ناهەق بێ، با سەد جار زەنگین و دەست ڕۆشتوو بێ، لای من کەس بە دەوڵەمەنیدا نەنازێ، کەس بە نەسەب و باوک و باپیریا نەنازێ، خوای گەورە بەڵێن و هەڕەشەی هەیە، بەڵێن بە چاکەکاران دەدا و، هەڕەشە لە خراپەکاران دەکا. دەی ئیتر بۆ لۆمەی عومەر بکرێ، ئەگەر بیەوێ تەرازوی دادگەریی هەبێ و خەڵک بە تای ترازوی دادگەریدا بکێشێ و لاواز و بەهێز لای ئەو نەخوا، تەنیا ڕاساڵی دەوری هەبێ؟ نابێ لە سەردەمی دەسەڵاتی منا مافی کەس بخورێت، نابێ هەژاران بچەوسێنرێنەوە.

- قوربان قسەکانت تەواون، من مەبەستم ئەوە نەبوو. مەبەستم ئەوە بوو پاکانەی خۆت بکەی لەو تۆمەتەی بۆت کراوە، نەک بە سەر خۆتیدا ساغ کەیتەوە!

- باشە، دەبێ مرۆڤ واز لە چاکەیەک بێنێ، هەر لەبەر ئەوەی کەسانێک ڕقیان لە چاکەیە؟! نە بە خوا نابێ. عومەر دەبێ تەنیا ڕەزامەندیی خوای لە بەر چاو بێ، ئیتر خەڵک ڕازین یا نە، کەیفی خۆیانە. من خۆم بە تەنیا دەمرم و دەچمە قەبرەوە، بە تەنیا زیندوو دەبمەوە، بە تەنیا پرسیارم لێ دەکرێت، بە تەنیا دادگایی دەکرێم، تەنیا هەق و ڕاستی فریام دەکەون. ناهەقی و ناڕاستی ماڵم وێران دەکەن. ئەگەر خەڵک لە بەر شتێکی هەق لێم بترسن و ڕقیان لێم بێت، ئەوەم لا پەسەندترە لەوەی کە لەبەر گەندەڵی و ناهەقی منیان خۆش بوێت.

— بە خوا قوربان ڕاستە خوای گەورە هەق و ڕاستیی خستۆتە سەر دڵ و زمانت، من نەمویست تووڕەت بکەم یان خۆم لە بیروڕای جەنابتدا هەڵقورتێنم. من تەنیا داوای ڕوونکردنەوە و زیاتر زانیاریم کرد. من بەلای خۆمەوە چاوەڕێی شتی تر بووم.

- تۆ دەتەوێ بڵێی: "دڵنیاییت پێ بدانایە"؟

- بەڵێ قوربان.

- ئێ وام کرد.

- چۆن؟

- ئەی من نەمگوت: "توندوتیژیم بۆ سەر خەڵکی زاڵم و بەدکار زیاتر دەکەم؟" ئەی من نەمگوت: "ئەو کەسانەی ڕاساڵ و چاکەکارن، ئەوپەڕی نەرمونیان دەبم لەگەڵیاندا؟"

- با قوربان وتت.

- دەی ئیتر ئەمە دڵنیایی و ئارخەیانی نەبێ چییە؟ کوڕم! من هەڕەشە و گوڕەشەکانم بۆ ئەو کەسانە بوو کە زاڵم و ستەمکار و بەدڕەفتاربوون. جا هەرکەس ستەمکار نەبووبێ، ئەوە ئەو هەڕەشانە دڵنیاییکەر بووە بۆی، هەرکەسیش ستەمکار

بووبێ، ئەوە هەڕەشە و گوڕەشەیەکی توند بووە بۆی. نابێ ستەمکار خاترجەم و دڵنیا بکەی تا دڵنیایی نەدەی بە ستەملێکراو. ئەگەر دڵنیایی و خاترجەمی بە زاڵم و ستەمکار بدرێت، دەس دەکەن بە ترساندن و تۆقاندنی خەڵکی داماو و بێ دەسەڵات. من وتارم بۆ کەسانێک دا، دەمزانی ستەمکاریان تیا نییە، ئەوانە خەڵکێکی ئاسایی و سەلامەت بوون، ئەگەر لەم ڕووەوە سەرنجت دابێ، من خاڵم لەسەر قسەکان داناوە و هەڕەشە و گوڕەشەم نەکردووە.

- بە خوا وایە قوربان! تا ئێستا گوێم لە قسەی ئاوا پوخت و پاراو نەبووە.

- کام قسە؟

- ئەوە کە فەرموت: "ناهێڵم کەس ستەم لە کەس بکا، سەری ستەمکار دەخەمە سەر زەوی و بە پێلەقە دەچمە سەر سەری هەتا پەشیمان نەبێتەوە و بەرەو هەق نەگەڕێتەوە وازی لێ ناهێنم. سەریشم دەخەمە سەر زەوی، بۆ ئەو کەسانەی ڕاساڵ و لەسەر هەقن!"

- من دەبوو هەر وام گوتبا، بەڵام بە دیاریکراوی بە کام خاڵ سەرسامی؟

- قوربان ئەوەی کە لە بەردەم دادگادا هەژار و زەنگین، دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات وەک یەک بن، ئەوەی کە فەرموت: "ناهێڵم کەس ستەم لە کەس بکا." ئەم قسانە بە دیاریکراوی بەرەو ڕووی هیچ کەست نەکردۆتەوە و هەموو کەسێک دەگرێتەوە. ستەمکار هەرکەس بێت و کوڕ و نەوەی هەرکەس بێ و دەسەڵاتی هەرچەند بێ، تۆ بەرابەری دەوەستیتەوە. ستەملێکراو هەرکەس بێت و کوڕ و نەوەی هەرکەس بێ و دەسەڵاتی هەرچەند بێ، تۆ بۆی تێدەکۆشی. خەڵک بۆ ئەوەی کاروباریان بە باشی ڕاپەڕێ، پێویستیان بە کەسێکی ئاوایە، ستەمکار پێویستی بە دەستێکی بەهێزە بیگرێ و نەهێڵێ ستەم بکات، یارمەتیی بدا بە سەر نەفس و شەیتاندا زاڵ بێ، ستەملێکراو پێویستی بە دەستێکی بەسۆزە لەناوشانی بدرێ و بڵێت: "تۆ تەنیا نییت، منت لە پشتە." زۆر مایەی خەمگینییە کە دەسەڵاتدار خەڵک بەرەڵلا بکا و وەک ئاژەڵ لێیان بڕوانێ. بەهێز لاواز بخوا،

دانـدارەکان دانیـان لە بێـدانەکان گیـر بـکەن، کەس حسـاب بـۆ کەس نەکـا و چاودێرێکیان نەبێت.

- بینیت! من مەبەستم لەو قسە کە پێم وتی ئەوە بوو، مـن وتـم: بە قەسـتی وام وت، بۆ ئەوەی ستەمکار لێم بترسێ و ستەملێکراو دڵی بە بوونی من خۆش بێ. من نەمەویسـت سـتەمکار بەرەڵـڵا بـێ و وەک ئـاژەڵی درنـدە بکەوێـتە وێـزەی هەژار و داماوەکان و، ئەم و ئەو بخوا و ئەم و ئەو لەکەدار بکا.

- بە شتێکی تریش سەرسامم.

- چی؟

- بەو ترازووەی کە ویستت بۆ خەڵکی دابنێی، بەو سیاسـەتەی ویسـتت کـاری لەسەر بکەی؛ پێ لەسەر سەری ستەمکار دا دەنێـی تـا دێـتە سـەر ڕێ، لە بەرابەر هەق و ڕاستیدا خۆت بە بچووک دەزانی و سەر لە بەرپێی ڕاساڵەکاندا دادەنێی! بە خوا ئەم جۆرە مامەڵەیە، مامەڵەی مرۆڤە گەورە و مەزنەکانە.

- کوڕی خۆم! سـەرکردە دەبـێ وەک دایـک بـێ بـۆ منـداڵە نەخۆشـەکەی، پێـی ناخۆشە جگەرگۆشەکەی شتی ناخۆش بخوا، بەڵام بە دەستی خۆی دەرمانی تاڵ و ناخۆش دەکا بە قوڕگیدا، چونکە دەزانێ تاڵایی ئەو دەرمـانە، شیرنایی لەشسـاغیی پێوەیە.، ئەگەر کاتی دەرمانخواردنی منـداڵەکەی دوا بـکەوێ دەدا بە سـەر سـەری خۆیدا و بە کڕوزانەوە و سۆزەوە دەڕوا بۆلای منداڵەکەی، منـداڵەکە چەنە پێویسـتی بە دەرمانە بۆ ئەوەی خۆی بگرێتەوە، ئەوەنەیش پیویستی بە سـۆزی دایکیەتـی بـۆ ئەوەی چـاک بێـتەوە. خەڵـک وەک ئەو منـداڵە نەخۆشـەن، هەرکەس سـتەم بکـا، تاڵاوی دەرمانی دەرخوارد دەدەین بۆ ئەوەی ڕاساڵی و ئـایینە لەدەسـتچووەکەی بـۆ بگەڕێتەوە، ستەملێکراویش دیسان وەک ئەو منداڵەن پێویستیان بە سۆز و بەزەییە.

- ئەم لێکچوواندنە چەن جێی خۆیەتی و چەنـدە نموونەیەکی جـوان و ڕاسـتە قوربان!

- رۆڵە! باشترین قسە ئەوەیە کە کرداری لەگەڵدا بێ. خراپترین قسە ئەوەیە کە هەر قسە بێ و نەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە. داوام لە خوا ئەوەیە کە قسەکانم کردەیان لەگەڵدا بێ و، بە قازانجم بشکێنەوە. پەنا دەگرم بە خوا لە قەسە و بەڵێنی بێ کردەوە— سەری پیاو دەخوا!

- قوربان تۆ عومەری، عومەر! تۆ ئاوا ترست هەبێ، ئەی دەبێ ئێمە چۆن بین؟

- خوای گەورە هەموو لایەکمان باش بکا.

— ئامین! قوربان ڕوخسەتم دەدەی بگەڕێمەوە بۆ وتاری یەکەم ڕۆژی خەلیفایەتیت؟ بەردەوام چەند شتێکم لە مێشکدایە، دەمەوێ پرسیاریان لە بارەوە بکەم.

- دەی بپرسە چ پرسیارێکت هەیە بیپرسە.

- تۆ وتت: "من بۆم نییە باج و خەراج و داهاتی ئێوە بە هەدەر بدەم، دەبێ بەو جۆرەی سەرف بکەم کە خوا پێی خۆشە." مەبەستت لەم قسەیە چی بوو؟

مەبەستم ئەوە بوو کە داهاتی گشتی هیی هەموو خەڵکە و مافی تاکە کەس نییە، دەوڵەت تەنیا دەتوانێ زەکات لە خەڵک بسەنێ، ئەوە مافی خۆیەتی. دواتر ئەو ماڵە لە خەڵک وەردەگیرێ، بۆ خەڵک دەگەڕێتەوە، لە دەوڵەمەند وەردەگیرێ و دەدرێ بە هەژار. من تەنیا خزمەتکارێکم و دەبێ خزمەتەکەم بە باشی جێبەجێ بکەم، ئەو ماڵە بە باشی وەربگرم و، بە باشی بە مافدارانی بدەمەوە. من بۆ ئەوە نەکراومەتە سەرکردە، ماڵ لە خەڵک بسەنم. نایشبێ فرمانی خوا پشت گوێ بخەم و زەکات لە کەس نەستێنم.

- ئەی باشە بۆ خەڵک زەکات بداتە دەوڵەت، با خۆی بیدا بەو هەژارانەی کە دەیانناسێت؟

- تۆ جیاوازی لەنێوان زەکات و سەدەقەدا ناکەی؟!

- جیاوازییان چییە؟

- سەدەقە سوننەتە، موسڵمان بە ئارەزووی خۆی دەتوانێ سەدەقە بدا بە خەڵک، ئەوە خۆ نزیک کردنەوەیە لە خوای مەزن، بەڵام زەکات فەرزە، خواپەرستیە، لەسەر دەوڵەت پێویستە کە کاروباری خەڵک راپەڕێنێ، برسی تێر بکا، قەرزی قەرزاران بداتەوە، ژن بۆ لاوە هەژارەکان بێنێ، چارەسەری نەخۆش بکا، منداڵی هەتیو پۆشتە بکاتەوە؛ ئا لە بەر ئەمانە پێویستە ماڵی زەکات کۆ بکاتەوە و لەوانەدا سەرفی بکاتەوە. ئەگەر دەوڵەمەنەکان خۆیان زەکات بدەن بەو هەژارانەی کە دەیانناسن، ئەی چارەنووسی ئەو هەژارانە چی لێ دێت کە کەس نایانناسێ؟ ئەی چارەنووسی نەخۆش؟ چارەنووسی قەرزار؟ پیر و پەککەوتە؟ بێوەژن؟ کێ ئەوانە بگرێتە ئەستۆ؟ دەوڵەمەند خۆی سەرپشکە سەدەقەی خۆی بە کێ دەدا و چەندی پێ دەدا، بەڵام پێویستە زەکاتەکەی بدا بە دەوڵەت، بۆ ئەوەی دەوڵەت بە گوێرەی پێویست خەرجی بکا.

- ئەی ئەگەر سەردەمێک هات و دەوڵەت نەبوو، یان لە بەر هۆکارێک دەوڵەت نەیتوانی دەستی بە سەر خەڵکدا بگا و زەکاتیان پێ بگەیەنێت، ئەو کاتە دەکرێ بڵێین: پێویست ناکا ئیتر کەس زەکات بدا؟

- زەکاتدان عیبادەت و خواپەرستیە. هەرکەس سەروەت و سامانەکەی گەشتە رادەی زەکات، بە هیچ بەهانەیەک ناتوانێ خۆی لە زەکات بدزێتەوە. خۆ ئەگەر دەوڵەت بە دەوڵەت نەما و نەیدەتوانی بە سەر خەڵکدا رابگا، ئەوە ئەو کاتە مافی دەوڵەت بەسەر خەڵکەوە نامێنێ، بەڵام مافی خوا هەر دەمێنێ، پێویستە خواپەرستی لە کاتی خۆیدا جێبەجێ بکرێت، ئەو کاتە هەرکەسە خۆی زەکاتی خۆی دەدا بەو هەژارانەی کە خۆی دەیانناسێ، بەو ئاتاجانەی کە دەیانبینێ، دەبێ لە خزمە نزیکە هەژارەکانی خۆیەوە دەست پێ بکا، پاشان ئەوانەی کە خزمایەتییان دوورترەو...هتد.

- زۆر جوانە قوربان! تێگەشتم، ئەی مەبەستت لە "مافی ئێوەیشە کە من ئەو زەکاتەی دەستم دەکەوێ، بە ڕێ و جێ بە کاری بێنم" چی بوو؟

- مەبەستم ئەوە بوو کە عومەر بەو شێوەیە زەکات کۆ دەکاتەوە کە خوا فرمانی داوە، هەر بەو شێوەیەیش بە کاری دێنێ کە خوا فرمانی داوە. نە عومەر نە هیچ کەسێکی تر بۆیان نییە زەکات و سامان بۆ خۆیان کۆ بکەنەوە، یان بە کەیفی خۆیان بە کاری بێنن، یان بیدەن بە خزم و دۆستان و، خەڵکی تر فت.

- ئەی بەشی خەلیفە؟

- خەلیفە بێجگە لە مووچەی شیاوی خۆی، هیچیتری لە سەروەت و سامانی دەوڵەت ناکەوێ. خەلیفەیش وەک هەموو کەسێکی ئاسایی فەرمانبەرێکە و تەواو: فەرمانبەرێکە بۆ ئەوەی کاروبار بە باشی بەڕێوە ببا، بە باشی چاودێری دەوڵەت بکا. بۆیەیش مووچەی پێ دەدرێ، چونکە لەبەر بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت، بۆی ناکرێ خۆی کار و کاسبی بکا و نان پەیدا بکا. مووچەی خەڵک چۆنە، دەبێ مووچەی خەلیفەیش هەروابێ، بۆ نموونە ئەگەر مووچەخۆرێکی ئاسایی هەزار دیناری هەبوو، دەبێ خەلیفەیش هەزار زیاتری نەبێ، چونکە خەلیفەیش هەر مرۆڤێکە وەک فەرمانبەرەکانی تر، تاکێکە لە موسڵمانان.

— بەڵام قوربان من بیستوومە، تۆ لە بەخشیندا وەک ئەبوو بەکر نەبووی، مووچەی هەموو کەس لە سەردەمی ئەبوو بەکردا وەک یەک بوو، کەس لە کەس زیاتری پێ نەدەدرا، بەڵام لە سەردەمی خەلافەتی تۆدا مووچەی هەندێ کەس لە مووچەی هەندێ کەس زیاتر بوا

- بەڵێ وابوو، ئەوە من هەر لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوو بەکردا ئەو بۆچوونەم هەبوو، بەویشم وت، بەڵام پەسەندی نەکرد. ئەو دەیوت: "دەبێ هەموو کەسێ وەک یەک مووچەیان هەبێ، بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ شتێ، ئەوانەی کە هەر لە سەرەتاوە موسڵمان بوون و هاوکار و یاوەری پێغەمبەر بوون، ئەوە کارێکە بۆ خوایان کردووە و خوا لە قیامەتدا پاداشتیان دەداتەوە." منیش دەموت: "ناکرێ! چۆن کەسێ کە لە خزمەت پێغەمبەردا جەنگاوە و کەسێک لە دژی پێغەمبەر جەنگاوە، وەک یەک بن؟"

- بۆچونەکەی تۆ تەواوە، بەڵام قوربان من زیاتر بە ڕاکەی ئەبوو بەکر سەرسامم و ڕای ئەوم پێ جوانترە، ئەی ئەبوو بەکر بە گوێی دەکردی؟

- گوێی بۆ دەگرتم، بەڵام بە قسەی نەدەکردم، ئەو هەموو کەسێکی لا یەکسان بوو، بەڵام من لە سەردەمی خەلافەتی خۆمدا، قانونەکەم گۆڕی و بە ڕای خۆم کارم کرد! هەرکەسە و بە گوێرەی بیروبۆچوونی خۆی!

- قسەکەت تەواوە، بەڵام قوربان پێت وانییە کە یەکسانی باشتر بێ؟

- با پێت بڵێم: مەبدەء و بیروبۆچوونێک هەیە کە زۆر لە یەکسانی باشتر و بەهێزترە، ئەوەیش دادگەریە، یەکسانیی تەواو، بەلای نادادپەروەریدا دەشکێتەوە. ئەوەتا خوای گەورە بەشە میراتی زۆر دادگەرانە داناوە، کەچی یەکسانیی تیا نییە!

- چۆن قوربان؟

- ئەوەتا خوای گەورە بەشی کوڕێکی بە ئەندازەی بەشی دوو کچ دیاری کردووە، خۆ ئەمە یەکسانی نییە، بەڵام ئەوپەڕی دادگەرییە، پیاو کاتێ بیەوێ ژن بێنێ، مارەیی بە ژنەکە دەدا، واجبە لەسەر پیاو کە ژنەکەی و ماڵ و منداڵەکانی بەخێو بکا. ئافرەت هەرچەن دەوڵەمەند و دارایش بێ، لەسەری واجب نییە ماڵ و منداڵ بە خێو بکا، پیاو دەبێ ماڵ و خانو دابین بکا، دایکی و ئەو خوشکانەی کە شوویان نەکردووە، بە خێو بکا. دەی لەبەر ئەوەی پیاو ئەرکی زیاتری لەسەرە و خەرجیی زیاتر دەوێ، ئەوە دادگەریی ئەو کاتە بەوجۆرە دەبێ کە بەشە میراتی زیاتر بێ.

- ئەی تۆ لەسەر چ ئەساسێ مووچە و بەخشینت بە خەڵک دەدا؟

- پێت دەڵێم. دوای ئەوەی خوای گەورە عێراق و شامی بۆ ڕزگار کردین و دارایی زیادی کرد، خەڵکم کۆ کردەوە و پێم وتن: "خەڵکینە! من دەمەوێ مووچە و بەخشش بەو کەسانە بدەم کە شیاوی مووچە و بەخششن." وتیان: "ئەوە ڕایەکی بەهێز و جوانە."

منیش وتم: "لەکێوە دەست پێ بکەم؟"

وتیان: "لە خۆتەوە."

منیش وتم: "نەخێر، من خۆم وەک خۆم حیساب دەکەم، نەک خەلیفە. من لە خزم و کەسوکاری پێغەمبەرەوە دەست پێ دەکەم."

- ئەی قوربان تۆ خۆت ئەم کارەت گرتە ئەستۆ؟

- نەخێر، خەلیفە هەرچەند بەهێزیش بێ، ناتوانێ بە تەنیا بەسەر ئەو هەمووە خەڵکەدا ڕابگا، دەبێ هاوکار و یارمەتیدەری هەبێ، دەبێ کەسانێک هەبن چاودێر بن بە سەریەوە و لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکەن. من ئەو کارەم بە عەقیلی کوڕی ئەبوو تالیب و جوبەیری کوڕی موتعیم و مەخرەمەی کوڕی نەوفەل سپارد، فرمانم پێکردن کە هەرکەس بە گوێرەی مەکانەت و شایستەیی مامەڵەی لەگەڵدا بەکەن. عومەر و بنەماڵەی عومەر پێش هیچ کەس نەخەن و وەک خەڵکی سادەیان ئەژمار بکەن!

- ئەی کەسوکارت بەوە ڕازی بوون، وەک خەڵکی ئاسایی بن؟

- بەنی عەدی، خزمەکانم، هاتن بە منیان وت: "تۆ لێگەڕێ با ئەو سێ کەسە چۆن حیسابمان بۆ دەکەن ئاوابێ، لە پێشدا کەسوکاری پێغەمبەر، دوایی کەسوکاری ئەبوو بەکر دواتر کەسوکاری تۆ.

منیش وتم: "بەهـ بەهـ بەنی عەدی! دەتانەوێ بەسەر منەوە بخۆن؟! دەتانەوێ چاکەکانی خۆمتان پێ بدەم؟!

- ئەی بەخشش و مینحە چۆن بوو؟

- بەشی دایە ئایشەم بە دوانزە هەزار دانا، ئەو خێزانەکانی تری پێغەمبەر هەریەکە و دە هەزار، بەڵام جووەیریە و سەفیە یەکی شەش هەزار.

- قوربان خۆ ئەمە نە یەکسانییە نە دادپەروەری؟!

- ئایشە خۆشەویسترین خێزانی پێغەمبەر بوو، بۆیەش دوانزەم بۆ دانا هەر لەبەر ئەو خۆشەویسیە. ئەوانی تر وەک یەک بۆم دیاری کردن. هەرچی جووەیریە و سەفیەشە، ئەوە ئەوان دیل بوون و ئازاد کران، بۆیە یەکی شەش هەزارم بۆ دیاری کردن، ئەمە دادپەروەریە. پیاوەکانی بەنی هاشم یەکی پێنج هەزارم بۆ دیاری کردن، گەنجەکانیان یەکی سێ هەزار، بەڵام بەشی حەسەن و حوسەینم وەک پیاوەکان دیاری کرد، چونکە پێغەمبەر زۆری خۆش دەویستن. بەشی ئوسامەم چوار هەزار دانا. عەبدوڵلای کوڕم هات و پێی وتم: "بۆچی بەشی ئوسامە لە بەشی من زیاترە؟"

منیش وتم: "باوکی ئوسامە لە باوکی تۆ خۆشەویستر بوو لای پێغەمبەر، خودی ئوسامەیش لە تۆ خۆشەویستر بوو لای پێغەمبەر!" ئەوانەی لە غەزای بەدردا بەشدار بوون، یەکی چوار هەزارم بۆ دیاری کردن، خەڵکی تریش یەکی دوو هەزار!

- بۆچی بەشی خێزانەکانی پێغەمبەر لە بەشی پیاوان زیاتر بوو؟

- چونکە ئەوان ئیتر ڕێی شوکردنیان نەمابوو، ئەوان تازە بووبوونە دایکی ئیمانداران، لەبەر ئەوەی ئەوان ئیتر هەتا هەتایە بێ شوو دەبوون، دەبوو بەباشی ژیانیان دابین بکرێ و ئەوەی شیاوی ئەوانە پێیان بدرێت.

- پاک و بێگەردی بۆ خوا! قوربان بە خوا تۆ بیر لە شتی وا دەکەیتەوە کە کەسیتر بیری لێ ناکاتەوە. پاک و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی هەق و ڕاستگۆیی خستۆتە نێو دڵ و سەر زمانتەوە. با بگەڕێمەوە سەر باسەکەی خۆم! مەبەستت لەو قسەیە کە وتت: "ئەو مافەتان لەسەر من هەیە کە نەتانفەوتێنم و نەتانخەمە تەنگانە و نارەحەتیەوە" چی بوو؟

- مەبەستم ئەوەبوو پێیان بڵێم: من ژیانی ئێوە ناخەمە مەترسیەوە، لەبەر ئەوەی ئاواتمە شوێنێک ڕزگار بکەم کە خۆم حەز بکەم ڕزگاری بکەم. دیسان ناتانخەمە مەترسیەوە، لەبەر ئەوەی ئاواتمە دوژمنێک بشکێنم.

- یانی تۆ بەڵێنت پێ داون کە نەیانبەی بۆ جیهادکردن؟
- کێ شتی وای وتووە؟
- من لە قسەکەی تۆ وا تێگەشتم، کام جەنگ و ڕزگارکردن هەیە کە ژیانی جەنگاوەرەکانی تیا نەکەوێتە مەترسیەوە؟ کام دوژمن بەبێ جەنگ و کوشتار دەشکێ؟ کام جەنگە مەترسیی کوشتنی تیا نییە؟ ڕاستە ئەو کەسەی کە لە سەنگەرەکانی پێشەوەدایە، لەو کەسەی کە لە ماڵدا نووستووە، لە مەرگەوە نزیکتر نییە، بەڵام دیسان جەنگ هۆکارێکە بۆ تیاچوون و کوژران.
- کوڕم! من ئەوەم مەبەست نەبوو. هیچ جەنگێک بێ کوشتار و مەترسی نییە. جیهاد و جەنگ دێتە پێشەوە و نابێ خۆمانی لێ بدزینەوە. جەنگ جەنگە، لە هەموو سەردەمێکدا هەر ڕوو دەدا. خوای گەورە هەرکەسی زۆر خۆش بوێ، بە پلەی شەهیدبوونی دەگەیەنێت. من مەبەستم لەو قسانە وەک دەڵێن: "جەنگی خۆ ترێن" و سەرکەشی بوو، ئەو جەنگانەی کە لە ڕووی نەزانییەوە دەکرێن، ئەوانە وەک قومارن.
- بەڵام قوربان ئێمە ئەگەر سەیری زۆربەی جیهادەکانی ئێوە بکەین، تەماشا دەکەین سوپای کافران زۆر لە سوپای ئیسلام زیاتر بوون. خۆ ئەو جیهاد و جەنگانە پڕ بوون لە مەترسی، زۆربەی جار خەڵک بڕوای وابوو سوپای ئیسلام دەشکێ، بۆ نموونە جەنگی قادسیە سوپای موسڵمانان نزیکەی سی و شەش هەزار کەس بوو، کەچی سوپای کافر سەد و بیست هەزار! لەگەڵ ئەوەشدا تۆ سەرکەوتی!
- کوڕم! ئەگەر سەرکەوتن بە ژمارە و کەرەستەی جەنگەوە ببەستینەوە، ئەوە قسەکەت تەواو ڕاستە! بەڵام سوپای ئیسلام بە هۆی گوێڕایەڵی لە فرمانەکانی خوا و یارمەتی خودایی سەر دەکەوتن. کوفر بە هۆی پشت کردنە فرمانەکانی خوا و ئەو ترس و لەرزەوە دەدۆڕان کە خوا دەیخستە دڵیانەوە، ئەمە یەک.

دووەمیش، لەگەڵ ئەو جیاوازییە گەورەیەیش لە ژمارە و کەرەستەی جەنگیدا، ئەو جەنگە جەنگێکی کراوە بوو، پیاو بەرابەری پیاو دەوەستا. مەترسی لەو جەنگەدا لە مەترسیەکانی هیچ جەنگێکی تر زیاتر نەبوو. ئەگەر شتەکە پێچەوانە با ئەوان سی و شەش هەزار و ئێمە سەد و بیست هەزار، مەترسی ڕووبەڕووبوونەوە هەر هەبوو. ئەو قسەیەی من، مەبەستم شتێکی تر بوو، نەک ژمارە و کەرەستە.

ـ شتی وەک چی گەورەم!

ـ ئێسە پێت دەڵێم و، دوو نموونەیشت بۆ باس دەکەم. نموونە و ڕووداوەکان باشتر مرۆڤ تێدەگەیەنن تا قسە، نموونەی یەکەمیان لە سەردەمی مندا ڕووی دا، موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان زۆری لێ کردم و زۆر داوای کرد کە بە ڕێگەی دەریاییدا بچین بۆ ڕزگارکردنی قوبرس. من لە ژیانی خۆمدا دەریام نەدیبوو، نامەیەکم نووسی بۆ عەمری کوڕی عاس، بۆ ئەوەی بە درێژی باسی دەریا و سەفەری سەر دەریام بۆ بکا.

عەمر وەڵامی نامەکەی دایەوە و وتی: "من شتی(کەشتی) زەبەلاحم دیوە، خەڵکانێکی کەم سواری بوون، ئەگەر لەناو ئاودا بوەستێ، دڵەکان ئازار دەبینن، خۆ ئەگەر بڕوا عەقڵەکان جام دەبن، پیاو سەرگەردان دەبێ و نازانێ چی بکا، خوا خوایانە بگەنە جێ. ئەگەر ئەو شتە(کەشتیەکە) لەرەلەر و ئەملاولا بکا، دەخنکێن، ئەگەریش بە سەلامەتی بگەنەوە جێ، تازە بە زەحمەت جارێکی تر سواری دەبنەوە.

من کە ئەم نامەیەم خوێندەوە، نامەیەکم بۆ موعاویە نووسی و وتم: "هەرگیز تاقە سەربازێک بە ڕێگەی دەریادا نانێرم بۆ جەنگ و نایانخەمە مەترسیەوە." ڕۆڵە! لە مەبەستم تێگەشتی؟

ـ بەڵێ قوربان! تێگەشتم، ئەی ڕووداوی دووەم چی بوو؟

- ڕووداوی دووەم لە سەردەمی ئەبوو بەکردا ڕووی دا، خالیدی کوڕی وەلید نامەیەکی بۆ ئەبوو بەکر نووسیبوو، داوای کردبوو کە موسەنناى کوڕی حاریسە — جیاتی خۆی — بکاتە سەرکردەی عێراق و خۆی بڕوا بکاتە سوپای موسڵمانان لە یەرموک. بەڕاستی خالید کوڕی جەنگ بوو، باوەڕ ناکەم تازە هیچ ژنێک ڕۆڵەی ئاوا بە جەرگ بوێنێ، خۆی چونکە ئەوەندە زیرەک و لێهاتوو بوو، وای دەزانی هەموو کەس وایە. من ئەمەم بەلاوە سەیر نەبوو، بەڵام خەمی ئەو کەسانەم بوو لای ئەو سەرباز بوون. ئەلموهیم! خالید دەیویست بە ڕێگەیەکدا سوپا بەرەو یەرموک ببا کە ڕۆمەکان پێی نەزانن و هەستی پێ نەکەن، ئەوەیش دەبوو ئیللا بە بیابان و سارای سەماوەدا تێپەڕیبان. ئەو سارایە چۆڵ و بیابانێکی پڕ مەترسیە، ئەو ڕابەرایەتییەکی وای کرد کە من دان بە زیرەکیا دەنێم. بزانە چی کرد! هەرچی حوشتری گەورەو پیر هەبوو هەموو تینو کردن، پاشان زوو زوو ئەوەندە ئاوی دان تا هەموویان زگیان وەک حەوزی ئاوی لێهاتبوو، سوپاکەی خستە ڕێ، هەموو ڕۆژێک لەو حوشترانەی سەر دەبڕی و گۆشتەکەی دەدا بە سەربازەکان و ئاوی نێو زگی حوشترەکانی دەدا بە ئەسپەکان. چوار ڕۆژی ڕێک بەو جۆرە سوپاکەی جوڵاند، لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا گەشتە جێ. سوپای دوژمنانی تێک شکاند، هەواڵی سەرکەوتنیان گەشتەوە بە ئێمە. ئەبوو بەکر تەواو دڵخۆش بوو، بەڵام من دەستم کرد بە دەمەقرە لەگەڵیدا.

وتم بە ئەبوو بەکر: "ئەگەر خالید تەنیا گیانی خۆی بخستایەتە مەترسیەوە، ئەوە کەیفی خۆی بوو. منیش هەقم بە سەریەوە نەبوو، بەڵام چۆن دەبێ گیانی سەربازەکان بخاتە مەترسیەوە؛ ئەوە سەرکەشیە. کوڕم ئێستە تێگەشتی مەبەستم لە "ئەو مافەتان لەسەر من هەیە کە نەتانفەوتێنم و نەتانخەمە تەنگانە و ناڕەحەتیەوە" چی بوو؟

- بەڵێ قوربان تێگەشتم! قوربان! لەبەر ئەوە بوو کە هەر بووی بە خەلیفە، یەکەم کاری تۆ ئەوە بوو خالید لە سەرکردایەتی لابەی؟

ـ یەکەم: دەبێ بزانی من خالیدم لەبەر ئەوە لا نەبرد کە خوانەخواستە لاوازییەک لە ئایین و بیروباوەڕیدا بێ، هیچ گومانیشم لە زیرەکی و لێهاتوێتی ئەو نەبوو. لەبەر ئەوە نەبوو کە سوپاکەی بە بیاباندا بردبوو. من لەبەر چەند هۆکارێکی تر ئەوم لابرد، ئەو بڕیارەیشم بە شەو و ڕۆژێک بۆ دروست نەبوو. من داوام لە ئەبوو بەکریش کردبوو کە لە سەرکردایەتی لایبا، بەڵام ئەبوو بەکر ڕایەکی تری هەبوو. ئەبوو بەکر دانی بەوەدا دەنا کە خالید هەندێ هەڵەی کردووە، خۆ پێغەمبەرانیش نەبێ، هەموو کەسێ هەڵە هەر دەکا، ئەو هەڵانەی کە خالیدیش کردنی ئەوەندە گەورە نەبوون زەرەر لە بیرو بڕوا و دینی خالید بدا. ڕۆڵە! ئاوی کانی پیس نابێ، خالید نەک کانی، بگرە دەریا بوو. ئەبوو بەکر، خالیدی لەسەرکردایەتی لا نەبرد، بەڵکو هەندێ سەرکۆنە و گلەیی لێ کرد. ئەو پێی وابوو ئەو کارە هەڵانەی خالید بە قەسدی نەبووە. ئەو پێی وابوو مانەوەی خالید لە پۆستەکەیدا ئەوەندە گرنگە، هەموو هەڵەکانی دەشواتەوە!

دووەم: زیاد لەوەی کە باسم کرد، من پێم وابوو کە شمشێرەکەی خالید تووشی هەڵە بووە. تەنانەت لە سەردەمی پێغەمبەردا خالید هەندێ دیل و یەخسیری کوشت. هەر ئەو ڕۆژە پێغەمبەر هەردوو دەستی بەرز کردەوە و فەرمووی: "خوایە! من بەریم لەو کارەی کە خالید کردوویەتی!" جا پێغەمبەر خۆی لە کاری خالید بەری کرد، نەک لە خودی خالید، چونکە دەیزانی خالید بیروباوەڕی پتەو و تەواوە، بەڵام تووشی هەڵە بووە. منیش ئەمەم دەزانی، بەڵام من بڕیار لەسەر کار دەدەم، نەک لەسەر کەسایەتی. خالید ئەگەر هەر بەوەندە بوەستایەتەوە، ئەوا منیش لە سەرکردایەتی لام نەدەدا، بەڵام ئەو لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوو بەکریشدا دیسان هەڵەیەکی وای کرد: مالیکی کوڕی نوەیرەی کوشت. ئەبوو بەکر بانگی کرد و لێپرسینەوەی لەگەڵدا کرد، خالید خوێنی مالیکی بە کەسوکاری مالیک دا و سوڵحیان کردا!

- لەمانە زیاتر هیچی تری کردبوو کە شایەنی ئەوە بێ تۆ پۆستەکەی لێ بسەنیتەوە؟

- بەڵێ! خالید بێ ئەوەی پرس بە ئەبوو بەکر بکات، دەسکەوتی جەنگی دابەش دەکرد. من بە ئەبوو بەکرم وت: "نامەیەک بۆ خالید بنووسە و پێی بڵێ کە هیچ کەس بۆی نییە دەسکەوتی جەنگ دابەش بکا، بەڵکو دەبێ بۆ خەزێنەی دەوڵەتی بهێننەوە." ئەبوو بەکر نامەی بۆ نارد. خالید ئاوا وەڵامی دایەوە: "یا وازم لێ بێنە خۆم چی دەکەم، بیکەم؛ یا واز دەهێنم!"

من جارێکی تر بە ئەبوو بەکرم وت کە خالید لا با، بەڵام بە گوێی نەکردم. ئەبوو بەکر پێی وابوو کە سەرکردە چی دەکا با بیکا، بەڵام هەر لەبەر خاتری من، نامەی بۆ خالید نووسی. منیش خۆم لە سەردەمی خەلافەتی خۆمدا پێم وابوو کە دەبێ من چاودێر و سەرکردە بم بەسەر هەموو سەرکردە و بەرپرسەکاندا؛ لە هەموو کارێکی ورد و گەورەیان بپرسمەوە. ئەبوو بەکر هەرچەند خالیدی لا نەبرد، بەڵام بە تەواوی لێی ڕازی نەبوو. منیش هەرچەند لامبرد، بەڵام خۆ ڕقم لێی نەبوو. من و ئەبوو بەکر دوو کەسی جیاواز بووین. هەریەکەمان بە ڕێگەی خۆمان کاروباری دەوڵەتمان بەڕێوەبرد.

- گەورەم! هۆکاری تر هەبوو؟

- یەک هۆکاریتر هەیە کە پەیوەندیی بە خودی خالیدەوە نییە. خەڵک زۆر بە خالید سەرسام بوون، چونکە هەر سوپایەک خالید سەرکردەی بووبێ، نە لە سەردەمی جاهیلیدا شکاوە، نە لە سەردەمی ئیسلامدا. خوای گەورە هێز و دلێری و فێڵی جەنگی بە خالید دابوو، زۆر جوان نەخشەی جەنگی دادەڕشت، جوان بەڕێوەی دەبرد، کارەکانی بە جوانی دەکرد، بۆیەش خەڵک دەیانگوت: "سەرکەوتن سەرکەوتنی خالیدە." بۆیە ترسام ئەو خەڵکە بیروباوەڕیان لەق ببێت و تەنیا پشت بە خالید ببەسن و خودایان لە بیر نەمێنێ. ئەو ڕۆژەی کە من خالیدم لەسەر کار لابرد، وتم: "ئەوا من خالیدم لەسەر کار لابرد، بۆ ئەوەی خەڵک بزانێ سەرکەوتن،

سەرکەوتنی خوایە(خالید تەنیا هۆکارە.) هەموو ئەمانە وای لە من کرد کە بڕیاری لەسەرکارلادانی خالید بدەم، چونکە قازانجی ئیسلام و موسڵمانانم لەوەدا دەبینی. من هەمیشە هەوڵ و تێکۆشانەکانی خالیدم لە بیرە و بەرزیان دەنرخێنم. ئەو ڕۆژەی لام برد، نامەیەکم بۆ ئەبوو عوبەیدە نووسی و وتم: "پرس بە خالید بکە و، بڵێ: 'عومەر نیازێکی ئاوای هەیە.' " من پێم وابوو بەم کارەم، هەموو موسڵمانان یەک دەنگ دەکەم لەسەر ئەوەی کە پێویستە خالید لا ببەم - ئەبوو عوبەیدە م خستە جێی خالید.

ـ قوربان من وا دەزانم کە هۆکارێک هەیە کە ئەبوو بەکر لای نەدەبرد و تۆ لات برد، بەڵام خۆت درکت بەو هۆکارە نەکردووە، دەرفەتم دەدەی بۆت باس بکەم؟

ـ ئادەی کوڕم! بیڵێ بزانم چییە؟

ـ من وا دەزانم هەموو ئەو شتانەی کە ڕووی داوە، هۆی ئەوەیە کە تەبیعەتی تۆ و ئەبوو بەکر لە یەک جیاوازبوو، ئەبوو بەکر نەرمونیان، تۆیش توندوتۆڵ. ئەو بۆیە خالیدی لا نەدەدا، چونکە ئەو توندیەی خالید بۆشایی ئاتوندیەتیی ئەبوو بەکری پڕ کردبوویەوە، بۆیەیش تا کۆتایی ژیان ئەبوو بەکر خالیدی لەسەر کار لا نەبرد، ئەوان دوو کەسایەتی پێچەوانە و دۆستی یەک بوون، تەواوکەری یەکتر بوون. هەرچی تۆ و خالیدە لە یەک سرشت و گڵ بوون، دوو کەسایەتی وەک یەک، بۆیەیش کەستان نەبوونە تەواوکەری ئەویترتان، ئەمە وای کرد کە تۆ و خالید بە یەکەوە نەتانکرێ و، تۆ ئەو لە سەرکردایەتی لا ببەی و، ئەبوو عوبەیدە بکەی بە سەرکردە. ئەبوو عوبەیدە یش پیاوێکی نەرمونیان بوو، هێدی و هێمن بوو، ئەبوو عوبەیدە بووە تەواوکەری کەسایەتیی تۆ، ڕێک وەک ئەوەی کە خالید بووبووە تەواوکەری کەسایەتیی ئەبوو بەکر. ئەبوو بەکر هەرچەند زۆر ئەبوو عوبەیدەی خۆش دەویست، بەڵام چونکە ڕێک وەک خۆی بوو هیچ پۆستێکی پێنەدا. تۆیش هەرچەند خالیدت خۆش دەویست، بەڵام چونکە نەبووە تەواوکەری تۆ، بۆیە لە

پۆستەکەی دوورت خستەوە. تۆیش و ئەبوو بەکریش بەدوای کەسێکدا دەگەڕان کە ببێتە تەواوکەری خۆی!

- من لەبەر ئەوە نەبوو خالیدم لابرد، هەرچەند بۆچوونەکەت جێگەی لێ ڕامانە، بەڵام ئەگەر ئەبوو عوبەیدەیش وەک خالیدی کردبا، لەسەر کارم لادەدا!

- دەی قوربان با ئەم لاپەڕە بپێچینەوە، من ئەوەندەم لێ بیستی کە بزانم بە چ پێوەرێک کارەکانت پێواوە، ئەوەندە دڵنیا بووم کە هیچ شەیتانێ نەتوانێ دوودڵم بکات و بڵێم کە ئەو کارانە هەندێکیان لەبەر خاتری خۆیان بووە، نەک خاتری خوا و قازانجی گشتی.

- کەواتە باسی وتاری یەکەم ڕۆژی خەلافەتم کۆتایی هات؟

- نەوەڵلا قوربان یەک شت ماوە، دەخوازم کە گەورەم سەخڵەت نەبێ و وەڵامم بداتەوە.

- نا کوڕم چی دەپرسی بپرسە، زۆر ئاساییە.

- ویستم بپرسم مەبەستت لەو قسە چی بوو کە فەرموت: "ئەو مافەتان لەسەر من هەیە کە لە کاتێکدا لە جەنگدان و لە ماڵ و منداڵتان دوورن، نەهێڵم ماڵ و منداڵ و خێزانەکانتان بێناز بن تا خۆتان دەگەڕێنەوە"؟

— ئەوە ڕوونترین پرسیار بوو کە تۆ لە منت کرد، ئەوە قسەیەکی ڕوون و ئاشکرایە و هیچ پێچ و پەنای تیا نییە و هیچ مەبەستێکی شاراوەی تیا نییە، بۆیە زۆر بە کورتی وەڵامت دەدەمەوە.

- دەی قوربان هەموو گیانم دەکەمە گوێ بۆ بیستنی فەرموودەکەت.

- کوڕی خۆم! خوای گەورە موسڵمانان بۆ جیهاد هان دەدا و فرمان دەکا کە بەرابەر کافران بوەستنەوە، بۆ ئەوەی ئایینەکەی بە سەر زەویدا بڵاو بێتەوە. لە بەرامبەریشدا پاداشێکی زۆر گەورەی بۆ جەنگاوەرەکان داناوە، ئەو پاداشە ئەوەندە مەزنە، هەرچەند نوێژ و ڕۆژوو زۆر مەزنن، بەڵام نە ڕۆژووگر بە هۆی ڕۆژوەوە و نە

نوێژکەر بە هۆی نوێژەکانییەوە پێی ناگەن؛ زۆر موسڵمان بۆ دەسکەوتنی ڕەزامەنـدی خـوا و پاشـان دەسـکەوتنی ئەو پاداشـە مەزنە ڕۆشـتوون، بەڵام هەرچۆنێـک بـێ، ئەوانەش مـرۆڤن، ژن و منـداڵیان هەیە، خوشـک و برایـان هەیە، کەسـانێکی وایـان هەیە کە دەبـێ سەرپەرەشـتییان بـکەن، دەبـێ بەخێویـان بـکەن، چاودێریـان بـن، لەوکاتەی دەچن بۆ جیهاد، کەس نییە چـاودێر و بەخێـوکەر و سەرپەرەشـتیکاری ئەوانە بێ. ئەوە کەی ڕەوایە ئەو مرۆڤانە بچـن لە پێنـاوی خـوا بجەنگـن و، ژن و منداڵ و خوشک و برا و دایک و باوک بەجێ بێڵن و ئەوانیش لە بێ کەسیدا چـاو ببڕنە دەستی ئەم و ئەو؟! نە بە خـوا ڕەوا نـییە، دەبـێ لەو کـاتەی ئەوان لە مـاڵ نین، من چاودێر و بەخێوکەری ماڵ و منداڵ و کەسوکاریان بم. ئەگەر باوک لە ماڵ نەبوو، دەبێ من باوک بم. ئەگەر برا لە ماڵ نەبوو، دەبێ من برا بم. نابێ من تێـر بخۆم هەتا ئەوان تێر نەخۆن. نابێ ئارخەیان و ئاسوودە بـم تـا ئەوان ئارخەیـان و ئاسوودە نەبن. نـابێ بـخەوم تـا ئەوان بە ئـارامی نەخەوون. نـابێ بە جـارێ بـێ مێردی و بێ باوکی و بێ براییان پیوە دیار بێ و، چاو لە دەسـتی ئەم و ئەو بـن. نابێ عومەریش مـنەت بکـا بە سـەریاندا. ئەمە پێویسـتیەکی سەرشـانی عـومەرە و دەبێ جێبەجێی بکا.

- چەن جوامێری قوربان چەن جوامێری!

- ئەمە ئـایینە ڕۆڵەکەم! ئەمە شـەرعی خـوایە. هەنـدێ کەس وا دەزانـن ئەگەر ئێمە داکۆکییان لێ بکەین، پیاوەتییان لەگەڵدا دەکەین!

دەی کوڕم، بزانم دوای وتاری یەکەم ڕۆژی خەلیفایەتی، چ پرسێکی ترت لایە؟

- زۆرم لایە قوربان! خەڵک لە قسەکردن لەگەڵ تۆ و هاوڕێنەکانی تۆ تێر نـابێ، بە خوا تا کۆتاییی ژیانم لە خزمەت تۆدا بم و قسەت لەگەڵدا بکەم، تێر نابم. بۆیە وتـووێژت لەگەڵـدا دەکەم و پرسـیارت لە بـارەی خـۆتەوە لـێ دەکەم و، ئەو پرسیارانەیش خۆشەویسیت لە دڵمدا زیاتر دەکـا، دڵنیـا دەبـم کە زۆر خـۆڕاگر و بە حەوسەڵەی، من هەرگیز لام وانەبووە کە خۆڕاگری و حەوسەڵە لەگەڵ تونـدوتۆڵی و

تەکووزی دژی یەک بن، بەڵکو تەواوکەری یەکترن. پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایە کە خۆڕاگری و توندایەتی، حەوسەڵە و هەڵچونی لە تۆدا کۆ کردووەتەوە؛ تۆیەک کە ئەگەر پێغەمبەرێکی تر دوای پێغەمبەری ئیسلام هەبا، ئەوە تۆ دەبووی!

- دەی کوڕم، ئەمە گومان باشیی خۆتە بەرابەر من.

- بە خوا تۆ شایانی ئەو گومان باشییەی.

- دەی واز لەم قسانە بێنە، بپرسە بزانم چ پرسیارێکت لایە؟

- لە زۆر کەسم بیستووە و تەنانەت لە زۆر کتێبدا خوێندوومەتەوە کە قورئان لە زۆر شوێندا هاوڕا بووە لە تەک تۆدا. ئەگەر خەڵک هەمووی ڕایەکی هەبووبێ و تۆیش ڕایەکی جیاواز، ئەوا قورئان لەگەڵ تۆدا هاوڕا بووە و ڕاکەی تۆی پەسەند کردووە، پێم خۆشە باسی ئەوەم بۆ بکەی.

- کوڕم! منیش یەکێکم وەک ئەو خەڵکە، لەوان زیاتر نیم. جاری وا هەیە ڕا و بۆچونەکانم ڕاست دەردەچن و، جاری واش هەیە نایپێکم، تەنیا پێغەمبەران دوورن لە هەڵە. بەڵام خوای میهرەبان جۆرە هەست و لێزانینێک بە هەندێ کەس دەبەخشێ، دڵیان ڕووناک دەکاتەوە، ئەو بڕیارەی کە دەیدەن، ڕێک وەک بڕیاری خوا دەردەچێ. خوای گەورە لوتفی لەگەڵ مندا کردووە و چەند جارێک ڕا و بۆچونەکانم وەک قورئان دەرچووە.

- دەی قوربان بۆم باس ناکەی؟

- باسی ئەوە زۆری پێ دەچێ، بەڵام قەیناکا وەڵامت دەدەمەوە.

- قوربان من لە قسەی تۆ تێر نابم، چۆنی دەکەی بیکە، تینوێتیم بشکێنە!

- دەی کە وابوو، گوێ بگرە! من زۆر جار قسەکانم وەک قورئان دەرچووە:

یەکەم: کاتی خۆی، ئێمە لە مەقامی حەزرەتی ئیبراهیمدا نوێژمان نەدەکرد، بە پێغەمبەرم وت: "قوربان بۆ لە مەقامی ئیبراهیمدا نوێژ نەکەین؟"

زۆری پـێ نەچـوو خـوای گەورە ئـایەتی ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ البقرة: ١٢٥ی نارده خوارەوە. واتە: "(پێمان وتن) شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگای نوێژ."

ـ ئەی پـاک و بـێگەردی بـۆ خـوا! بەڵام قوربـان چـی وای لە تـۆ کـرد ئەو داواکاریە بکەی؟

ـ جـا بـۆ داواکـاریەکی وام نەبـێ؟ هەرکەس بە باشـی ئیبـراهیم بناسـێ و لە ژیاننامەی ئاگادار بێ و، پـێش گـوێی سـەر، بە گـوێی دڵ گـوێی بـۆ ژیاننـامەکەی گرتبێ، ئەوا ئیبراهیم و ئایینی ئیبراهیم و شوێن کەوتوانی ئیبراهیمی خـۆش دەوێ. ئیبـراهیم پیـاوێکی وابـوو کە خـوای گەورە کردبـووی بە خۆشەویسـی خـۆی. هەڵبژاردەی خـوا بـوو، پێغەمـبەر بـوو، بەڵام پێغەمبەر! لە تـاقیکردنەوەی ئایینیـدا دەرچوو، کوڕەکەی پاڵخست بۆ ئەوەی سەری ببڕێ و فرمانی خـوا جێبەجـێ بکـا، دژایەتی نەمروودی کرد، بەرابەر فیـرعەون وەستایەوە. دوای ئەمـانە، خـوا فرمـانی پێکرد کە کەعبە نـوژەن بکـاتەوە، کـردی: ئیسـماعیل بەردی بـۆ دەهێنـا و ئەویـش وەستایی دەکرد، کە دیوارەکە بەرز بوویەوە، بەردێکی گەورەی هێنا بۆ ئەوەی بچێتە سەری و دیوارەکە زیـاتر بەرز بکـاتەوە، جـێ پێـی حەزرەتـی ئیبـراهیم لەسـەر ئەو بەردە دەرکەوت و چاڵ بوو، ئەو پیاوێکی وا بوو کە دڵی بۆ خـوا نەرم کردبـوو، لە بەرابەرا خوای گەورە بەردی لەژێر پێیدا نەرم کرد. ئیتر شوێنی ئەو بەردە بـوو بە مەقـامی ئیبـراهیم، مـن بە بۆچـونی خـۆم ئەوەم بـۆ دەرکەوت کە لای ئەو بەردە شوێنێکی پیرۆزە و جێی خۆیەتی کە موسڵمانان نوێژی تیا بکەن. هەرچەند هەمـوو لایەکی کەعبە هەر پیرۆزە، بەڵام ئیتر ئەو جێگەیە پیرۆزیەکی زیاتری هەیە، پاشان خوای گەورە وەک پاڵپشتی بۆ ڕا و بۆچونەکەی من، ئەو ئـایەتەی نـاردە خـوارەوە، ئەمەیش چاکە و بەخششێکە خوا بە هەرکەسی بیەوێ دەیدا.

ـ پاک و بێگەردی بۆ خوا! پێغەمـبەر ڕاسـتی فەرمـوە "هەق و ڕاسـتی خـراوەتە سەر دڵ و زمانی عومەر" ئەمە جاری یەکەم ئەی جاری دووەم چۆن بوو؟

ـ جاری دووەم، پێشتر باسی تەبع و سروشتمان کرد، باسی جیاوازیی سروشتی من و ئەبوو بەکرمان کرد!

ـ بەڵێ قوربان وابوو باسمان کرد.

ـ بەڵێ کوڕم! وابزانم لە بیرت چوو من نموونەیەکم بۆ باس کردی! تۆ هەستت پێ نەکرد کە ئەوە دووەم جار بوو خوای گەورە پاڵپشتیی قسەی منی کردبێ.

ـ کام قسەیەت مەبەستە گەورەم؟

ـ باسی دیلەکانی بەدر.

ـ ئێ بیرم هاتەوە قوربان، وابوو باسمان کرد، دەکرێ ئەم جارەیش باسی بکەیتەوە و بزانم لە کوێدا خوا پاڵپشتیی کردی؟

ـ باشە کوڕم! لە جەنگی بەدردا خوای گەورە ئێمەی سەرخست، جەنگ تەواو بوو، هەرکێ کوژرا، کوژرا؛ ئەوەی بە دیل گیرا، گیرا. پێغەمبەر لە مەڕ ئەو دیل و یەخسیرانە پرس و ڕاوێژی بە ئێمە کرد؛ چونکە تا ئەو کاتە هیچ دەقێکی قورئان لەو بارەوە دانەبەزیبوو. ئەبوو بەکر وتی: "قوربان ئەوانە هەموویان کوڕی هۆزی خۆمانن، خزم و کەسوکارن، من پێم باشە شتێکیان لێ وەربگرین و ئازادیان بکەین؛ ئەو پارەیەی کە وەریدەگرین، بەهێزمان دەکا و، بەڵکو ئەمە خوایە ئەوانیش دوایی هیدایەت وەربگرن و موسڵمان ببن و دوایی ببنە هاوکار و پاڵپشتی خۆمان!" پێغەمبەر پرسی بە منیش کرد، من وتم: "نا وەڵڵا، من ئەو بۆچوونەی ئەبوو بەکرم پێ باش نییە، من پێم باشە لەناویان بەرین، ئەوانە هەموویان کافرن و کەسی ئاسایی و هەژاریش نین؛ گەورە کافرن. من خۆم داوام لە پێغەمبەر کرد کە نزیکترین خزمی خۆمم پێ بدا بۆ ئەوەی لەناوی ببەم. عەقیلی کوڕی ئەبوو تالیب کە برای عەلی بوو، بیدا بە عەلی لەناوی ببا، بۆ ئەوەی کافرەکان بزانن کە دڵمان بە ئەندازەی سەرە دەرزیەکیش بۆ ئایینە کۆنەکە لێنادا.

پێغەمبەر تەشریفی بردە ناو خێوەتەکەی خۆی و، زۆری پێ نەچوو تەشریفی هێنایە دەرەوە، فەرمووی: "خودای مەزن دڵی هەندێ کەس وا نەرم دەکا، لە نەرمیش نەرمترە؛ دڵی هەندێ کەسیش وا توند دەکا، لە بەردیش توندترە. ئەی ئەبوو بەکر تۆ رێک وەکوو ئیبراهیم وای، (خودا باسی ئیبراهیم دەکا کە) دەیفەرموو: ﴿فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّيۖ وَمَنۡ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ إبراهیم: ٣٦ واتە: "سا هەرکەسێ شوێنی من کەوت، ئەوە ئەو کەسە لە خۆمە. هەرکەسێکیش لێم یاخی بوو، ئەوسا ئەتۆ خەتا بەخش و دلۆڤانی. وەک عیسا وای(خودا باسی عیسا دەکا کە دەیفەرموو ): ﴿إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ المائدة: ١١٨ واتە: "گەر بتەوێ ئازاریان بدەی، بەندەی خۆتن. گەر بیشتەوێ لێیان خۆشبی، خۆت دەزانی و هەر بۆ خۆتی کە دەستەڵاتت بە دەستە و لەکارزانی."

عومەریش رێک وەکوو نوحە(خوا دەفەرمووێ:) نوح دەیفەرموو: ﴿رَّبِّ لَا تَذَرۡ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ دَيَّارًا﴾ نوح: ٢٦ واتە: "خوایە! لەم سەر هەردە ئەو کەسانەی تۆ ناناسن جووقەواریان لێ مەهێڵە." وەکوو موسای(خودا باسی موسا دەکا کە) دەیفەرموو : ﴿رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾ یونس: ٨٨ واتە: "خودای گەورە! ماڵیان لێ تەرت و توونا بکە، دڵیان پتر رەق و رەش بکە با هەرگیز باوەڕ نەهێنن، هەتا جەزرەبەی زۆر بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. ئێوە(ئەی دیلەکان) ئێستە هەژار و ئاتاجن یان بە کڕینەوە رزگارتان دەبێ یان بە لەناو بردن!"

بۆ سبەینێ، چوومە خزمەتی پێغەمبەر، تەماشا دەکەم ئەو و ئەبوو بەکر هەردووکیان دەگرین. وتم: ئ"ەی پێغەمبەری خوا! ئەوە تۆ و هاوڕێکەت بۆ دەگرین؟ با بزانم مەسەلە چییە؟ ئەگەر گریانی دەوێ، با منیش بگریم. ئەگەر نا، با لەبەر ئەو گریانەی ئێوە خۆم بگریێنم!"

پێغەمبەر فەرمووی: "لە بەر ڕاو بۆچونی هاوڕێکانت دەگریم. ئەوان وتیان با ئەو دیلانە بە پارە ئازاد بکەین، ئەم شەو سزای ئەوانەم هەموو بینی- ئا لەو دارە نزیکترم بینی، خوای گەورە ئایەتی بۆ دابەزاندوم و فەرموویەتی: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ الأنفال: ٦٧، واتە: 'بۆ هیچ پێغەمبەرێک ڕەوا نییە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێک چاک پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا.'

- کەوابوو قسە قسەی تۆ دەرچوو و خوای گەورە پشتی ڕاکەی تۆی گرت؟

- بەڵێ وایە.

- ئەی چی وای لێ کردی کە بە پێچەوانەی ئەبوو بەکر ڕا دەر ببڕی؟

- من پێچەوانەی ئەبوو بەکر ڕام دەرنەبڕی، بە خوا ئەو پیاوێکی قسە ڕاست و ڕاساڵ بوو. دوای پێغەمبەران کەس وەک ئەو نییە. بەڵام شورا بۆیە هەیە. بۆ ئەوەی هەرکەس ڕای خۆی دەربڕێ، ڕاو بۆچونەکان بە بەڵگەوە هەڵبسەنگێنرێن. دوایی خاوەن بڕیار، ڕاکان بە سەر بکاتەوە و کامەیانی لە هەموویان بە باشتر زانی و لە فرمانی خوا زیاتر نزیک بوو، ئەوە پەسەند بکات و بڕیاری پێبدا. ئەو کەسەی ڕا دەردەبڕێ، بە بیروبۆچوون و تێڕوانینی خۆی شتەکان هەڵدەسەنگێنێ. ئەو کەسەیشی بڕیار بەدەستە، هەر وایە. من بۆیە ئەو ڕایەم هەبوو، چونکە دەمزانی خوای گەورە نەسەب و حەسەبی سەردەمی نەفامی بەلاوە هیچە، خزم و بنەماڵەی مرۆڤی موسڵمان، بیروباوەڕەکەیەتی. من دەترسام ئەو دیلانە، ئەو بڕیارە کە بە پارە ئازاد بکرێن، بەو جۆرە لێک بدەنەوە کە گوایە ئێمە هێشتا لە ئەوان دەترسین و لاوازین. من ویستم تێیانبگەیەنم کە ئێمە چاونەترسین، لە خوا بەولاوە لە هیچ شتێک ناترسین، ئێمە تەنیا ڕەچاوی بیروباوەڕ و دینداری دەکەین. من کوشتنی ئەوانەیشم بەو جۆرە پەسەند کرد کە هەرکەسە و خزمی نزیکی خۆی بکوژێ. جا هەرکەس ئەو حیسابە بۆ خەڵک بکا کە بۆ خۆیشی کردوویەتی، ئەوە ستەمی لەو خەڵکە نەکردووە.

- بەڵێ قوربان ئەمە دووەم، ئەی سێیەم چۆن بوو؟

- بەڵێ شتێک هەیە با بیڵێم.

- دە فەرموو قوربان، هەموو گیانم دەکەم بە گوێ بۆ بیستنی فرمایشەکانت.

- هاوڕایی سێیەم لە ئایەتی باڵاپۆشیدا بوو، یەکەم جار باڵاپۆشی واجب نەبوو. من پێم خۆش بوو کە پێغەمبەر فرمان بە خێزانەکانی خۆی و دوایی بە ئافرەتە موسڵمانەکان بکا بۆ ئەوەی باڵاپۆش بن. بە پێغەمبەرم وت: "قوربان! بە خێزانەکانت بفەرموو کە باڵاپۆش بن، ئەوان خەڵکانێکی باش و نیوە باش و تەنانەت جار جار خراپیش قسەیان لەگەڵدا دەکەن." ڕۆژێک دام بەلای خێزانەکانی پێغەمبەردا پێم وتن: "بە خوا! ئەگەر لە گوێم بکرێ، نابێ کەس چاوی بە ئێوە بکەوێ. ئەگەر ئێوە باڵا پۆش بن، ئەوە بۆ ئێوە گەورەییە، وەک چۆن مێردەکەتان لە هەموو پیاوێک گەورەتر و مەزنترە، ئاوایش ئێوە لە ژنانی تر گەورە و مەزنترن!" زەینەبی کچی جەحش وتی: "کوڕی خەتتاب! ئەوە تۆ غیرە لە ئێمە دەکەی؟! وەحی لە ماڵەکانی ئێمە دێتە خوارەوە!"

زۆری پێنەچوو ئایەتی باڵاپۆشی دابەزی. خوای گەورە باڵاپۆشیی لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر و هەموو ئافرەتە موسڵمانەکان فەرز کرد.

- کەوابوو هاوڕاییەکی تازە بوو، قوربان چی وای لێ کردی کە لەو بارەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەر و، تەنانەت لەتەک خێزانەکانی پێغەمبەریشدا بکەی؟

- کوڕی خۆم! پێش ئەوەی باڵاپۆشی فەرز بێ، من دەمزانی چەن سوودێکی گشتی تیایە؛ باڵاپۆشی پاسەوانی ناموسە، لابەری فەساد و بەدگومانییە. پیاوان بە چاوی ئارەزووەوە لە ژنان دەڕوانن، ئەوە سروشتی مرۆڤە. باڵاپۆشی تۆمەت و دڵ پیسکردن نییە لە ئافرەتان و بەخسیر کردنیان نییە، بەڵکو پارێزەری شکۆی ئافرەتە. خەڵک سەری مەنجەڵ چێشت دەگرێ بۆ ئەوەی مێشێکی تێ نەکەوێ، ئەی بۆ ئافرەت خۆی دانەپۆشێ بۆ ئەوەی پارێزراو بێ؟ ئەو نموونە زیاتر شتەکە لە دڵی

مرۆڤدا دەچەسپێنێ، ئەگینا ئافرەت زۆر لەوە مەزنترە، بەڵام خۆ دەشزانی سەرگرتنی چێشت بۆ پاراستن و مانەوەیەتی بە جوانی، خۆ بۆ خراپکردن و بەکەمزانینی چێشتەکە نییە؟

- بەڵێ قوربان وایە.

ـــ دواتـر، باڵاپۆشـی هۆکـاری دڵپـاکیی پیـاوان و ئافرەتـانی موسـڵمانە، ئـاوەدانکردنـەوەی دڵـەکانە بە خواپەرەستی، بۆیە خوا لە قورئانـدا دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ﴾ الأحزاب: ٥٣ واتە: "ئەو باڵا پۆشییە چاکتر و پاکترە بۆ ئێوە و ئەوانیش." لەوەش زیاتر، باڵاپۆشی ڕێز و حورمەتە، چ ئاکارێک لەوە بەرزتـرە کە مـرۆڤ شـکۆی خـۆی بپاریزێ؟ باڵاپۆشـی قەڵایە، ڕێگەگـرتنە لە شـەیتان. مـرۆڤ ئـاواتە خـوازی ئەو شـتانە نـابێ کە بـۆی ڕەوا نیـیە. باڵاپۆشـی پارێزەری شەرم و حەیای ئافرەتە؛ ئەو شەرم و حەیایەی کە سروشتی ئافرەتانە. ژن هەرچەند پێی خۆشە کە پیاوان خۆشیان بوێ، بەڵام حەز دەکا تەنیا لە دڵی یەک پیاودا بێ. ژن بەوە ڕازی نییە کە ببێتە وێستگەی حەز و ئارەزووی هەموو پیاوێک، تەنیا پێی خۆشە بۆ مێردەکەی بێت. زیاد لەوەش باڵاپۆشی پارێزەرە بـۆ پیـاوانیش، سروشتی پیاویش وایە کە بەرابەر شەرەف و نامووسـی خـۆی غیـرەی هەیە. ئەگەر بینیی وا خەریکە شەرەف و نامووسی بەر بـڤە و خەتەر دەکەوێ، غیـرەکەی تەواو هەڵدەچێ و زیاد دەکا، تەنانەتە ئەگەر بزانێ بـۆنی بـڤەش دێ، تەواو هەڵـدەچێ. خۆ ئەگەر ئافرەت ڕووت و دانەپۆشراو بن، ئەم دەرگایە هەروا بە کراوەیی دەمێنێت و بە باڵاپۆشی نەبێ، داناخرێ.

- ئەی قوربان ئەگەر وایە، بۆچی هەر لە سـەرەتاوە خـوای گەورە باڵاپۆشـیی فەرز نەکرد؟

ـ خوای گەورە بە سۆزە، بەرە بەرە و کەمە کەمە ئـایینەکەی بە سـەر خەڵکـدا فەرز دەکا. ئەم شەرعە هەمووی بە یەکجار و لە کتوپڕێکدا فەرز نەبووە. تۆ تەماشا

بکە، نوێژ، ڕۆژوو، حەج و زەکات هەمووی بە جارێ لەسەر خەڵک فەرز نەبووە.
ئێمە سیانزە ساڵ موسڵمان بووین ئەمجا ڕۆژوو فەرز کرا. خوای گەورە لەبەر ئەوەی
ئەوەندە بەسۆز و میهرەبانە، ئەو خواپەرەستییانەی کە خۆی پێی ڕازیە و لە
موسڵمانی دەوێ، هەموویانی بە جارێ فەرز نەکردووە. ئەو خواپەرەستیانەی کە
درەنگ فەرز کران، لەبەر ئەوە نییە کە بەلای خواوە گرنگ نین. هەموو شتێک بە
دەست خوایە، ئایین ئایینی خوایە، خەڵک هەموو بەندەی خوای گەورەن،
هەرشتێکی بوێ، لە هەرکاتێکدا خۆی بیەوێ، لەسەر بەندەکانی فەرز دەکا!

- باشە قوربان! ئەمە هاوڕایی چوارەم، هیی تریش هەیە، قوربان؟

- بەڵێ هەیە.

- دەی قوربان بۆم بڵێ! بە خوا قسەکانت ئەوەندە خۆش و لەبارن، مرۆڤ لێیان
بێزار نابێ. تا زیاتر بڵێی، زیاتر تامەزرۆ دەبم. کەم کەس هەن کە مرۆڤ حەز بکا
قسەکانیان درێژە پێبدەن و مرۆڤ لێی بێزار نەبێ؛ بە خوا تۆ یەکێکی لەو کەمانە.

- هاوڕایی پێنجەم لە بارەی خێزانەکانی پێغەمبەرەوە بوو.

- چی بوو گەورەم؟

- خێزانەکانی پێغەمبەر غیرەیان هەبوو، دەیانگوت: "بۆ ژنی خەڵکی ئاسایی
دەوڵەمەندن و زێڕ و زیوی زۆر و ماڵی خۆشیان هەیە و، ئێمە ژنی پێغەمبەری
خواین، کەچی لەوپەڕی هەژاریدا دەژیین؟ ناهەقیشیان نەبوو، ئەوان ژنی پێغەمبەری
خوا بوون، غیرەی پیاو لە ژن و، ژن لە پیاو خۆشە، وەک خوێی چێشت وایە، کەم
بێ چارەی دێ و چێشتەکە خراپ نابێ، بەڵام ئەگەر زۆر بوو، چێشتەکە کەڵکی
نامێنێ و هەمووی خەسار دەبێ. خێزانەکانی پێغەمبەر داوای ژیانی باشتر و
سامانی زۆرتریان دەکرد، پیغەمبەریش بەڕێزترین و دڵاوا ترین مرۆڤ بوو،
سەخیترین کەس بوو، بەڵام خۆت دەزانی ئەم چەپگەردی گەردونە هەرجارە و بە
بارێکدا دەسووڕێ و تا سەر بۆ کەس لەبار نییە، هەر وا بووە و هەر وایش دەبێ؛

تاوێ گەردوون ڕوو دەکاتە مرۆڤ و دوای مرۆڤ دەکەوێ و، تاوێکیش پشتی تێ دەکا و بە هیچ کەس ناگیرێ. ئەوان هەموویان بە جارێ ڕوویان کردە پێغەمبەر و داوای ژیان و خانوو و ماڵی باشتریان لێ کرد. ئەویش سوێندی خوارد مانگێک توخنی کەسیان نەکەوێ. لەناو خەڵکدا دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویەوە کە پێغەمبەر ژنەکانی خۆی تەڵاق داوە.

- دەی قوربان تەڵاقی دان؟

- نەخێر کوڕم، پەلە مەکە وا خەریکم ڕووداوەکەت بۆ دەگێڕمەوە.

- باشە قوربان بەسەر چاو.

- هەواڵ گەیشت بە من کە پێغەمبەرﷺ لە خێزانەکانی تووڕەیە و لێیان جیا بووەتەوە. ڕۆیشتم بۆلای خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ، هەموویان پێکەوە بوون، پێم وتن: "ئەگەر پێغەمبەرﷺ ئێوەی تەڵاق دا، هیوادارم ژنی لە ئێوە باشتر بێنێ!" ئەو قسەم کرد و بەجێم هێشتن، بەڵام زۆر پەشێو و دڵگران بووم، چونکە پێغەمبەر دڵگران بووبوو، بۆیە ڕۆیشتم بۆلای ئایشە، پێم وت: "کچی ئەبوو بەکر! ئەوە تۆ وات لێ هاتووە دڵی پێغەمبەری خوا بڕەنجێنی؟!"

ئەویش وتی: "ئەوە تۆ هەقت بەسەر منەوە چییە، کوڕی خەتتاب؟ ئەی بۆ نارۆی تەمێی کچەکەی خۆت بکەی؟!

- ڕۆیشتم بۆلای حەفصەی کچم، وتم: "حەفصە! ئەوە تۆ وات لێ هاتوە دڵی پێغەمبەری خوا بڕەنجێنی؟!"

حەفصە دەستی کرد بە گریانێک هەر مەپرسە...

وتم: "پێغەمبەری خوا لە کوێیە؟"

وتی: "ئا لەوێیە و نایەت بۆلای هیچکام لە ئێمە."

ڕۆیشتم و حەفسەم بەجێ هێشت، ویستم بڕۆم و کەمێک دڵنەوایی پێغەمبەر بدەمەوە، چاوم بە ڕەباحی خزمەتکاری پێغەمبەر کەوت، لە بەردەرگا وەستابوو.

پێم وت: "ریباح! برۆ داوا لە پێغەمبەر بکە با بیبینم."

ریباح تەماشایەکی ژورەکەی پێغەمبەری کرد و، پاشان تەماشایەکی منی کرد و هیچی نەگوت.

بۆ جاری دووەم وتم: "ریباح! برۆ داوا لە پێغەمبەر بکە با بیبینم."

ریباح تەماشایەکی ژورەکەی پێغەمبەری کرد و، پاشان تەماشایەکی منی کرد و هیچی نەگوت، ئیتر زانیم پێغەمبەر نایەوێ بمبینێ. بۆ جاری سێیەم بە دەنگی بەرز بە ریباحم وت: "برۆ داوا بکە با پێغەمبەر ببینم، من وا دەزانم پێغەمبەر وا دەزانێ لە بەر حەفصە هاتووم. بە خوا ئەگەر پێغەمبەر فرمان بکا و بڵێ حەفصە بکوژە دەیکوژم!"

ریباح بە هێما پێی وتم وەرە ژورەوە. ئیتر زانیم پێغەمبەر ڕازی بووە بچمە خزمەتی. ڕۆیشتمە خزمەت پێغەمبەر، لەسەر حەسیرێک ڕاکشابوو، جێی شووڵەکانی حەسیرەکە بە لەشی پێغەمبەرەوە دیار بوو، دەستم کرد بە گریان!

پێغەمبەر فەرمووی: "کوڕی خەتتاب بۆ دەگرییت؟"

وتم: "قوربان! پێغەمبەری خوا! چۆن نەگریم، جێ شووڵی حەسیرەکە بە سەر لەشتەوە کەوتووە و دیارە، ئەوەیش لە ژیانی قەیسەر و کیسرا لە چ ناز و نیعمەتێکدان؟!"

فەرمووی: "کوڕی خەتتاب! ڕازی نابی ئەوان دونیایان هەبێ و، ئێمە قیامەت؟!"

وتم: "بەرەوەڵلا."

ئیتر ئەوەندە قسەم بۆ کرد تا خەم و خەفەت بە ناوچاوانییەوە دیار نەما و، دەستی کرد بە زەردەخەنە. بە خوا کاتێ زەردە دەکەوتە سەر لێوانی، جوانترین کەس بوو!

دوایی لێم پرسی: "قوربان! من لە مزگەوت بیستوومە کە خێزانەکانت تەڵاق داوە، ئەوە ڕاستە؟"

فەرمووی: "نەخێر، تەنیا یەک مانگ ناچم بە لای هیچیاندا."

وتم: "قوربان! ئیزن دەدەی بە خەڵک بڵێم کە تەڵاقت نەداون؟"

فەرمووی: "کەیفی خۆتە."

هەڵسام، پێغەمبەرم بەجێهێشت و هاوارم کرد: "هۆ خەڵکینە! پێغەمبەر خێزانەکانی تەڵاق نەداوە." دوایی خوای گەورە ئایەتی ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ﴾ التحريم: ٥ ـەی ناردوە خوارەوە. واتە: "ئەگەر پێغەمبەر بڕیاری تەڵاقدانتان بدات، ئەوا دڵنیابن خوا لەجیاتی ئێوە، ژنانی باشتری پێ دەبەخشێت."

- قوربان خۆ تۆ پێشتر ئەوەت فەرمووە!

- دەی بەڵێ، خوای گەورە قسەکەی منی پەسەند کرد.

- بەڵام قوربان! من شتێکم زۆر پێ سەیرە!

- چی؟

- باشە خێزانەکانی پێغەمبەر لە هەموو ژنانی دونیا باشتر بوون، دایکی موسڵمانان بوون، ئیماندار و لەخواترس بوون، چۆن کارێکی لەو جۆرەیان کرد؟

- کوڕم! ژن ژنە! پیاویش پیاوە، هەرچەند پلەی ئیمانیشیان بەرەو سەر هەڵبکشێ، هەر ژن و پیاون. ئیمان سروشتی مرۆڤ پاک و خاوێن دەکاتەوە، خۆ لەناوی نابا، هەموو مرۆڤێک پێی خۆشە لە ژیانێکی خۆشدا بژی.

- بەڵام پێغەمبەر پێغەمبەری خوا بوو!

- بەڵێ زۆر ڕاستە پێغەمبەر پێغەمبەری خوا بوو. بە خوا ئەو ڕۆژە کە وتم: "ئەگەر بفەرمووی حەفصە بکوژە! دەیکوژم، درۆم نەکرد، بە ڕاستم بوو. بەڵام دەبێ لە سوچێکی ترەوە لە بابەتەکە بڕوانین.

- چۆن قوربان؟

- پێغەمبەر سەرمەشق و پێشەوای ئێمەیە، ئەوەی کە بە سەر ئەودا هات، وانەیەکە بۆ هەموومان، بۆ ژن و پیاو، خوا ویستی ئەوەمان بۆ دەربخا کە ژن هەمیشە چاوی لە ژیانی خۆش و زێڕ و سامانە. خۆ ئەگەر تاقە کەسێک لەو جۆرە ژنانە دووربایە، ئەوە پێغەمبەری خوا دەبوو. ئەو کات هەموو پیاوێک تێدەگا کە ژنەکەی ئەویش هەر داواکاریەکی گرانی هەبێ، بەلایەوە سەیر نەبێ، نە خێزانی ئەو دەگا بە خێزانەکانی پیغەمبەردا، نە خۆیشی دەگا بە پێغەمبەردا. خۆ ئەگەر ژنە هەڵبژاردەکان ئاوا بن، ئەوە سەیر نییە ژنانی تریش وا بن. خوای گەورە ژنانیشی تێگەیاند کە نابێ ئافرەت خۆی تەسلیمی غیرەی خۆی بکا. ئەگەر وابێ وەک ئەسپێکی چەمووشی[1] لێ دێت کە کەس نەتوانێ ڕایبێنێ و، تێدەگا غیرە پیاوی وای ئازارداوە کە پڕ بە زەوی و ئاسمانەکان لە پیاوەکەی ئەو باشتر بووە، ئیتر چۆن پیاوەکەی ئەم ئازار نادا؟! خوای گەورە ویستی ئەوەیشمان پێ بڵێ کە هەموو ماڵێک تەبایی و ناتەبایی تێ دەکەوێ. هەر لە سەرەتای دروست بوونی مرۆڤەوە وا بووە و هەر وایش دەبێ؛ ئەمە ژیانی هاوسەرێتیە، خۆشی تیایە، ترشی تیایە، ئەمەیش ئەگەر لە تام دەرنەچێ زۆر ئاساییە.

- بەڵێ قوربان ڕێک وایە، دەبێ لە سوچێکی ترەوە لە مەسەلەکە بڕوانین! ئەی قوربان ئێستە پێم بڵێ، زیاد لەمانە هیچ هاوڕاییەکی تر هەیە؟

- بەڵێ! دیسان هەیە.

- دەی قوربان بیفەرموو، گیان و دڵم لەلاتە.

- باشە! گوێ بگرە، من لەسەرەوەی شاری مەدینە پارچە زەوییەکم هەبوو، دەڕۆشتم سەرم لێ دەدا. لەسەرڕێگەکەمدا یانە و قوتابخانەی جوولەکە هەبوو، جار جار دادەنیشتم و گوێم لێ دەگرتن.

---

[1] چەمووش: ڕەوەک، سڵ، لەقەهاوێژ.

ڕۆژێکیان پێیان وتم: "عومەر! ئێمە تۆمان خۆش دەوێ و هیوامان پێتە ببیتە جوولەکە."

منیش وتم: "بە خوا! من لەبەر خۆشەویسی لای ئێوە دانانیشم، هەر پرسیارێکیشتان لێ بکەم، لەبەر ئەوە نییە کە شەک و گومانم لە ئایینەکەی خۆم هەبێ، من بۆیە گوێ لە ئێوە دەگرم، بۆ ئەوەی باشتر پێغەمبەرﷺ بناسم و بزانم لە کتێبە ئاسمانییەکەی ئێوەدا چۆن باسکراوە؟!"

دوایی پرسیارێکم لە بارەی جوبرەئیلەوە لێ کردن.

وتیان: "ئەوە دوژمنی ئێمەیە، نهێنییەکانی ئێمە بە موحەممەد دەڵێ و، هەرچی سزا وماڵکاولیشە هەمووی بە دەستی ئەوە!"

دوایی لە بارەی میکائیلەوە پرسیارم لەوان کرد.

وتیان: "ئەو هەرزانی و گوشادی و تەڕەساڵی و ئاوەدانی لەگەڵ خۆی دێنێ."

منیش وتم: "ئەی جوبریل و میکائیل پلەوپایەیان لای خوا چەندە؟"

وتیان: "نزیکترین پلەوپایەیان هەیە. جوبریل لای ڕاستی خوایە، میکائیلیش لای چەپی! میکائیل دوژمنی جوبرەئیلە."

منیش وتم: "دەی ئەگەر وابێ کە ئێوە دەیڵێن، ئەوان دوژمنی یەک بن، ئێوە لە کەر نەفامتر و کافرترن! هەرکەس دوژمنی یەکێکیان بێ، دوژمنی ئەویتریشیانە، هەرکەسیش دوژمنی ئەوان بێ دوژمنی خوایە."

دوایی وتم: "سوێند بە خوا! هەرکەس دوژمنی خوا و فریشتەکانی خوا و پێغەمبەرانی خوا و جوبرەئیل و میکائیل بێ، ئەوە خوا دوژمنی کافر و بێباوەڕانە."

دوایی گەڕامەوە خزمەت پێغەمبەر و، پێی وتم: "ئەی عومەر! خوا هاوڕای تۆیە و ئەم ئایەتەی بۆ ناردومەتە خوارەوە: ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾ البقرة: ٩٨ . واتە: 'هەرکەسێک دوژمنی خوا و فریشتەکانی خوا و پێغەمبەرانی و جوبرەئیل و میکائیل بێت(ئەوە بێ بڕوایە.) جا بێگومان خوایش دوژمنی بێ بڕوایانە.' "

دوای ئەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لەسەر ئایینەکەم مکوڕ و سوورتر دەبووم.

- پاک و بێگەردی بۆ خوا! ئەی قوربان! تۆیش وەک من لەو نەفامانە تێدەگەی؟ ئەگەر ئەوان دوژمنی جوبرەئیل بن، لەبەر ئەوەی کە سزای بە دەستە و تۆڵە لە خەڵک دەکاتەوە، کەواتە دوژمنی خودایشن، خۆ جوبرەئیل هیچ بێفرمانییەکی خوا ناکات، هەموو فرمانەکانی لە خواوە بۆ دێت!

ـــ ئەرەوەڵڵا. بە خوا! ئەوان لەوپەڕی نەفامیدان. پاشان کێ وتویەتی کە جوبرەئیل تەنیا کاولکاری و تۆڵەسەندنەوەی بەدەستە؟! جوبرەئیل فریشتەیەکی مەزنە و سەرکردەی هەموو فریشتەکانە. کاری یەکەمی ئەو ئەوەیە کە سرووش بۆ پێغەمبەران دەبا، ئەو بە فرمانی خوا دەڕوا بۆلای پێغەمبەران، پەیام و کتێب و شەرعی خوایان بۆ دەبا. پەیام و شەرعی خوا بەرچاوڕۆشنی و هیدایەتە بۆ خەڵک، بەو پەیام و هیدایەتە خوای گەورە ئەو خەڵکە لە چاڵی تاریکی دەهێنێتە دەرەوە و دەیانخاتە سەر ڕاستە ڕێگە و ڕۆشنایی، لە گومڕاییەوە بۆ هیدایە.. هەرچی سزا و تۆڵەیش هەبێ، ئەوە بە فرمانی خوا بووە. هەم جوبرەئیل و هەم فریشتەکانی تریش فەرمانبەری خوای مەزنن و گوێڕایەڵی ئەون، بە هیچ جۆرێک سەرپێچیی فرمانەکانی ناکەن، هەرچییەکیان پێ بفەرمووێ، یەکسەر جێبەجێی دەکەن. فرمان دەکا بە جوبرەئیل کە سرووش و نیگا بۆ پێغەمبەران ببا، ئەویش دەیبا، فرمانی پێدەکا کە سزا ببارێنێ؛ ئەویش دەیبارێنێ، بە هیچ جۆرێ بە قەد سەرەمویەک و لەوەش کەمتر لە سرووش و نیگا یان لە سزادان زیاد و کەم ناکا. ئەو کاتەی کە خوای گەورە فرمانی پێکرد سزای ئەو گوندانە بدا کە بەرابەر پێغەمبەر لوط وەستابوونەوە، هەموویانی سزا دا؛ حەوت گوند بوون، بە باڵێکی هەموویانی هەڵگرت و ئەوەندە بەرزی کردنەوە خەریک بوو لە ئاسمانی یەکەم بدەن. تەنانەت فریشتەکانی ئاسمانی یەکەم گوێیان لە وەڕەی سەگەکانی ئەو حەوت گوندە بوو، دوایی لەوێوە وەریگەڕاندن و بەرەو زەویی بەریدانەوە، ئەمە هەمووی بە فرمانی خوا

بـوو. میکاییـل کاربەدەسـتی بـاران بـارینە، ئەو بە فرمـانی خـوا بـاران دەبـارێنێ، بارانیش زۆر جار خێر و خۆشیی پێوەیە و کەم جارێکیش سزایە. یەک تـک بـاران لە هەرکوێ بدا، ئەوە بە فرمانی خوایە. هەرکوێ تووشی کەمبارانی و وشکە ساڵی ببێ، ئەوەیش بە فرمانی خوایە. هەر فریشتەیەک فرمانێکی تایبەتی هەیە: فریشتەی گیان کێشان فەرمانبەری گیان کێشانە، ئەوە کاری ئەوە و خوا بۆی دیاری کردووە؛ فریشتەیەک فرمانبەری ئاگرە، ئەوە کاری ئەوە و خوا بۆی دیـاری کـردووە؛ ڕیـزوان کاربەدەستی بەهەشتە، ئەمە کاری ئەوە و خوا بۆی دیـاری کـردووە. ئەو فریشـتانە هەموویان بەڕێزن، هەموویان فەرمانبەری خوای گەورەن، بە فرمانی خوا کار دەکەن، مالیک بە فرمانی خوا سزای جەهەنەمیەکان دەدا، ڕیزوان بە فرمـانی خـوا پاداشـی بەهەشتیەکان دەداتەوە، عیزرائیـل بە فرمـانی خـوا گیـانی خەڵـک دەکێشـێ. بەڵام جولەکە بەرابەر خوای گەورە بێڕێزن، بیروبۆچوونیان بۆگەنە. بێئەدەبـی و بێڕێـزی لەوە زیاتر چییە کە پێیـان وایە: فریشـتەیەک بەبـێ فرمـانی خـوا هەر لە خـۆیەوە شتێک دەکا؟!

- ڕەحمەتی خوات لێبێ، گەورەم! قسـەکانت مـرۆڤ دڵخـۆش دەکەن، وتەکانـت مرۆڤ تێدەگەیەنن، ئەی قوربان هیچ هاوڕاییەکی تر هەیە بۆم باس بکەی؟

- بەڵێ! دیسان هەیە.

- دەی فەرموو! ئەی ئەو کەسەی کەس لە قسـەت تێر نـابێ و کەس لە وتەت بێزار نابێ.

- ئەم جارەیان لەبارەی شەرابە. جارێک من و مەعازی کـوڕی جەبەل ڕۆشـتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و وتمان: "قوربان! لە بارەی شەرابەوە فەتوایەکمان بۆ بـدە. شەراب عەقل و بیر و هۆش لە ناو دەبا و سەروەت و سامان کەم دەکاتەوە."

ئیتـــر خـــوای گەورە ئـــایەتی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ﴾ البقرة: ٢١٩ ناردە خـوارەوە. واتە: "پرسیارت لـێ دەکـەن

دەربارەی عەرەق و قومار، پێیان بڵێ: 'لەو دووانەدا تاوان و گوناهێکی گەورە هەیە، هەر چەندە چەند سوودێکیشان تێدایە بۆ خەڵکانێک."

من دڵم بەوە تێراو نەبوو کە خوای گەورە تەنها بە خراپە ناوی ببا و حەرامی نەکا.

وتم: "خوایە لە بارەی شەرابەوە ئایەتێکمان بۆ بنێرە کە بە تەواوی ڕوونکەرەوە بێ."

زۆری پێنەچوو خوای گەورە ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ﴾ النساء: ٤٣ نارده خوارەوە. واتە: "ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! لە کاتێکدا ئێوە سەرخۆشن، نزیکی نوێژ مەکەون، هەتا ئاسەواری سەرخۆشی نامێنێت و دەزانن چی دەڵێن(لە نوێژەکەدا.)"

دیسان دڵم بەوەش تێری نەخواردەوە و وتم: "خوایە لە بارەی شەرابەوە ئایەتێکمان بۆ بنێرە کە بە تەواوی ڕوونکەرەوە بێ."

زۆری پێنەچوو خوای گەورە ئایەتی ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ المائدة: ٩١ نارده خوارەوە. واتە: "بێگومان شەیتان هەر ئەوەی ئەوێ کە بە هۆی ئارەق و قومارەوە دوژمنایەتی و کینە و ڕق بخاتە ناوتانەوە و، بەرگریتان بکات لە یاد و باسی خوا و لە نوێژکردن. دەی ئایا ئێوە واز دەهێنن(لەو خراپانە)."

ئیتر منیش زۆر سپاسی خوام کرد بۆ ناردنی ئەو ئایەتە.

- باشە قوربان بۆچی خوا هەر یەکەم جار شەرابی حەرام نەکرد؟

- ئەگەر خوای گەورە کتوپڕ حەرامی بکردایە، ئەوە وەک سزایەک بوو بۆ ئەو خەڵکە. خوا خۆی باشتر بەندەکانی خۆی دەناسێ؛ خوا بەسۆزە، بەرە بەرە و کەم کەم حەرامی کرد. کاتێ کە ئایینی ئیسلام هات، هەموو خەڵک ئالوودەی بادە و شەراب بووبوون، بەیانی و ئێوارە دەیانخواردەوە، لە کارزانی خوای گەورە وا بوو

کە سەرەتایەکی بۆ دابنێت و، خاڵی دەسپێک دیاری بکات و چارەسەری کارەکە بکا!

- چۆن قوربان؟

- چارەسەر دەبێ یەکەم جار لە ڕووی نەفسیەوە دەست پێ بکا. یەکەم جار خوای گەورە بادەی حەرام نەکرد، لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا، خوای گەورە باسی بادەی نەکردە بنێشتە خۆشەی دەمی خەڵک. خوای گەورە یەکەم جار ویستی بیروباوەڕی خەڵک چارەسەر بکا، بانگیان بکا بۆ یەکتاپەرەستی. دوای ئەوەی کە خۆشەویسیی خوا دەبێتە گەورەترین شت بەلای باوەڕدارانەوە، ئەو کاتە شەراب هەر هیچ نییە و مەسەلەیەکە کە شایانی باسکردن نەبێ. خوای گەورە کەمە کەمە شتەکەی حەرام کرد و، خەڵکیش هەموو بەدەم فرمانەکەی خواوە هاتن. خەڵک نەک هەر وازیان لە خواردنەوەی شەراب هێنا، بەڵکو بوو بە شتێکی قیزەون، ڕقیان لە شەرابخۆر و مەیفرۆش و مەیدروستکردن و مەیدروستکەر و هەرشتێکیش کە پەیوەندیی بە شەرابەوە بێت، دەهات!

- کەوابوو وردە وردە و کەمە کەمە بۆ کارێک ڕۆشتن، ئەوە سوننەتێکی خواییە؟

- بەڵێ وایە، ئەم سوننەتە دەبێ لە بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵک و سیاسەت و بەکارخستنی بڕیارەکانی شەرع و یاسا و ڕێسای ژیاندا ڕەچاو بکرێ. دەبێ بزانین کە ئەمانە بە سەرە قەڵەمێک چارەسەر نابن، یان بە فرمانێکی سەرۆکایەتی و پادشایی چارەسەر نابن، ئەمانە کەم کەم و لەسەرەخۆ چارەسەر دەبن. یانی دەبێ نەخشە ڕێژییان بۆ بکرێ و بیروڕای بۆ بخرێتە کار و، تێکۆشان و هەوڵدانیان بۆ بکرێت. ئەگەر بمانەوێ دەستی خەڵک بگرین و بەرەو خوایان بەرین، دەبێ یەکەم جار فێری یەکتاپەرەستییان بکەین، بیروباوەڕیان چارەسەر بکەین. ئەگەر ئیمان لە دڵیاندا جێگر بوو، ئەو کات قۆناغی دووەم دێتە پێشەوە، ئەوەیش بریتیە لەوەی کە گیان و نەفسی خۆیان بەوە ڕابهێنن کە بڕیارە شەرعیەکان وەربگرن و لێیان بێزار

نەبن. پلە پلە دەست پێدەکەین، لە سەرەتادا بە کەمیش ڕازی دەبین، کەم کەم کامڵ و تەواویان دەکەین. هەرچی کون و قوژبنی ئایین هەیە هەر هەمووی فێر دەکەین. نابێ خۆمان چیمان پێ خۆشە، ئەوەی پێ بڵێین و ئەوانی تر ڕەچاو نەکەین. ئیسلام یەکپارچەیە و لەت لەت نابێ، بەڵام ئەمە قۆناغبەندی و نەخشەسازی و پلەبەندیە!

- قسەیەکی زۆر جوانە قوربان! بەڵام پێم بڵێ بۆ تۆ لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەوەدا بووی شەراب حەرام بکرێ؟

- ئەی چۆن لەگەڵ حەرامبوونیدا نەبم؟! هەرچۆن بێ، من هەر پێم وا بوو کە خوا شەراب حەرام دەکا، لە بەر ئەو هۆکارەی کە دوایی پێی حەرام کرد.

- ئەو هۆکارە چی بوو؟

- یەکەم: بادە کەمئاوەزی و بێعەقڵی پێوەیە. عەقڵ یەکەم هۆکاری ئەوەیە کە خوای گەورە داواکاریی لە مرۆڤەکان هەیە. ئەوەتا داوا لە ئاژەڵ و گیاندارانی تر ناکا، چونکە عەقڵ و ئاوەزیان نییە. هەرکەسیش بە قەزا و قەدەری خوا عەقڵی لەسەر خۆی نەبێ، بۆ نموونە شێت بێ، ئەوە خوای گەورە هیچ داوایەکی لێ نەکردووە، کەوابێ شێت هەرشتێک بکا، ئازادە و هیچ تاوانێکی بۆ نانووسرێ. شێت یەک خواپەرستی لەسەر واجب نەکراوە، چونکە هۆکاری ئەمانە هەمووی ئاوەزە. کەوابوو مرۆڤ بە هۆی ئاوەزەوە لە ئاژەڵانی تر جیاوازە و لەوان بەڕێزترە. دەی بادەنۆشی هەوڵدانێکە بۆ ئەوەی مرۆڤ خۆی بە دەستی خۆی ئەو شتە لە دەست بدا کە بووەتە مایەی ڕێز و کەرامەتی، خۆی لە قاڵبی مرۆڤبوون دەباتە دەر!

- قوربان! ئەمە مانای وانییە کە مرۆڤ ئا لەو چەند ساتەی کە سەرخۆشە، هیچی لەسەر واجب نەبێ؟

- نەخێر هەرگیز! کێ وای وتوە؟

- ئەی قوربان تۆ نەتفەرموو: "هەرکێ عەقڵی نەبێ، هیچی لەسەر واجب نییە و، خوا تەکلیفی لێ ناکا؟"

- بەڵێ ئەمە دروستە، بەڵام من مەبەستم لەو کەسانە کە عەقڵ و ئاوەزیان نییە، ئەوانەیە کە نییانە نەک ئەوانەی کە خۆیان بە دەستی خۆیان، خۆیان بێ ئاوەز دەکەن و ئاوەز لە خۆیان دەتۆرێنن؛ ئەوانە ڕێک وەک مرۆڤی بە ئاوەز لێپرسینەوەیان لێ دەکرێ. ئەگەر لە کاتی سەرخۆشیدا کاریکی خراپ ئەنجام بدەن، بەرپرسن لەو کارە. بۆ نموونە ئەگەر سەرخۆشێک کەسێکی کوشت، دەبێ لەباتی ئەو کەسەدا بکوژرێتەوە. ئەگەر بە سەرخۆشی دزیی کرد، دەبێ دەستی ببڕنەوە، دوایش دەبێ سزای سەرخۆشییەکان بچێژن.

- تێگەشتم قوربان! ئەی باشە هیچ هۆکاریتر هەیە بۆ حەرامبوونی شەراب؟

- ئەو تاکە هۆکارە بەسە بۆ حەرام بوونی، بەڵام هۆکاری تریش هەیە. بادەنۆشی جگە لەوەی کە مرۆڤ بێئاوەز دەکا، سامانیش لە ناو دەبا و بە فیڕۆی دەدا. شەرعیش بۆیە هاتووە، بۆ پارێزکاریی لە گیان و ماڵ و دارایی و چەند مەبەستێکی تر، بادە نۆشی گیان و ماڵ لە ناو دەبا.

- ئەی ئەگەر پیاو دەوڵەمەن بێ، ئەوکات چی؟ ئەو هۆکارە هەر دەمێنێ؟

- بەڵێ! مەبەست لە ماڵ بەفیڕۆدان ئەوە نییە کە مرۆڤ بکەوێتە سەر ساجی عەلی، بەڵکو مەبەست لە فیڕۆدانی ماڵ ئەوەیە کە بە جۆرێک خەرج بکرێ کە شیاو نەبێ. لەوە خرابتر چییە کە مرۆڤ ماڵ و سامانی خۆی لە ڕێگەی حەرامدا دابنێ؟ زیاد لەوەش ئایا دەوڵەمەنی دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەو کەسەی بادە دەنۆشێ، عەقڵی لەسەر خۆی بمێنێ و سەرخۆش نەبێ؟! ئەمە هۆکاری یەکەم بوو.

- ئەی ئەگەر مرۆڤ ئەوەندە بخواتەوە کە سەرخۆشی نەکا، چی؟

- هەرشتێ زۆرەکەی مرۆڤی سەرخۆش کرد، کەمەکەیشی حەرامە. حەرامبوونی بادە تەنها بە لەدەسدانی ئاوەزەوە نەبەسراوەتەوە، بەڵکو ئەوە یەکێکە لە هۆکارەکان. خۆ ئەگەر ئەو هۆکارەمان نەهێشت کە ئێمە پێمان وایە لەبەر ئەوە حەرام کراوە،

دیسان حەرام هەر حەرامە، ئەم بڕیارە بڕیارێکی شەرعیە و بڕیاری خوایە، خوا خۆی نەبێ، کەس ناتوانێ بڕیاری حەلاڵبوونی بادە بدا. خۆ شەرعیش تازە ئیتر دانابەزێ، چونکە پێغەمبەرایەتی کۆتاییی هات.

- ئەی قوربان! هۆکاری تر هەیە بۆ حەرامبوونی شەراب؟

— ئەیچۆن! ئەگەر هۆکارت بۆ باس بکەم، ئەمڕۆ لێ نابمەوە، بەڵام یەک هۆکاریترت بۆ باس دەکەم: ئەوەیش پاراستنی شکۆ و کەرامەتی ماڵ و خێزانە. پیاو چاودێر و لێپرسراوی ماڵە. ژنیش لە ماڵی خۆیدا لێپرسراو و چاودێرە. ئەمە بەرپرسییەکە لە ئەستۆی ژن و پیاودایە. خۆسەرخۆشکردن ڕاکردنە لە بەرپرسیارێتی. ئەو پیاوەی کە خوا داوای لێکردووە نازی ژنەکەی هەڵگرێ و لەگەڵ منداڵەکانیدا بەسۆز بێ و گوێڕایەڵی دایک و باوکی بێ، ئەمە چۆن لە کاتی سەرخۆشیدا ئەمانەی پێ دەکرێ؟ نەک ئەوە ناکرێ، بەڵکو سەرخۆش زۆر جار دژی ئەمانە دەکا و، تەنانەت خوێنڕێژی و تاوانی گەورە گەورە دەکا.

- هیچی تر هەیە قوربان؟

- مەبەستت لە شەرابە؟

- نە قوربان! مەبەستم هاوڕاییی خودایە لە تەک تۆدا.

- بەڵێ، دیسان هەیە.

- دەی قوربان بۆم باس بکە.

- هاوڕاییی ئەم جارە لە بارەی دووڕووەکانە.

- چۆن؟

— دوای ئەوەی عەبدوڵلای کوڕی سەلوول سەرگەورەی دووڕووەکان مرد، عەبدوڵلای کوڕی هات بۆلای پێغەمبەر- عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سەلول موسڵمان بوو، موسڵمانێکی باشیش بوو، - داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە کراسەکەی بەری خۆی بدا بەو بۆ ئەوەی بیکا بە کفن بۆ باوکی. پێغەمبەریش پێیدا. دوایی داوای لە پێغەمبەر ﷺ کرد نوێژی مردوو لەسەر باوکی بکا. پێغەمبەر ﷺ هەستا

بڕوا نوێژی لەسەر بکا، منیش هەستام و چاکی پێغەمبەرم گرت، وتم: "قوربان! نوێژ لەسەر کێ دەکەی؟ ئەی خوا نەیفەرمووە نوێژی لەسەر مەکە؟"

فەرمووی: "نەخێر، نەیفەرمووە مەیکە، سەرپشکی کردم. خوا فەرموویەتی: ﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾ التوبة: ٨٠ یانی: 'ئەی پێغەمبەر! داوای لێخۆش بوون بۆ ئەو دووڕووانە بکەیت یان داوای لێخۆش بوونیان بۆ نەکەیت، وەک یەکە. تەنانەت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەیت، ئەوە خوا هەرگیز لێیان خۆش نابێت.'

من لە حەفتار جار زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەم."

منیش وتم: "چۆن نوێژی لەسەر دەکەی؟ ئەها فلان ڕۆژ ئاوای وت و ئاوای وت، دانە دانە قسەکانی ئەوم بیر پێغەمبەرﷺ دەهێنایەوە."

فەرمووی: "عومەر! وازبێنە."

دوایی پێغەمبەر تەشریفی برد و نوێژی لەسەر عەبدوڵلا کرد، زۆری پێنەچوو خوای گەورە ئایەتی ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَٰسِقُونَ﴾ التوبة: ٨٤ دابەزاندە خوارەوە. یانی: "ئەی پێغەمبەر! هەر کام لەو دووڕووانە مردن، هەرگیز نوێژیان لەسەر مەکە، لەگەڵ جەنازەکەیدا مەڕۆ و لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە، بێگومان ئەوانە کافرن بە خودا و بە پێغەمبەری خودا، بەبێ باوەڕی و بە فاسقی دەمرن، چونکە دەرگای ئیمانهێنانیان لە خۆیان داخستوە."

- کەوابێ ئەم دەقە بوو کە نوێژکردن لەسەر دووڕووەکانی حەرام کرد؟

- بەڵێ.

- ئەی تۆ چۆن بە پێغەمبەرت وت: "قوربان نوێژ لەسەر کێ دەکەی؟ ئەی خوا نەیفەرموە نوێژی لەسەر مەکە؟"

ـ ئەوە مـن ڕاوبۆچونێـک بـوو کە لە ئـایەتی ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ ئاوا تێگەشتبووم، من وام دەزانی ئەو ئایەتە نـوێژکردنی لەسـەر دووڕووەکـان حەرام کردووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "خـوا سەرپشـکی کـردووم، حەرامـی نەکـردووە." پێغەمبەرﷺ بەسـۆزترین مـرۆڤ بـوو، بە ئەنـدازەی سـەرە دەزوویەک شـتی شـک ببردایە بۆ تەبایی و خۆشەویسی، بەکاری دەهێنا و درێغـی نەدەکـرد، ئەو بەردەوام وابوو.

ـ ئەی ئیتر قوربان هیچ هاوڕاییەکی تر هەیە؟

ـ ئەوە هەمووی بوو، گشتیم بۆ باس کردی.

ـ لە چیرۆکی ئیسلام بوونت، ئەوەی کە پێشتر بۆ منت باس کرد، شتێکم بەلاوە سەیرە، ئەویش هەڵوێستی فاتمەی خوشکتە، پێشتریش هەڵوێستی دایکی عەبـدوڵلام بەلاوە سەیر بوو، ئەو کاتەی کە دەیویست کۆچ بکات، ئەویش وەک فـاتمە وەڵامـی دایتەوە، بێ پەروا، سوور و سـاف، بـێ هـیچ دڕدۆنگـی و تـرس و لەرزێـک. لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمە ئەگەر تەماشای ئەو سەردەمەی ئیسلام بکەین، دەزانین بانگەشە بـۆ ئیسلام هێشتا بە نهێنی بوو. حاڵی ژنانیش دەزانین، ئەوان بەردەوام پلەیەک خـوار پیاوان بوون. قوربان تۆ پێت وایە ئەو زیرەکی و چاونەترسیە پەیوەندی بە ئیمانەوە هەبێت؟ یان هەر پەیوەندی بە سروشتی خۆیانەوە بوو؟

ـ بێگومان ئیمـان سـەرچاوەی هێـزە، چـونکە بـاوەڕ و دڵنیـایی بە مـرۆڤ دەدا، لەوەش بێگومان بە کە سروشـتیش دەوری خـۆی هەیە و مرۆڤەکـان بە سروشـت لە یەکتر جیاواز دەبن، بەڵام ئەگەر ئێمە بێـین و بە تـایبەت باسـی ئـافرەت بکەیـن، ئەوە بێگومان ئافرەت لە پیاو سۆزدارترە، ئەم سۆزدارییە هەرچەند زۆر کات خـاڵی لاوازی ئافرەتە، بەڵام ئا لەم کاتانەدا خـاڵی بەهێـزییە، چـونکە سـەرچاوەی ئیمـان دڵە، ئیمـانیش یەکـێکە لە بەهێزتـرین ئەو سـۆز و عاتیفـانەی کە لە مرۆڤـدا خـۆی دەنوێنێ. جا ئەو مـرۆڤە ژن بـێ یـان پیـاو، بەڵام لەم بـابەتەدا زۆر جـار ئـافرەت

لەسەرەوەی پیاویشە. ئەم قسەی تۆ شتێکی بیر خستمەوە، باسی کەنیزەکەی بەنی موئمیل، من لە سەردەمی نەفامیدا پێش ئەوەی خوا هیدایەتم بدا بۆ سەر ئەم ئایینە پاکە، ئازاری ئەو ئافرەتە بەڕێزە خاوەن شکۆیەم دەدا، بەردەوام لێم دەدا. ئەویش بە ئەندازەی سەرە موویەک لە ئیمان و بیروباوەڕی خۆی پاشگەز نەبووەوە، من ئەوەندەم لێدەدا، ماندوو دەبووم. پێم دەوت: "ئیتر ماندوو بووم ناتوانم، ئەگەر ماندوو نەبام هەر لێم دەدای." ئەویش لەو ئیمانەی خۆی ماندوو نەدەبوو، وازی لێ نەدەهێنا، بەڵکو سوورتر دەبوو، من لەو کاتانەدا وام دەزانی خاوەن هێز و سام و هەیبەت و شکۆم. بە خوا ئێستە دەزانم چەن لاواز بووم، ئێستە دەزانم ئەو ئافرەتە چەن بەهێز و چاونەترس بوو. ئەگەر موسلمان نەبووبام، نەمدەزانی بەرانبەر ئەو ئافرەتە من دۆڕاو بووم و، هەروام دەزانی بەهێز و دلێر خۆم بووم. ئەبوو جەهلیش وابوو، ئەو سومەیەی دایکی عەمماری لەسەر دینداری کوشت. دوایی وای دەزانی سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، سومەیە بەو کوژرانە بە ڕوو سووری بەرەو ئەو دونیا کەوتەڕێ، ئەو یەکەم شەهید بوو لە ئیسلامدا، ئەبوو جەهلیش بە ڕووڕەشی و زەرەرەوە دونیای جێ هێشت. ئەوەتا نازناوی ئەبوو جەهلی بە سەردا دابڕا، یانی سەرچاوە و باوکی نەفامی و نەزانی. ئەو کەسەی بڕوا بە خوا دەهێنێ و موسڵمان دەبێ، دەزانێ کە مردن لە ڕێگەی بەرنامەی خوادا دۆڕان و شکست نییە، بەڵکو سەرکەوتنە. ئەو کەسەیش کە تاریکبینە و لەگەڵ تیشکی خۆردا شەڕ دەکا، ئەوە تەواو لەناو گومڕایی و تاریکیدا سەرخۆش بووە، نازانێ بەری خۆر بە بێژنگ ناگیرێت، نازانێ ڕۆشنایی لەناو ناچێ، نازانێ ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن بەرەو ژیانێکی هەتا هەتایی دەڕۆن. بەڵێ فاتمەی خوشکم توانی بەرەو ڕووی من بووەستێتەوە، منێک کە بە توڕە و توندوتیژ و بوێر ناوبانگم بوو، منێک کە کەس پێی نەدەوێرام، بەڵام فاتمە دەیزانی کە لەسەر هەقە. ئەگەر مرۆڤیش گەشتە ئەم بیروبڕوایە و خۆی بە هەق زانی، تازە ئیتر بڕوای بە هێز و توانای خۆی هەیە،

بڕوای بەوە هەیە کە دەتوانێ بەرابەر هەموو نەهامەتیەک بووەستێتەوە، هەمیشە ئەو ئاواتەیشی هەیە کە بتوانێ دەستی ئەو کەسانە بگرێ کە لە دەریای نەفامیدا خەریکە دەخنکێن؛ ئاواتی ئەوەی هەیە لەو دەریایە ڕزگاریان بکا و بیانهێنێ بۆ لێواری بیروبڕوا و ئیمانهێنان. کوڕم! هێزی ئافرەت لەنێو دڵیدایە، دڵیش چاوگەی ئیمان و باوەڕە.

ـ کەوابوو ڕۆڵی ژنان لە ئیسلامدا، لە ڕۆڵی پیاوان کەمتر نەبووە و، بگرە جارجاریش زیاتر بووە؟

ـ با یەک نموونەت بۆ باس بکەم، یەکەم کەس کە ئیمانی بە پێغەمبەر هێنا ژن بوو. هەر کە پێغەمبەر ﷺ باسی پیغەمبەرایەتی خۆی بۆ کرد، هیچ دڕدۆنگی و دوودڵیەک ڕووی تێ نەکرد و ئیمانی پێ هێنا، ئەو یەکسەر بڕوای بە قورئان هێنا. جیاوازیی کلتوری خێلایەتی و عەرەبی ئەو سەردەمە لەگەڵ قورئاندا نەبوونە لەمپەر لە بەرابەر بڕواهێنانی. ئەوە لەم کاتەدا دڵ بڕیاردەرە، دڵی بڕیاری داو وتی: "أشهد أن لااله الا الله و أن محمدا رسول الله." بەڵێ خاتوو خەدیجە بێ دوودڵی خۆی لە ئیسلامدا دیەوە. بە عەقڵ، بە پارە، بە دڵ لە پێناوی خوادا و بۆسەرکەوتنی ئایین جەنگا. بەبێ دوودڵی بووە پشتیوانی پێغەمبەری خوا، هیچ کات دوودڵی ڕووی تێنەکرد. پێش ئەوەی پێغەمبەر بفەرمووێ بووم بە پیغەمبەر، ئەو ئیمانی پێ هێنا، ئەو وەک ژن و هاوسەر، وەک خۆشەویسێک، وەک هاوڕێ، ئیمانی بە پێغەمبەر هێنا. دوای ئەوەی کە پێغەمبەریش فەرمووی: "لە لایەن خوداوە سروشم بۆ هاتوە،" یەکسەر وتی: "مزگێنی ئەی کوڕە مام! خوا ڕاوەستاوت بکا. بەو کەسەی گیانی خەدیجەی بەدەستە! هیوام وایە تۆ پێغەمبەری ئەم ئوممەتە بی." دەی ئیتر کەس گومانی هەیە کە ژن بەشێکی دانەبڕاوی کۆڵەکەی بانگەشەیە؟ خەدیجە چاوەڕێی نەکرد تا پیغەمبەر دەفەرمووێ من بووم بە پێغەمبەر، پێش ئەوەی ئەو بفەرمووێت، خەدیجە ئیمانی پێهێنا، بە شوێن بەڵگەدا نەگەڕا، بەبێ هیچ ڕامان و دواکەوتنێک

بوو بە یەکەم ئافرەت کە بڕوای بە پێغەمبەر هێنابێ. ئەو هەر لە سەرەتاوە دڵی بووبووە نیشتمانی بیروبڕوای پتەو، دڵی بووە نیشتمانێک بۆ پێغەمبەر، بۆیە دووبارەی دەکەمەوە و دەڵێم: دڵەکان یەکەم هەوارگەی ئیمانن، ئەو هەوارگانە دەبنە پتەویی بیروباوەڕ و خۆڕاگری. بۆیەیش خوای گەورە پێش ئەوەی عەقڵ و ئاوەز بدوێنێ، دڵەکان دەدوێنێ. ئەوەتا خوا لە بارەی کافرانەوە دەفەرمووێ: ﴿لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا﴾ الأعراف: ١٧٩ واتە: "دڵیان هەیە و پێی تێناگەن." دیسان دەفەرمووێ: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ الحج: ٤٦ واتە: "لە ڕاستیدا چاوان کوێر نابن، ئەو دڵانە کوێر دەبن کە لەناو سینەکاندان."

مرۆڤ بە دڵ عەقڵ وەردەگرێ و تێدەگا، دڵ پێویستە بینەر بێ بۆ ئەوەی تێبگا و عەقڵ وەربگرێ. پێویستی بە نوور و ڕۆشنایی هەیە بۆ ئەوەی ببینێ، لە هەر شوێن و جێگایەک ئیمان و باوەڕ هەبوو نوور و ڕۆشناییش هەیە. خەدیجە دایکی ژنە ئیماندارەکانە، ئەو ژنانەی کە گیان و ژیانی خۆیان کردە گۆڕی[1] و درێخییان لە هیچ هەوڵ و تێکۆشانێک نەکرد لە پێناو ئەو نوور و ڕۆشناییەی کە خوا خستیە دڵیانەوە، بەڵکو ئافرەت و ژنی وا هەبوو پەلەپەلی بوو بۆ ئەوەی بگاتە ئیسلام، کۆچ بکا. سوور بوون لەسەر ئەوەی کە لە ڕیزی پێشەوەی ئیمانداران بن، پێشبڕکێیان بوو بۆ گەشتن بەو ڕێز و کەرامەتە. ئەسمای کچی عەمیسیش یەک بوو لەو ئافرەتانە، ڕۆژێ چووم بۆلای حەفصەی کچم، ژنێک لەوێ بوو، وتم: "ئەوە کێیە؟"

حەفصە وتی: "ئەسمای کچی عەمیسە."

وتم: "ئەسمای حەبەشی دەریایی."

ئەسما خۆی وەڵامی دایەوە و وتی: "بەڵێ."

---

١ گۆڕی: فیدا

بە ئەسمام وت: "ئێمە پێش ئێوە کۆچمان کرد، کەوابوو ئێمە لە پێغەمبەر نزیکترین."

ئەسما تورە بوو وتی: "نا، بە خوا وانییە. ئێوە لای پێغەمبەرﷺ بوون، هەرکامتان برسی بووایە تێری دەکرد، نازی دەکێشان، بەڵام ئێمە ئاوارە و دوورە وڵات، دەربەدەر و ئازارکێش، ئەوەیش تەنیا لەبەر خوا و پێغەمبەری خوا. بە خوا! نە تامی ئاو دەکەم، نە تامی نان تا ئەو قسەیەت بۆ پێغەمبەرﷺ نەگێڕمەوە، ئێمە ئازار دەدراین، دەترسێنراین، ئەوەیش بۆ پێغەمبەرﷺ باس دەکەم، لێی دەپرسم. بە خوا هیچ شتێ زیاد ناکەم و درۆیش ناکەم، چیمان بەسەر هاتووە ڕێک ئەوەی بۆ دەگێڕمەوە."

ئەسما ڕۆشت بۆلای پێغەمبەرﷺ و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا! عومەر ئاواو و ئاوای وتووە."

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "عومەر لە ئێوە نزیکتر لە منەوە نییە، عومەر و هاوڕێنەکانی عومەر یەک کۆچیان کردووە، بەڵام ئێوەی ئەهلی کەشتی دوو کۆچتان کردووە!"

جا ئەم سووربوون و مکوڕبوونەی ئەسما لەسەر ئایین، وای لێکرد کە بچێتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و ئەم بابەتە ئاوا ڕوون بکاتەوە.

خۆی بخزێنێتە ڕیزی پێشەوەی بڕواداران. ئەو هیممەتە بەرزو بڵندە، ئەو گیانە پایەبەرزەی کە هیچ کات دونیای بەلاوە مەبەست نەبوو، ئەو مشتومڕەشی بۆ بەدەستهێنانی سەروەت و سامان و دەسەڵات نەبوو، بەڵکو مەبەستی سەرەکیی ئەوە بوو لە خوا و پێغەمبەری خواوە نزیک بێ.

- ئەی قوربان! ئەم مشتومڕەی نێوان تۆ و ئەسما نەبووە هۆی دڵتۆرانتان لە یەکتری؟

- کورە ئەوە تۆ چی دەڵێی ڕۆڵە؟! ئەسما ئافرەتێکی خاوەن زانست و ئیمان و بەڕێز بوو، ئەو مشتومڕەی لە خۆشەویسیی خوا و پیغەمبەرەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەی ئیتر من چۆن دڵم لە کەسێک بتۆرێ کە ئەوەندە خوا و پیغەمبەری خۆش بووێ؟ بەتایبەت ئەسما، ئەو ئەسمایەی کە پێغەمبەر شایەتیی گەورەیی و بەڕێزی و دینداریی بۆ دابێت.

- قوربان ئەم فەرمایشانەی جەنابت وای لێکردم کە حەز بکەم لە بارەی ڕۆڵی ئافرەتانەوە زیاتر بزانم. باسی ئەو ئافرەتانەیشم بۆ بکە کە لە سەردەمی خەلیفایەتی تۆدا ڕۆڵی گەورە و گرنگیان بینیوە و تۆیش هەڵوێستت چۆن بووە لەگەڵیان؟

- ڕۆژێک لەگەڵ جارودی عەبدی لە دەرەوەی مزگەوت بووم، دامان بەلای پیرەژنێکدا و، سڵاوم لێ کرد و وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە.

دوایی وتی: "هەیهوو عومەر هەیهوو! ڕۆژ ڕۆژی تۆیە! لە بیرتە لە بازاڕی عوکازدا گۆچانێکت پێ بوو مەڕت دەلەوەڕاند و پێیان دەوتی: "هۆمەر؟ ڕۆژگار هات و چو، بووی بە عومەر. زۆری پێ نەچوو بووی بە گەورەی ئیمانداران. لە خوا بترسە عومەر! چاوت لەو خەڵکە بێ. هەرکەس لە هەڕەشەی خوا بترسێ، دووری لێ نزیک دەبێتەوە. هەرکەس لە مردن بترسێ، هەلی لە دەست دەرناچێ."

- ئەی قوربان ئەو قسانە و بوێریی ئەو پیرەژنە تۆی تووڕە نەکرد؟

- نەخێر، جارود پێی وت: "هۆ پیرەژن! قسەی ڕەقت زۆر کرد بەرابەر پێشەوای ئیمانداران."

منیش وتم: "لێی گەڕێ! نایناسی؟ ئەوە خەولەی کچی حەکیمە، ژنی عوبادەی کوڕی صامت، ئەو ژنەیە کە خوای گەورە گوێی بۆ گرت. عومەر کێیە تا گوێی بۆ نەگرێ؟ ئەو قسانەی ئەو هەر هەمووی ڕاست و دروستن. هەرکەس لە قسەی هەق قەڵس و تووڕە بێ، ئەوە نەفام و نەزان و ستەمکارە. من پێم خۆش نییە ستەمکار یان نەفام و نەزان بم. هەر کۆڕ و کۆمەڵێک مرۆڤی ئامۆژگاریکەری تیا نەبێ، ئەو کۆڕ و

کۆمەڵە کوڕ و کۆمەڵێکی خراپە. خەولە هەروابووە، هەقناس بووە و لەبارەی هەقەوە مشتومڕی کردووە، هەقی دەربڕیوە، خوای گەورە لەبەر خەولە سوورەتێکی قورئانی ناردووەتە خوارەوە، کەوابوو من دەبێ لە بەردەم ئەودا بووەستم و گوێ لە قسەکانی بگرم."

- بە خوا قوربان نازانم لە هەڵوێستی تۆ سەرم سووڕ بمێنێ یا لە هەڵوێستی خەولە؟ بەڵام ئەوەندە دەزانم کە زیاتر تامەزرۆی بیستنی هەڵوێستی ئافرەتانم، هیچی تر هەیە بۆم باس بکەی؟

- بەڵێ، باسی ئافرەتێکت بۆ دەکەم لە کاتی وتاردا هەڵەیەکی بۆ ڕاست کردمەوە.

لە کاتی کچ بەشوداندا خەڵکی فێر بووبوون داوای مارەییی زۆریان دەکرد. بۆیە من ڕۆژێک ویستم سنوورێک بۆ مارەییی ژنان دابنێم.

چوومە سەر مینبەر و وتارێکمدا و وتم: "کورە خەڵکینە! ئاگادار بن مارەییی زۆر داوا مەکەن، ئەگەر مارەییی زۆر ڕێز و حورمەت بووایە یان لە خواترسان بووایە، ئەوە پێغەمبەرﷺ پێش هەموو کەس داوای مارەیی زۆری دەکرد بۆ کچەکانی و مارەیی زۆریشی دەدا بە ژنەکانی. پێغەمبەر نە بۆ کچەکانی و نە بۆ ژنەکانی لە دوانزە ئەوقیە[1] مارەییی زیاتری دانەناوە."

ژنێک هەستایە سەرپێ و وتی: "هۆو عومەر! خوا پێمان دەبەخشێ و تۆ حەرامی دەکەی؟ ئەی خوا نافەرمووێ: ﴿وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا﴾ النساء: ٢٠ واتە: 'نابێت هیچێك لەو ماڵ و سامانەی کە وەریانگرتووە، ئێوە لێیان بستێننەوە، هەرچەندە کلوورێکیش[2] بێت.' "

---

[1] ئەوقیە کێشانەیەکە بەرابەرە بە ٣١ گرام، هەر مسقاڵێک زێڕیش بەرابەرە بە ٤.٢٥ گرام. کەوابو ١٢ ئەوقیە بەرابەرە بە ٣٧٢ گرام، و ٣٧٢ گرام بەرابەرە بە ٨٧ مسقاڵ. یانی مارەیی خێزانەکانی پێغەمبەر و هەروەها کچەکانیشی هیچیان لە ٨٧ مسقاڵ زیاتر نەبووە.

[2] مامۆستا هەژار لە تەرجەمەی ئەم ئایەتەدا قنطاری بە کلوور لێک داوەتەوە، قنطار کێشانەیەکە بەرابەرە بە ١٤٣ کیلۆ.

- ئەی قوربان تۆ وەڵامت چی بوو؟

- وتم: "ئەو ژنە هەقی پێکا و، عومەر هەڵەی کرد."

- باشە قوربان! بۆ مەقام و شکۆی تۆ وا باشتر نەبوو لەسەر مینبەر و بە بەرچاوی خەڵکەوە پەشیمان نەبیتەوە و، دوایی دووبەدوو لەلای ئافرەتەکەدا پەشیمان بووبایتەوە؟

- کوڕم دانتان بە هەڵە و کەموکووڕیدا کەمایەتی نییە، بەڵکو خۆخاوێنکردنەوە و گەورەییە. مرۆڤ مرۆڤە و شایانی هەڵەیە. من چۆن دانم بە هەڵەی خۆمدا نەنایە و، خۆم پێشتر وتبووم: 'بوێریی خەڵک بەرابەر دەسەڵات چ بوێریەکی چاکە!" من ڕازیبم بەوەی کەوا دەمی خەڵک ببەسم و نەهێڵم قسەی هەق بکەن؟! نەهێڵم ژنان قسەی هەقی خۆیان بەرابەر پیاوان بکەن؟! باشترین کەس بەلای منەوە ئەو کەسەیە کە هەڵەکانم بە دیاری بۆ دەهێنێتەوە. ئەو بوێریەی کە سەردەکێشێ بۆ ڕێگەی ڕاست، زۆر لەو بێدەنگیە باشترە کە دەبێتە هۆی مانەوە لە هەڵەدا، هەر دەمێنێتەوە و هەڵە لە دوای هەڵە هەمووی کۆ دەبێتەوە. کەم کەس ئەو جۆرە بوێریەی هەیە، شیفای کچی عەبدوڵڵا یەکێک بوو لەو کەمانە.

- باشە ئەو شیفایە هەر ئەو ژنە نەبوو کە یەکەم کەس بوو بە چاودێر بەسەر بازاڕەوە؟

- با ئەو بوو. شیفای کچی عەبدوڵڵای عەدەویی قورەیشی بوو، ژنێکی دامەزراو و عاقڵ و بەحورمەت بوو. پێغەمبەری دیبوو. تەنانەت پێش کۆچ موسڵمان بووبوو. ئەو یەکێک بوو لەو ژنانەی کە لە سەرەتای کۆچەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە. پێغەمبەر جار جار سەری لێ دەدا و لەماڵیان دەمایەوە. پێغەمبەر خانویەکی بۆ دابین کردبوو لەگەڵ سولەیمانی کوڕیدا تیا دەژیان. شیفا لە سەردەمی نەفامیدا خوێنەوار بوو، دەیتوانی شت بنووسێ. ئەو کاتە ئەوە شتێکی زۆر دەگمەن بوو، تەنانەت پێغەمبەر داوای لێکرد کە حەفصەی خێزانی، کە کچی منیشە، فێری

نووسین بکات. فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت کردووە. لە سەردەمی خەلافەتی ئەبوو بەکریشدا لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا ئامادە دەبوو و خاوەن ڕا و بڕیار بوو. لە سەردەمی منیشدا هەر وا بوو، هەر کاتێک پرس و ڕاوێژم بە خەڵک کردبێ، پرسم بەویش کردووە. شیفا لە بازاڕی مەدینەدا شوێنێکی تایبەتی (دوکانێکی) هەبوو کاری تیا دەکرد. ئەو وەک شارەگ بوو لە مەدینەدا، هەرجار بڕۆشتمایەتە بازاڕەوە، سەرم لێ دەدا. شیفا ئافرەتێکی ئەوەندە عاقڵ و دامەزراو و نموونە بوو، من حەزم دەکرد هەرچی ئافرەتی موسڵمانە هەمووی وابێ. ئەم ئوممەتی ئیسلامە ئوممەتێکی گەورە و بەهێزە، من هەمیشە هەوڵم داوە ئەو گەورەیی و بەهێزیە لە ئافرەتانیشدا دەربکەوێ. بۆیە زۆر بەوە توورە دەبووم کە شتێکم دیبا لە بەهێزی و ئازایی ژنانی کەم بکردایەتەوە، یان ئافرەتێکی مەزن خۆی بە شتێکی کەم و بێنرخ خەریک بکردایە. یەکێک لەو شتانەی منی توورە کرد، ئەوە بوو ڕۆژێک دام بەلای هەندێ کیژۆڵەدا دەفیان لێ دەداو دەیانگوت:

"گۆرانی دەڵێین، گۆرانی دەڵێین
ئێمە هەموومان گۆرانی دەڵێین
هەر بۆ گۆرانی دروست کراوین"

منیش بە قامچییەکەم هەموویانم ترساند و ڕاوم نان و وتم: "درۆ دەکەن، درۆ دەکەن. خوا ملی شەیتان بشکێنێ، ئەوە شەیتان ئەو قسەیەی خستووەتە سەر زمانتان، خەڵک بۆ کارێکی مەزن و گرنگ دروست کراون، ژن و پیاو جیاوازییان نییە."

هەر لەبەر ئەوەیش بوو کە پیاهەڵدان و شین و ڕۆڕۆم لە سەردولکەبێژەکان[1] مەنع کرد. بە خوا هەر سەردولکەبێژێکم دیبێ شمقارەکەم پێش زمانم کەوتووە و

---

[1] سەردولکەبێژ: شینگێڕ، ئەو کەسەی بە گۆرانی و ئاوازی گریاناوییەوە مردوو دەلاوێنێتەوە.

بەر شمقارم داوە. شین و ڕۆڕۆکردن کارێکی خراپە و ئیسلام حەرامی کردووە، شکۆو هەیبەتی ئافرەت کەم دەکا.

- کەوابێ ژنان تەنیا لە بواری ئایینپەروەریدا ڕۆڵیان نەدیوە، بەڵکو لە بواری بەڕێوەبردنی حوکوومەتیشدا ڕۆڵیان هەبووە؟

- ئەیچۆن! ژنان ڕۆڵێکی مەزنیان هەبوو. دەوڵەت بە چینێک ڕاناوەستێ. هەرکەسەو ڕۆڵی خۆی دەبینێ و، دەوڵەت پێویستی بە هەموو کەسێکە. ئەگەر پیاوان حوکوومەت و دەوڵەت دروست بکەن، ئەوا ژنان پیاوان دروست دەکەن. مەبەستم منداڵبوون و نەسەب نییە، مەبەستم پەروەردەیە، مەبەستم پێگەیاندنە. هەرچەند ئەم ڕۆڵ بینینە خەڵک وەک خۆی بەرز نایнرخێنێ، بەڵام نەک کەم نییە، بگرە زۆریشە. زیاد لەوەش ژنان ڕۆڵی تریان هەبووە، لەگەڵ پیاواندا لە جەنگەکاندا بەشدارییان کردووە. پیاو بۆ شەڕ و شیر و تیر، ژنیش بۆ برینپێچی و فریاکەوتنی برینداران. هەرکەس بە گوێرەی هێز و بازوی خۆی. لەبەر ئەوەی کە هێزی ژنان لەناو دڵیاندایە، ئەوە دواوەی سوپا جێگەیانە، برینداران تیمار دەکەن، فریای لێقەوماو دەکەون. چونکە هێزی پیاوانیش لە بازوو و مەچەکیاندایە، تیر و شیر بە دەستەوە دەگرن و لە پێشی پێشەوە شاڵاو دەبەن.

- چەن تێڕوانینێکی بەرز و بەنرخت هەیە بۆ ئافرەتان! قوربان ئێستە ئیزنم دەدەی قیتارەی قسەکانم ڕوو بکەمە شوێنێکی تر؟ با کەمێک لە باسی سیاسەت و حوکوومەت و چاودێر و ماودێر دوورکەوینەوە.

- بە ئارەزووی تۆ. چ پرسیارێکت هەیە فەرموو؟!

- باسێکی گرنگ، بیستوومە تۆ ڕۆڵێکی کاریگەرت تیایدا دیوە، چەندین قسەم لەو بارەوە بیستووە کە هەندێکیان بەیەکەوە دەگونجێن و هەندێکیان دژ بە یەکن.

- چ باسێک؟

- قوربان باسی شیعرە!

ـ شیعر؟ شیعر لق و پۆپی زۆرە، بەڵام تۆ مەبەستت لە دژبەیەک چی بوو؟
ـ دوایی لەو بارەوە پرسیارت لێ دەکەم و ڕوون دەبێتەوە، بەڵام قوربان! مەسەلەی نێوان تۆ و کچەکەی هەرەمی کوڕی سینان چییە؟
ـ ئەو کچە جارێک وەک وەفد هاتبووە سەردانی من. لێم پرسی: "ئەوە باوکت چ شتێکی بەخشیوە بە زوهەیر وا ئەوەندە پەسنی داوە و بووەتە قسەی سەر زاری عەرەب؟"
وتی: "لە بیرمان نەماوە، نازانین چیمان بە زوهەیر بەخشیوە."
منیش وتم: "بەڵام ئەو شتەی زوهەیر بەخشیویەتی بە ئێوە، لە بیر ناکرێ."
ـ قوربان پێم بڵێ، هەرەمی کوڕی سینان کێیە؟ مەبەستت لەو قسانەی کە لەگەڵ کچەکەیدا کردت چی بوو؟
ـ هەرەم دەمسپی و گەورەی تیرەی غەتفان بوو. لەنێوان تیرەی عەبەس و تیرەی زەبیان شەڕێک هەڵگیرسابوو، چل ساڵی خایاندبوو. هەرەم کێشەکەی بڕییەوە و خوێنی کوژراوەکانی دا و، ئاشتی کردنەوە. زوهەیر شیعرێکی پیا هەڵدا. هەرەمیش لە باتی ئەو شیعرە، بەخششێکی زۆری پێ دا. من دەمەویست بزانم ئەو بەخششە چەند بووە و چی بووە، بەڵام کچەکەی هەرەم لە بیری نەمابوو چییان بە زوهەیر بەخشیوە. منیش وتم: "تۆ نازانی چیتان بە زوهەیر بەخشیوە، بەڵام ئەوەی زوهەیر بە ئێوەی بەخشی، لەبیر ناکرێ!"
مەبەستم ئەوەبوو کە وێژە هێزێک و دەسەڵاتێکی وای بەسەر مێژودا هەیە کە مەپرسە. وێژە هەرچیی تۆمار کردبێ، بە زۆری نەفەوتاوە و ماوە. هەرەم یەکەم کەس نەبووە کە دوو تیرە و هۆزی ئاشت کردبێتەوە، بەڵام ئەو جۆرە جوامێریانە لە بیر کراون، چونکە وێژە تۆماری نەکردوون. ئەو پاداشەیش کە زوهەیر وەریگرت، هەمووی خەرج کرد و کەسیش نازانێ چەندی پێ بەخشرا و چۆنی خەرج کرد. بەڵام ئەوەی زوهەیر بەخشی، هەر دەمێنێتەوە و لە بیر ناکرێ، چونکە زوهەیر

ئەدەبی بەخشی، شیعرێکی پڕمانا و مەزن. دیسان سەیر بکە، سەخر ناوێک کوژرا و خوشکەکەی شین و شەپۆڕی بۆ کرد. ئەو سەخرە یەکەم کەس نەبووە کوژرابێ و شین و شەپۆڕی بۆ کرابێ، بەڵام چونکە خەنسای خوشکی شیعرێکی بەهێزی پیا هەڵداوە، تا مێژوو ماوە ناوی سەخریش هەر دەمێنێ و خەڵک چین لە دوای چین دەیناسن و باسی دەکەن. لەولایشەوە تەماشا دەکەین بە هەزاران و زۆر زیاتریش کوژراو ناویان بووە بە خۆڵەمێش و لە بیر کراون!

- قسەیەکی جوانە! شتێک لە دڵمدا دێ و دەچێ، ئەم باسە وام لێ دەکا لێت بپرسم.

- چییە بیڵێ.

- زۆر جار بیستوومە ئیسلام بە چاوێکی پڕ بە بایەخەوە لە شیعر ناڕوانێ، بەو جۆرە سەیری شیعر دەکا کە بەخشین و وەرگرتنێک لەنێوانیدا هەیە و هیچیتر، ئەم بەخشین و وەرگرتنە وا دەکا خەڵک بەلای خۆیدا ڕابکێشێ، ئەگینا خۆی لە خۆیدا بێبایەخە. ئەم بۆچوونەش لە تێگەشتنی ڕواڵەتیی کۆتایی سوورەتی شوعەراوە سەرچاوەی گرتووە. بۆیە زۆر کەس ئەو لێکدانەوە و بۆچوونەیان وەک خوسپ[1] و زەم بۆ شیعر و شاعیر وەرگرتووە، قوربان تۆ چۆنی لێ تێدەگەی؟

- باشە پرسیارت لە کەسێکی شارەزا کرد. کوڕم! شیعریش قسەیە، قسەیش ئەگەر خراپ نەبێ، حەرام نییە. قەصیدە وەک پەرداخێک وایە، ناوەڕۆکەکەیشی وەک خواردنەوە وایە، جا ئەو پەرداخە ئەگەر بادە و شەرابی تیابوو، ئەوە هەم پەرداخ و هەم خواردنەوەکەیش هەردوو خراپن، خۆ ئەگەر پەرداخەکە ئاوێکی زوڵاڵ و خاوێنی تیابوو، ئەوە هەم پەرداخ و هەم خواردنەوەکە پاک و چاکن. ئەگەر ئایەتێک بە ڕەهایی باسی شتێکی کرد، دەبێ ئەو شتە بە ئایەتی تر و فەرموودەوە گرێ بدرێ، ئەگینا لێکدانەوەکە هەڵە دەردەچێ.

---

[1] خوسپ: غەیبەت، پاشملەگوتن

ـ دەی قوربان ئێستە ئەم باسی شیعرە چۆن گرێ بدەین بە فەرموودەوە؟

ـ پێغەمبەر ﷺ زەوقێکی ئەدەبیی بەرزی هەبوو، حەزی لە قسەی جوان و پڕمانا بوو، هەڵوێستەی لەسەر مانای جوان هەبوو. زەبرەقان ناوێک وەک وەفد هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پاکانەی بۆ خۆی کرد و چەند شیعر و قسەی جوان و پڕمانای کرد. پێغەمبەر ﷺ ئەو فەرموودە بەناوبانگەی فەرموو کە دەفەرمووێ: "ان من البيان لسحرا. واتە: هەندێ قسە وەک سیحرە،" یانی ئەوەندە کاریگەرە وەک سیحر لە مرۆڤ بکا وایە.

پێغەمبەر هیچ کات شیعری هەر بە خراپ یان هەر بە باش نەزانیوە. زۆر جار هانی حەسسانی دەدا بۆ ئەوەی بە شیعرەکانی داکۆکی لە ئیسلام بکا، دەیفەرموو: "حەسسان! بەو شیعرانە شاڵاو بەرە سەریان(سەرکافرەکان) جوبریلیش هاوکارت بێ!"

دوای ئەوەی بینی کە شیعری حەسسان چەندە کار دەکاتە سەر کافرەکان. پێی فەرموو: "ئەو شیعرانەی تۆ لە تیری تیژ باشتر کاریان تێ دەکات!"

پێغەمبەر مرۆڤێکی خاکی بوو، بۆیە نەهیی لە ئێمە کردبوو کە لەبەری هەستینەوە، وەک چۆن ڕۆمەکان لە بەرابەر قەیسەر، یان فارسەکان بەرابەر کیسرا هەڵدەسان. جارێک پێغەمبەر تەشریفی هات بۆلامان، ئێمەیش بێ ئەوەی هەستی پێبکەین، هەمووومان لە بەری هەستاین. تووڕە بوو. پێغەمبەر ئەگەر تووڕە ببا، بە دەموچاویدا دیار بوو کە تووڕەیە. حەسسان هەستا و چەند شیعرێکی وت.

- چی وت؟

- وتی:

فەرزە لـــەسەر من لە بەرت هەستم

تـــەرکی فـــەرز بۆمن کاریّ دزێوە

پێم سەیرە هەرکەس بە بیر و هۆشە

جـــوانی ببینێ و نـــەوەستێ پێوە؟[1]

ئیتر پیغەمبەر هاتەوە سەرخۆ و تووڕەییەکەی نەما. پێغەمبەر درەنگ تووڕە دەبوو، زوو ئاشت دەبووەوە!

کەعبی کوڕی مالیکیش حوکمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوبوو، هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و داوای لێبوردنی لێ کرد و، قەصیدە بەناوبانگەکەی بانت سوعادی وت، کە سەرەتاکەی ئاوایە:

سوعـــاد تۆراوە ، دڵـــم خەمگینە

توێ توێی دڵەکەم داخە و بەتینە[2]

---

[1] لە وەرگێڕانی شیعردا مانا گۆڕانکاری بە سەر دێت شیعرەکە بە عەرەبی ئاوایە: وقوفی للعزیز علی فرض

وترک الفرض ما هو مستقیم

عجبت لمن له عقل و فهم

یری هذا الجمال و لا یقوم

من بەو شێوەی سەرەوە توانیومە بیکەم بە کوردی، لەمەولایش توشمان دەبێ بە توشی شیعرەوە، ئەوانیش بە هەمان شێوەی ئەم شیعرانە.

[2] شیعرەکە بە عەرەبی ئاوایە:

بنت سعاد فقلبی الیوم متبول

متیم اثرهـا لـــم یفد مکبول

کەعب بەردەوام بوو، ئەمانەیشی وت:

بیستوومە کـــەوا پێغەمبەری خـــوا
هەڕەشەی لێم کرد، هەر هەمە هیوا
بمبەخشێ چونکە ڕۆشنایی و نوورە
شمشێری خوایە، تۆڵە لـــەو دوورە[١]

پیغەمبەر کەواکەی خۆی لە بەر داکەند و کردیە دیاری بۆ کەعب.

دوای ئەوەی خەنسایش موسڵمان بوو، پێغەمبەر پێی فەرمو: "ئا دەی خـونەیس، بزانم باسی سەخر چییە و چۆنە؟"

لەوەیش زیاتر، پیغەمبەر بیروڕای تایبەتی لەمەڕ شیعر و وێژەوە هەبوو: ڕەخنەی دەگرت، ڕای خۆی دەردەبڕی، تاریفی هەنـدێ شـیعری دەکـرد، هەنـدێ شیعریشـی بەلاوە پەسەند نەبوو، دەیفەرموو: "ڕاسترین قسە، ئەو قسەیەی لەبیـدی شـاعیرە کە وتویەتی:

'خوا نەبێ هەموو شتێ بەتاڵە' "

دوایی نیوەکەی تری بیست کە دەڵێ:

"یەک خۆشی نییە تا سەر بمێنێ[٢] "

---

[١] بە عەرەبی ئاوایە:

نبئت أن رسول الله أوعدني
والعفو عند رسول الله مأمول
إن الرسول لنور يستضاء به
مهند من سيوف الله مسلول

[٢] شیعرەکە بە عەرەبی ئاوایە:

ألا كل شيء ما خلا الله باطل
و كـــل نعيم لا محـــالـة زائل

ماناکەی بە کوردی ئاوایە:

خوانـــەبێ هـــەمو شتێ بەتـاڵـە
یەک خۆشی نییە تا سەر بمێنێ.

فەرمووی: "درۆ دەکا، خۆشی و ناز و نیعمەتی بەهەشت هەتا سەر دەمێنێ و کۆتایی نایەت."

پێغەمبەر شیعری ئومەیەی کوڕی ئەبوو صەڵتی پێ جوان بوو. ئومەیە ماوەیەکی زۆر لە سەردەمی نەفامیدا ژیابوو. ئەو بت پەرەست نەبوو، بڕوای بە شیرک و گومڕایی نەبوو، وەک وەرەقەی کوڕی نەوفەل و قوسسی کوڕی ساعیدە، بەڵام ئومەیە سەردەمی ئیسلامی بینی کەچی موسڵمانیش نەبوو. لەگەڵ ئەوەیشدا پێغەمبەر هەر شیعرەکانیی پێ بەرز و پڕمانا بوو و، دەیفەرموو: "ئومەیە زۆر نزیک بوو لە ئیسلامەوە و خەریک بوو موسڵمان بێ."

جارێک گوێی لە شیعرێکی ئومەیە بوو، فەرمووی: "شیعرەکانی موسڵمانانەن، بەڵام بە دڵ موسڵمان نەبوو!"

ـ گەورەم! کەوابێ شیعریش هەمان حوکم و بڕیاری قسەی ئاسایی هەیە. هەرکامیان جوان و باش بێ، پاداشتی لەسەر وەردەگیرێت و، هەرکامەیش خراپ بێت، سزای لەسەر وەردەگیرێت. ڕەوا نییە بۆ ئایینێک کە کتێبە ئاسمانییەکەی پڕ بێ لە ڕەوانبێژی و، دژایەتی شیعریش بکا!

ـ ڕێک وایە .

ـ بە خوا ڕاستت کرد قوربان! لە بارەی شیعرەوە پرسم بە کەسێکی شارەزا کرد. قوربان! باسی شیعر و وێژەم بەلای پێغەمبەرەوە بیست، دەمەوێ باسی خۆتم بۆ بکەی، لەگەڵ شیعر و وێژەدا بەینت چۆنە؟

ـ باشە کوڕم! باسی چیت بۆ بکەم و لە کوێوە دەست پێبکەم؟

ـ پرسیاری زۆرم لە هەگبەدایە، هیوادارم مۆڵەتم پێ بدەی هەموو پرسیارەکانم بکەم تا هەگبەکەم خاڵی دەبێ.

ـ دەی کوڕم بپرسە.

- باسی خۆت و حەسسانم بۆ بکە. بیستوومە لە سەردەمی خەلافەتی تۆدا حەسسان لە مزگەوتدا شیعری وتوە و تۆیش نەهیت لێ کردووە!

- بەڵێ وایە. ڕۆژێک دام بەلای مزگەوتدا گوێم لێ بوو حەسسان لە مزگەوتدا شیعری دەوت، منیش وتم: "ئەوە لە مزگەوتدا شیعر دەڵێی؟!"

ئەویش وتی: "بەڵێ، من لە مزگەوتدا شیعرم وتووە و، کەسێکی لە تۆ باشتریش گوێی لێم بووە!(مەبەستی پیغەمبەر بوو.)"

دوایی لای کردەوە بەلای ئەبوو هورەیرەدا وتی: "توو خوا ئەبوو هورەیرە، تۆ خۆت لە پیغەمبەرت نەبیست بە منی فەرموو: 'لە جیاتی من وەڵام بەرەوە! خوایە! گیانە پیرۆزەکە(جوبرەئیل) بکەرە یارمەتیدەری!' "

ئەبوو هورەیرە وتی: "با."

- ئەی تۆ چیت کرد؟

- وازم لێ هێنا و ڕۆشتم.

- دەی مادەم پیغەمبەر ئیزنی دابێ لە مزگەوتدا شیعر بڵێ، خۆ دەبێ تۆیش ئەوەت زانیبێ ئیتر بۆچی نەهیت لێکرد؟

- من لەبەر ئەوە نەهیم نەکرد کە شیعر حەرام بکەم یان شیعروتن لە مزگەوتدا قەدەغە بکەم، بەڵام من ئەو سەردەم و ماوەی کە شیعر لە مزگەوتدا دەوترا، دەمناسی و دەمزانی. ماوەیەک بوو شیعر لەنێوان ئێمە و قورەیشدا کەرەستەی جەنگ و داشۆرینی یەکتر بوو، بۆیە بە زەروورم دەزانی ئەو ماوەیە وا بێت. خۆ دەمزانی هەموو شتێکی حەڵاڵ هەر بە حەڵالی دەمێنێتەوە، بەڵام بارودۆخیش کاریگەریی هەیە. من دەمویست جیاتی ئەوەی شیعر لە مزگەوتدا بگوترێ، ئایەت و فەرموودەی تیا بگوترێ. پێم وابوو بەو کارە دەرگایەک دادەخەم کە ئەگەر بە کراوەیی بمێنێتەوە، مزگەوت دەبێت بە گۆڕەپانی شیعر و شانامە.

- ئەمە بۆچونێکی تەواوە و ڕایەکی بەهێزە وەک هەموو ڕاوبۆچونەکانی ترت، بەڵام قوربان نابێ بەدیلێک هەبێ لە بەرابەردا؟

- با بۆ نابێ!

- چۆن؟

- لە تەنیشت مزگەوتەوە جێگەیەکم تایبەت کرد، پێیان دەوت: "بەتحا." دوایی وتم: هەرکێ دەیەوێ شیعر بڵێ یان قسەی بێمانا یان شۆخی و گاڵتە بکا، یان بە دەنگی بەرز قسە بکا، با لەوێ بیکا و نەچێتە مزگەوتەوە.

- یانی قوربان مەبەستت دژایەتیی حەسسان نەبوو؟

- بۆ؟ چیم داوە بەسەر حەسسانەوە؟ ئەو شتەی بۆ خەڵک حەڵاڵ بێ بۆ ئەوی حەرام بکەم؟! حەسسان پیاوێکی وابوو بەرگریی لە ئیسلام و پێغەمبەر دەکرد. ئەو بە لای ئێمەوە بەڕێز و بەوەج[١] بوو، ڕێزو حورمەتی لەسەر سەرمان و وەک خۆی دەیپارێزین، بەڵام ئیدی ئەوە بۆچونی من بوو. تا منیش بمێنم دەبێ حەسسان خاوەن ڕێز و حورمەتی تایبەتی خۆی بێ. ئەمە تەنیا بۆچونی من نییە، تەنانەت ئایشەی خێزانی پێغەمبەریش زۆری پێناخۆش بوو کە ئازاری حەسسان بدرێت، هەمیشە دەیوت: "ئەوە حەسسان نەبوو وتویەتی:

'بە خۆم و دایک و باوک و منداڵ و شەرەفمەوە
قوربانی ماڵ و منداڵ و شەرەفی موحەممەد'[٢] "

- ئەی بۆچی تەنانەت لە بەتحایشدا هەڵدانەوەی ئەو شیعرانەت قەدەغە کردبوو کە لەنێوان جەنگەکانی موسڵمانان و قورەیشدا وترا بوون؟

---

[١] وەج: حورمەت

[٢] بەیتەکە بە عەرەبی ئاوایە:

إن أبي و والدتي و عرضي
لعرض محمد منكم وقـاء

ــ بەڵێ من قەدەغەم كرد. ئەوەیش لەبەر ڕێزی ئەو كەسانەی دوای ئەو جەنگانە موسڵمان بوون، ئەوانەی كە بە باشی باوەڕیان هێنا، ئەو شیعرانە جگە لە جنێودان بە زیندوو و مردوو چیتر نەبوون. ڕق و كینەی دروست دەكرد. ئیسلامیش هەرچی ڕەفتار و كرداری ناشیرین هەیە، هەمووی بەلاوە ناپەسەندە و ڕەدی دەكاتەوە!

- یانی قوربان تۆ. شیعروتن كە خۆی لە خۆیا حەڵاڵە، قەدەغەت كرد لەبەر پاراستنی ڕێز و حورمەت و خۆشەویسی نێوان موسڵمانان؟

- بەڵێ وایە.

- ئەی قوربان تۆ شیعری كام شاعیرت بەلاوە پەسەندە؟

- شیعری زوهەیری كوڕی ئەبوو سەلما، شیعری نابیغە، هەروەها شیعری خەنسا.

- هیچ یادگاریت لەگەڵ شیعری ئەم شاعیرانەدا هەیە؟

- بەڵێ هەمە.

- دەی بۆم بڵێ قوربان.

- باشە، با باسی نابیغە بكەم. ڕۆژێك چومە دەرەوە، تەماشا دەكەم وەفدی غەتفان لە بەردەرگا وەستاون، پێم وتن: "كام شاعیری ئێوەیە وتویەتی:

'ئەگەر لە دوای كەسێكی بێ گوناهی ببتە هاوكارت
هەتا مردن بەبێ هاوڕێ دەژیت كوا پیاوی بێتاوان'[1] "

وتیان: "قوربان نابیغە."

وتم: "ئەی كێ وتویەتی:

'وەك شەوی تاریك لە دوم ئەگەڕێی
هەر پێم دەگەیت و زراووم دەبەی
لە چاڵی قوڵام، هیچم ناگاتێ

---

[1] بەیتەكە بە عەرەبی ئاوایە:

و لست بمستبق أخا لا تلمه
على شعث أي الرجال المهذب

تـۆش هــەر قولاب و تــەنـاف ناو دەبەی[1]"

وتیان: "ئەوەیش هەر شعیری نابیغەیە، قوربان."

وتم: "ئەی خاوەنی ئەم شیعرە کێیە کە دەڵێ:

'خــۆم و ئـەسپەکـــەم خستە تـەنگـانـە

هــەر لــەبۆ ئــەوەی بگەم بــە جێ پات

بــە ڕووتــوقـوتـی و بـەبـێ جلوبـەرگ

بــە تــرس و لــەرزۆ هــاتمــە دەرگــات

وەک نــوح پــاراستت بــەبێ غــەلوغەش

هەمووی تەواوە قــەرز و ئــەمــانــات[2]' "

وتیــان: "ئــەوەیش هــەر هیی نــابیغەیە."

وتــم: "ئــەی کــام شاعیر وتــویــەتـی:

'جگە سولەیمان کە خوا پێی فەرمووی:

---

[1] شیعرەکە عەربیە و ئاوایە:

فانك كـالليل الذى هـو مدركـي

وان خلت أن المنتأى عنك واسع

خطاطيف حجن فى جبال متينة

تمد بهـا أيـد إليك نـوازع

[2] شیعرەکە بە عەرەبی ئاوایە:

الى ابـن محرق اعملت نـفسى

و راحلتى و قـد هدت العيون

اتيتك عـاريـا خلقا ثيـابى

على خـوف تظن بـي الظنون

فـألفيت الأمانـة لم تخنهـا

كذلك كـان نـوح لا يخون

بە نیعمەت خەڵکی لە کوفر دوور خە[١]"

وتیان: "ئەوەیش هەر هیی نابیغەیە."

منیش وتم: "کەوابێ نابیغە سەرگەورەی شاعیرەکانتانە!"

ـ قوربان تۆ چەژەی وێژەت بەهێزە. ئەمە نابیغە، ئەی زوهەیری کوڕی ئەبوو سەلما؟

ـ بە خوا من سەرسامم بە شیعری زوهەیر، وانازانم کە شاعیری کۆن هەبێ هێندەی ئەو شاعیر بێ، من ئەوەندە بە شیعری سەرسام بووم کە ڕۆژێک لە سەفەرێکا بووین، بەدەم ڕۆشتنەوە وتم بە هاوڕێکانم: "ئەوە بۆ شەڕەشیعرێک نەکەین؟ فلانکەس تۆ ببە بە هاوڕێی فلانکەس، فلانکەس تۆیش لەگەڵ فلان هاوڕێبە، عەبدوڵلا تۆیش لەگەڵ من بە." عەبدوڵلای کوڕی عەبباس هەرچەند لە تەمەنا لاو بوو، بەڵام زۆرم خۆشەویست، چونکە خزمی نزیکی پێغەمبەر بوو، زۆریش لەخواترس و موسڵمان بوو. ماوەیەک شەڕەشیعرمان کرد و من شیعرێکی حەسسانم وت کە دەڵێ:

"حوشتر لە ژیانیا سوارێکی نەبووە
کە هێندەی زاتی حەزرەت بەڕێز بێ[٢]"

دوایی وتم: "عەبدوڵلا شیعرێکی گەورەی شاعیرانمان بۆ ناڵێی؟"

وتی: "گەورەم! گەورەی شاعیران کێیە؟"

وتم: "زوهەیری کوڕی ئەبوو سەلما."

---

[١] عەرەبیەکەی ئاوایە:

الا سليمان اذ قال الإله له
قم في البرية فاحددها عن الفند

[٢] عەرەبیەکەی ئاوایە:

و ما حملت ناقة فوق رحلها
أبر و أوفى ذمة من محمد

وتی: "قوربان بۆ بە گەورەی شاعیرانی ناو دەبەی؟"

وتم: "چونکە شیعری بەسراوی نەبووە، مانای بەیتێک نەبەسراوە بە بەیتێکی ترەوە، بە دوای وشەی سەختا نەگەڕاوە، پەسنی کەسیشی بە جۆرێک نەداوە کە ئەو کەسە وا نەبێ!"

ئەوڕۆژە عەبدوڵلا شیعری زوهەیری زۆر خوێندەوە.

ڕۆژگار تێپەڕی، من لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێ و دۆستدا بووم، باسی شیعرمان کرد.

دوایی لێم پرسین: "کێ گەورەترین شاعیرە؟"

هەرکەسەو یەکێکی وت.

لەو کاتەدا عەبدوڵلا هات، منیش بەوانم وت: "ئەوەتا، کەسێکی شارەزا و شیعرناس هات!"

دوایی لە عەبدوڵلام پرسی: "عەبدوڵلا! گەورەترین شاعیرکێیە؟"

وتی: "زوهەیری کوڕی ئەبوو سەلما."

وتم: "دەی هەندێ شیعری زوهەیرمان بۆ بخوێنەوە."

دەستی کرد بە شیعر خوێندنەوەی شیعرەکانی زوهەیر و وتی:

" گەر هۆزێک هەبێ لە ڕێز و وەجا
هێندە بالا بن لەسەر خۆر بژین
ئەو هۆزە بێشک نەوەی سینانە
هەموویان پاکن بە پاکی دەژین
چون خاوەن ماڵن، گەورەو سەروەرن
هێدی بن پەاون، تووڕە بن پەڕین
هەرکەسێ وابێ ئیرەی پێ دەبەن

ڕەببی مەحفوز بن، لە چاوی بەدبین[١] "

ـ کوڕە قوربان خۆ ئەمە سەردەمی تۆ تەنیا لە سیاسەت و بڕیاردانا پێش نەکەوتبوو، بەڵکو لە ئەدەب و وێژەیشدا هەروا پێشکەوتوو بوو!

ـ بە چیا دەزانی؟

ـ بەوەدا ئەو ڕەخنەگرانەی دوای تۆ پەیدا بوون و فکر و ئاوەزیان لە مەڕ شیعر و قەسیدە و وێژەوە خستووەتە کار، هەموویان قسەی تۆیان پەسەند کردووە!

ـ چۆن؟

ـ تۆ فەرموت زوهەیر گەورەی شاعیرەکانە، ئەبوو عوبەیدە کابرایەکی زمانزان و ڕەخنەگر بوو، ئەو قسەیەی تۆی بیست و وتی: "پێشەوا عومەر ڕاست دەفەرمووێ، وایە! شیعری زوهەیر لە ناسکیدا دەڵێی شیلەی هەنگوینە، لە ڕەقیدا وەک پۆڵا وایە گەر بتەوێ بەردی پێ دەشکێنی!"

ئیبن سەلامیش کە ئەویش زمانزانە و وەک ئەبوو عوبەیدە زانایە، وتویەتی: "عومەر ڕاست دەکا، شیعری زوهەیر پڕماناترین شیعرە، وشەی کەمە و مانای زۆر، ڕەوانبێژیی زۆر تێدایە، لە ڕاستییەوە نزیکە و فڕوفیشاڵی تیا نییە!"

---

[١] عەرەبیەکەی ئاوایە:

لو كان يقعد فوق الشمس من كرم

قـــوم بـــأولهم أو مجدهم قعدوا

قـــوم أبـــوهم سنان حين تنسبهم

طابوا و طاب من الأولاد ما ولدوا

جـــنّ إذا غضبوا إنس إذا أمنوا

مـــرزّؤون بـــهـــاليل إذا جـــهدوا

محسّدون على ما كـــان مـــن نعَم

لا ينزعُ الله منهم مـــا لـه حُسدوا

- ئەوە ڕێز و بەهرەیەکی خواییە، خودا دەیبەخشێ بەو کەسانەی کە خۆی ئارەزویی لێیەتی.

- پاک و بێگەردی بۆ خوای باڵادەست. بەڵام قوربان تۆ مەبەستت لە "شیعری بەسراوی نەبووە، مانای بەیتێک نەبەسراوە بە بەیتێکی ترەوە، بە دوای وشەی سەختا نەگەڕاوە، پەسنی کەسیشی بە جۆرێک نەداوە کە ئەو کەسە وا نەبێ،" چی بوو؟

- شیعر بەسراوی بریتیە لەوەی کە مانای وشەی شیعرەکە ڕوون نەبێ، وشەکان ڕیز نەبن، مانای وشەیەک بەسراوە بە وشەیەکی تری دوور لە خۆی، پێش و پاشی تیایە، وشەی نامۆ و بێگانە دەکەوێتە نێوان ئەو وشانەی کە بە یەکەوە مانا تەواو دەکەن، ئەمەیش لە وێژەوانیدا پەسەند نییە، چونکە کێشە بۆ ڕەوانبێژی دروست دەکا. بە کورتی ئەو بەسراوی و داخراویە بریتیە لە تێکەڵوپێکەڵی، ئەمەیش باش نییە، وەک ئەو بەیتە شیعرەی ئەوسی کوڕی حجر کە دەڵێ:

"ئەو بێ عەقڵە دەست بەسراوە
ئاویش ناخوا جاشە کەرە [1] "

لێرە مەبەستی لە جاشەکەر منداڵیکە!

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

و ذات هدم عار نواشرها
تصمت بالماء تولبا جدعا

یان هەر شیعرێک مەخرەجی وشەکانی زۆر لێک نزیک بوو و بە ناڕەحەتی ئەوترا، ئەوەیش کێشە بۆ ڕەوانبێژی دروست دەکا و شیعرێکی باش نییە، وەک ئەو بەیتە شیعرە کە دەڵێ:

"حەی حەیفم بۆ حەرب حەی حەی لەو حەفرە

لای حەفری قەبری حەرب قەبرێ نییە[1] "

- باشە قوربان ئەمە تێکەڵوپێکەڵی، ئەی مانای سەخت چییە؟

- خۆی سەختایی بۆ شوێنی ناڕەحەت و لاپاڵی کەژ و کۆسار بەکار دەهێنرێ. بەڵام لە قسەدا بریتیە لەو وشانەی کە ماناکانیان ڕوون نییە و مرۆڤ باش لێیان تێناگا، هەرچەند ئەو قسانە قسەی شاعیرێکی باشیش بن، بەڵام لەبەر ئەوەی ماناکەیان ڕوون نییە، ئەوە ڕەوانبێژی تیا نییە، وەک:

"چووەتە چەم سەرووی چەمان ئەشکم چەمان

چەم لە چەم جاری نەبێ بۆ چەم چەمان[2] "

مانای ئەم هەمووە چەمە ڕوون نییە و نازانرێ چییە؟

- بەڵێ قوربان تێگەیشتم، ئەی لەگەڵ خەنسادا چ یادگاری و بەسەرهاتێکت هەیە؟

- خەنسا ژنێک بوو— وەک لە شیعرەکانی کە بۆ سەخری برای وتووە دەردەکەوێ— کێوێکی سەر بە ئاگر بوو، من لە سەردەمی نەفامیشدا هەر ڕێزم

---

[1] عەربیەکەی ئاوایە:

و قبر حرب بمكـــان قفر

وليس قرب قبر حرب قبر

[2] ئەم بەیتە هی شاعیری گەورەی کورد مەحویە، خۆم بۆ زیاتر تێگەشتن بۆم زیاد کرد، هەرچەند بەیتەکە هی گەورە شاعیرێکە، بەڵام چونکە تا ئێستە مانای وشەکان ساغ نەبووەتەوە، ڕەوانبێژیی تیا نیە، هەرکات ماناکەی ساغ بووەوە، ئەوە ئەو کات وەک هەموو شیعرەکانی تری پڕ ئەبێ لە ڕەوانبێژی.

دەگرت، چونکە ژنێکی پاکداوێن و ماقووڵ بوو. هەروەها لەبەر ئەوەیش ڕێزی لێ دەگرم کە چوار کوڕی لە جەنگی قادسیەدا شەهید بوون. ئەو لای خوا بەڕێزە، بەڵام سەبارەت بە نێوان من و خەنسا ئەوە بۆت باس دەکەم. خەنسا لەگەڵ هەندێ کەسی خزم و کەسوکاری خۆیدا بەرەو حەج کەوتبوونە ڕێ. یەکێک هات و بە منی وت: "ئەوە خەنسایە، ئا ئامۆژگاریەکی بکە، ئەوسا و ئێستەیش بەردەوام دەگری."

منیش هەستام و چووم بۆلای و وتم: "خەنسا!"

وتی: "چت دەوێ و کێت دەوێ؟"

وتم: "ئەوە چی وای لێ کردووی ئاوا چاوەکانت ئاوی سپییان هاتووە؟"

وتی: "گریان بۆ گەورەکانی هۆزی موزەر."

وتم: "خۆ ئەوانە لە سەردەمی نەفامیدا تیا چوون، ئەوانە لە جەهەنمدان، لە ئاگردان!"

وتی: "دایک و باوکم بە قوربانت بێ، ئەی پێشەوای ئیمانداران، ئەوە منی کوشتوە و ئازارم دەدا!"

وتم: "دەی هەندێ شیعری خۆت بخوێنەوە."

وتی: "من تازە شیعرە کۆنەکانم ناخوێنمەوە، با شیعرێکت بۆ بڵێم کە ئێستا کت و پڕ دەیڵێم!"

وتم: "دەی بیڵێ."

وتی:

"بە ڕەشێنەی چاو وا (غەمرە)م ئاو دا
تاوی بارانیش وا ئاوی نادا
هەرکاتێ باسی خەفەت بکرایە
ئاخم دەکێشا و گوێچکەم پێ دەدا
پێش مردنی تۆ بۆ زۆر کەس گریام
خەمی تۆ، خەمی هەمووی بە بادا"

وتم: "لێی بگەڕێن بە خوا ئێستەیش هەر خەمبارە."

- قوربان شتێک هەیە نابێ بە سەرماندا تێپەڕێ، تۆ ڕەچاوت کردووە؟

- چییە کوڕم؟

- خەنسا ئەو هەمووە گریان و شینوشەپۆڕەی بۆ سەخری برای بووە، بەڵام سەیر دەکەین بەو شێوە کە بۆ سەخر گریاوە، ئاوا بۆ ئەو چوار کوڕەی نەگریاوە کە لە قادسیە شەهید بوون! تۆ خۆت دەزانی کە سۆزی دایک چۆنە بۆ ڕۆڵەکەی.

- ڕاست دەکەی، بەڵام من وادەزانم لەبەر ئەوە بێ کە مەرگی مرۆڤ لە سەردەمی نەفامیدا مردنە! بەڵام مەرگ لەسەردەمی ئیسلامدا زیندووبوونەوەیە، هەموو مردویەک خۆشەویسە و مرۆڤ خەمی بۆ دەخوا، بەڵام مردنی موسڵمان لەکوێ و مردنی کافر لەکوێ، مەرگی سەخر لەکوێ کە لە سەردەمی نەفامیدا مردووە و، مەرگی کوڕەکانی لەکوێ کە بە شەهیدی ڕۆشتوون؟!

- ئەم قسەیەت چیرۆکی تۆ و موتەممیمی کوڕی نووەیرەی بیر خستمەوە!

- بەڵێ، بە خوا ئەو چیرۆکەیش لەم بابەتەیە.

- دەی قوربان بۆم بگێڕەوە، پێم خۆشە بیبیسم، چیرۆکەکە باسی شیعریشی تیایە و لە بابەتەکەی خۆمان ناچینە دەرەوە.

- باشە بۆت دەگێڕمەوە.

- دەی قوربان، منیش بە باشی گوێ دەگرم.

- ڕەحمەتی خوا لە زەیدی برام بێت. پێش من موسڵمان بوو، پێش من گەڕایەوە بۆ حزوری خوای گەورە. ئەو لە مەککە موسڵمان بوو، بەڵام لە منی شاردبووەوە، لە خزمەت پێغەمبەردا لە غەزای بەدر و غەزاکانی تردا بەشداریی کردبوو، لە جەنگی یەمامەدا ئاڵابەدەستی سوپای ئیسلام بوو، لە پێشی پێشەوە بەرابەر دوژمن وەستابوو و ئاڵاکەیشی بە دەستەوە بوو، جەنگا تا شەهید کرا.

بیرمە هێشتا من موسڵمان نەبووبووم، ڕۆژێک دەچـووم بـۆ دارونـنەدوە بـۆ ئەوەی بزانین چی بکەین بە پێغەمبەر. لە ڕێگەدا گەشتم بە زەیـد، هەر ئەو ڕۆژە بـوو کە زەید موسڵمان بووبوو.

پێم وت: "ئەوە لەگەڵمدا دێی بچین بۆ داروننەدوە تـا بـزانین چـی بکەیـن بەم موحەممەدە؟"

وتی: "ئەگەر بۆ خێر و چاکە دەچی، ئەوە کوڕێکی خەتتاب بەشدار بێ بەسە، ئەگەریش بۆ شەڕ و خراپە دەچی، دیسان یەکێک بەسە!"

خـۆزگە ئەو ڕۆژە چـۆن لەو قسـەیە تێنەگەشـتم؟! ڕەحمەتـی خـوا لە زەیـد چەنـد قسەکەی مانادار بوو!

- ڕەحمەتی خوا لە تۆیش بێ گەورەم، وابزانم برینی کۆنی تـۆم کولانـدەوە، مـن پرسیاری موتەممیم دەکەم و تۆ باسی زەیدی برات دەکەی!

- هەرجار باسی موتەممیم لەلا بکرێ، منیش باسی زەید دەکەم!

- بۆچی گەورەم؟

- چونکە جارێک موتەممیم هات بۆلای ئەبوو بەکر سکاڵای لە خالیـدی کـوڕی وەلید هەبوو، گوایە مالیکی برای موتەممیمی کوشـتووە. هـات بـۆ مـزگەوت و ئـێمە نوێژی بەیانیمان دەکرد. دوای نوێژ لام کردەوە، پیاوێکی گـنەڵەی یەکچـاوم بینـی، کەوانەکەی لەسەر پشت لەتەنیش خۆی داناوو، پرسیم: "ئەمە کێیە؟"

وتیان: "موتەممیمی کوڕی نووەیرە."

وتم: "ئا هەندێ لەو شیعرانەم بۆ بڵێ کە بۆ مەرگی براکەتت گوتووتە."

وتی:

" ماوەیەکی زۆر هەردوو هاوڕێ بووین

گوتیان: هیچ کوێیان بێ یەک نەدیوە

کە مالیک کوژرا وا لێک دابڕاین

دەتگوت یەکترمان قەت نەناسیوە[١] "

منیش پێم وت: "بە خوا ئەوە لاواندنەوەی مردووە. خوا ڕەحم بە زەیدی برام بکا، وا دەزانم ئەگەر منیش بمتوانیایە شیعر بڵێم، ئاوا زەیدم دەلاواندەوە!"

دوایی وتم: "چەندە خەفەت بۆ براکەت دەخۆی؟"

ئەویش وتی: "ئەم چاوەم کوێر بووە، ئەوەندە گریام؛ ئەمەیشیان ئاوی سپی هاتووە و هەمیشە پڕە لە فرمێسک و گریان!"

منیش وتم: "یەکجار ئاوایش نە! کەس ئەوەندە بۆ مردوو ناگری!"

ئەویش وتی: "بە خوا ئەگەر براکەی منیش وەک براکەی تۆ لە جەنگی یەمامەدا شەهید بووایە، هەرگیز بۆی نەدەگریام!"

منیش وتم: "خوا بەزەیی بێتەوە پیاتدا، بە خوا تا ئێستە کەس وەک تۆ سەرەخۆشی لە من نەکردووە."

- سەیرە قوربان سەیرە! بە خوا مرۆڤ چاو لە توندوتیژیت بکا دەڵێ: 'ئا ئەمە بەزەیی بە هیچدا نایەتەوە،' چاو لە سۆز و بەزەییت بکا دەڵێ: 'ئەمە هەرگیز لە ژیانیدا توندوتیژ نەبووە!'

- کوڕم! توندوتیژی دژی سۆز و بەزەیی نییە، لەنێوان توندوتیژی و دڵڕەقیدا سنوورێک هەیە، کەم کەس پێی دەزانێ؛ لەنێوان دڵنەرمی و لاوازیشدا دەشتێکی وا هەیە کە کەم کەسی دڵنەرم و بەسۆز تێی دەچێت و سەر لە لاوازیەوە دەرناکا. بە خوا من توندوتۆڵم، بەڵام دڵڕەق نیم؛ نەرمم، بەڵام لاواز نیم.

---

١ عەرەبیەکەی ئاوایە:

وكنـــا كندمـــاني جذيمة برهة
من الدهر حتى قيل: لن يتصدعا
فلمـــا تفرقنا كـــأني و مـــالكـــا
لطول الفراق لم نبت ليلة معـــا

- بە خوا قوربان ڕاست دەفەرمووی وایە! داوای لێبوردن دەکەم بێ مەبەست برینم کولاندیتەوە، با ئەم لاپەڕە هەڵدەینەوە و تەنیا باسی شیعر بکەین.

- باشە با وابێ.

- بیستوومە کابرایەکی دەشتەکی بە دەم شیعروتنەوە داوای خێر و سەدەقەی لێ کردووی، باسی ئەوەم بۆ بکە!

- ئەوە پیاوێکی دەشتەکی بوو، سکاڵای خۆی لە دەست هەژاری و دەستتەنگی دەکرد، داوای خێر و سەدەقەی دەکرد و وتی:

"عومەر! بۆ ئەوەی خێرت بنووسرێ

بچیتە بەهەشت بێ یەک و دوو و سێ

ئەو کچانەی من لەگەڵ دایکیانا

جلیان بۆ بکە، بە خوا هەر دەبێ

ئەو فرمانەی من بکەی جێبەجێ

گەر نەیکەی شتێ گەورە دەقەومێ[1] "

منیش ویستم کەمێ سەر بخەمە سەری و وتم: "ئەی ئەگەر نەیکەم چی دەقەومێ؟"

وتی: "دەی باوکی حەفصە، ئەگەر نەیکەی دەڕۆم!"

منیش وتم: "دوای ڕۆشتن چی دەکەی؟"

وتی: "بە خوا سکاڵای لەسەر تۆمار دەکەم."

وتم: "لەسەر کێ؟"

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

یا عمر الخیر لک الجنة

أکس بناتي و أمهن

أقسمت علیک لتفعلن.

بەخوا هەر دەبێ، یانی بەخوا هەر دەبێ جلیان بۆ بکەی.

وتی: "لەسەر ئەو ڕۆژەی کە بەخششەکان تێیدا یان بۆ بەهەشتن یان بۆ ئاگر."
منیش وتم: "چیی دەوێ پێی بدەن، لە ترسی گەرمایی و ئاگری ئەو ڕۆژە نەک لە بەر شیعرەکانی."

- قوربان فەرمایشەکانت شیرنن، باسەکانت خۆشن، مرۆڤ هەرگیز لە گوێگرتن لێت ماندوو نابێ، دەخوازم تۆیش لە من ماندوو و بێزار نەبی!

- دەی لە بارەی شیعرەوە هێشتا پرسیارت ماوە؟

- بەڵێ قوربان، چەند شتێکی تر ماون. من هەموو ڕۆژێ تۆم دەست ناکەوێ.

- دەی باشە بیڵێ بزانم چییە؟

- باسی نەجاشی و حارسی کوڕی عەجلان!

- نەجاشی نازناوی پیاوێکە ناوی قەیسی کوڕی عەمرە، بە شیعر هۆزی بەنی عەجلانی داشۆریبوو. حارس هات بۆلای من و سکاڵای لە نەجاشی هەبوو.
منیش پێم وت: "چی پێ گوتن؟"
وتی:
هەرکاتێ خودا دژی خوێڕی بوو
ئەو کاتە دژی بەنی عەجلانە[1] "
من بەرگی شیعرم داکەندوە و کەوای قەزام پۆشیوە و ویستم بڕیارێکی گوماناوی نەدەم.
منیش پێم وت: "ئەمە نزایە، خوا دژی هیچ موسڵمانێک نییە!"
ئەویش وتی: "گەورەم! ئەو دەڵێ:
'ئەوان هۆزێکن پەیمان ناشکێنن
هەرگیز ستەمیش لە خەڵکی ناکەن"[2]

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

اذ الله عــادى أهـــل لؤم و ذلــة      فعادى بنى العجلان رهط ابن مقبل

[2] عەرەبیەکەی ئاوایە:

قبيـلــة لا يـغـدرون بــذمــة      ولا يظلمون النـــاس حبـة خردل

منیش پێم وت: "دەی خۆزگە نەوەکانی خەتتاب هەموویان وا بوونایە."

بەخوا من دەمزانی مەبەستی چی بووە، کاتی خۆی عەرەب مەبەستیان لەوە کە ستەمکار نییە یانی خوێڕی و ترسەنۆکن، ئەو ویستویەتی بڵێ: "ئەو هۆزە هەموویان خوێڕی و ترسەنۆکن،" بەڵام شیعرەکە دوو مانای هەیە، مانایەکی نزیک کە لە وشەکان دەردەکەوێ، ئەو مەبەستی ئەمەیان نەبووە و، مانایەکی دووریش کە لەناوەڕۆکی شیعرەکەوە دەردەکەوێ. من بۆم نییە کابرا بگرم و بڵێم: سوور دەزانم مانا دوورەکەت مەبەستە و، تۆڵەی لێ بکەمەوە. منیش هەر بەپێودانگی ئەوەی کە بە بەڵگەی گوماناوی حوکم و بڕیار نادرێ، وتم: "خۆزگە نەوەکانی خەتتاب هەموویان وا بوونایە."

دوایی وتی: "ئەی گەورەی ئیمانداران! ئەو پێمان دەڵێ:

'مردوویان بمرێ سەگ گۆشتی ناخوا

سەگ گۆشتی کەعب و نەهشەل زوو دەخوا[1] '

منیش وتم: "دەی ڕاست دەکا، مردووەکان دەخەنە قەبر و، ئیتر سەگ گۆشتیان ناخوا. بە خوا دەمزانی مەبەستی چی بووە، مەبەستی ئەوە بووە کە دایانشۆرێ و بڵێ: ئەوەنە پیس و بۆگەنن، سەگ بێزی نایە گۆشتی مردوەکانیان بخوا. بەڵام ئەگەر سەگەل ڕێیان لە لاشەی مردوویەکی بەنی نەهشەل بکەوێ، هەمووی دەخۆن. یانی بەنی نەهشەل پاک و خاوێن و بەڕێزن. دیسان لێرە ئەمەیشم پێنە کرد و بە بەڵگەی گوماناوی بڕیارم نەدا!

دیسان وتی: "قوربان ئەو پێمان دەڵێ:

"ناچنە سەر کانی هەتا ئێوارە

ئەو کاتەی ئاودێر کانی چۆڵ دەکا[2] "

---

[1] عەرەبییەکەی ئاوایە:

تعاف الكلاب الضاريات لحومهم     وتأكل من كعب بن عوف و نهشل

[2] عەرەبییەکەی ئاوایە:

ولا يردون الماء إلا عشية     إذا صدر الوراد عن كل منهل

منیش وتم: "دەی ئەو کاتە زۆر باشە، ئاوەکە لێلایی نامێنێ و کانییش چۆڵ دەبێ."

من دەزانم مەبەستی ئەو لەو شیعرە چی بووە، مەبەستی ئەوە بووە ئەوانە هۆزێکی لاوازن، ئەو کاتەی خەڵک مەڕ و ماڵات ئاو دەدا، ئەوان ناوێرن بچن مەڕ و ماڵاتی خۆیان ئاو بدەن و، دەوەستن تا ئێوارە کانی چۆڵ دەبێ، دوایی دەچن ماڵاتەکانیان ئاو دەدەن. دیسان لێرەیش مانا نزیکەکەم وەرگرت و پینەم کرد و وازم لە مانا دوورەکە هێنا بۆ ئەوەی بە بەڵگەی گوماناوییەوە بڕیار دەرنەکەم.

وتی: "قوربان ئەو بە ئێمەی وتووە:

بۆیە ناونران بە هۆزی عەجلان

ئەو هۆزە وتیان: زۆر بە عەجەلە

مەنجەڵت بێنە و شیری خۆت بەرە.

دۆ و ماست و پەنیر، یان ژاژی و کەرە[1]

منیش وتم: "ئێمە هەموومان بەندەی خوداین، باشترین بەندەیش ئەو کەسەیە کە سوود و قازانجی بۆ خەڵک زۆرە."

بەخوا من دەمزانی مەبەستی قەیس ئەوە نەبوو، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوو کە ئەو هۆزی عەجلانە پاشکۆی خەڵکن، خزمەتکار و کرێکاری خەڵکن، هەر شیردۆشین و دارهێنان و ئاوهەڵگۆزین دەزانن، ئەم کارانەش کاری کۆیلە و بەردەستە نەک کاری ئاغاو سەرۆک. بەڵام من ئەم جارەیش ویستم بۆی پینە بکەم و، بە بەڵگەی گوماناوی بڕیار نەدەم، مانای نزیک و ڕواڵەتی شیعرەکەم وەرگرت و لە ناوەڕۆک و مەبەست خۆم پاراست؛ مرۆڤ دەبێ ئاوا بڕیار بدا!

دیسان وتی: "قوربان قەیس ئەو شیعرەیشی لە داشۆرینی ئێمەدا وتوە:

---

[1] عەرەبییەکەی ئاوایە:

وما سمی العجلان الا لقولهم      خذ القعب واحلب أيها العبد و اعجل

"ئەوانـە ڕۆڵەی خوێڕی و بێکارەن
سەرکز و زەلیل، پوچ و ئاوارەن[١] "

منیش وتم: "بە خوا ئیتر ئەمەم پێ پینە ناکرێ، ئەی تۆ چیت وت؟"

وتـی: "بەسـتمەوە، لـێم دا، پاشـان بەرەڵام کـرد و هەڕەشـەم لـێ کـرد و وتـم: 'یەکجاری تر شتی وا بکەی، لەمە خراپترت بەسەر دەهێنم."

ـ قوربـان مـۆڵەتم دەدەی دووبـارە بـێمەوە سـەر ئەو قسـەیە کە تونـدوتۆڵی و گورجوگۆڵی دژی نەرمونیانی نییە؟

ـ ئەی ئەو باسەمان نەبڕاندەوە؟

ـ بـا قوربـان، بەڵام مەبەسـتم چیـرۆکێکە کە پەیوەنـدیی بە تونـدوتۆڵی و نەرمونیانییەوە هەیە.

ـ ئەو چیرۆکە کامەیە؟

ـ ئەوەی کە لەنێوان تۆ و حەتیئەدا ڕووی دا.

ـ ئەوەنەم باش لە بیرە، وەک بڵێی ئێستا ڕووی دابێ.

ـ دەی بۆم دەگێڕیتەوە؟

ـ لە پرسیارەکەتەوە وا دەردەکەوێ کە شتێکی لێ بزانی!

ـ پێش ئەوەی بە خزمەتت بگەم، ڕازی بووم ئەو چیرۆکـانە لە خەڵـک ببیسـتم، بەڵام ئێستە نا، دەمەوێ لە زاری خۆتەوە بیبیسم.

ـ دەی باشە بۆت دەگێڕمەوە.

ـ باشە قوربان منیش بە باشی گوێ دەگرم.

ـ با لە پێشدا دوو کەسایەتیت پێ بناسێنم، چونکە پێویستە بیانناسی، بۆ ئەوەی بە باشی لە چیرۆکەکە حاڵی ببی، چیرۆکەکە لەنێوان من و حەتیئە ڕووی نەداوە، بەڵام لەنێوان من و حەتیئەدا کۆتایی هات!

---

[١] عەرەبییەکە ئاوایە: اولئک أولاد الهجهن و أسرة الـ لئم و رهط العاجز المتذلل

سەرەتا لەنێوان حەتیئە و زیبرەقانی کوڕی بەدردا ڕووی دا.

حەتیئە ناوی جەروەلی کوڕی مالیکە، حەتیئە نازناویەتی، لەبەر ئەوەی کە زۆر کورتە باڵا بوو، پێیان دەوت: "حەتیئە،" سەردەمی نەفامی دیبوو، درەنگ موسڵمان بوو، لە سەردەمی ئەبوو بەکردا ئیمانی هێنا، زمانی تیژ بوو، لە داشۆریندا باڵادەست بوو، هەرکەسی ناسیبا، مەگەر چۆن، ئەگینا بە شیعر دایدەشۆری؛ تەنانەت بە شیعر دایک و باوک و خاڵ و مامەکانی خۆی داشۆریبوو. ڕۆژێک هیچ کەس نەمابوو دایشۆرێ، دەستی کردبوو بە داشۆرینی خۆی، ئەمە پێش ئیسلام بوو، لە داشۆرینی دایکیا دەڵێ:

"بڕۆ دوورکەوە لام دامەنیشە

خودا بتکوژێ، با خەڵک ڕزگار بن

بە دزی داوای هێلەکێ دەکەی

لەلای کەس مەیلێن زۆر زۆر هوشیار بن

زۆر بە ئاشکرا فیتنەیی دەکەی

خەڵکی هان دەدەی، دەڵێی: وەک ئار بن

خودا هەمیشە شەڕت بنووسێ

چی نەوەت هەیە بەڵاو ئازار بن[١] "

---

[١] عەرەبیەکەی ئاوایە:

تنحی فـــاقعدی عنی بعیدا — أراح الله منک العالمینا

أ غربالا إذا استودعت سرا — وکانونا علی المتحدثینا

جزاک الله شرا مـن عجوز — ولقاک العقوق مـن البنینا

باوک و مام و خاڵی خۆی داشۆریوە و گوتوویەتی:

"خوا داتوەشێنێ باوک و مام و خاڵ

چتۆ پیاوێکن؟ بێ ماڵ و بێ حاڵ

لەسەرشۆڕیدا پیاوێکی دیارن

لەناو مەردانا لەودیون سەد یاڵ[1] "

لە داشۆرینی خۆیدا دەڵێ:

"دەم وتی: زمان ئەمڕۆ هەر دەبێ

بۆ داشۆرین و غەیبەت بەکار بێ

زەمی کێ بکەم؟ با هی خۆم بکەم

تف لە ڕوومەتم، لەسەرم، لە پێ[2] "

ئەمە حەتیئە، با بێمە سەر باسی زیبرەقان، زیبرەقان نازناو بوو، چونکە ئەوەندە جوان بوو پێیان دەوت: "زیبرەقان،" لە سەردەمی نەفامیدا گەورە و ماقووڵ بوو. لە سەردەمی ئیسلامیشدا هەر ماقووڵ و بەڕێز بوو، وەک وەفد و نوێنەر هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و ئیمانی هێنا. پێغەمبەریش کردی بە کاربەدەستی زەکات و سەدەقەی هۆزەکەی، دوای ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، هەندێ کەس لە ئایین وەرگەڕانەوە، بەڵام ئەوان هەر لەسەر ئایینداریی خۆیان سوور بوون، هەرچی زەکات و سەدەقە هەبوو هەمووی بۆ ئەبوو بەکر هێنا. ئەبوو بەکریش هەر لەسەر کارەکەی خۆی هێشتیەوە، منیش لە سەردەمی خەلافەتی خۆمدا هەر لەسەر کار لام نەبرد.

---

[1] عەرەبییەکەی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| لحاك الله ثم لحاك حقا | أبا و لحاك من عم و خال |
| فنعم الشيخ أنت لدى المخازى | وبئس الشيخ أنت لدى المعالى |

[2] عەرەبییەکەی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| أبت شفتاى اليوم إلا أن تتكلما | بشر فما أدرى لمن أنا قائله |
| أرى لى وجها شوه الله خلقه | فقبح من وجه و قبح حامله |

ئەم دوکەســە پــاڵەوانی چیرۆکەکەمــان دەبــن، چیــرۆکەکەیش لە ســەردەمی خەلافەتی مندا و لە کاتی وشکە سالیە بەناوبانگەکەدا ڕووی دا. زیبرەقان سەدەقە و زەکاتی هۆزەکەی هێنا بۆ ژێر دەسەلاتی من. لە ڕێگە گەشتبووە حەتیئە. حەتیئە لەگەڵ ماڵ و منداڵیدا بەرەو عێراق دەڕۆشتن. زیبرەقـان حەتیـئەی، دەناسـی بەلام حەتیئە زیبرەقانی نە دەناسی.

زیبرەقان لە حەتیئەی پرسی: "بۆ کوێ دەڕۆی؟"

وتی: "بۆ عێراق."

زیبرەقان وتی: "لەوێ چی دەکەی؟"

وتی: "وشکە سالیە، دەڕۆم بەلکو لەوێ پیاوێ ژیـانی خـۆم و مـاڵ و منـداڵم لە ئەستۆ بگرێ. منیش بە شیعرەکانم هەر مەدحی دەکەم و پەسنی دەدەم."

زیبرەقـان وتـی: "بە پیاوێـک ڕازی دەبـی شـیر و خورمـات پـێ بـدا و ڕێـزت بگرێ؟"

حەتیئە وتی: "کێیە؟"

زیبرەقان وتی: "من."

حەتیئە وتی: "تۆ کێی؟"

زیبرەقان وتی: "زیبرەقانی کوڕی بەدر."

حەتیئە وتی: "ماڵت لە کوێیە؟"

زیبرەقان وتی: "سواری ئەم وشترە بـبە و بەرەو خـۆر بـڕۆ گەشـتی بە هەرکـێ، پرسیار بکە ماڵەکەم دەدۆزیتەوە و، منیش کارەکەم تەواو کرد، دێمەوە."

حەتیئە ڕۆشت و ماڵی زیبرەقانی دۆزیەوە، ژنەکەی زیبرەقـان بە جـوانی ڕێـزی گرتن، بە خێوی کردن، خانەخوێیەکی بـاش بـوو بۆیـان. هـۆزی شـیماس بەمەیـان زانی، ئەوان لە پیاوەتی و ماڵداریدا ململانێیان لەگەڵ زیبرەقانـدا دەکـرد، دەیـانزانی ئەگەر حەتیئە دەست بکا بە پیاهەڵدانی زیبرەقان، ئەوە زیبرەقان تەواو ناو دەردەکا، بۆیە ناردیـان بە دوای حەتیـدەدا. یەکەم جـار نەڕۆشـت، بەلام بە فێـڵ بردیـان،

فێڵەکەیش ئاوا بوو: کەسێکیان نارده لای ژنەکەی زیبرەقان و پێیان وت: "زیبرەقان بە نیازە کچەکەی ئەم حەتیئەیە مارە بکا." کچەکەی ناوی مولەیکە بوو، زۆر جوان بوو. ئیتر ژنەکەی زیبرەقان بەرابەر ماڵی حەتیئە گۆڕا و لوتەلا بوو لێیان. دوایی هۆزی شیماس ناردیان بە دوای حەتیئەدا و بەڵێنیان پێ دا کە بە جوانی بەخێوی بکەن و دڵی ڕابگرن.

حەتیئە پێی وتن: "ژن هەروا خۆش باوەڕ و عاتفییە، من گوناهی ئەم ژنە لەسەر زیبرەقان حسێب ناکەم."

ئەوان زۆر لە حەتیئە پاڕانەوە، لەولایشەوە ژنەکەی زیبرەقان هەر لوتەلا بوو لێیان، بۆیە ڕازی بوو بڕوا بۆلای ئەوان. ئەوانیش دەوارێکی گەورەیان بۆ حەتیئە هەڵدا، شیر و خورمای زۆریان پێدا، جلوبەرگی زۆر، وشترێکی شیردەریش.

زیبرەقان گەڕایەوە، پرسیاری حەتیئەی کرد، چیرۆکەکەیان بۆ گێڕایەوە، ڕمەکەی هەڵگرت و سواری ئەسپەکەی بوو، ڕۆشتە بەر دەرگەی ماڵی هۆزی شیماس و وتی: "ئەو میوانەم بۆ بگەڕێننەوە."

بەغیزی کوڕی عامیری کوڕی شیماس پێی وت: "ئەو تازە میوانی تۆ نییە و لە دەستت دا."

ئەگەر ڕیشسپی هەردولا نەبا، شەڕ دەقەوما.

بە بەغیزیان وت: "میوانەکەی بدەرەوە."

وتی: "هەرگیز کاری وا ناکەم، دواتر حەتیئە خۆی ئازادە چی دەکا، با بیکا."

بە حەتیئەیان وت و ئەویش بەغیزی هەڵبژارد.

زیبرەقان هات و لە بەردەم حەتیئەدا وەستا و پێی وت: "باوکی مولەیکە! ئەوە لە بەر ناخۆشی و ناڕەحەتی ماڵی منت بەجێ هێشت؟"

وتی: "نە."

زیبرەقان گەڕایەوە و حەتیئەی بەجێ هێشت.

حەتیئەیش دەستیکرد بە پەسندانی هۆزی شیماس، بەڵام ڕازی نەدەبوو هەرگیز زیبرەقان داشۆرێ. هۆزی شیماس بەردەوام داوای ئەو کارەیان لە حەتیئە دەکرد، ئەویش دەیوت: "ئەو پیاوە بێتاوانە."

ئەوان ئەوەندە تکایان لێ کرد، حەتیئە ناچار ئەم بەیتەی لە داشۆرینی زیبرەقاندا وت:

"بە دوای چاکەدا هەرگیز مەگەڕێ

کاری تۆ دووانە: خواردن و پۆشین[1] "

زیبرەقان هات و لای من سکاڵای لە حەتیئە کرد.

منیش پێم وت: "دەی خۆ ئەو شیعرە داشۆرین نییە."

وتی: "قوربان من ئەوەندە ناپیاوم کە تەنیا بخۆم و بپۆشم؟"

من ویستم لەو کارەدا پەلە نەکەم، بڕیاری نابەجێ نەدەم، چونکە قسەکە شیعریشە، ناردم بۆ کەسێکی شارەزا.

- قوربان بۆ کێت نارد؟

- بۆ حەسسانی کوڕی سابیت.

لێم پرسی: "حەسسان ئەم شیعرە داشۆرینە؟"

وتی: "نەک داشۆرین، بەڵکو میز پیاکردنیشە."

- ئەی تۆ چیت کرد؟

- حەتیئەم زیندانی کرد و هەڕەشەی زمان بڕینم لێ کرد.

- دەی دوایی چی ڕووی دا؟

- حەتیئە شیعرێکی لە پەسنی مندا هۆندەوە و لە شیعرەکەیدا داوای لێبوردنی کردووە و دەیەوێ لە بەر منداڵەکانی بەزەییم پیا بێتەوە، دەڵێ: "کەسیان نییە نان و ئاوێکیان بۆ پەیدا بکا."

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

دع المكارم لا ترحل لبغيتها          واقعد فإنك أنت الطاعم الكاسي

- دەی ئەو شیعرەی کە گوتویەتی کامەیە؟

وتویەتی:

"جوجەڵەی ورد و بێ پەڕ و باڵم

لەو دەشتە وێڵن هاوار بەماڵم

سایە و پەنایان وا لە چاڵە ڕەش(سجن)

لە خۆشی دونیا هیچ نەیماوە بەش

سڵاوت لێبێ عومەری دانا

پیاوی بە جەرگ و هێز و توانا

هیواو ئاواتی خەڵکی هەژاری

جێگری نەبی و یاری نێو غاری

بەیعەتیان پێدای لە بەر تۆ نەبوو

خەڵک لە پێش تۆ لە خەمی خۆ بوو[1] "

- ئەی تۆ دوای ئەوە چیت کرد؟

- بەزەییم پیا هاتەوە، بە خوا چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسک، فرمانم دا ئازادیان کرد. دوایی داوایلێبووردنی کرد وتی: "تازە من فێری شیعری داشۆرین بووم،" وتی: 'قوربان من لەمەوپێش دایک و باوک و مام و خاڵ و تەنانەت خۆمم بە شیعر داشۆریوە!' "

وتم: "چیت وتووە؟"

ئەو شیعرانەی کە لە پێشدا بۆم باسکردی هەمووی بۆ وتم.

---

[1] شیعرەکە بە عەرەبی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| مـــاذا تقول لأفراخ بذى مـــرخ | حمر الحواصل لا ماء و لا شجر |
| غيبت كـــاسبهم فـــى قعر مظلمة | فاغفر عليك سلام الله يـــا عمر |
| أنت الامين الذى من بعد صاحبه | ألقت إليک مقـــاليد النهى البشر |
| لـــم يؤثرک بهـــا إذ قدموک لهـــا | لكن لأنفسهم كـــانت بهـــا الإثر |

- دوای ئەوە تۆ چیت کرد؟

- وتم: "نەکەی جارێکی تر خەڵک داهشۆری."

وتی: "دەی منداڵەکانم لە برسدا دەمرن، کاسبی و مووچە و کاری من هەر ئەوەیە!"

منیش وتم: "دەی نەکەی جیاوازی بکەی."

وتی: "جیاوازیی چییە؟"

وتم: "جیاوازی بکەی لەنێوان خەڵکدا و بڵێی فلان لە فیسار باشترە و هۆزی ئەم لە هۆزی ئەو باشترە."

وتی: "بە خوا تۆ لە من شاعیرتری."

- دەی قوربان دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

- نامووس و شەرەفی خەڵکم لێ کڕییەوە.

- چۆن؟

- سێ هەزار دیرهەمم پێدا و بەڵێنم لێ وەرگرت کە چیتر خەڵک بە شیعر دانەشۆرێ.

- ئای قوربان چ پیاوەتیەکی گەورەیە! ئەمە یەکەم جارە ببیسم کەسێک شەرەف و نامووسی خەڵکی بکڕێتەوە.

- کوڕم! خەڵک ئەمانەتە لای من. خوای گەورە ئەو خەڵکەی خستووەتە ژێر دەستی من، سەیر دەکا بزانێ من چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکەم؛ برسیەکان تێر بکەم و داکۆکی لە شەرەف و نامووسیان نەکەم؟

- با، بە خوا داکۆکییان لێ دەکەی. لە بیرتە قوربان ئەو کاتەی داوام لێ کردی ئەم چیرۆکەم بۆ بگێڕیتەوە، وتم: "لەم چیرۆکەدا دڵنەرمی و زەبروزەنگی تۆ دەردەکەوێ؟"

- بەڵێ لە بیرمە.

ـ دەی بە خوا ئەمە زەبروزەنگ و دڵنەرمیە. تۆ ڕازی نەبووی موسڵمانێک دابشۆردرێ، لە بەرابەریشدا سزای شاعیرەکەت دا، سزایەکی وا بوو تەمێی بکا نەک لەناوی بەرێ. بەزەییت بە حاڵی خۆی و ماڵ و منداڵیدا هاتەوە، ئازادت کرد و ڕێوشوێنی شیعردانانیشت فێرکرد. دواتریش کە بۆت دەرکەوت ئەو پیاوە جگە لە داشۆرین هیچی تر نازانێ، هەستای حەیا و نامووسی موسڵمانانت کڕییەوە بۆ ئەوەی کەس دانەشۆرێ.

ـ دەی ئەوەیش ڕێزێکی خوداوەندیە، بە هەرکێی بوێ دەیدا. ئێستە پێم بڵێ، وا نازانی باسی شیعر و شاعیریمان درێژ کردەوە؟

ـ بەرەوەڵڵا قوربان.

ـ دەی پرسیاری ترت هەیە یان بەس بێ؟

ـ قوربان لە شیعر تێر بووم، بەڵام لە قسەی تۆ نا. با تا کردنەوەی لاپەڕەیەکی تر ئەم لاپەڕەیە دانەخەین، گەورەم ڕازیت؟

ـ باشە ڕازیم دەی بڵێ!

ـ قوربان باسی شیعرمان کۆتا پێ هێنا، بەڵام ئیزنم بدە باسێکی نزیک لە شیعردوە بێنمە ناو باسانەوە، ئەویش باسی سۆز و خرۆش و میهرەبانییە، لەم سۆنگەوە دەمەوێ پرسیاری قسەیەکی تۆ بکەم کە لەسەر زارانە، گوایە لە سەردەمی خەلافەتی تۆدا پیاوێک هاتوە ویستویەتی ژنەکەی تەڵاق بدا...

ـ کام قسەت مەبەستە؟

ـ ئەو قسەیە کە گوتووتە: "هەموو ماڵێک لەسەر خۆشەویسی بنیاد نراوە؟ ئەی پیاوەتی و بەرپرسیاری لەکوێن؟"

ـ بەڵێ من ئەو کاتە ئەو قسەیەم کرد، پیاوێک هات و وتی: "دەمەوێ ژنەکەم تەڵاق بدەم." منیش وتم: "بۆ؟" دەیوت: "خۆشم ناوێ."

منیش پێم وت: "ئەوە هەموو ماڵێک لەسەر خۆشەویسی بنیاد نراوە؟ ئەی چاودێری و بەرپرسیاری لەکوێن؟"

ـ کەوابێ خۆشەویسی مەرجی بەردەوامی ژن و مێردایەتی نییە و بناغەی پەیوەندیی هاوسەرگیری نییە؟!

ـ مەرج نییە، خێزان بە ئەمانەت و بەرپرسیارێتی و خۆشگوزەرانی و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و هەستان بە بەرپرسیارێتیەوە بەندە. زەواج ئارامی و سۆز و میهرەبانییە. ئەگەر خۆشەویسی ئەو ئارامی و میهرەبانییەی فەراهەم نەکرد، ئەوا دەبێ مرۆڤایەتی و ترسان لە خوا فەراهەمی بکات. هەموومان چاودێرین و هەموویشمان بەرپرسین لەو چاودێریە. یەکێک لەو بەرپرسیاریەتیە ئەوەیە کە نابێ پیاو هەر لەبەر ئەوەی ژنەکەی خۆش ناوێ، ئیتر دەری بکاتە دەرەوە. یەکێکی تر لە بەرپرسیارێتی ئەوەیە کە نابێ پیاو سەر لە ماڵ و منداڵی بشێوێنێ هەر لەبەر ئەوەی کە هیچ خۆشەویسی بۆ ژنەکەی نییە؛ خۆشەویسی مەبەستی کۆتایی نییە. ئەگەر خۆشەویسی لەنێوان ژن و مێرددا هەبوو، ئەوە شتێکی زۆر باش و چاکە، ئەگینا نابێ هەر لە بەر غیابی خۆشەویسی، ماڵ و خێزان و هاوسەرگیری تێک بدرێت. با وای دابنێین کە غیابی خۆشەویسی بنیادی خانەوادە تێک دەدا، ئەی هەموو ماڵێک بەخێوکەر و پیاو یان ژنی تیایە، پیاو کاتێ ژن دێنێ، هیچ لە بارەی ژنەکەی نازانێ جگە لەوەی کە لە دوورەوە دیویەتی یان بیستوویەتی، ژنیش هەروەها، ئەمە لە سەرەتادا خۆشەویسیەک دروست دەکا، بەڵام ئەو ناسینەی کە خۆشگوزەرانی لەسەر بنیاد دەنرێت و بە درێژایی رۆژگار درێژە دەکێشێ و هەموو پلەکانی ژیان بە ترش و شیرینییەوە دەبڕێ، ئەوە ئەو ناسینەیە کە لە دواییدا بۆ ژنەکە دەردەکەوێ، ئیتر جاری وا هەیە ئەو ناسینەی کە دەردەکەوێ، ژنەکە پێی قەڵس دەبێ و جاری واش هەیە کەیفی پێی دێ، یان ئەو شتەی کە لە سەرەتادا هەستی پێ دەکرد، ئێستە هەستی پێ ناکا. ژیانی زۆربەی ژن و مێردەکان ئاوایە،

دەی دەبێ بە تەڵاقدان لە یەکتر جیابنەوە، یان هەر یەکەو سوچێکی ئەو کەمهێنانە بگرنە ئەستۆ و درێژە بە ژیان بدەن؟ ئەو ژیانەی کە دەبێتە هۆکاری خۆپاراستن لە گوناه، دەبێتە هۆکاری منداڵبوون، پەروەردەی منداڵ. گرنگیدانی پیاو بە خێزانەکەی، گرنگیدانی ژن بەو شتانەی لە ئەستۆیدایە، پێش ئەمانەیش لە خواترسان لەلایەن هەردوو لاوە پێش ئەوەی بگەڕێنەوە بەر دادگای خوا.

- بەڵام خۆ قوربان! خوای گەورە تەڵاقی حەڵاڵ کردووە و نەیبەستووەتەوە بە هیچ شتێکەوە. هەرکات پیاو ژنەکەی نەویست، دەتوانێ تەڵاقی بدا؛ هەرکاتیش ژن مێردەکەی نەویست، دەتوانێ خولع بکا و تەڵاقەکەی بکڕێتەوە. لەسەردەمی پێغەمبەریشدا شتێکی وا ڕووی داوە. ژنەکەی سابیتی کوڕی قەیس هاتە خزمەت پێغەمبەر و وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا! من هیچ ڕەخنەیەکم لە ئاکار و دینداریی سابیت نییە، بەڵام پێم ناخۆشە دوای موسڵمان بوون کافر ببمەوە."

پێغەمبەر فەرمووی: "باخچەکەی - کە کردیە مارەیی بۆ تۆ - بۆ دەگەڕێنیتەوە؟"

وتی: "بەڵێ."

پێغەمبەر بە سابیتی فەرموو: "یەک تەڵاقی بدە و باخچەی لێ وەربگرەوە."

دەی ئەمە مانای ئەوە نییە کە نەبوونی خۆشەویسی بەسە بۆ ئەوەی کە پیاو و ژن لە یەکتر جیا ببنەوە؟!

ـ تەڵاق حەڵاڵە بەڵێ. ئایینی ئیسلام تەڵاقدانی حەڵاڵ کردووە. منیش ئەو قسانەم بۆ ئەو پیاوە وەک فەتوا نەکرد، بەڵکو ئامۆژگاریم کرد، ویستم نێوانیان چاک بکەمەوە. ئایین هەندێ شتی بۆ مرۆڤ بەجێ هێشتوە تا بزانێ مرۆڤ چەندە لە خوا ترسە؟ هەر لەبەر ئەوەیشە کە بەهەشت چەند پلەی هەیە، پەڕینەوەیش لە پردی سیرات، ئەویش دیسان پلە پلەیە، مرۆڤی وا هەیە بە ئاسانی لێی دەپەڕێتەوە، هەیە بە ناڕەحەتی، هەیە لە ناوقەدی پردەکەدا دەکەوێتە خوارەوە، هەیشە لە یەکەم هەنگاودا دەکەوێ. سزا و ئاگری دۆزەخیش بەهەمان شێوە پلەپلەیە. لەنێوان حەڵاڵ

و حەرامدا ئەوەندە مەودا زۆرە، بەشی ئەوە دەکا کە مرۆڤ بیەوێ لە چ پلەیەکدا بێت. زۆر جار ئایین لە مەڕ هەندێ شتەوە بێدەنگە، بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی خۆی بدوێ، خۆشناکاری خۆی بدوێ، لێبوردن خۆی بدوێ. نابینی ئیسلام کوشتنەوەی بکوژی بۆ خزمەکانی کوژراو حەڵاڵ کردووە، هەرخۆیشی هانی خەڵک دەدا کە چاوپۆشی بکەن و نەیکوژنەوە، فرمان ناکا بە لێبوردن بەڵکو داوا دەکا. ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ الشورى: ٤٠ واتە: "ئەو کەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی بکات، ئەوە پاداشتی لای خوایە."

نابینی مافی خەڵک بە سەر خەڵکەوە ڕوون دەکاتەوە، حوکم و بڕیاری بۆ داناوە، دوایش دەفەرمووێ: ﴿فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ البقرة: ١٧٨ واتە: "ئینجا هەرکەسێک لەلایەن برایەکی دینییەوە بە بەشێک بەخشرا، دەبێ بە باشی پەیڕەوی بکەن."

بەڕاستی کاکڵە و گەوهەری هیچ شتێک حەرامێتی یان حەڵاڵێتی ئەو شتە نییە، بەڵکو هەڵوێستی مرۆڤە. ئا لەو کاتەی سەرپشک دەکرێت، جا ئیتر یان ئەوەتە مرۆڤێکی باش دەردەچێ و ڕەچاوی خەڵکیش دەکا. ئەگەر خۆی بەڕێز بوو لە مافی خۆی خۆش دەبێ، چونکە دەزانێ سەندنەوەی ماف بە زەرەری کەسانی تر تەواو دەبێ، یان ئەوەتا چی قازانجی خۆی بێت، وا دەکا و ڕەچاوی کەس ناکا، ئەوەیش زەرەر لە بیر و بڕوا و دینی نادا، بەڵام لە پیاوەتی و جوامێریی کەم دەکاتەوە. دواتریش نەبوونی خۆشەویسی مانای ڕقلێبوون نییە، ئەگەر ڕق لەنێواندا نەبێ، پێکەوە ژیان ئاسانە. ئەگەر خۆشەویسی و ڕق هیچیان نەبوون، با سۆز و دۆستایەتی هەبێ.

- دۆستایەتی؟!

- بەڵێ کوڕم! دۆستایەتیی ژن بۆ پیاوەکەی ئەوەیە کە گوێڕایەڵ بێت، هی پیاویش ئەوەیە کە ئاکارجوان و ڕەفتار شیرین بێ، ئەمە سۆز و هاوسەنگی لەنێوان

خێزانەکاندا دروست دەکا. ئەو ژنەی کە مێردەکەی خۆش ناوێ، دەبێ خۆی وا نیشانی مێردەکەی بدا کە خۆشی دەوێ، نابێ بێزاری و وەڕەسی خۆی ئاشکرا بکا. ئەگەر وایکرد، ئەوە بنیادی خانەوادە تێک دەچێ و مەبەستی سەرەکی زەواج بەجێ نایەت. ئەگەر ژن بێزاریی خۆی دەربڕی، لە بەرابەریشدا پیاو هەست بە ڕق و کینە و دوژمنایەتی و ئاژاوە دەکا. جا جیاتی ئەوەی دۆستی یەکتر بن، دەبن بە دوژمنی یەکتر، ئیتر هێمنایەتی و هۆگری لە ناو دەچێ و، سۆز و ڕێز لە دڵی هیچ لایەکدا نامێنێ. لەم بارەوە چیرۆکێکم لایە، لە سەردەمی خەلافەتی مندا پیاوێک هەبوو ناوی ئیبن ئەبی عوزرە بوو. ئەم پیاوە ژنی زۆری هێنابوو، زۆریشی تەڵاق دابوو، بۆیە بووبووە بنێشتە خۆشەی دەمی خەڵک. دوای ئەوەی زانی بووەتە بنێشتە خۆشە، هەستا عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی برد بۆ ماڵی خۆیان. لە بەردەم عەبدوڵڵادا بە ژنەکەی وت: "سوێندت دەدەم بە خوا، تۆ ڕقت لە منە؟!"

ژنەکەی وتی: "سوێندم مەدە."

وتی: "بەڕەوەڵڵا سوێندت دەدەم."

ژنەکەی وتی: "دەی ئەرەوەڵلا."

ئیبن ئەبی عوزرە بە عەبدوڵڵای وت: "گوێت لێیە؟"

دوایی هات بۆلای من، وتی: "گەورەم! خەڵک دەڵێن گوایە من ستەمم لە ژنەکانم کردووە و تەڵاقم داون. دەی خۆت لە عەبدوڵڵا بپرسە بزانە ژنەکەم چی وتووە؟"

لە عەبدوڵلام پرسی و ئەویش باسەکەی گێڕایەوە.

ناردم بە دوای ژنەکەیدا، ژنەکەی هات، پێم وت: "ئەوە تۆ بە مێردەکەتت وتووە خۆشم ناوێی و ڕقم لێتە؟"

وتی: "ئەی گەورەی ئیمانداران! من پێش ئەو تەوبەم کرد و گەڕامەوە. ئەو سوێندی دام، نەمتوانی درۆ بکەم. قوربان! درۆ بکەم؟"

وتم: "بەڵێ، درۆ بکە. هەر ژنێک مێردەکەی خۆش ناوێ، با پێی نەڵێ خۆشم ناوێی. کەم خێزان هەیە کە تەنیا خۆشەویستی بە یەکەوەی گرێدابن. خەڵک بە ئاکاری جوان و بە هۆی دینداریەوە لەگەڵ یەکدا دەیانکرێ و پێکەوە دەژین."

- کەوابێ ڕەوایە ژن بە هۆی درۆوە نێوانی لەگەڵ پیاوەکەیدا خۆش بکا؟

- درۆ تەنیا بۆ ئاشتبوونەوە ڕەوایە، چونکە لە کاتی ئاوادا ڕاستگوتن ماڵوێرانیی بە دوای خۆیدا دەهێنێ. ئەگەر دەرخستنی شتە جوانەکان و شاردنەوەی شتی ناشیرین باش بێ، ئەوە شاردنەوەی ئەو شتەی کە شاراوەیە باشترە، وەک ئەوەی ئافرەتێک ئەو شتانە لە مێردەکەی بشارێتەوە کە ئاشکرابوونی دەبێتە هۆی شەڕو ئاژاوە. خۆ ئەگەر ژن فرمانی پێ کرابێ کە خۆی بۆ مێردەکەی بڕازێنێتەوە، ئەوە قسەی جوان و گفتولفتی خۆشیش بەشێکە لەو خۆڕازاندنەوە. تەنانەت لە خۆڕازاندنەوەیش گرنگترە، چونکە ئەو زمانەی کە پیسە و خۆی لە وتنی قسەی خراپ ناپارێزێ، دەبێتە هۆی تۆرانی هاوڕێ و هاوسەر.

خوی مرۆڤ وایە، ملکەچی قسەی نەرمونیانە. قسەی نەرمونیان کلیلی دەرگای دڵە، چۆن دەیڵێ، بە چ جۆرێک دەری دەبڕێ. خۆ ئەگەر لە قسەکردندا زانا و لێهاتوو نەبوو، با زمانی خۆی بگرێ و هیچ نەڵێ. ئەمە دابونەریتی کۆمەڵگایە و لە کاتێکدایە کە ئەو دوو مرۆڤە لەوانەیە تەنیا یەک جار لە ژیاندا یەک ببینن. ئەی دەبێ پیاو و ژن چۆن بن کە بە درێژاییی ژیان پێکەوە دەبن؟

- ڕاست دەکەی قوربان! قسەکانت زۆر جوانن و لە جێی خۆیەیان دان. ئیزنم دەدەی پرسیاری هەنێ کاروباری خانەوادەکانی سەردەمی خەلافی خۆتت لێ بکەم، چونکە وتە و ئامۆژگایەکانت سوودی گشتییان تیایە.

- کوڕم! وەک چۆن مرۆڤەکان لە یەکتری جیاوازن بە هەمان شێوە خانەوادەکانیش جیاوازن. خانەوادە و بنەماڵە بەسراوەتەوە بە تاکەکانییەوە. ئەگەر تاکەکان باش و ڕێکوپێک و چاک بن، ئەوا خانەوادە و بنەماڵەکانیش وا دەبن، بەڵام خوانەخواستە ئەگەر تاکەکان خراپ و نالەبار بن، خانەوادەکانیش خراپ دەبن. جاری وایش هەیە لە خانەوادەیەکدا هەم تاکی خراپ هەیە، هەم باش. خانەوادە وەک چەتر وایە و داپۆشەری عەیب و عاری تاکەکانە و خراپەکانیان دەشارێتەوە، جگە ئەو تاکانە نەبێ کە خۆیان عەیب و عاری خۆیان ئاشکرا دەکەن، ئابڕووی کەس ناچێت، ئەو کەسە نەبێ کە خۆی ئابڕووی خۆی دەبا. ئەو دەرگایە ناکرێتەوە، ئەو کاتە نەبێ کە تاکەکان دەیکەنەوە. من لە سەردەمی خەلافەتی خۆمدا شەوان دەردەچووم و بە کۆڵان و شەقامەکاندا ئەگەڕام تا بزانم حاڵی خەڵک چۆنە و لە چ بار و گوزەرانێکدان؟ بۆ ئەوەی کێشە و ئارێشەکانیان کۆتا پێ بێنم و هاوکاریان بم، شەو بە تاریکیی خۆی ڕەنگ و شێوەی دەموچاوەکان دەشارێتەوە، بە هەمان شێوە دەنگ و باسیشیان هەر دەشارێتەوە. ئا لەبەر ئەوە شەوان زۆر باش بوو بۆ ئەوەی من بگەڕێم و ئەو شتانەی بە ڕۆژ بۆم دەرناکەوێ، بە شەودا بیانزانم. شەوێکیان بۆ ئەو مەبەستە لە دەرەوە بووم، گوێم لە دەنگی دوو ژن بوو، بە گفتوگۆکەیاندا زانیم دایک و کچن. دایکەکە بە کچەکەی دەوت کە ئاو بکاتە ناو شیرەوە، بۆ ئەوەی شیرەکە زیاد بکا و ئاوەکەیش بە نرخی شیر بفرۆشن. کە گوێم لەم قسەیە بوو، ڕاوەستام بزانم لە ئەنجامدا چی دەکەن. کچەکە بە دایکی وت: "واناکەم!" دواییش وتی: "عومەری گەورەی ئیمانداران گوتوویەتی کەس شیر و ئاو تێکەڵ نەکا بۆ فرۆشتن!"

دایکەکە دەیویست کچەکەی ڕازی بکا، بۆیە وتی: "دەی خۆ عومەر نامانبینێ و ئاگای نییە لێمان!"

کچەکە وتی: "دەی خۆ خوای عومەر ئاگای لێمانە و دەمانبینێ!"

- بە خوا قوربان وەڵامێکی جوانی داوەتەوە، ئەی تۆ چیت کرد؟

- پێم وایە نموونەی ئەو جۆرە کچانە زۆر کەمن، ئەوانە پێویستییان بەوە نییە کەس چاودێریان بێت، چونکە خۆیان دەزانن کە خوای گەورە پێش هەموو کەس چاودێرە و ئاگای لە خشەی مار و مورورە. وەلامی ئەو کچەم بەلاوە گرنگ بوو. بڕیارم دا ئەگەر خوا بیەوێ، بیکەم بە بووکی خۆم و داوای بکەم بۆ یەکێک لە کوڕەکانم. دەبێ کوڕ لەبەر کاری ئاوا چاک، دڵی لە کچێک بچێت. هەموو جارێک لەو شەوانە ئەگەر بمویستایە ماڵێک بە ڕۆژدا بدۆزمەوە، ئەوا دیاریم دەکرد و نیشانەیەکم بۆ دادەنا، بۆ ئەوەی بە ڕۆژدا بێمەوە و ماڵەکە بە ئاسانی بدۆزمەوە و کێشە و ئارێشەکانیان چارەسەر بکەم، بەڵام ئەم جارەیان مەبەستەکە جیاواز بوو، ئەم جارە کەسێکم دۆزیبووەوە کە شایانی ئەوە بوو ببێتە هاوسەر و دایک. بۆیە کوڕەکانم کۆ کردەوە و باسەکەم بۆ گێڕانەوە، وتم: "کامتان ژنی دەوێ؟"

عاصمی کوڕم وتی: "من." بۆمان داوا کرد و کچەکە بوو بە بووکی من. ئای کە بووکێکی چاک و هاوسەرێکی چاکە!

— بە خوا قوربان کارێکی باشت کرد. دەی قوربان چیتر لایە لەمەڕ ئێشکچێتی شەوانە، بۆم باس بکەی؟

- زۆر هەیە. خەڵک ئەو شتانەی کە بە ڕۆژدا دەیشارنەوە، بە شەودا دەریدەخەن. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە شەو عەیب و عارەکان دادەپۆشێ. تەنیایی ئەو خەڵکە پاڵنەرێکە بۆ ئەوەی هەرشتێکی مەبەستە، بێ دوودڵی و ترس بیکا. هەست دەکەن زیاتر لە پەروەردگارەوە نزیکن، سکاڵای خۆیان لای خودا دەکەن. هەر لەم بارەوە شەوێک گوێم لە ژنێک بوو بە دەم سۆزەوە دەیوت:

"دۆستم لام نییە کەمێک ڕابووێرین
شەوگار درێژە، چاوم پڕ ئەسرین
بەخوا ئەگەر خوا چاودێرم نەبا

نوێن و بانەکەم هەموو هەڵەفڕین

ترسی خواو ڕێزی مێرد و شکۆی خۆم

بوونەتە لەمپەر بۆ منی بەدین[١] "

ڕۆشتم پرسیارم لە حەفصەی کچم کرد و وتم: "ڕۆڵە، ژنان تا چەند تەحەمولی دووری مێردەکانیان دەکەن؟"

وتی: "شەش مانگ."

منیش فرمانم دەرکرد کە نابێ هیچ سەربازێ لە شەش مانگ زیاتر لە بەرەکانی جەنگدا بمێنێتەوە.

ـ بە خوا قوربان ڕۆشتن بە دەم خەڵکەوە و چاودێرییان لەلایەن جەنابتەوە، هیچ لە تەقوای ئەو ژنە کەمتر نییە. خەلیفەیەکی وەک جەنابت دەبێ خەڵکی ئاوا پاکداوێن پەروەردە بکا. بەڵام قوربان پرسیارێکم لا دروست بووە، هیوادارم ئەو پرسیارەم لای جەنابت ئاسایی بێت!

ـ لە بارەی چییە؟

ـ هەر باسی ماڵ و خێزانە، باسی دایک و کچەکە، باشە سەیر نییە کچ ئامۆژگاری دایکی بکا؟ خۆ دەبوو شتەکە پێچەوانە بایە، دایک ڕاهێنەرە، پەروەردەی خێزانی بە دەستە. تۆ پێت وایە چاکێتی و لەخواترسیی کوڕ هیچ پەیوەندی بە ئاکار و ڕەفتاری باوکەوە نەبێ؟

ـ کوڕم! دایکان و باوکانیش مرۆڤن، دایکایەتی و باوکایەتی وا لە مرۆڤ ناکەن ئیتر ئەو مرۆڤە بە هیچ جۆرێک تاوان نەکا. هەر لەبەر ئەوەی بوونەتە دایک و باوک نابنە شتێکی تەواو پیرۆز. چاکە و چاکەخوازییش هەرکات ڕێی بردە سەر

---

[١] عەرەبیەکەی ئاوایە:

تطاول هذا الليل واسود جانبيه ... وارقنى أن لا حبيب ألاعبه

فوالله لـولا الله أنـى أراقبه ... لحرک هـذا السرير جوانبه

مخافة الله و الحيـاء يصدنى ... وإكرام بعلى أن تنال مراتبه.

دڵێک، هەقی بە تەمەن و ئەوانەوە نییە. عەقڵ و ئاوەز هەرکات ڕێی کەوتە مێشک و دڵی کەسێک، هەقی بە سپیبوونی موو و شتی وا نییە، ئەوە هیدایەتە هیدایەت! بەڵام ئەوەیشمان لە بیر بێ کە پەروەردەکردن ڕۆڵێکی زۆر گرنگی لە ژیاندا هەیە. بە پەروەردەکردنێکی باش زۆر جار مرۆڤی نالەبار دێتە سەر ڕێ. بە پەروەردەی خراپیش جارجار مرۆڤی باش خراپ دەبێ. بەڵام پەروەردەیش سنوورێکی هەیە لێی تێناپەڕێ، جاری وا هەیە مرۆڤ ئاکار و ڕەفتارێکی هەیە هەر لەگەڵیدا لە دایک بووە و سروشتی مرۆڤەکە وایە، ئەو سروشتە قابیلی خێریش و شەڕیشە، بەڵام دەبێ ئارەزوویەکی پێشتر هەبێ بۆ سەر ئەو ڕێگەیەی کە مرۆڤ هەڵیدەبژێرێ، ئارەزوویەک کە لە گیانەوە سەرچاوەی گرتبێ، ئارەزویەکی وا کە هەرکات پەروەردە و پێگەیاندن ڕاستە ڕێگەی خۆیان گۆڕی، ئەو ئارەزووە بیانخاتەوە سەر ڕێ. چاکبوونی مرۆڤەکانیش نەبەسراوە بە چاکبوونی باب و باپیران. ئەگەر وابا ئیبراهیم چۆن دەبوو بە پێغەمبەر، خۆ باوکی ئیبراهیم بتپەرست بوو؟! چاکبوونی دایک و باوکیش نابێتە قەڵای پۆڵایین بۆ منداڵ. ئەگەر وابا، چۆن نووح موسڵمانەکانی سەردەمی خۆی لە لافاو دەرباز دەکرد و کوڕەکەی دەخنکا؟! ئەمە دوو نموونە بوو لە ماڵ و خێزانی پێغەمبەرانەوە ڕوویان دابوو، ئیتر دەبێ خەڵک چۆن بن. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم قسە مانای ئەوە نییە کە چاکبوونی باب و باپیر و کوڕوکاڵ هیچ کاریگەرییەکی لەسەر یەکتر نابێ. بەڵام باڵادەسی هەرە مەزن هەر خوایە، دڵی مرۆڤ بە دەست خوایە، ئەگەر خوای گەورە هیدایەتی خستە نێو دڵێکەوە، ئەو دڵە نەک بە فووی گومڕایی، بەڵکو بە ڕەشەبای گومڕاییش لە جێی خۆی نالەقێ و ناجووڵێ.

- ڕاست دەفەرمووی قوربان! ئا لەبەر ئەوەیە کە خوای گەورە گوێڕایەڵی لە دایک و باوکی لە هەموو گوێڕایەڵییەکانی تر جیا کردووەتەوە و دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ﴾ لقمان: ١٥ واتە: "ئەگەر

(بـاوك و دایکـت) ئەوپـەڕی هـەوڵیان دا لەگـەڵت بـۆ ئـەوەی شـتێ بکـەیت بـە هاوبەشی من کە هیچ زانیاری یەکت پێی نییە، ئەوە کوێڕایەڵییان مەکە."

بەمە بۆمان دەردەکەوێ کە جاری وا هەیە منداڵ باشە و دایک و بـاوک گـومڕایە و ئەو مافە گەورەی دایک و باوک لەسەر منداڵ نابێ بگاتە ئاستێ کە منداڵ بە لاڕێدا بەرێ.

ـ بەڵێ ڕاستە، خوای گەورە چەن مافێکی بۆ دایک و باوک لەسـەر منـداڵ فەرز کردووە و بە پێچەوانەیشەوە هەندێ مافی بە قازانجی منداڵ لەسەر دایـک و بـاوک فەرز کردووە، بۆ ئەوەی مافی هەموو لایەک پارێزراو بێ و تای ترازوی هـیچ لایەک بەسەر لایەکەی تردا زاڵ نەبێ و، هیدایەت و گومڕایی تێکەڵ نەبن و خاوەن مافی زیاتر، مافی ئەوی تر نەخوا!

ـ گەورەم! ئێمە دەزانین مافەکانی دایـک و بـاوک بەسـەر منـداڵەوە چییە! ئەی مافەکانی منداڵ بە سەر دایک و باوکەوە چییە؟

ـ با چیرۆکێکت بـۆ بگێـڕمەوە بـۆت دەردەکەوێ. ڕۆژێـک پیاوێـک هـات بـۆلام، سکاڵای لە کوڕەکەی خۆی دەکرد. منیش بانگی کوڕەکەم کرد. کوڕەکە هات.

لێم پرسی: "بۆچی بۆ باوکت خراپی؟"

کوڕەکە وتی: "قوربان! ئەی منداڵیش مافی بە سەر باوکەوە نییە؟"

وتم: "با."

وتی: "ئەو مافانە چین گەورەم؟!"

وتم: "یەکەم ئەوەیە کە کچێکی باش دەسنیشان بکا بۆ هاوسـەرێتی، بـۆ ئەوەی منداڵەکانی داهاتووی دایکێکی باشیان هەبێ. دەبێ نـاوێکی جـوان بـۆ منـداڵەکەی هەڵبژێرێ. دەبێ فێری قورئانخوێندن وخوێندەوارییان بکا."

کوڕەکە وتی: "دەی قوربان باوکم هیچ یەکێک لەمانەی بۆ من نەکردووە. دایکم قولەڕەشێکی ناشیرینە و کەنیزەی پیاوێکی مەجوسی بووە. نـاوی نـاوم: 'قـالۆنچە' یەک وشەیشی فێر نەکردوم!"

لام کردەوە بە لای پیاوەکەدا وتم: "ئەوە تۆ هاتووی سکاڵا لە کوڕەکەت دەکەی و دەڵێی بۆم خراپە! پێش ئەوەی ئەو بۆ تۆ خراپ بێ، تۆ بۆ ئەو خراپ بووی، پێش ئەوەی ئەو نالەبار بێ، تۆ نالەبار بووی!"

ـ باشە قوربان دەستنیشانکردنی ئافرەتێک بۆ هاوسەرگیری، چۆن مافە بۆ منداڵ؟

ـ ئەمە مافێکە پێش ئەوەی خاوەن ماف بێتە دونیاوە، دەبێ پیاو کچێکی باش دیاری بکا بۆ هاوسەرگیری، بۆ ئەوەی دایکێکی باش بێ بۆ منداڵەکانی. ئەو کەسەی کە باخەوانە، شوێنێکی باش دیاری دەکا بۆ نەمام چاندن. دەبێ پیاو ئافرەتێکی داوێنپاک، دەست و دڵ چاک، بەڕێز و خاوەن شکۆ دیاری بکا، بۆ ئەوەی سبەی کوڕەکەی لەناو خەڵکدا بە هۆی خراپیی دایکیەوە سەرشۆڕ نەبێ. دەبێ ئافرەت بایی ئەوەندە بێ کە بتوانێ منداڵ بە باشی پەروەردە بکا. ئا لەبەر ئەوە دەبێ لە بنەماڵەیەکی باش و پاکداوێن داوای ژن بکا. پێغەمبەر فەرموویەتی: "ژنی باش بۆ خۆتان دەست نیشان بکەن، ئەو کەسانەی کە شایانی ئێوەن، ژنیان لێ بێنن و ژنیان پێبدەن."

ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بەو خێڵەکایەتی و بنەماڵە پەرەستییەوە نییە کە ئیسلام ڕەفزی کردووەتەوە. ئەمە پەیوەندیی بە ئاکار و خۆشڕەفتاریەوە هەیە، پێوەری ئەمەیش تەقوا و لەخواترسانە. ئەو ماڵ و خانەوادەیەی کە بە خواپەرستی و ئاکار و ڕەفتاری ئیسلامییەوە ئاوەدانە، وەک ئەو ماڵ و خانەوادە نییە کە بێڕەوشت و نابەجێن، خانەوادەی خراپی وایش هەیە کە خوای گەورە لوتفیان لەگەڵدا دەکات و هیدایەتیان دەدا و لە خراپەوە بەرەو چاکە دێنەوە.

ـ باشە قوربان ئەمە لەبارەی هەڵبژاردنی دایک، ئەی لەمەڕ هەڵبژاردنی ناو چی؟ چۆن هەڵبژاردنی ناو مافی منداڵی تیایە؟ خۆ منداڵ پێش ئەوەی هیچ شتێک لە دونیا بزانێ، ناوی لێ دەنرێ؟

- بەڵێ، ڕێک لەبەر ئەوەیە کە ناو مافی منداڵە بەسەر دایک و باوکەوە. ناو یەکەم شتێکە کە خەڵک یەکتری پێ دەناسنەوە، منداڵ لە کاتی ناولێنرانەوە تا مردن بەو ناوە بانگ دەکرێت، لەناو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بەو ناوە باسی دەکەن. ناو وەک گیان دەنووسێ بە مرۆڤەوە، بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدایە، لێی جیا نابێتەوە. ئەوەندە بەسە بۆ ناو کە کاریگەریی لەسەر خاوەن ناو هەیە. تۆ دەتەوێ منداڵێک ناوی قالۆنچە بێت و لەناو خەڵکیشدا بە چاوێکی حورمەتەوە تەماشا بکرێت؟ هەرچەند ئەو قالۆنچە ناوە باشترین کەسیش بێ، بەڵام بە هۆی ناوەکەیەوە لە شان و شکۆی دێتە خوارەوە. ئەم جۆرە ناوانە کاریگەرییان لەسەر ڕۆحیەتی مرۆڤ هەیە، دەیکا بە مەسخەرە و گاڵتەی ئەم و ئەو. ئەو باوکەی منداڵەکەی ناو دەنێ قالۆنچە، ئەوە بڕیاری داوە کە ئەو کوڕەی لەناو خەڵکدا بە سەرشۆڕی و سەرکزییەوە بژی و کوڕەکەیش هیچ تاوانێکی نییە، هەر لە منداڵییەوە ئەو باوکە کوڕەکەی خۆی شکاندوەتەوە. هەر خودی ناوەکە بۆ ئەو کوڕە وەک ئەوە وایە کەسێک تاوانێکی کردبێ و بە هۆی تاوانەکەیەوە سەرشۆڕ و سەرکزبێ. نەفامی لەوە نەفامی تر دەبێ چی بێ کە پیاو لەناو ئەو هەمووە ناوە جوانە ناوێکی قۆڕ و خراپ بۆ کوڕەکەی هەڵبژێرێ؟! لە سەردەمی نەفامیدا عەرەب وایاندەزانی ئەگەر ناوی قۆڕ و ناشیرین لە منداڵەکانیان بنێن، ئەوە لە چاوی بەد و لە ئێرەیی ئێرەبەر پارێزراو دەبێ، جا دەگەڕان کام ناوە ناشیرینە، لە کوڕەکانی خۆیان دەنا، لەگەڵ ئەوەیشدا کام ناوە جوانە، لە کۆیلەکانی خۆیان دەنا. مەبەستیشیان ئەوە بوو، کە ناوە ناشیرینەکان لە کوڕەکان دەنێن بۆ دوژمنەکانیان و ناوە جوانەکان لە کۆیلەکان دەنێن بۆ خۆیان. بەڵام دوای ئەوەی ئیسلام هات، ئەو نەفامییەی ڕەد کردەوە. پێغەمبەر هانی خەڵکی دەدا بۆ ئەوەی ناوی جوان و شیرین لە منداڵەکانیان بنێن، چونکە لە ڕۆژی پەسڵاندا بەو ناوانەوە بانگ دەکرێن. هەروەها دەیفەرموو: "باشترین ناو ئەو ناوانەن کە مانای سپاسگوزاری و بەندایەتیی بۆ خوایان تیا بێ. وەک:

عەبدوڵلا و عەبدورڕەحمان." هەرکەسی نەناسیبا بە عەبدوڵلا بانگی دەکرد، چونکە ئێمە هەموومان بەندەی خوداین. ئەمەیش ئەوەمان بۆ دەردەخا کە ناو کاریگەریی لەسەر مرۆڤ هەیە و تەنیا بۆ نیشانە و ناسینەوە بەکار نایەت، هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەر ناوی ناشیرینی دەگۆڕی و ناوی جوانی بۆ خەڵک هەڵدەبژارد. هەر لەم بارەوە با شتێکت بۆ بگێڕمەوە، باپیری سەعیدی کوڕی موسەییەب هاتە خزمەت پێغەمبەر. پێغەمبەر لێی پرسی: "ناوت چییە؟"

وتی: "حەزن(خەمگین)"

فەرمووی: "تۆ (با ناوت) سەهل(ئاسان) بێ."

وتی: "باوکم ناوی ناوم حەزن و، ناوەکەی خۆم ناگۆڕم."

سەعیدی کوڕەزای دەڵێ: "لە دوای ئەو کاتەوە، خەم لە بنەماڵەی ئێمە نەبڕاوە."

پێغەمبەر زۆر ناوی تریشی لە بەر خراپی گۆڕیوە، لەوانە ناوی : عاص(تاوان.) عەزیز(خاوەن دەسەڵات و توانای ڕەها،) عەتەلە(نوێڵ.) شەیتان، حەکەم(پیرە یان بڕیاردەر،) غوراب(قەلەڕەش.) شەهاب(پشکۆ.) حەباب(کوڵی ئاو لەسەر ئاگر یان مار.) حوباب ناوی ناو دەنا هاشم(بێریڤان.) حەرب(جەنگی) ناوی ناو دەنا سەلم(ئاشتی.) مضطجع(پاڵکەوتوو یان بێکار) ناوی ناو دەنا المنبعث(وشیار.)

پارچە زەوییەک هەبوو ناوی عەفرە بوو(یانی: زەوی وشک و زۆر گەرم و بێخێر.) ناوی گۆڕی و کردی بە خضرة(سەوزەڵان.) دۆڵ و شیوێک هەبوو ناوی شعب الضلالة(دۆڵی گومڕایی) بوو، ناوی گۆڕی و کردی بە شعب الهدی(دۆڵی ڕێنوێن.) هۆزێک هەبوو ناویان بنو الزینة(هۆزە نەخۆشەکە) بوو، ناوی گۆڕین بە بنو الرشدة(هۆزی توانا.) بنەماڵەیەک هەبوو ناوی بنو مغوية(بنەماڵەی ڕێونکردوو) بوو، ناوی گۆڕین و کردی بە بنو الرشدة(بنەماڵەی ڕێدروست.)

ڕۆژێک ژنێ هاتە خزمەتی ناوی عاصیة(تاوانبار یان خراپەکار) بوو، لێی پرسی: "ناوت چییە؟"

وتی: "من عاصیەم."

فەرمووی: "نەخێر تۆ جەمیلە(جوانە)ی."

عایشە دەگێڕێتەوە دەڵێ: "ڕۆژێک پیرەژنێک هاتە خزمەت پێغەمبەر، پێغەمبەر لێی پرسی: 'ناوت چییە؟'

وتی: 'من جوسامە(بێکار و تەمەڵ، مۆتەکە یان پیس و نالەبار) م لە هۆزی موزەنیم.'

پێغەمبەر فەرمووی: 'نە! تۆ حسانة(زۆر جوان و دەلال)ی موزەنیت، دەی چۆنن؟ دەنگوباستان؟ چی دەکەن؟ چی ناکەن؟'

وتی: 'وەڵڵا دایک و باوکم بە ساقەت بێ، باشین.'

دوای ئەوەی ڕۆشت وتم: 'ئەی پێغەمبەری خوا! ئاوا بەم جۆرە پێشوازی لە پیرەژنێکی پیر دەکەی؟!'

فەرمووی: 'ئەوە لە سەردەمی خەدیجەدا هات و چۆی دەکردین. وەفا و چاکەلەبەرچاوبوون بەشێکە لە ئیمان!' "

- باشە قوربان ئەمە مافی منداڵ بوو بەسەر دایک و باوکەوە لەمەڕ ناونانەوە، ئەی لەمەڕ فێرکردن و زانستەوە؟

- کوڕم! خوێنەوارکردنی منداڵ بەشێکە لە پەروەردەکردنی. پێویستە باوکان چۆن زگی منداڵەکانیان تێر دەکەن، ئاوا عەقڵ و ئاوەزیشیان تێر بکەن. پۆشتەکردن و نانپێدانی منداڵ چاودێرییە، بەڵام فێرکردنی خوێنەواری پەروەردەیە! باوک پێویستە هەم چاودێربێ و هەم پەروەردەکار. هەرکەس چاودێری و پەروەردەی نەبوو، ئیتر کەی باوکە؟! ئەوە تەنیا خاوەن منداڵە نەک باوک، منداڵی هێناوەتە دونیا و، بەرەڵڵای کردوون چۆن دەژین، بژین! منداڵ فێری خوێنەواری و سەربازی و مەلەوانی و ئەسپ سواری(بۆ ئەمڕۆ شۆفێری) بکەن، هەقی باوکایەتی بە جێ

بهێنن! فێری چاکەیان بکەن. ڕەحمەتی خوا لەو باوکەی لە چاکەکاریدا هاوکاری منداڵەکانییەتی.

ـ ڕەحمەتی خوایش لە تۆ ئەی گەورەم! بە باشی باس لە هەموو کون و قوژبنێک دەکەی، هیچ مافێک نییە باسی نەکەیت، قسە هەر بۆ خۆت باشە، لەم بارەوە هیچی تر هەیە پێم بڵێی؟

ـ شتێکی تر هەیە پەیوەندی بە منداڵ و باوکەوە هەیە. پیاوێک هات بۆ لام و وتی: "لە سەردەمی نەفامیدا کچێکمان بوو، ئەو کچە موسڵمان بووە، تووشی تاوانێک بووە، ڕۆژێک چەقۆیەکی هەڵگرت و خۆی سەربڕی. پێی گەشتم نەمهێشت تەواو خۆی بکوژێ. تەنیا چەند ڕەگێکی لاملی بڕیبوو. دەرمانم کرد و چاک بووەوە، پاشان ڕووی کردووەتە قورئانخوێندن(و تەوبەی کردووە) ئێستە کوڕێک داوای دەکا، ئایا هەموو ئەوانە بدرکێنم و بۆ داواکارەکەی باس بکەم؟"

منیش پێم وت: "ئەوە خوا شتێکی شاردووەتەوە، تۆ دەتەوێ فووی پیا بکەی و ئاشکرای بکەی؟ بە خوا ئەگەر ببیسم یەک وشەت لەو بارەوە باسکردووە، دەتکەم بە پەندی زەمانە. بڕۆ وەک کچێکی داوێن پاک و موسڵمان بیدە بە شوو."

ـ ئەی قوربان ئەم کارەی تۆ دژی ئەو ئایەتە نیە کە دەفەرمووێ ﴿وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ﴾ النوور: ٣ واتە: "ئافرەتی زیناکەر تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات؟"

ـ نەخێر! ئەوە مەبەستی ئەو پیاو و ژنانەیە کە تەوبە ناکەن و ناگەڕێنەوە بەر دەرگای پەروەردگار. ئەوانەی کە بە ڕاستی تەوبە دەکەن، وەک ئەوە وایە هیچیان نەکردبێ مرۆڤی تۆبەکەر وەک ئەوە وایە هیچی نەکردبێ. دواتر داپۆشین و شاردنەوەی تاوان لە پێشترە تا ئەوەی ڕێز و حورمەت و شکۆی کەسێک بشکێندرێت، بە تایبەت باسکردنی شتێک کە هیچ قازانجێکی نەبێ و تەنانەت ببێتە مایەی خراپەکاری و ڕسوابوونی کەسێک. ئەو ئافرەتەی کە تەوبەی کردووە و

خۆی خاوێن کردووەتەوە لەو گوناهەی کە کردویەتی، ئەگەر گوناهەکەی ئاشکرا بکرێ، چی لێ دێ؟ ئەگەر ناوی لەناو ناواندا بزڕێ، چی لێ دێ؟ ئەگەر بە داوێنپیس ناوی دەربچێ، چی لێ دێ؟ تا مردن دەبێتە پەڵەیەکی ڕەش بە نێوچاوانییەوە. ئەو نەنگی و شورەییە چۆن پاک بکاتەوە؟ ئەگەر ئەم باسە بدرکێندرێ بۆ داواکارەکە، ئەوە ئافرەتەکە نەک هەر هەلی هاوسەرگیری لە دەست دەدا، بەڵکو هەلی ژیانێکی پاکیش لە دەست دەدا، ئەوەیش لەبەر تاوانێکی پێشوو کە تەوبەی لەو تاوانە کردووە و لێی پەشیمان بووەتەوە.

ـ بەڵێ قوربان ڕاست دەفەرمووی! کەوابوو تەوبەکردن هەموو گوناهەکانی پێشو دەشواتەوە. قوربان! پرسیارێکم لە دڵدایە، ئیزن دەفەرمووی بیکەم؟

ـ دەی کوڕم! بپرسە.

ـ بەرچاوڕوونی(فەراسەت) و پەیپێبردن چییە؟

ـ بەرچاوڕوونی بریتیە لە: بەڵگەهێنانەوە بە شتە ڕوون و ئاشکراکان، لەسەر بوونی شتە پەنهان و بەرپێوارەکان. ئەوەیش شتێکە بێ تێڕوانین و بەڵگەهێنانەوە دەکەوێتە نێو دڵی مرۆڤەوە.

ـ وەک ئەو هاوڕاییانەی خودا لەگەڵ تۆدا کە لەمەوپێش باسکرا؟

ـ شتێکی ئا لەوجۆرەیە.

ـ من لە فرمایشەکەی جەنابت وا تێدەگەم کە دوو جۆر بێ، تۆ فەرموت: "بەڵگە هێنانەوە بە شتە ڕوون و ئاشکراکان لەسەر بوونی شتە پەنهان و بەرپێوارەکان، ئەمە پێویستی بە ئەزموون و لێڕامان و بەراورد کردنە." دوایش فەرموت: "ئەوەیش شتێکە بێ تێڕوانین و بەڵگە هێنانەوە دەکەوێتە نێو دڵی مرۆڤەوە." بەپێی ئەم قسەیەش، هیچ پەیوەندیەکی بە ئەزموون و لێڕامان و بەراورد کردن نییە، وایە؟!

- ڕێک وایە، دوو جۆرە، بەشێکیان مرۆڤ دەتوانێ بە ئەزموون و لێکۆڵینەوە و لێڕامان و دەروونناسی و داب و نەریتی خەڵکی بە دەستی بێنێ، بەشێکیشیان خوا خۆی دەیخاتە نێو دڵی ئەو بەندانەی کە خۆی دەیەوێ.

- با واز لە بەشی یەکەم بێنین، وا دەردەکەوێ ئەو بەرچاوڕوونیانەی جەنابت لە جۆری دووەم بێ، با باسی جۆری دووەم بکەین، ئایا نموونەی هەیە؟

- کوڕم! نموونەی زۆرە. ئەوە بەشێکە لەو جۆرەی کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "لە بەرچاوڕوونی موسڵمانان بترسن. ئەو کەسەی بەرچاوی ڕوونە، بە هۆی نوورێکی خوداییەوە شتەکان دەبینێ!"(یانی بە نهێنیی ناو دڵ دەزانێ و دەزانێ مرۆڤ چی بە خەیاڵدا دێت.)

ئەم فەرموودە مەبەستی جۆری دووەمە، ئەو جۆرەی کە خوا دەیخاتە نێو دڵی بەندەکانییەوە، بە ئەزموون و لێڕامان پەیدا نابێ. قورئان پڕە لە باسی ئەمجۆرەیان.

- بۆ نموونە کامە؟

- وەک بەرچاوڕوونی خاتوو ئاسیەی خێزانی فیرعەون.

- بەرچاوڕوونییەکەی لەکوێدایە؟

ـ فیرعەون لە خەوا بینی کە ئاگرێکی گەورە بەربووەتە ژوور و هۆڵەکانی کۆشکەکەی، لە ترسدا خەبەری بووەوە، هەموو خەوپەرژێنکەرانی دەرباری خۆی کۆ کردەوە و خەوەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش وتیان: "لە نەتەوەی بەنی ئیسرائیلدا کوڕێک لە دایک دەبێ و تەخت و بەختی فیرعەون تێک دەشکێنێ." فیرعەون فرمانیدا بە سەربڕینی هەر کوڕێک کە لە هۆزی بەنی ئیسرائیلدا لە دایک ببێ. ماوەیەکی زۆر وابوو، کاربەدەستەکانی دەنارد بۆ سەرژمێری ئەو ژنانەی دووگیانن، ناویان دەنووسرا، دەیانزانی کەی وەختی منداڵبوونیانە، سەریان لێ دەدانەوە، ئەگەر منداڵەکەیان کوڕ بایە سەریان دەبڕی، ئەگەر کچیش بایە دەیانهێشتەوە. دوایی میسریەکان هاتن بۆلای فیرعەون و داوایان کرد ڕێگە چارەیەکی تر بدۆزێتەوە، بەنی

ئیسـرائیل هەموویـان کـۆیلە و کرێکـاری فیـرعەون بـوون، کشـتوکاڵیان دەکـرد و خزمەتکاری نێو کۆشکیش بوون، بەرەبەرە جووتیار و خزمەتکارەکان ڕوویان لە کزی کـرد و خەریـک بـوو کۆتاییـان دەهـات، چـونکە کوڕەکـان سـەر دەبـڕان و پیـاوە گەورەکانیش بە تەمەندا دەچون یان دەمردن یان پەکیان دەکەوت. فیرعەون فرمانی کرد ساڵێک ئەو منداڵانەی کە کوڕن سەرببڕێن و ساڵێک لێیان بگەڕێن. ئەو ساڵەی کە بەر بەخشین کەوتبوو، هارونی برای حەزرەتی موسا لە دایک بـوو، لای دایکـی مایەوە. ساڵی دواتـر کە سـاڵی سـەربڕین بـوو، موسا لە دایـک بـوو. خـوای گەورە خسـتیە دڵـی دایکـی حەزرەتـی موسـا کە تێـر شـیری بکـا و دوایـی بیخـاتە نـاو سندووقێکەوە و جوان کونبڕی بکا و بیدا بە ئاودا. خوای گەورە بەڵێنی بە دایکـی حەزرەتی موسا دابوو کە ڕۆڵەکەی بە ساغ و سەلامەتی بۆ بگەڕێنێتەوە. ئەویش بە گوێی فرمانەکەی خوای کرد، بە فرمانی خوای گەورە ئاو سندوقەکەی بـردە بەردەم کۆشکەکەی فیرعەون، لەو کاتەدا فیرعەون و ئاسیە لەنێو باخچەی بەردەم کۆشـکدا کە دەیڕوانییە سەر ڕووبارەکە، پیاسەیان دەکرد. ئاسیە چـاوی بە سـندووقەکە کەوت و وتی بە خزمەتکارەکان بۆی بێنن. کاتێ کردیەوە، تەماشـا دەکـا کـوڕێکی جـوانی تیایە. خوای گەورە خۆشەویسیی ئەو منداڵەی خستە دڵی ئاسیە خانەوە. فیـرعەون ویستی منداڵەکە سەر ببڕێ، بەڵام ئاسیە نەیهێشت و پێی وت: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا﴾ القصص: ٩ واتە: "بۆ مـن و تـۆ دەبێـتە مـایەی چاوڕوونی، واز لە کوشتنی بهێنن، بەشکو سوودی بۆمان هەبێ، یان بیکەینە کـوڕی خۆمان."

فیرعەون بە گوێی ئاسیەی کرد و ڕازی بوو کە کوڕەکە نەکوژرێت. ئەو کوڕە لە کۆشکی فیرعەوندا گەورە بوو، دوایی بوو بە پێغەمبەر؛ موسا بوو. ئاسیە باوەڕی پێ هێنا و موسڵمان بوو. فیرعەون ئاسیەی لە خاچ دا بۆ ئەوەی پەشیمان بێتەوە، بەڵام سوودی نەبـوو. ئاسیە گیـانی خـۆی لە پێنـاو هەق و ڕاستیدا بەخـت کـرد، ئەوە

بەرچاوڕوونیی ئاسیە بوو ئەو کاتەی وتی: "بەشکو سوودی بۆمان هەبێ." چ سوودێک لە بەهەشت گەورەتر و مەزنترە؟!

ـ پاک و بێگەردی بۆ خوا! فیرعەون بۆ ئەوەی ڕێی لە موسا بکەوێ، بە هەزاران منداڵی سەر بڕی، کەچی موسا لە کۆشکەکەیدا گەورە بو؟!

ـ قەزاو قەدەری خوا دێتە جێ کوڕم! کاتێک خوای گەورە نەخشەسازی بۆ شتێک دەکا، مرۆڤ تەواو سەرسام دەبێ، فرمانی خوا لەنێوان کاف و نونە. خوای گەورە سەربازی زۆری هەیە. فیرعەون ویستی موسا سەرببڕێ کەچی موسا لەگەڵ فیرعەوندا لە کۆشکدا لەسەر یەک سفرە نانیان دەخوارد! دایکی دای بە ئاودا و پێی وا بوو ئیتر بێ دایک دەبێ، کەچی خوای گەورە بۆی گەڕاندەوە و دایکێکی تریشی پێ بەخشی کە ئاسیە خانی ژنی فیرعەون بوو. ئەمە جگە لە خودی فیرعەون کە بووبووە چاودێری موسا.

ـ قوربان لە قورئاندا بەرچاوڕوونیی تریش باس کراوە؟

ـ بەڵێ، نموونەیەکت بۆ باس دەکەم دیسان بەرچاوڕوونیی ئافرەتە، پەیوەندیی بە موسایشەوە هەیە. ڕۆژێک پیاوێکی بەنی ئیسرائیلی و پیاوێکی میسری شەڕیان دەکرد، کابرای بەنی ئیسرائیلی چاوی بە موسا کەوت و هاواری لێ کرد. موسا هات و زللەیەکی لە میسریەکەدا، کابرای میسری پار مرد نەک ئەم ساڵ. ڕۆژی دواتر کابرای بەنی ئیسرائیلی دیسان شەڕی دەکرد و دیسان هاواری کردە موسا، موسا چوو بە گژیا و ئەویش ئەوەندە نامەرد بوو کوشتنی پیاوەکەی دوێنێی ئاشکرا کرد. موسا خەبەری بۆ هات کە لە کۆشکەوە فرمانی لە سێدارەدرانی دەرچووە. موسا بەرەو مەدیەن هەڵهات، گەشتە سەر کانییەکەی مەدیەن، تەماشا دەکا ئەو خەڵکە ڕان و مەڕ و ماڵاتی خۆیان ئاو دەدەن، لەولایشەوە دوو ئافرەت زۆر بە شەرمەوە وەستاون، چاوەڕێن خەڵک لێ ببێتەوە و ئەوانیش ڕانەکەی خۆیان ئاو بدەن. موسا هەروا تەماشای دەکرد، دوای ئەوەی شوانەکان لێ بوونەوە، دوو کچەکە

ڕۆشتن ڕان و ماڵاتەکەی خۆیان ئاو بدەن، بەڵام بە باشی نەیاندەتوانی، ئافرەت بوون و لاواز بوون. موسا ڕۆشت و ماڵاتەکەی ئاودا، دوایی ڕۆشتە بن سێبەری دارێکەوە و بۆی ڕاکشا. دوو کچەکە گەڕانەوە بۆ ماڵ و چیرۆکەکەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە. باوکی ئەو دوو کچە پێغەمبەرێک بوو ناوی شوعەیب بوو، شوعەیب بە یەکێک لە کچەکانی وت: "بڕۆ بانگی ئەو پیاوەم بۆ بکە با پاداشتی چاکەکەی بدەمەوە." کچەکە هات و بە موسای وت: "باوکم بانگت دەکا و ئیشی پێتە." بەیەکەوە بەرەو ماڵی شوعەیب کەوتنە ڕێ، کچەکە چونکە ڕێ نیشاندەر بوو لە پێشەوە بوو، بایەک هات و قاچ و قولی کچەکەی دەرخست، موسا وتی: "وەرە لە دوای منەوە ڕێ بکە." کچەکەی ئەم بەسەرهاتەی بۆ باوکی گێڕایەوە. باوکی تەواو دڵنیا بوو کە ئەم کوڕە کوڕێکی خاوێن و پاکداوێنە. دوایی ئەم کچە بە باوکی وت: ﴿يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ﴾ القصص: ٢٦ واتە: "باوە! بە کرێی بگرە، باشترین ڕەنجبەر ئەوەیە کە بەهێز و جێگەی باوەڕ بێ."

- دەی قوربان بەرچاوڕوونی لەکوێدا بوو؟

- لەوێدابوو ئەو کچە زانی موسا کوڕێکی بەهێزە، چونکە بینی بەردێکی گەورەی لەسەر زاری بیرەکەی لابرد و ماڵاتەکەی بە تەنیا ئاودا، خەڵکانی تر بە چەند کەسێکەوە ئەو بەردەیان لادەبرد، بەڵام موسا بە تەنیا لای برد. دیسان زانی کە موسا خاوێن و پاکداوێنە، چونکە هەر با لێی دا و قاچ و قولی دەرکەوت، یەکسەر موسا پێی وت لە دواوە ڕێ بکات بۆ ئەوەی تووشی نەزەری نامەحرەم نەبێت.

- کەوابوو ئەمە بەڵگەهێنانەوە بە شتە ڕوون و ئاشکراکانە لەسەر بوونی شتە پەنهان و بەرپێوارەکان.

- بەڵێ وایە. ئەو کچە لە بەرچاوڕوونییەکەیدا باش بۆی چووبوو. موسا پیاوێکی بەهێز و چاو و دەم و دەس و دڵپاک بوو ـــ پاکداوێن بوو.

- قوربان لە قورئاندا فەراسەتی تر هەیە؟

- بەڵێ! بەرچاوڕوونیی عەزیزی میسر بەرابەر یوسف.

- ئەوە چۆن بوو؟

- براکانی یوسف پیلانیان داڕشت بۆ ئەوەی یوسف بکوژن یان لانی کەم لە باوکیان دووری بخەنەوە؛ هاتن بۆلای باوکیان، داوایانکرد کە ئیزنیان بدا یوسف لەگەڵ خۆیان ببەن بۆ دەر و دەشت و بە دەم ئاژەڵ لەوەڕاندنەوە لەگەڵ یوسفیشدا یاری بکەن. یەعقوب یەکەم جار لە ترسی گورگ ڕازی نەبوو. براکانی یوسف زۆر پاڕانەوە، وتیان: "ئێمە چەند کەسێکین و بەهێزین، گورگ پێمان ناوێرێ. چۆن گورگ دەتوانێ منداڵێک لەنێوان چەند پیاوی بەهێز و شارەزادا لە دەر و دەشت بڕفێنێ؟! ئێمە بە دڵ و گیان ئاگاداری یوسفین."

یەعقوب ڕازی بوو. یوسفیان برد بۆ دەر و دەشت. یەکەم جار کراسەکەیان لە بەر داکەند، مەڕێکیان سەر بڕی و کراسەکەی یوسفیان خوێناوی کرد بۆ ئەوەی دواتر بە باوکیان بڵێن: گورگ یوسفی خواردوە. ئەوان بە گومانی خۆیان وایان دەزانی بەو کارە یەعقوب بڕوایان پێدەکا، بەڵام لە ڕاستیدا یەعقوب بەوەدا دەیزانی کە درۆ دەکەن.

- داوای لێبوردن دەکەم گەورەم! ئا لێرە قسەکەت بە شەکر دەبڕم، شتێک هەیە دەمەوێ بۆم ڕوون بکەیتەوە!

- چی یە؟

- فەرموت:"ئەوان بە گومانی خۆیان وایان دەزانی بەو کارە یەعقوب بڕوایان پێدەکا، بەڵام لە ڕاستیدا یەعقوب بەوەدا دەیزانی کە درۆ دەکەن." یەعقوب چۆنی زانی؟

- بەڵێ، ئەوان ویستیان کراسەکە خوێناوی بکەن بۆ ئەوەی یەعقوب بڕوایان پێ بکا، کراسەکەیان خوێناوی کرد، بەڵام ئەوەیان نەدەزانی کە گورگ منداڵێ بخوا

چۆن کراسەکەی بە ساغی دەمێنێتەوە؟ بەڵێ خوای گەورە پیلانەکەی خۆیانی بەسەر خۆیاندا شکاندەوە. یەعقوب زانی ئەمە فێڵ و تەڵەکەیە.

ـ باشە قوربان ئەمەم زانی، ئەگەر ئەرک نییە قسەکەم بۆ تەواو بکە. گەشتینە ئەوێ کە فەرموت: "یەعقوب بەوەدا دەیزانی کە درۆ دەکەن."

ـ باشە بە ئیزنی خوا قسەکەمان تەواو دەکەین. دوای ئەوەی کراسەکەی یوسفیان لە بەر داکەند، بەر شەقیان دا، بە مست و زللە کەوتنە گیانی، یەکەم جار ویستیان بیکوژن، بەڵام یەک لە براکان بەوە ڕازی نەبوو و وتی: "ئێمە دەمانەوێ یوسف لە باوکمان دوور بخەینەوە. بۆ بیکوژین؟ دەیخەینە ناو بیرێکەوە با کاروانێ ڕێیان لێی بکەوێ و بیبەن بۆ خۆیان. هەموویان بە قسەی ئەو برایەیان ڕازی بوون و وایان کرد.

خستیانە ناو بیرێکەوە. کاروانێک هات و کەسێکیان نارد ئاو لە بیرەکە هەڵبگۆزێت. دۆڵچەی خستە خوارەوە بۆ ئاو، بەڵام کوڕێکی زۆر جوان هاتە دەرەوە. پیاوەکە زۆر دڵخۆش بوو، یەکەم شتێک بە بیریدا هات ئەوە بوو کە ئەمە کەل و پەلێکی باشە بۆ فرۆشتن و هیچ ئەزیەت و ماندوو بوونێکیشی تێدا نییە. لە بازاڕی نیخاسەدا[1] دەیفرۆشین!

کاروان گەشتە میسر. یوسفیان بردە بازاڕی نیخاسە، بە پارەیەکی کەم فرۆشتیان. ویستی خوا وا بوو ئەو ڕۆژە عەزیزی میسر هاتبووە بازاڕ. یوسفی بینی. جوانی و ڕێکوپێکی و سام و هەیبەتی یوسف کاریان کردە سەر عەزیزی میسر. عەزیزی میسر یوسفی کڕی لەگەڵ خۆیدا بردیەوە بۆ کۆشک، بە زولەیخای ژنی وت: ﴿أَكْرِمِي مَثْوَاهُ عَسَىٰ أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا﴾ یوسف: ٢١ واتە: "قەدری بگرە، بەشکو قازانجی لێ بکەین یان بیکەینە کوڕی خۆمان."

---

١ نیخاسە بازاڕێک بووە لە میسر تایبەت بووە بە فرۆشتنی مرۆڤەوە.

ئا لێرە بەرچاوڕوونی هەیە. بوونی یوسف لە کۆشکی عەزیزدا، پاشتر زیندانیکرانی یوسف و دواتر ئازاد بوونی بە هۆی ئەو خەوپەرژێنییەی کە بۆ پاشای کرد، ئەمانە تەنیا قازانج و خێر و فەڕ و بەرەکەت نەبوو بۆ ماڵی عەزیز، بەڵکو بۆ هەموو میسر بوو؛ قازانجێکی دینی و دونیایی، لایەنە دونیاکەی لەوەدا بوو کە لەو وشکە ساڵیەی بەسەریاندا هات، ڕزگاریان بوو. ئەمەیش بە هۆی ئەو ئامادەکارییانەی کە پێشتر بە فرمانی یوسف کرابوو. لایەنی دینییش ئەوە بوو کە زۆربەی خەڵکی میسر وازیان لە گومڕایی و بتپەرستی هێنا و موسڵمان بوون.

- پاک و بێگەردی بۆ خوا! چۆن فرمانێک لە ئاسماندا گەڵاڵە دەکرێت و لەسەر زەویدا بە باشی جێبەجێ دەکرێت!

- پاک و بێگەردی بۆ خوای مەزن.

- ئەی قوربان لە بارەی بەرچاوڕوونیی ئەبوو بەکری سدیقەوە؟

- چ بەرچاو ڕوونییەک؟

- ئەی قوربان تۆ خۆت نەتفەرموو، پێغەمبەر فەرموویەتی: "لە بەرچاوڕوونیی موسڵمانان بترسن، ئەو کەسەی بەرچاوی ڕوونە، بە هۆی نوورێکی خوداییەوە شتەکان دەبینێ"؟

- با من وتم.

- دەی قوربان ئەبوو بەکر ئیماندارترین کەسە، کەوابێ بێگومان بەرچاوی ڕوون بووە.

- بەڵێ، زۆر جار بەرچاوڕوونیی هەبوو.

- قوربان هەر ئەوەندە بەس نییە کە تۆی دیاری کرد بۆ ئەوەی دوای خۆی ببی بە خەلیفە؟

- کوڕم ! ئەمە لە چاکە و نیازپاکی خۆتە.

- نە قوربان، بەڕێزت کەسێکی خاکی و پاکی، بە خوا ئەو ڕۆژەی پرسیار کرا لە ئەبوو بەکر و پێیان وت: "ئەی لە بارەگای خوادا چ وەڵامێکت هەیە بۆ ئەوەی کە عومەرت دەسنیشان کردووە؟" ئەویش فەرمووی: "دەڵێم باشترین کەسم دیاری کردووە،" زۆر ڕاستی کرد.

- ڕەحمەتی خوا لە ئەبوو بەکر چ خەلیفەیەک بوو! بە نەمانی ئەبوو بەکر هەمیشە خەمبارم. ئەبوو بەکر لە ئیمانداری و دادگەری و خاکێتیدا وەک سوارێکی زۆر زیرەک بوو کە بە سەری باشترین ئەسپەوە سوارچاکی و پێشبڕکێ بکا، کەسی پیا نەدەگەشت!

- ڕەحمەتی خوای لێبێ! بە خوا ئێمەیش هەر ئاوا لەو تێگەشتووین. خوای گەورە لە قیامەتدا تۆ لەگەڵ پێغەمبەر و ئەبوو بەکردا بکا بە هاوڕێ.

- ئامین! خوایە گیان ئامین!

- ئەی لە بارەی بەرچاوڕوونیی خۆتەوە گەورەم!

- چ شتێک؟

- چی هەیە بۆم باس بکەی؟

- ئەی هەر لە سەرەتای گفتوگۆکەمانەوە باسی هاوڕاییی قورئانمان نەکرد لەگەڵ مندا؟!

- با قوربان باسمان کرد، بەڵام ئەوە تەنیا پەیوەندیی بە باسی قورئانەوە هەبوو، من لێم ڕوونە کە جگە لەوەی باسکراوە، بەرچاوڕوونیی ترت زۆرە.

- بەڵکو وابێ کە تۆ دەیڵێی، بەڵێ شتی تر هەیە.

- دەی قوربان بۆم باس بکە.

- باشە بۆت باس دەکەم.

- دەی قوربان زووبە، زۆر بە پەرۆشەوەم بیبیستم.

- ڕۆژێک بیستم کوڕێکی زۆر جوان، لە جوانیا وەک کچ وابوو، هیچ موو لەسەروچاوی نەهاتبوو، بیستم کوژراوە و فڕێدراوە. زۆر پرسیارم کرد، هەوڵمدا بزانم بۆ کوژراوە؟ بەڵام هیچ سەرەداوێکم دەست نەکەوت... وتم: "خوایە گیان! بکوژی ئەم کوڕەم بۆ ئاشکرا بکە!"

ڕۆژگار هات و چوو، بۆ ساڵی دوایی ڕێک لەو شوێنەی کوڕەکە فڕێدرابوو، منداڵێکی یەکشەوە فڕێدرابوو. لە دڵی خۆمدا وتم: "ئەگەر خوا بیەوێ، بکوژەکەم دۆزییەوە!" منداڵەکەم دا بە ژنێک بۆ ئەوەی شیری پێبدا و بەخێوی بکا. پێم وت: "بە کرێ بەخێوی بکە، باش ئاگاداربە! هەر ژنێک هات و لەباوەشی گرت و ماچی کرد و بە خۆیەوە نووساند، پێم بڵێ!"

دوای ئەوەی منداڵەکە کەمێ گەورە بوو، کەنیزەکێک هاتبوو بە ژنەکەی وتبوو: "ئەو ژنەی کە گەورەی منە، منی ناردووە بۆلای تۆ، بۆ ئەوەی ئەو منداڵەی بۆ بنێری کەمێک بیبینێ، دواتر بۆت دەنێرێتەوە!"

ژنەکەیش وتبووی: "باشە، بەڵام منیش لەگەڵتدا دێم." ژنەکە لەگەڵ کەنیزەکەکە و منداڵەکە پێکەوە ڕۆشتبوون بۆلای ئەو ژنەی کە گەورەی ئەم کەنیزەکە بوو. هەر کە گەورەی کەنیزەکەکە منداڵەکەی دیبوو، یەکسەر گرتبوویە باوەش و ماچی کردبوو و توند لە سینگی خۆی توند کردبوو!

ئەو ژنەی کە داوای بینینی منداڵەکەی کردبوو، کچی یەکێک لە سەرۆک خێڵی ئەنصاریەکان بوو، ئەو ژنەیش کە من منداڵەکەم لەلا دانابوو، هات و ڕووداوەکەی بۆ من گێڕایەوە.

- ئەی تۆ چیت کرد قوربان؟!

- شمشێرەکەم هەڵگرت و ڕۆشتم بۆ ماڵی ژنەکە، باوکی لە بەردەرگا پاڵی دابووەوە.

پێم وت: " کچەکەت چی کردووە؟"

وتی: "گەورەم خوا پاداشتی بە چاکی بداتەوە. ئەو کچەم خواناسترین کچە. باشترین کچە بۆ باوکی. نوێژ و ڕۆژووی قایمە. بە باشی دەستی بە ئایینەوە گرتووە."

منیش وتم: "پێم خۆشە بچم ببیینم و زیاتر هانی بدەم بۆ خواناسی و چاکەکاری."

من و باوکی بە یەکەوە ڕۆشتینە ژورەوە. دوایی داوام کرد کەس لەگەڵماندا نەمێنێ. من و ئەو بە تەنیا ماینەوە، شمشێرەکەم هەڵکێشا و پێم وت: "ئەگەر ڕاستیم پێ نەڵێی، بەم شمشێرە دەتکوژم!"

وتی: "بەسەرچاو گەورەم! بە خوا درۆت لەگەڵدا ناکەم."

وتم: "ئەو لاوە جوانە کە پار کوژرا، تۆ کوشتت؟"

وتی: "بەڵێ!"

وتم: "بۆچی؟"

وتی: "پیرەژنێک بەردەوام دەهات بۆلای من. منیش وەک دایکی خۆم سەیرم دەکرد. ئەویش وەک کچی خۆی خزمەتی منی دەکرد. منیش وەک دایکی خۆم خزمەتی ئەوم دەکرد. ماوەیەکی زۆر وابووین، ڕۆژێک پێی وتم: "کچم! من سەفەرێکی درێژم بۆ هاتووەتە پێش، کچێکم هەیە لە شوێنێکە دەترسم تیا بچێ. پێم خۆشە لای تۆ بێت تا لە سەفەرەکەم دەگەڕێمەوە."

منیش وتم: "ئای پورێ گیان بە سەرچاو.

"کوڕێکی جوانکیلەی بێ مووی هەبوو وەک کچ ڕازاندبوویەوە. منی برد بۆلای کوڕەکەی. من بە هیچ شێوەیەک گومانم نەدەبرد کە کوڕ بێ، بۆیەیش لەلای ئەوا خۆم دانەدەپۆشی و وەک کچ ڕەفتارم لەگەڵدا دەکرد. ڕۆژێک من خەوتبووم، ئەو کوڕە بە هەڵی زانیبوو. کاتێک بە ئاگا هاتم، تەماشا دەکەم بەسەرمەوەیە، ئەوەی کە پیاو لەگەڵ ژنی خۆیدا دەیکا، بە منی کرد. چەقۆیەکم لێ نزیک بوو، منیش دەستم برد و چەقۆکەم هێنا و کوڕەکەم کوشت!

"دوایی وتم لە شوێنێکدا فڕەی بدەن. ئیتر من لەو کوڕە دووگیان بووم. ئەو باسەم لە باوکم شاردەوە، هەر منداڵەکەم بوو لەو شوێنە فڕێمدا کە باوکیان لێ فڕێدابوو، ئەمە تەواوی چیرۆکەکە بوو، بە خوا یەک وشەی درۆ نەبوو!"

منیش پێم وت: "ئای کە کچێکی پاک و لێهاتووی! بە خوا ئەگەر لەبەر خۆت نەبووایە و لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئەم شتە پەنهانە و کەس پێی نەزانیوە، ئەوا باسم دەکرد بۆ ئەوەی هەرچی ژن هەیە هەمووی بیبیستایە!"

دوایی هاتمە دەر و بە باوکی کچەکەم وت: "بە خوا کچێکی زۆر باشت هەیە." دوایی گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان.

- ئای گەورەم چەندە سەیری! بە خوا زۆر سەیری! بەڕاستی تۆ کەسێکی بە نوورێکی خودایی شتەکان دەبینی.

- کوڕم ! ئەوە ڕێز و بەهرەیەکی خواییە. خوا دەیبەخشێ بەو کەسانەی کە خۆی ئارەزووی دەکا.

ــ دەی قوربان پێم بڵێ ئەو کاتەی منداڵەکەت دۆزییەوە، چۆنت زانی کە دۆزینەوەی بکوژەکە نزیک بووەتەوە و دایکی ئەو منداڵە لە منداڵەکەی دەپرسێت و ماچی دەکا و وەک هەموو دایکێکی تر سۆزی بۆی دەبێت؟

- ئەمە سروشتێکە کە خوای گەورە بە بەندەکانی بەخشیوە. دەمزانی هیچ شتێ لە دڵی دایکدا وەک منداڵ گەورە نییە. هەرچەندە ڕۆژگار تێبپەڕێ، بەڵام هێشتا سۆزی دایکایەتی بەرابەر منداڵەکەی کۆن نابێ و هەر دەمێنێ، دەیەوێ کوڕەکەی ببینێ هەرچەندە فڕێیشی دابێ. ئەم چیرۆکەیش زۆر لە چیرۆکی دوو ئافرەتەکەی سەردەمی سولەیمان دەچێ، ئەوانیش لەسەر منداڵێک کێشەیان بوو، هەریەکەیان دەیوت: "منداڵی منە!"

- گەورەم! ئەو چیرۆکە چۆنە پێم خۆشە بیبیسم؟

ـ ئێمە ڕۆژێک لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتبووین ئەو چیرۆکەی بۆ گێڕاینەوە، فەرمووی: "ڕۆژێک دوو ژن بەیەکەوە بوون و دومنداڵیان پێبوو، گورگێک هاتوو منداڵی یەکێکیانی برد. ئەو ژنەی کە گورگ منداڵەکەی خواردبوو، بەوی تری وت: 'گورگ منداڵەکەی تۆی خواردووە.'
ئەویتریشیان وتی: 'نەوەڵلا، منداڵی تۆی خوارد.'
ڕۆشتن بۆلای حەزرەتی داوود. حەزرەتی داوود منداڵەکەی بە ژنە گەورەکە دا. ڕۆشتنە دەر و گەشتن بە حەزرەتی سولەیمان. چیرۆکیان بۆ گێڕایەوە، بریارەکەی حەزرەتی داوودیشیان بۆ گێڕایەوە!
سولەیمان فەرمووی: 'شمشێرێکم بۆ بێنن، دەیکەم بە دوو کەرتی یەکسانەوە، هەریەکەو کەرتێکی ببا!'
ژنە بچووکەکە وتی: 'نەخێر قوربان! ئەو ڕاست دەکا منداڵی ئەوە هی من نییە!'
سولەیمان منداڵەکەی دا بە ژنە بچووکەکە!"
ئەو دڵەی کە ڕێگەی نەدا منداڵەکە بکرێت بە دوو کەرتەوە، هەمان ئەو دڵەیە کە دەیویست منداڵەکەی لە باوەش بگرێ و ماچی بکا. من باش دەمزانی ڕۆژێک دێت دایکی ئەو منداڵە هەواڵی منداڵەکەی بپرسێ. ئا لەبەر ئەوە بەو ژنەم وت کە منداڵەکەم لا دانابوو: وریا بێت ئەگەر کەسێک هەواڵی منداڵەکەی پرسی یەکسەر خەبەرم بداتێ!

ـ دەی قوربان بۆچی دوایی منداڵەکەت نەدایەوە بە دایکی؟

ـ ڕۆڵە ! پێم خۆش بوو بیدەمەوە، بەڵام ئەگەر بمدایەتەوە، نهێنییەکە ئاشکرا دەبوو. ئەوە داپۆشینێکە، نابێ هەڵبماڵرێ و ئاشکرا بکرێ. خوای گەورە تاوانی بەندەکانی خۆی دادەپۆشێ و پێی خۆشە خەڵکیش داپۆشن. ئەگەر ئەو کچە دوای ئەوەی منداڵەکەی بوو، بیتوانیایە ڕووداوەکە داپۆشێ، ئەوا هەر یەکەم جار منداڵەکەی فڕێ نەدەدا. ئیتر لێ گەڕێ بە چ ڕێگەیەکیش ئەو منداڵەی بووە، هەروەها لە باوکی نەدەشاردەوە. بۆیە کوڕەکەی خۆی فڕێداوە بۆ ئەوەی ئەو

نهێنییە ئاشکرا نەبێ. هەرچەندە هیچ عەیب و عارێک بەرۆکی ئەو کچەی نەدەگرت، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا من بۆم نەبوو ئاشکرای بکەم. ئەو کچە هەرچییەک بێ، کچە؛ وەک هەموو کچێکی تر مێردی دەوێ. ئەگەر ئەو ڕووداوە ئاشکرا ببووایە، ئەوا ئەو کچە لە مێردکردن بێهیوا دەبوو. لەوەیش زیاتر، ئەو کچە کچی هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا بوو. با وای دانێین کە ئەو کچە تاوانبارە، ئایا ڕەوایە حەیای هاوەڵێکی پێغەمبەر لەبەر کچەی ببەین؟!

- نەوەڵڵا گەورەم! پەردەپۆشکردن لە هەموو شتێ باشترە.

- دەی منیش وام کرد.

- بە خوا قوربان ،ئەو نزایەی پێغەمبەرت بۆ گیرا بووە کە فەرمووی: "خوایە! هەق بخەیتە سەر دڵ و زمانی عومەر."

- خوایە سپاس بۆ تۆ!

- دەی قوربان پێم بڵێ هیچ بەرچاوڕوونییەکی تر ماوە بۆم باس بکەی؟ بە خوا قسەکانت دەڵێی بارانی بە ڕەحمەتە و لە زەوییەکی وشکی تینووی بێگیا دەدا و تێراوی دەکا و، دەیکا بە بەهەشتێکی سەوز و ڕازاوە!

- بەڵێ، هێشتا ماوە.

- دەی قوربان بیفەرموو، هەموو گیانم گوێبیسی فرمایشەکانتە.

- ڕۆژێک ویستم بەرەو شام بڕۆم، لە ئوردون نزیک بوومەوە و هەواڵم پێگەیی کە پەتای تاعون لە عەمواس[1] بڵاو بووەتەوە، خەڵکم کۆ کردەوە و ڕاوێژم پێکردن، وتم: "درێژە بە سەفەرەکەمان بدەین یان بگەڕێینەوە؟"

هەندێ کەس وتیان بگەڕێینەوە، هەندێکیش وتیان درێژە بە سەفەرەکەمان بدەین.

---

[1] عەمواس شوێنێکە لە فەلەستین، لە نزیک بەیتولمەقدیس. لە ساڵی هەژدەی کۆچی لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا پەتای تاعونی تیا بڵاو بووەوە و پەتاکە بەرەو شام کشا. دەڵێن ٢٥٠٠٠ کەس بەو تاعوونە تیاچووە. فەرهەنگی دهخدا.

ئەوانەی پرسم پێکردن، هەموویان پیر بوون، وتم: "ئێوە بڕۆن خوا حافیزتان، ئادەی چینی گەنجانم بۆ بانگ بکەن. پرسم بەوانیش کرد.

ئەوانیش ڕێک وەک پیرەکان وەڵامیان دامەوە، هەندێ دەیانوت بڕۆین و هەندێکی تر دەیانوت بگەڕێینەوە.

ماوەیەک بیرم کردەوە و بڕیاری گەڕانەوەمدا.

ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح پێی وتم: "قوربان ئەوە لە قەزاو قەدەری خوا ڕا دەکەی؟!"

منیش وتم: "خۆزگە تۆ ئەو قسەیەت نەکردایە! بەڵێ، لە قەزا و قەدەرێکی خوا ڕا دەکەم بۆ قەزاو قەدەرێکی تری خوا. ئەوە تۆ هەندێ وشترت لابێ و نزیک دوو چیا و دۆڵ بی، یەکێکان وشک و بێ ئاو و گیا و ئەوی تر ئاودار و سەوزەڵان. لە هەر کامیاندا وشترەکانت بلەوەڕێنی، هەر قەزاو قەدەری خوا نییە؟"

وتی: "بەڕەوەڵلا."

هەر لەم باسەدا بووین کە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف هات، وتی: "من شتێکم لەم بارەوە لایە.

"گوێم لێ بوو پێغەمبەر دەیفەرموو: 'ئەگەر زانیتان شوێنێک تاعوونی تیایە، تێی مەچن. ئەگەر لە شوێنێکیش بوون و تاعوون گرتنیەوە، لەو شوێنە دەرمەچن و لێی ڕامەکەن!' "

منیش سپاسی خوام کرد و خەڵکەکەم گەڕاندەوە.

- قوربان مەبەستت چی بوو لە "لە قەزا و قەدەرێکی خوا ڕا دەکەم بۆ قەزاو قەدەرێکی تری خوا"؟

ـ مەبەستم ئەوە بوو کە ئەگەر ڕێگە بگرمە بەر و بڕۆم، ئەوا بەرەو قەزا و قەدەری خوا دەڕۆم. ئەگەر بیشگەڕێمەوە، هەر بەرەو قەزا و قەدەری خوا دەڕۆم. مرۆڤ نازانێ بە قەدەر تا تێی دەکەوێ. مرۆڤ لەنێوان دوو شتدا سەرپشک دەبێ، خۆی یەکێکیان هەڵدەبژێرێ. خوا لە پێشدا زانیویەتی کە ئەم مرۆڤە کامەیان

هەڵدەبژێرێ، بەڵام مرۆڤەکە خۆی نازانێ تا ئەو کاتەی یەکیان هەڵدەبژێرێ و ئەوەی کە لە لەوحولمەحفوزدا نووسراوە، ئەوەیان دیاری دەکا!

- کەواتە ئێمە سەرپشک نین بەڵکو ناچارین؟

- کێ وای وتووە کوڕم؟!

- تۆ قوربان! ئەی نەتفەرموو: "مرۆڤ ئەو قەزا و قەدەرە هەڵدەبژێرێ کە لە لەوحولمەحفوزدا نووسراوە"؟

- با من وام وت، بەڵام نەموت بە ناچاری. ئەگەر ئێمە ناچاربین ئیتر پاداشت و سزا هیچ مانایەکی نامێنێ. چۆن خوا سزای بەندەیەکی دەدا کە بەرەو ئاگری ناردووە و، بەندە بە ناچاری بەرەو ئاگر دەڕوا، یان چۆن پاداشتی بەندەیەکی دەدا کە بەرەو بەهەشتی ڕەوانەکردووە. من باسی ئەوەم نەکردووە کە بەندە سەرپشکە یا ناچار، من تەنیا باسی زانستی خوام کرد، ئەم زانستەیش مرۆڤ ناچار ناکا، بەڵکو مرۆڤ خۆی بە ئارەزووی خۆی ئەو شتە هەڵدەبژێرێ کە خوا تەقدیری کردووە و نووسیویەتی، چونکە خوا ئاگاداری غەیبە و لە غەیب دەزانێ؛ دەزانێ چی ڕووی داوە و چی ڕوو دەدا.

- قوربان نموونەیەکم بۆ باس بکە، با باش تێبگەم.

- باشە! وای دانێ کە تۆ کوڕێکت هەیە، هەر لە منداڵییەوە ئەم کوڕەت بەخێو کردووە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، تا ئەو کاتەی کوڕەکەت گەورە دەبێ و، تۆ لە هەموو کەس باشتری دەناسی و دەزانی ئاکارو ڕەفتاری چۆنە. ئەگەر بیبینی دەچێتە ناو بێستانێکەوە و تۆیش دەزانی کە زۆر دەسپاکە و دەست بۆ هیچ شتێک نابا، دوایی بڵێی: "کوڕەکەم دەست بۆ هیچ نابا!" ئەوە تۆ وات کردووە کە لەو بێستانە دەست بۆ هیچ نەبا؟

- بێگومان نەخێر!

- وای دابنێین کە تۆ کوڕەکەت دەناسی و دەزانی کە زۆر چاوچنۆکە و دەست بۆ ماڵی خەڵک دەبا و لە دڵی خۆتدا دەڵێی: "ئێستە شتێک دەبا،" دوایی کوڕەکە شتێکی برد، ئەوە تۆ ناچارت کردووە کە شتێک ببا؟

- نەوەڵڵا.

- ئەگەر لەبەر دەست پاکیەکەی پاداشتێکت پێدا، ئەوە ئەو کوڕە شایانی ئەو پاداشتەیە؟

- بەڵێ قوربان شایانییەتی.

- ئەی ئەگەر لەسەر چاوچنۆکی و دەست پیسیەکەی سزات دا، ئەوە ستەمت لێ کردووە؟

- بێگومان نەخێر!

- دەی ئەمەیش وەک ئەوەیە. زانستی ئێمە لە چاو زانستی خوای گەورەدا وەک سەرەدەرزیەکە لەناو بیابانێکی گەورەدا، یان وەک دڵۆپێک ئاوە لە چاو زەریایەکی مەزندا. ئەو پێشبینییەی کە مرۆڤ بۆ داهاتووی دەکا، بەپێی ڕابردوو دەیکا، جاری وا هەیە ڕاست دەردەچێ و، جاری وایش هەیە ڕاست دەرناچێ، چونکە زانستی مرۆڤ سنووری هەیە، بەڵام زانستی خودا بێسنوورە. ئا لەبەر ئەوە زانستی خوا بۆ غەیب و داهاتوو، هەرگیز هەڵە دەرناچێ و لە سەدا سەد وەک خۆی دەردەچێ. خوای گەورە زۆر پێش لە بوونی ئێمە زانیویەتی ئێمە چی دەکەین و چی ناکەین، هەر هەمووی نووسیوە و مرۆڤ بە ئەندازەی سەرەموویەک لێی لا نادا. ڕێک وەک پێشبینییەکەی تۆ بۆ کوڕەکەت، دەتزانی کە دەست بۆ هیچ نابا، یان دەتزانی کە دەست بۆ شتێک دەبا. ئەم زانستەی تۆ کوڕەکەتی ناچار نەکردووە کە دەست بۆ شت نەبا یان بیبا. هەموو خەڵکی تریش وان، خوای گەورە هێزی پێ بەخشیون بۆ ئەوەی خۆیان سەرپشک بن. خەڵکیش هەموویان سەرپشکن.

- بەڵام قوربان پێم بڵێ مرۆڤ لە هەموو شتێکدا سەرپشکە؟

- جگە لە خوا، هیچ کەس لە هەموو شتێکدا سەرپشک نییە. خوا هەر شتێکی بیەوێ، دەیکا و، هەرچی نەیەوێ نایکا. بەڵام دروستکراوەکانی خوا کە مرۆڤیش بەشێکە لەو دروستکراوانەی، مەبەستەکەمان زیاتر مرۆڤە، لە هەندێ کاردا سەرپشکە و لە هەندێ کاردا ناچار. مرۆڤ لە ڕزق و ڕۆزی و هاتنی وادەی مردنی بێدەسەڵاتە و سەرپشک نییە، بەڵام سەرپشکە لەو ڕزق و ڕۆزیانەی کە خوا پێی بەخشیوە چۆنی سەرف دەکا و دەیبەخشێ. ئەگەر بیەوێ بەو ڕزق و ڕۆزییە خۆی و ژن و منداڵی تێر دەکا و بەشی خەڵکیشی لێ دەدا. دەتوانێ بەو پارە و سامانەی کە خوا پێی بەخشیوە، شەراب و بادە بکڕێ و بیخوا، دەتوانێ بە پارە و سامانەکەی ئاژاوەیەک دروست بکا و بە دەیان و سەدان مرۆڤ لە ناو بچێ. ئا لەبەر ئەوەیە کە یەکێک لە دادگەرییەکانی خوای مەزن ئەوەیە کە لێپرسینەوە لەو شتانە ناکا کە لەژێر دەستی مرۆڤدا نەبووە. خوای گەورە سزای کەسێ نادا بفەرمووێ بۆچی تەمەنت کورت بوو، پاداشتی هیچ کەسێکیش ناداتەوە بفەرمووێ ئەمە لەبەر ئەوەی کە تەمەنت درێژ بوو. پاداشت و سزا بە گوێرەی ئەو کار و کردەوانەیە کە مرۆڤ دەیانکا، ئیتر تەمەن کورت بێ یان درێژ! بە هەمان شێوە خوا سزای هەژاران نادا بفەرمووێ بۆچی هەژار بوون، پاداشتی زەنگین و دەوڵەمەنەکانیش ناداتەوە بفەرمووێ ئەوە لەبەر ئەوەی دەوڵەمەند و زەنگین بوون، پاداشت و سزا بە گوێرەی خۆڕاگریی هەژارانە، بە گوێرەی شوکرانەبژێریی دەوڵەمەندانە!

- قوربان مرۆڤ بۆی هەیە لای خوا ڕەخنە لە هەژاریی خۆی یان تەمەن کورتیی خۆی بگرێ؟

- پاک و بێگەردی بۆ خوا! ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾ الأنبياء :٢٣ "خوا پرسیاری لێ ناکرێت و ڕەخنەی لێ ناگیرێ لە هەر کارێك کە دەیکات، بەڵام ئەوان (ئادەمیزاد) پرسیاریان لێ دەکرێ."

ئەم پرسیارە کاتێ ڕەوایە کە دونیا کۆتایی هەموو شت بێ و ژیانی پاش مردن نەبێ، بەڵام ئێمە دەزانین کە دونیا شوێنی تاقیکردنەوە و ئەزموونە. خوای گەورە ئێمەی خستووەتە سەر دونیا بزانێ (باشیش دەزانێ) چی دەکەین، دوایی پاداش و سزا بە گوێرەی کار و کردەوەکانە. ڕەخنە گرتن لە کارەکانی خوا بێ ئەدەبیە.

باشە تۆ نازانی هەر لەناو مرۆڤدا هەندێ کەس هەندێ کار بە هەندێ کەسیتر دەسپێرێ، چونکە لە تاقیکردنەوەی ئەو کارەدا دەرچووە. ئەگەر تۆ بچی بۆلای خاوەن کارێک و داوای کاری لێ بکەی و ئەویش چەند مەرجێکت بۆ دابنێ، تۆ دەتوانێ بڵێی: "مەرجی چی؟ من هیچ مەرجێک قبوڵ ناکەم و گوێ بە تۆ نادەم و بە ئارەزووی خۆم کار دەکەم و دێم و دەچم"؟!

- بێگومان نەخێر!

- ئەگەر بچی بۆلای پیاوێک و داخوازیی کچەکەی بکەی، ئەویش داوای بڕێ مارەیی بکا، تۆ دەڵێی: "مارەیی بۆ چییە؟ من بەبێ مارەیی دەمەوێ"! یان بە گوێرەی توانای خۆت ئەگەر مارەییت پێ هەڵسووڕا، قەبوڵی دەکەی ئەگینا دەڕۆی بۆ داخوازیی کچێکی تر؟

- بەڵێ قوربان وا دەکەم، ئەگەر هەمبوو قەبوڵی دەکەم، ئەگەریش نەمبوو، دەچم بۆ داخوازیی کچێکی تر.

- دەی ئەمە هەندێ مەرجە کە مرۆڤ دایدەنێ و زۆربەیشمان پێی ڕازیین، ئیتر چۆن بە مەرجەکانی خوای گەورە ڕازی نەبین لە کاتێکدا هەموو مەرجەکانی خوای گەورە پڕە لە سوود و قازانج و حیکمەت؟!

- بەڵێ، بە خوا وایە، دەبێ بە مەرجی خوا ڕازی بین!

- دەی ئەم خاڵە کۆتایی هات؟

ـ بەڵێ قوربان، زۆر جوان ڕوونت کردەوە و لەم باسە تێگەشتم. پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئاوا تۆی زانا کردووە! دەی قوربان ئێستە پێم بڵێ لە باسی بەرچاوڕوونی هیچی تر ماوە بۆم باس بکەی؟

ـ بەڵێ... بەڵێ، هێشتا ماوە.

ـ دەی فەرموو باسی بکە.

ـ ڕۆژێک پیاوێکیان هێنایە لام وتیان: "دزیی کردووە." منیش بەو پیاوەم وت: "تۆڵەی دزی دەست بڕینەوەیە! تۆڵەش بە بەڵگەی گوماناوی و دوودڵی ناسەنرێت، تۆیش هیچ گومان نییە کە دزیت کردووە."

پیاوەکە وتی: "قوربان سوێندت دەدەم بە خوا کە لێم ببوری! بە خوا ئەمە یەکەم جارە دزی بکەم."

منیش وتم: "درۆ دەکەی ئەمە یەکەم جارت نییە!"

وتی: "بۆ تۆ غەیب دەزانی؟"

وتم: "نەخێر! غەیب نازانم، بەڵام ئەوەندە دەزانم خوای گەورە ئەوەندە بە سۆزە کە ئەگەر بەندەکانی تاوانێکیان کرد بە یەکەم تاوان ئابڕوویان نابا."

ـ دوایی چیت کرد قوربان؟!

ـ فرمانم کرد دەستیان بڕییەوە، عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب شوێنی کەوت و پێی وت: "تو خوا ئەمە یەکەم جار بوو دزی بکەی؟"

وتبووی: "بە خوا ئەمە جاری بیست و یەکەمە!"

عەلی وتبووی: "بە خوا عومەر ڕاست دەکا، وتویەتی: 'من فێڵباز نیم و هیچ فێڵبازێکیش ناتوانێ فێڵم لێ بکا!' "

ـ پاک و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی ئاوا تۆی زانا کردووە!

ـ هەزار جار پاک و بێگەردی بۆ خوا!

ـ دەی گەورەم هیچی تر باسی بەرچاوڕوونی ماوە؟

- دانەیەک ماوە بەو دانەیە ئەم باسە تەواو دەکەین و دەچینە سەر باسێکی تر.

- باشە گەورەم چۆنت پێ خۆشە با وابێ.

- سەعدی کوڕی ئەبوو وەقاص نامەیەکی بۆ نووسیبووم، وتبووی: "سندووقێکم دۆزیوەتەوە، لە زێڕ دروست کراوە، قوفڵێکی پێوەیە ئەویش هەر زێڕە، قوفڵەکەم نەشکاندوە. پیاوێک تەماعی تێ کردووە و پارەیەکی زۆری پێ دەدا، دەڵێ: 'هەرچی تیا بوو بۆ من و، سندووقەکە و قوفڵەکەیش بۆ خۆتان!"

منیش وەڵامم دایەوە و وتم: "پێی بفرۆشە! بە خوا ئەو پیاوە گێلە و، ئەو مامەڵەیەیش مامەڵەیەکی گێلانەیە کە دەیکا."

سەعد پێی فرۆشتبوو.

کابرا قوفڵەکەی کردبووەوە، کاغەزێکی تیا بوو بە فارسی لێی نووسرابوو، فارسیزانێک خوێندبوویەوە، لێی نووسرابوو:

"ڕیششانەکردن لەو لایەوە کە دەتاشرێ(یانی لەسەرەوە بۆ خوار) هەزار جار باشترە لەوەی کە لە ژێرەوە شانەی بکەی."

کابرا پەشیمان بووبووەوە، ویستبووی پارەکەی پێ بدەنەوە.

سەعد نامەیەکی بۆ من نووسی، وتبووی کابرا وا دەڵێ.

منیش نامەیەکم بۆ نووسی و وتم: "ئەو پیاوە سوێند بدەن بزانین ئەگەر ئەو سندوقە پڕ بووایە لە زێڕ، شەریکی دەکردین؟ هیچی بۆ دەگەڕاندینەوە؟!"

کابرا وتبووی: "نەوەڵلا!"

دیسان سەعد نامەی بۆ من نووسی و وتی: کابرا دەڵێ: "نەوەڵلا."

منیش نامەیەکم بۆ نووسیەوە و وتم: "هیچی پێ مەدەنەوە، سندوقەکە چی تیابووە هەر ئەوەی بدەنێ!"

- قوربان ئەم چیرۆکە چیرۆکێکی بەتام و خۆشە، مرۆڤ دێنێتە پێکەنین. دەی ئێستە پێش ئەوەی هیچ قسەیەکی تر بکەین، لە دڵمدا شتێک دەگوزەرێ، زۆرم لا مەبەستە باسی بکەین.

- چییە؟!

- ڕێکخستنی کاروباری شارەوانی، چەند سیاسەتێکی تر نەمبیستووە کەس پێشی تۆ پیادەیان بکا.

- ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ و باسێکی درێژە.

- دەزانم! بەڵام بە تەمام گەورەمان بە لوتف و میهرەبانیی خۆی بۆمان باس بکا.

- باشە! بزانم چیت دەوێ؟

- بیستوومە تۆ یەکەم کەسی پێت بگوترێ (أمیر المؤمنین) گەورەی ئیمانداران. ئەمە ڕاستە؟

- بەڵێ، ڕاستە.

- ئەم ناوە چۆن نرا؟

- ئەبوو بەکر پێی دەوترا خەلیفەی پێغەمبەر. دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد و، من بووم بە خەلیفە، ماوەیەک خەڵک بە منیان دەوت: "خەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا!" هاوەڵان لەناو خۆیانا باسی ئەمەیان کرد. وتیان: "ئەمە دەری ناهێنێ. ئەی دوای عومەر خۆ دەبێ بڵێین: 'خەلیفەی خەلیفەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا!' خۆ کار ئاوا بڕوا دەبێ دوو سێ دێڕ خەلیفە بڵێین و بنووسین! با ناوێکی تر بۆ ئەم خەلیفانە بدۆزینەوە."

دوایی هەندێ کەس وتیان: "ئێمە هەموومان ئیمانداریـن، عومەریش گەورەمانە، کەوابوو ئەو گەورەی ئیماندارانە." ئیتر ئەو ناوەیان دابڕی بەسەر مندا و، من بوومە یەکەم کەسێک کە ئەو ناوەی لێ نرابێ.

- قوربان ئەمە شەرەفێکی گەورەیە بۆ جەنابت.

- لەم ناو و شەرەفە گەورەتر ناو و شەرەفی ئەبوو بەکرە، ئەو تاکە خەلیفەی پێغەمبەر بوو، منیش خەلیفەی ئەوم، ڕەحمەتی خوای لێ بێ چەندە بەڕێز و پایە

بڵند بوو لای خوا! خوای گەورە زۆر مەزنی کردبوو، چونکە دەیزانی دڵی چ ئیمانێکی تیایە!

- ڕەحمەتی خوای لێبێ، تۆیش باشترین خەلیفەی بۆ خەلیفە ئەبوو بەکر.

- خوا بکا وابێ.

- بە خوا وایە.

- باشە لەوە گەڕێ پرسیارەکەت بکە.

- باشە قوربان! باسی ئەوەم بۆ بکە چۆن دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی تۆدا بوو بە چەند ویلایەتێک؟

- خوای گەورە بە لوتفی خۆی لە سەردەمی مندا یارمەتی داین و زۆر شوێنمان ڕزگار کرد، دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو، لە ڕووی ئیداری و بەڕێوەبردنەوە دەبوو بکرێ بە چەند بەشێکەوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بەڕێوە ببردرێن. ئەو شارانەی کە ڕزگار کرابوون، کردنم بە پێنج بەشەوە، وەک پێنج ویلایەتم لێکردن، ئەو پێنج بەشە بەم شێوەیە بوو:

عێراق، بریتی بوو لە ئەهواز و کوفە و بەصرە.

فارس، بریتی بوو لە سیستان و موکران و کرمان و تەبەرستان و خۆراسان.

شام، بریتی بوو لە حیمص و دیمەشق و ئیلە و ڕەمڵە.

ئەفریقا، بریتی بوو لە صەعیدی میصر[١]، میصری خواروو، لای ڕۆژئاوای میصر و بیابانی لیبیا.

جزیرەی عەرەبیش، ئەبوو بەکر چۆنی بەش کردبوو، ئاوا وەک خۆی هێشتمەوە، دوانزە ویلایەت بوو: مەککە، مەدینە، صەنعا، حەزرەمەوت، خەولان، زەبید، مەرقەع، جوند، نەجران، جەرش، بەحرەین و تائیف.

---

[١] صەعیدی میصر بریتیە لە زەوییەکانی سەرەوەی ڕووباری نیل، لە شاری جیزەوە تا شاری ئەسوان شۆڕ دەبێتەوە.

ـ قوربـان تـۆ لە دابەشـکردنی شـارەکان و بەڕێوەبردنیـان شـارەزاتری، ڕاسـتت فەرمـووا دەبـێ شـارەکان بەش بکـرێن بـۆ ئەوەی بەڕێوەبردنیـان ئاسـان بـێ، بەڵام قوربان لە بارەی والیەکانەوە چی؟

ـ مەبەستت چییە؟

ـ چۆن والیەکانت دیاری دەکرد؟

ـ من ئەوەندەی تەماشـای لێهـاتوویی پیـاوم بـۆ بەڕێـوەبردنی شـارەکان دەکـرد، ئەوەندە تەماشای خۆییم نەدەکرد بزانم ئایا کەس لەو ئیماندارتر هەیە یان نـا؟ من خۆم بووبوومە خەلیفە و بەڕێوەبەری هەموو مسوڵمانان، کەچی پیاوی وایش هەبـوو زۆر لە من موسڵمانتر بوو، زانیاریی لە من زیاتر بوو، لە مـن زیـاتر خواناسـتر بـوو. مـن دەزانـم فـلان کەس لە هەمـوو کەسـێ ئیمانـدارترە، بەڵام فیسـارەکەس لە بەڕێوەبردندا شارەزاترە. لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا عەمری کوڕی عـاص، موعـاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان و، موغەیرەی کوڕی شوعبەم کردە والی، بەڵام عوسمانی کوڕی عەففان، عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب، تەڵحە، زوبەیر، و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف لەوان خواناستر و بە ئیمانتر بوون.

ــ باشـە ئەوانەی کە نـاوت بـردن و نەتکـردن بە والـی، لە بەڕێوەبردنـدا بـێ دەسەڵات بوون؟

ـ کێ وای وتووە؟

ـ من وا تێگەشتم!

ـ هەرگیز کوڕم! هەرگیز. ئەوەی کە مەبەستم بوو لە کاروبارێکی دیـاری کـراودا بوو، لەسەردەمێکی دیاری کراودا. کاتێ سەرەی ڕۆڵبینینی ئەوانیش هات، هەرکەسە و کارێکم پێ سپارد، ئەگەرچی من عوسمانی کـوڕی عەففـان، عەلیـی کـوڕی ئەبـوو تالیب، تەڵحە، زوبەیر و، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفم نەکردە والی، بەڵام وەسـێتم کرد کە دوای من خەلافەت بە یەکێک لەو پێنج کەسە بدرێ. هیچ گومانـت نەبـێ کە خەلیفایەتی لە والییەتی گرانترە، والـی گەورەی شـارێک یـان ویلایەتـێکە، بەڵام

خەلیفە گەورە و بەڕێوەبەری هەموو شارەکان و موسڵمانانە، ئەمە یەک. دووەم، من پێم ناخۆش بوو گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر بە شار و وڵاتاندا بڵاو ببنەوە، چونکە من پێویستم بەوان بوو، پرس و ڕاوێژم پێ دەکردن، ئەوانە نزیکی من بووایەن و من سوودم لە عەقڵ و هوشیاری و دانایی ئەوانە وەرگرتایە زۆر لەوە باشتر بوو ببن بە والی، ئەو بازنە کەسانەی کە من دەمویستن، هەموو کەس نەیدەتوانی بێتە ناویەوە.

- ئەی تۆ چ مەرجێکت بۆ والی دانابوو؟

- جگە لەوەی کە دەبوو والی کەسێکی موسلمان و پاک بێ، زۆر مەرجی تریشم دانابوو، کەس بۆی نەبوو ببێ بە والی ئەگەر زۆر موسڵمان نەبووایە، ئەگەر زۆر موسڵمان بووایە ئەمجا مەرجەکانی تر دەهاتە پێشەوە، دەبوو بەرابەر بە خەڵک بەسۆز بێ. جارێک ناردم بە شوێن پیاوێکدا ناوی ناهێنم با نەبێ بە غەیبەت، ویستم بیکەم بە والی. هات و، وتم بە نووسەرەکەی بەردەستم کە کتابی بۆ بکا بۆ ئەوەی ببێ بە والی. نووسەرەکە کتابەکەی بۆ نووسی و دای بە من تەماشای بکەم، لەو کاتەدا کوڕەزایەکم هات و لە باوەشمدا دانیشت، منیش هەندێ گەپ و گاڵتەم لەگەڵدا کرد و ماچێکم کرد، ئەو پیاوە پێی وتم:

"قوربان من دە کوڕم هەیە، تا ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە!"

منیش وتم: "دەی من ئێستە چی بکەم بە تۆ؟! خوا سۆز و بەزەیی لە دڵی تۆدا دانەناوە!"

- دوایی چیت کرد قوربان؟

- کتابەکەم دڕاند و وتم: "هەستە لەلامدا من پێویستم بە تۆ نییە!"

- خۆ تۆ دەتزانی پیاوێکی ئیماندارە، ئەگەر نا بانگت نەدەکرد بۆ ئەوەی بیکەی بە والی، دەی بۆچی ئەو کارەت کرد و کتابەکەت دڕاند؟

- لە دڵی خۆمدا وتم: "ئەمە بەزەیی بە منداڵەکانیدا نایەت، ئیتر چۆن بەزەیی بەخەڵکا دێ؟"

کوڕم ! هەرکەس بەزەیی بە کەسوکاری خۆیدا نەیەت، بەزەیی بە خەڵکیشدا نایەت. هەرکەس بەرابەر کەسوکاری دڵڕەق بێ، بەرابەر خەڵکی تر دڵڕەقترە. پێغەمبەر فەرموویەتی: "باشترین کەستان ئەو کەسەیە کە باشترین کەسە بۆ خانەوادەکەی." منیش باشترین کەسم بۆ خانەوادەکەم.

جاری وابوو پێغەمبەر لە سەجدەدا زۆر دەمایەوە، دەزانی بۆ؟ چونکە حەسەن و حوسەین دەڕۆشتنە سەر پشتی. جارێک لەسەر مینبەر بوو، حەسەنی بینی، هاتە خوارەوە بۆ ئەوەی حەسەن لە باوەش بگرێ.

ئەبوو بەکر لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا هەر جار لەسەر ڕێگە دەربکەوتایە، منداڵەکانی دەهاتن و چاکی ئەویان دەگرت و دەیانوت: "بابە گیان! بابە گیان!"

کێ وتوویەتی مرۆڤی بەسۆز لاوازە؟! بە خوا بەهێزترین مرۆڤ بەسۆزترینە، لاوازترین مرۆڤیش دڵڕەقترین مرۆڤە، من پێویستم بە هیچ کەسێکی دڵڕەق نییە.

- دەی قوربان دوای دڵسۆزی و میهرەبانی چیترت بە مەرج گرتبوو؟

- بەهیزی و ئەمانەت، ئەگەر کەسێک بەهێزو ئەمین بایە، دەمکرد بە والی. پێویستە والی ئەو دوو سیفەتەی تیا بێ. جاری وا هەبوو یەکێکی بەهێزم لادەبرد، چونکە لەو بەهێزترم دەدۆزیەوە، ئەمەیش هیچ کەمایەتی نییە بۆ ئەو کەسەی لام دەبرد، ئەوەندە هەیە ئەمەی دووەم باشترە. پیاو بۆ خۆی پیاوە و، لاوازیەکەی بۆ خەڵکە، بەڵام موسڵمانی بەهیز بۆ خۆی و بۆ خەڵکە!

- لەم بارەوە نموونەت لایە قوربان؟!

- بەڵێ، نموونەیەکت بۆ باس دەکەم. جارێک شەرەحبیلی کوڕی حەسەنە والی بوو، لام برد و، موعاویەم خستە جێگەی. شەرەحبیل هات و پێی وتم:

"گەورەم! لە من زیزی وا منت لابردوە؟"

وتم: "نەخێر، نە من زیزم نە تۆیش خراپی، بەڵام موعاویە لە تۆ بەهێزترە، موعاویە دەکەم بە والی و، تۆیش لادەبەم هەرچەندە تۆ لەو خۆشەویستری!"

- قوربان ئەم خاڵە زۆر منی سەرسام کرد، تۆ زۆر نایابی، بیرت لە شتی وا کردووەتەوە. زۆر کاربەدەست هەیە والی دیاری دەکەن و پێوەریان تەنیا دینداریە و، ئیتر تەماشا ناکەن بزانن بەهێزن یا نە؟!

- ئەمە ژیری و مەنتیق وا دەڵێن؟ ئێمە یەک دەنگین لەسەر ئەوەی کە دینداری و ڕەوشتبەرزی شتێکە موساوەمەی لەسەر ناکرێ. دەمێنێتەوە هێز و بازووی ئەو کەسەی کە دەمانەوێ بیکەین بە والی و کاربەدەست. با وای دابنێین ئێستە جەنگ دەستی پێ کردووە و ئێمەیش دوو سەرکردەمان هەیە، یەکەمیان زۆر لە دووەم موسڵمانترە، بەڵام لە ڕووی سەربازییەوە شارەزاییەکی ئەوتۆی نییە. سەرکردەی دووەمیش هەر موسڵمان و باشە، بەڵام وەک یەکەم دیندار و خۆپارێز نییە، هەرچی لایەنی سەربازیشە زۆر شارەزایە، دەزانێ جوان نەخشەی جەنگ دابڕێژێ. سوپا بەڕێوە ببا، سەرکردایەتی جەنگ بکا، لە وەها کاتێکدا عەقڵی مرۆڤ نالێ: "دەبێ ئەم دووەمەیان سەرکردە بێ؟!"

- بۆچی گەورەم؟

- چونکە دینداری و خواناسی هەریەکەیان زیاتر پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە، بەڵام شارەزایی ئەو کەسانە لە جەنگدا پەیوەندی بە مان و نەمانی سەربازەکانەوە هەیە، لە کاتی جەنگدا ئێمە ئەوەندەی کە ئاتاجی مرۆڤی جەنگاوەرین، ئەوەندە ئاتاجی مرۆڤی لەخواترس نیین.

- ئەم پێوەرە بۆ هەموو کاتێکە؟

- بە گوێرەی کات و سەردەم، جاری وا هەیە لەخواترسان دەبێتە هۆکاری ئەوەی مرۆڤێک بکرێ بە کاربەدەست و والی. با وای دانێین کە ئێستە پرسیارێکی شەرعیمان بۆ هاتووە، ئەم پرسیارە شەرعییە دەقێکی قورئان یان فەرموودەی لەسەرە. پێویست ناکا خۆمان ماندوو بکەین و بە دوای وەڵامدا بگەڕێین، نە ئیجتیهادی گەرەکە نە بیر کردنەوە. ئێمەیش دوو زانامان هەیە، یەکیان زانستی کەمترە لەوی تر، بەڵام زیاتر خواناسە. ئەویتر زۆر زانایە، بەڵام لە خواناسیدا ناگا

بە یەکەم. ئا لەو کاتەدا پرسیارەکە ڕووبەڕووی زانای یەکەم دەکەینەوە، هەرچەندە زۆریش زانا نییە، چونکە وەڵامەکە سەخت نییە و پێویستی بە گەڕان و پشکنینی زۆر نییە، بەڵکو پێویستی بە کەسێکی لە خواترسە وەڵام بداتەوە. بەڵام ئەگەر وەڵامەکە سەخت بوو، گەڕان و لێکدانەوە و بیرکردنەوەی گەرەک بوو، ئەوە ژیری و لۆژیک پێمان دەڵێن پرسیارەکە ڕووبەڕووی زانای دووەم بکەینەوە، چونکە لە وەها کاتێکدا ئێمە زیاتر پێویستمان بە زانستە!

- قوربان تێگەشتم.

- شتێکی تر ماوە پێت بڵێم: کەسێک شارەزای کاروباری دونیا نەبێ و چاو و گوێ کراوە نەبێ و چاکە و خراپە نەناسێ، بەکەڵکی والییەتی نایەت. ڕۆژێک لە بارەی دانانی پیاوێک بۆ کارێک، پرسم بە چەند کەسێک کرد، یەک لەو کەسانە وتی: "فلان کەسی بۆ دیاری بکە."

وتم: "بۆ؟"

وتی: "زۆر پیاوێکی باشە، هەر نازانێ خراپە چییە!"

وتم: "قوڕبەسەرت! ئەوە زیاتر بۆی هەیە بکەوێتە ناو خراپەوە!"

- قوربان بۆچی وات فەرمو؟

- کوڕم ! مرۆڤ دوژمنی ئەو شتانەیە کە نایانزانێ. هەر ئەوەندە بەس نییە کە والی هەموو چاکەیەک بزانێ و خۆی پێوە بنێ، دەبێ خراپەکانیش بناسێ، بۆ ئەوەی خۆی لەو خراپانە بپارێزێ. با بە نموونەیەک بۆت ڕوون بکەمەوە، ئەو پیاوەی کە جگە لە حەڵاڵ هیچی تر ناناسێ، ئەمە مرۆڤێکی پاکە، بەڵام زۆر نزیکە بکەوێتە ناو حەرامەوە؛ چونکە نازانێ حەرام چییە بۆ ئەوەی خۆی لێ بپارێزێ!

- ڕاست دەفەرمووی گەورەم! قوربان چیی ترت بە مەرج دانابوو بۆ والی؟

- زۆربەی جارەکان ئەگەر لە ویلایەتێکدا کەسێکی باشم دەست بکەوتایە، ئەوا هەر خەڵکی ئەو شوێنەم دەکرد بە والی، ئەگەر بمویستایە والی بۆ شارێک دانێم و

دوو کەسی زۆر باش دەست بکەوتایە و یەکێکیان خەڵکی شارەکە بووایە، ئەوا ئەوم دەکرد بە والی!

- لەم بارەوە هیچ نموونەت لە یادە بۆم باس بکەی؟

- بەڵێ! من جابری کوڕی عەبدوڵلای بەجەلیم نارد بۆ عێراق و کردم بە والیی شارەکەی خۆیان. سەلمانی فارسیم کردە والیی مەدائین، خۆی لە بنەڕەتدا خەڵکی ئەوێیە. نافیعی کوڕی حارسم کردە والیی مەککە، چونکە خەڵکی مەککە بوو. عوسمانی کوڕی ئەبوولعاصم کردە والیی تائیف، چونکە خۆی تائیفی بوو.

- قوربان مەبەستت چی بوو لەم کارە؟

- من چەند ئامانجێکم هەبوو کە خەڵکی شارەکە خۆیان دەیانتوانی بە دی بهێنن، من ڕەچاوی سروشت و دابونەریتی خەڵکم دەکرد، دەبێ والی دابونەریت و سروشتی خەڵکی ویلایەتەکەی خۆی بزانێ و بناسێ. کەسێک لە دەرەوەی مەککە بڕواتە مەککە، وەک کەسێکی شاری مەککە ئەو شتانە نازانێ، شارەکانی تریش بەهەمان شێوە. ئا لەبەر ئەوە هەرگیز پیاوێکی دەشتەکیم نەدەکردە والی لە شاردا، یان پیاوێکی شارستانیم نەدەکردە والی لەو دەرودەشتە بەسەر ڕەشماڵ و دەوارنشینەکانەوە، چونکە دابونەریتی شاری جیایە و، دابونەریتی دەشتەکییش جیایە. دیسان دەبێ والی دەروونناس بێت، کەسێک بکرێ بە والی و دەروونناس نەبێ، ئەمە باش نییە، جاری وا هەیە ئەو کەسە دابونەریتی کەسانێک بە خراپ دەزانێ، سروشتی خەڵکانێکی بەلاوە سەیر دەبێ، ئەو کاتە شتی وا ڕوو دەدا کە لە قازانجی دەوڵەت و حوکوومەتدا نییە!

- سوێند بە خوا سیاسەت ئاوایە! حوکم ئاوایە! تۆ هەر بۆ سیاسەت و حوکمداری دروست کراوی. شتێکی تر ماوە قوربان پێم خۆشە پێم بڵێی؟

- چییە؟

- بۆچی خزم و کەسوکاری خۆت لە هیچ شوێنێ نەکرد بە والی؟

- بە خوا لەبەر ئەوە نەبوو بڵێم لێوەشاوە نین، یان دەستپاک و ڕاساڵ نین. من متمانەم بە دینداری و دەسپاکیی خزمەکانی خۆم هەبوو. سەعیدی ئامۆزام پیاوێکی زۆر چاک بوو، عەبدوڵڵای کوڕم زۆر زانا و لەخواترس بوو، بەڵام لە بەر دوو هۆکار نەمکردن بە والی:

یەکەم: لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەگەر کاربەدەستی خێر بێ، ئەوا لە بنەماڵەکەماندا من کاربەدەستم، ئیتر بەسە. ئەگەریش خراپە و شەڕ بێ، دیسان با هەر من بم!

دووەمیان: دەمویست ڕێگە لە شەیتان بگرم نەڕواتە نێو دڵی خەڵکەوە و بڵێن: ئەها عومەر فلان کەسی خزمی لەبەر خزمایەتی کردە کاربەدەست!

- قوربان کەس پێشنیاری ئەوەی بۆ کردووی کە خزمێکی خۆت بکەی بە کاربەدەست؟

- بەڵێ.

- چیرۆکەکەی چۆنە؟

- لای یەکێک لەو کەسانەی کە ڕاوێژکارم بوون، گلەیی ئەوەم کرد کە خەڵکی کوفە بە هیچ والییەک ڕازی نابن و زوو زوو والییان بۆ دەگۆڕین!

دوایی وتم: "خۆزگە پیاوێکی زۆر بەهێز، ئەمین، موسڵمان و دەستپاکم دەست بکەوتایە: بمکردایە بە والی کوفە."

ئەو پیاوە وتی: "من یەکێکت نیشان دەدەم."

وتم: "کێیە؟"

وتی: "عەبدوڵڵای کوڕی خۆت."

وتم: "دەک خوا بتکوژێ! بە خوا لەبەر خوا ئەو قسەیەت نەکرد! هەرکەس خزم و کەسوکاری خۆی بکا بە کاربەدەست، هەر لەبەر ئەوەی خزم و کەسوکارە، ئەوە خیانەتی لە خوا و پێغەمبەری خوا کردووە."

ـ بەڵام قوربـان کەمێـک پـێش ئێسـتا خـۆت فەرمـووت عەبـدوڵڵا شـایانی کاربەدەستی بوو!

- دەزانـم ! بەڵام خـۆ وتـم: "لە بنەماڵەی ئێمەدا یەکێکمـان کاربەدەست بـێن بەسە!" ئەوەیشم وت: "من ویستوومە دەرگا لەسەر شەیتان دابخەم!"

- بەڵێ قوربـان وابـوو. ئەی قوربـان پـێم بڵـێ سـەبارەت بە والییەکـان هیچـت دەبیستەوە؟

- چ شتێک؟

- بیستوومە هەرکەس خۆی داوای بەرپرسیارەتی کردبێ، پێت نەداوە!

- ڕاستە! جارێک ویستم پیاوێ بکەم بە والی، ئیرادەی خوا خۆی هات و داوای کرد بیکەم بە والی.

منیش پێم وت: "بە خوا من خـۆم ویسـتم بـتکەم بە والـی، بەڵام مـادەم خـۆت داواتکرد، ناتکەم! هەرکەس خۆی داوای کاربەدەستی بکا، ئێمە پێی نادەین!"

- مەبەستت چییە کە دەڵێـی: "هەرکەس خـۆی داوای کاربەدەسـتی بکـا، ئێمە پێی نادەین!"

- ڕۆڵە ! بەرپرسیارێتی تەکلیفە، نەک تەشریف. هەرکەس کرا بە کاربەدەست و، هەستی کرد بارێکی قورسی لەسەر شانە و، خۆی بـۆ وەڵامـدانەوەی ڕۆژی قیـامەت لە بەردەم دادگـای خـوا ئامـادە کـرد و پرسـیاری لێکـرا لەبـارەی ئەمـانەتەوە و، پاراستبووی، لە بەرابەر خەڵکەکەی ژێردەستی خـۆی دادگەربـوو، ئەوە ئەو کەسـە خوا یارمەتی دەدا و بارەکەی سووک دەکا و، بەهێـز و قسەڕۆشـتووی دەکـا، چەنـد کەسی بۆ موسەخەر دەکا تا یارمەتیی بـدەن و ئامۆژگـاریی بـکەن و، خەڵکەکـیەش هەموو بەگوێی دەکەن.

هەرکەسـیش بـۆ خـۆگەورەکردن و پلەوپـایە بەرپرسـیارەتی دەویسـت، ئەوە لەوە زیاتری دەست ناکەوێ کە خوا پێی دەدا.

ئەوەیش بزانە، هەرکەس بەرپرسیارەتی لەبەر خۆی ویست، ئەوە خەڵک بە دڵ لەگەڵیدا نابن. حوکوومەت و سەرکردایەتی بە خەڵکەوە بەندە، خەڵک نەبێ، حوکوومەت کوا؟ بەرپرسیارەتی کوا؟ بەرپرس خزمەتکاری خەڵکە و، خەڵک خزمەتکاری بەرپرس نین!

- ڕاست دەفەرمووی گەورەم! چیی ترت بە مەرج گرتبوو لەسەر والی؟

- پێش ئەوەی کارەکەیان پێ بسپێرم، سەروەت و سامانیانم دەژمارد، تا بزانم بەرپرسیارەتی بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکار دەهێنن یا نە؟ هەروەها بازرگانیم لە والیەکان قەدەغە کردبوو، نەمدەهێشت بازرگانی بە شتی گشتییەوە بکەن، ئیتر کڕیار بان یان فرۆشیار جیاوازیی نەبوو. دوای ئەوەیش بەرپرسیارەتییان کۆتایی دەهات، دیسان سەیری سەروەت و سامانم دەکردن، لەگەڵ ئەو کاتەی کە دەست بەکار دەبوون، بەراوردم دەکرد. ئەگەر شتێکی لە عادەتبەدەر زیادی کردبا، لێپێچینەوەم لەگەڵ دەکردن. هەرکەس بازرگانیی بکردایە بە بیانوو بۆ ئەو سامانەی کە لە ئەندازەبەدەر زیادی کردووە، پێم دەوت: "ئێمە ئێوەمان کردووە بە بەرپرس، نەک بازرگان!"

- قوربان ئەی بازرگانی حەڵاڵ نییە؟

- بەرەوەڵڵا ! خوا بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و، ڕیبایشی حەرام کردووە.

- دەی چۆن حەڵاڵت لەسەر ئەوان حەرام دەکرد؟

- کوا من بازرگانیم لەسەر خەڵک حەرام کردبوو؟

- نە! لەسەر خەڵک نا، بەڵام لەسەر والیەکانت حەرام کردبوو!

- من بۆ ئەوە قەدەغەم نەکردبوو کە بڵێم حەرامە. ئەمە مەرجی من بوو بۆ والی، مرۆڤ دەبێ پابەندی مەرجی خۆی بێ، هەرکەس پابەندی مەرجەکانم بووایە، دەمکرد بە والی و، هەرکەسیش پێی جێبەجێ نەکرایە، ئەوە ئەرز و ئەوە گەز، با بڕوا هەر بۆ خۆی بازرگانی بکا، بکڕێ و بفرۆشێ!

- حیکمەت چییە لە قەدەغەکردنی بازرگانی بۆ والی؟

- کوڕم وەک ڕۆژ ڕوونە! تەسەووری ئەوەم نەدەکرد پرسیارێکی ئاوا بکەی! بەڵام وەڵامت دەدەمەوە: ئەگەر والی بازرگانی بکا، ئەوە خۆی بە بازرگانییەوە سەرگەرم دەکا و مەرج و بەڵێن لە بیر دەکا. سەروەت و سامان بەڵایە، ئەگەر بمهێشتایە والییەکان بازرگانی بکەن، ئەوە دەبوونە ڕکابەری خەڵک. ئیتر ئەو کاتە ڕکابەرە دەسەڵاتبەدەستەکان هەر بارێک بهاتایە، دەچوون و کامە باشە بۆخۆیان دایاندەگرت، هەرچییان بویستایە دەیانکرد. ئەی ئیتر خەڵک چی بکردایە؟ چۆن نانیان پەیدا بکردایە؟!

- بەڵام خۆ لەوانەیە والی هەم والی بێت، هەم بازرگانێکی لەخواترس!

- بەڵێ ئەمە ڕاستە، بەڵام هێشتا هۆکاری یەکەم هەر دەمایەوە. والی ئەگەر بازرگان بوو، بە دەست خۆی نییە، سەرگەرمی کاروباری بازرگانی دەبێت و، کاروباری ویلایەتی پشت گوێ دەخا. دواتر مەرجەکانی من بۆ یەک کەس و دوو کەس نییە، بەڵکو گشتگیرە، خۆ نەمگوتوە: فلانکەس تۆ والی بە و بازرگانییش بکە، فیسار کەس تۆ والی بە، بەڵام بازرگانی نەکەی! من مەرجی بازرگانینەکردنم بۆ هەموو والیەکان بوو. من خۆم پێش ئەوەی ببم بە خەلیفە، بازرگان بووم. کە بووم بە خەلیفە، وازم لە بازرگانی هێنا. هەرکەسیش ئەو ڕەفتارانەت لەگەڵدا بکا کە لەگەڵ خۆیا دەیکا، ئەوە ستەمی لێت نەکردووە!

ڕاست دەفەرمووی گەورەم! پێم بڵێ. ڕۆژێک لە ڕۆژان پێش و دوای ویلایەت سامانی کەست ژماردبوو و گومانی لێ بکەی؟

- بەڵێ.

- چیرۆکەکەی چۆن بوو؟

- پیاوێکم کرد بە والی، ناوی حارسی کوڕی کەعب بوو، پێش دەستبەکاربوون سامانەکەی حارسم ژمارد - لەگەڵ هەموو کەسیش هەروا بووم - دوای ماوەیەک

ویستم کەسێکی تر بخەمە جێگەی حارس. حارسم لابرد و دیسان سامانەکەیم ژمارد، تەماشا دەکەم ئەوەندە زیادی کردووە، پیاو دەخاتە گومانەوە!

- ئەی چیت کرد؟

- لێم پرسی: "ئەمەت لە کوێ بوو(من أين لك هذا)؟

وتی: "خۆم برێ پارەم هەبوو، بازرگانیم پێوە کرد!"

منیش وتم: "بە خوا ئێمە تۆمان بۆ بازرگانی دانەناوە."

هەرچی زیادە هەبوو هەموم لێ سەندەوە.

- بەڵام قوربان ئەوە خۆ پارەی خۆی بوو؟

- ئەگەر کەسێکی ئاسایی بووایە، بەڵێ هی خۆی بوو، بەڵام ئەو والی و بەرپرس بوو.

- جیاوازیی چییە؟

- یەکەم: ئەو، ئەو مەرجەی پێشێل کرد کە وتمان نابێ بازرگانی بکەی.

دووەم: ئەگەر ئەو پارەیەی کە لێم سەندەوە، بۆ خۆمم بووایە، ئەوە حەرام بوو، بەڵام من ئەو پارەیەم خستەوە خەزێنەی حوکوومەت. پێشتر پێم وتی کە بازرگانیکردن وا لە بەرپرس دەکا ئاگای لە بەرپرسیارەتی نەمێنێ. ئەو بازرگانیی کردبوو، ئاگای لە کاروباری بەرپرسیارەتی نەمابوو، مووچەیشی وەردەگرت لەبەر ئەوەی والی بوو، ئەمەیش لەسەر حیسابی خەڵک تەواو دەبێ. منیش سامانە زیادەکەم لێ سەندەوە و، بۆ خەڵکم گەڕاندەوە!

- پاک و بێگەردی بۆ خوا! تۆ بیر لە شتی وا دەکەیتەوە کە بە بیری هیچ کەسێکدا نایەت، بۆیەیش بڕیاری ژیرانەی وا دەدەی کە پیاو سەرسام دەکا.

- خوا هاوکارە کوڕم!

- ئەی تۆ لە بارەی بەرپرسانەوە ڕاوێژت بە کەس دەکرد؟

- مەبەستت چییە؟

ـ مەبەستم ئەوەیە: تۆ کە ئەم مەرجانەت بۆ بەرپرسان دانابوو، دوایی لە خەڵکت دەپرسی بزانی مەرجەکان جێبەجێ دەکەن یان نە؟

ـ من هەموو کەس وەک یەک ناناسم، کەسی وا دەناسم کە ڕەگ و مێشک و دڵ و دەروونی دەناسم، کەسی وایش هەیە کە کەمێک دەیناسم، ئەو کەسانەی کە بە تەواوی دەمناسین، ئەگەر بمکردنایە بە بەرپرس، دوایی لە هیچ کەسێکم نەدەپرسی کە چۆنە و چۆن نییە؟ چونکە مەبەست لە ڕاوێژ ناسینە، منیش باش دەمناسین. جارجارەیش هەر دەمپرسی، بەڵام بۆ زیاتر دڵنیایی. ئەوانەیش کە بە باشی نەمدەناسین، زۆر بە وردی پرسیارم دەکرد لە بارەی دینداری، بەهێزی، ئەمانەتداری و... ڕاوبۆچونی خەڵکم بەلاوە مەبەست دەبوو.

ـ قوربان تێگەشتم.

ـ با زیاترت بۆ باس بکەم.

ـ فەرموو قوربان.

ـ من نەک لە بارەی والییەک، بەڵکو پرسیارم لە بارەی شارێکەوە دەکرد.

ـ چۆن؟

ـ ئێستا پێت دەڵێم و چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە تا بزانی چۆن حوکمم دەکرد.

ـ دەی قوربان فەرموو، گوێبیستم.

ـ ڕاوێژم لەگەڵ هاوەڵاندا کرد کە کێ بکەم بە والیی کوفە، پێم وتن: "کێ دەتوانێ والییەکی باش بۆ کوفە دیاری بکا؟ ئەگەر کەسێکی نەرمونیان دیاری بکەم، خەڵکی کوفە سواری ملی دەبن، ئەگەر یەکێکی توندوتیژیش دیاری بکەم، هاواریان لێ هەڵدەسێ!"

دوایش وتم: "خەڵکینە! ڕاتان چییە لە بارەی پیاوێکی زۆر موسڵمان و لە خواترس، بەڵام لاوازو نەتوان لەگەڵ پیاوێکی بە زەبروزەنگ، بەڵام وەک ئەوەی پێشوو لە خواناسیدا لە پێشەوە نەبێ، کامیان بۆ بەرپرسی باشترە؟"

موغەیرەی کوڕی شوعبە وتی: "گەورەم! ئەو پیاوەی کە ناتەوانە و موسڵمانە، ئەوە موسڵمانییەکەی هەر بۆ خۆیەتی و بەس، بەڵام لاوازی و نەتوانییەکەی بەسەر تۆ و موسڵماناندا دەشکێتەوە. ئەو پیاوەیش کە بەهێزە و زەبروزەنگی هەیە، ئەوە بۆ خۆی توندە و، هێزەکەیشی بۆ تۆ و موسڵمانانە. ئیتر تۆیش خۆت سەرپشکی کێ بە باش دەزانی."

منیش وتم: "وەڵڵا موغەیرە ڕاست دەکەی."

دوایی کردم بە والی کوفە و پێم وت: "کەسێکی وابە کە مرۆڤی باش پشتیان بە تۆ ئەستور بێ و، مرۆڤە خراپەکانیش لێت بترسن!"

ئەویش وتی: "بەسەرچاو. هەرچییەک تۆ بیڵێی."

- دەی وا بوو؟

- ئەرێ بەخوا، بۆ کاربەدەستی زۆر گونجاو بوو، دەیزانی خەڵک بەڕێوە ببا. وا دەزانم ئەگەر هەرکەسێکی ترم لەویش بە باشتر بزانیایە و بمکردایە بە والی کوفە، وەک ئەو کوفەی بەڕێوە نەدەبرد. خەڵکی کوفە هەموو هاتنە ژێر فرمانی، پرتەوبۆڵەیان کەمبوویەوە، سکاڵایان نەما!

- هیچ شتێکی تر هەیە لە بارەی ئەو مەرجانەی پێش بوون بە والی دات دەنان؟

- بەڵێ، هەیە.

- چییە؟

- من هەندێ لەو کەسانەم تاقی دەکردەوە، پێش ئەوەی بیانکەم بە والی.

- چۆن؟

- ویستم ئەحنەفی کوڕی قەیس بکەم بە والی، یەک ساڵی ڕەبەق لای خۆم هێشتمەوە، جوان تەماشای کار و ڕەفتاری ئەوم دەکرد، بەدڵم بوو، پێم وت: "ئەحنەف! من چەنێکە تۆ تاقی دەکەمەوە، بۆم دەرکەوت بە ڕواڵەت باشی،

هیوادارم لە ناخیشدا هەروا باش بیت." ئێمە هەمیشە باسی ئەوەمان دەکرد کە مرۆڤی دووڕووی زانا، خەڵک لەناو دەبا.

دوایی پێم وت: "دەزانی تۆم بۆچی لای خۆم هێشتەوە؟"

وتی: "نەخێر."

وتم: "من دەمەوێ بتکەم بە والی. ئەو مەرجانەی کە پێم خۆشە لە والیا هەبێ، لە تۆدا هەن."

وتی: "قوربان! ئەمە لە چاکەی خۆتە ئاوا من بە باش دەزانی."

پێش ئەوەی بینێرم، ئامۆژگاریەکم کرد و وتم: "ئەحنەف! هەرکەس زۆر پێبکەنێ، سام و هەیبەتی کەم دەبێتەوە. هەرکەس زۆر گاڵتە و فیشقیات بکا، سووک دەبێ. هەرکەس زۆر جۆرە کارێک بکا، بەو شتە ناوبانگ دەر دەکا و دەناسرێتەوە. هەرکەس زۆر قسە بکا، زۆر تێدەکەوێ. هەرکەس زۆر تێکەوێ، شەرم و شکۆی کەم دەبێتەوە. هەرکەس شەرمی کەم ببێتەوە، خۆپاراستنی کەم دەبێتەوە. هەرکەسیش خۆپاراستنی کەم ببێتەوە، دڵی دەمرێ!"

- ئای قوربان! چ ئامۆژگارییەکی جوانە! پێم خۆشە کۆتا پرسیارت لە بارەی کاربەدەستانەوە لێ بکەم.

- پرسیارەکەت چییە؟

- ئەگەر پیاوێک تەواوی مەرجەکانی تۆی تیا بووایە، چیت دەکرد؟ خەڵکی شارێک چۆنیان دەزانی تۆ والییەکت بۆ ناردوون؟ ئەگەر والییەکت لە کار لا بدایە، ئەو والییە چۆنی دەزانی کە لە کار لابراوە؟

- پاش ئەوەی مەرجەکانی من لە کەسێکدا هەبا، ئەوا ڕاوێژم بە چەند کەسێکی تر دەکرد، ئەگەر ئەوانیش ڕایان لەسەر بووایە، ئەوا نامەیەکمان دەنووسی و پەیمان دەوت: "بەڵێننامەی دیاریکردن(عهد التعيين.)" کۆمەڵێک لە کۆچەرییەکان و کۆمەڵێکیش ئەنصاریم دەکرد بە شایەت. چەند مەرجێکم تیا دەنووسی کە لەمەو پێش ئەو مەرجانە باسکران. ئەمە ئەگەر کابرا خۆی حازر بووایە، ئەگەر کابرا

خۆی حازر نەبایە و لە شوێنێکی تر بووایە، ئەوا بەڵێننامەکەم بۆ دەنووسی و بۆم دەنارد. بۆ عەلای کوڕی غەزوان وابوو، خۆی بە دیارەوە نەبوو، نامەکەم نووسی و بۆم نارد. سەبارەت بە لابردنی والییەک و دانانی کەسێکی تر لە جێگەیدا، ئەوە نامەکەم بە والییە تازەکە دەدا و، لە نامەکەدا لابردنی والییە کۆنەکە و دەستبەکاربوونی والییە تازەکەمان دەنووسی. نموونەی ئەمەیش وەک ئەو بەڵێننامەیەی کە بە ئەبوو موسای ئەشعەریم دا. موغەیرەی کوڕی شوعبە والی بەصرە بوو، ئەوم لابرد و ئەبوو موسام لە جێگەیدا دانا.

- قوربان تۆ نەتفەرموو: "موغەیرە بۆ والییەتی زۆر لێوەشاوەبوو؟"

- با، وتم.

- دەی بۆچی لات برد؟

- موغەیرە لە کوفەدا زۆر سەرکەوتوو بوو. ئەمە مانای وانییە کە لە بەصرەشدا سەرکەوتوو بێت. هەر شارەو تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەر خێڵ و هۆز و بنەماڵەیەک تەبیعەتی تایبەتی خۆیان هەیە. والیی وا هەیە لە شارێکدا زۆر بە سەرکەوتوویی والییەتی دەکا، بەڵام لە شارێکی تردا سەرکەوتوو نابێت. دواتر لابردنیش مانای ئەوە نییە کە ئەو والییە لێهاتوو نەبووە. زۆر جار بینیومە والییەک زۆر لێهاتوو بووە و، لە والییەتی لامبردوە بۆ ئەوەی کارێکی گرنگتری پێ بسپێرم.

- تێگەشتم قوربان! ئیتر لە بارەی دانانی والییەوە پرسیار ناکەم. تۆ باسی والی لابردنت کرد، ئیزنم دەدەی لەم بارەوە پرسیارت لێ بکەم؟

- فەرموو!

- بە درێژی باسی لابردنی خالیدی کوڕی وەلیدمان کرد. ئەی لە بارەی لابردنی سەعدی کوڕی ئەبوو وەققاص چی هەیە؟

- سەعد پیاوێکی پاک و لەخواترس، خاڵی پێغەمبەر[١]، ئەو یەکەم کەس بوو لە پێناوی خوادا تیری هاویشت. پێغەمبەر شتێکی وای پێ فەرموو، هەموو کەس خۆزگەی لێ دەخوازێ، پێی فەرموو: "بیهاوێژە! دایک و باوکم بە قوربانت بن." هەرچی لەبارەی لابردنییەتی، ئەوە خوانەخواستە لەبەر ئەوە نەبوو کە تاوانێکی ئەنجام دابێت. ئێستە بۆت باس دەکەم. کۆمەڵێک پیاو بە سەرکردایەتیی جەڕاحی کوڕی سینانی ئەسەدی لە کوفەدا کۆبوونەوە، سکاڵایان لە دژی سەعد تۆمار کرد. ئەو سەردەمە بوو کە سوپای موسڵمانان لەگەڵ ئاگرپەرەستەکانی نەهاوەنددا لە جەنگدا بوون. سەعد پیاوێکی دادگەر و، بەسۆز بوو بۆ ژێردەستەکانی خۆی، بەرابەر ناهەق و کوفر زۆر توند بوو، زۆر بەسۆز بوو بەرابەر خەڵکانێ کە لەسەر هەق بان و گوێڕایەڵ بان، لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێ کەسی هەقنەبین سکاڵایان لێ دەکرد، دەیانویست بەو سکاڵایە هەندێ لە ویست و ئارەزوەکانی خۆیان بێننە دی. کاتێکی زۆر ناسکیشیان بۆ سکاڵاکەیان هەڵبژاردبوو. موسڵمانان لە جەنگدا بوون، دەبوو هاودەنگ و یەکڕیز بان. من باش دەمزانی کە ئەو سکاڵای ئەوانە ناهەقە، بەڵام لەبەر ئەوەی یەکڕیزیی موسڵمانان تێک نەچێ و بارودۆخەکە بارودۆخێکی ناسک بوو، سکاڵاکەم لێ وەرگرتن. موحەممەدی کوڕی موسلیمەم نارد بۆ ئەوەی وەک داوەر بکەوێتە نێوان سەعد و سکاڵاکەران. سەعد لەسەر بەڵێنی خۆی مابوو، پیاوێکی ئەمین و ڕاستگۆ، بەڵام لەبەر ئەوەی فیتنە و ئاژاوە کپ بکەمەوە، سەعدم لابرد. وتم با ئەم ئاژاوەیە لە لانکدا بێ و گەورە نەبێ و پێنەگا و، نەبێتە هۆی دووبەرەکی و ئاژاوەی نێوان سوپای موسڵمانان. تەنانەت ترسم هەبوو سەربکێشێ بۆ کوشت و کوشتار. سەعد گەڕایەوە بۆ مەدینە. منیش ڕێزێکی تایبەتیم لێ گرت، تەنانەت کردم بە یەکێک لە ڕاوێژکارە هەرە نزیکەکانی خۆم. لەوەش زیاتر یەکێک

---

[١] سەعد ئامۆزای دایکی پێغەمبەر بوو، بۆیە بە خاڵە بانگی کردووە. لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە جارێکیان سەعد بەرەولای پێغەمبەر و کۆمەڵێک هاوەڵ دەهات، پێغەمبەر فەرمووی: "هذا خالي." واتە ئەمە خاڵۆی منە.

بوو لەو شەش کەسەی کە من دەستنیشانم کردن کە لە دوای منەوە یەکێکیان بکرێ بە خەلیفە. من ئەگەر بە ئەندازەی سەرەپەنجەیەک گومانم لە سەعد هەبووایە، ئاوا گرنگیم پێ نەدەدا. بێگومان وەرگرتنی پۆستی خەلیفایەتی زۆر لە پۆستی والی گەورەترە، خەلیفە گەورەی تەواوی موسڵمانانە، بەڵام والی تەنیا گەورەی شارێکە.

- قوربان! پرسیارێک دەکەم، لەوانەیە کەمێک ڕووتەقی بێ، ئەو کارەی تۆ کردت وێنای لاوازیی نەدەکرد؟! من بێگومانم کە تۆ لاواز نەبووی! بەڵام بۆ وات کرد؟

- لاوازی لە کوێدایە کوڕم؟!

- پیاوێک بە باشی دەیناسی، دەزانی دیندارە، دەسپاکە، بەهێزە. پاشتر کەسێک دەنێری تا بزانێ وەک جاران ماوە یان گۆڕاوە، بۆت دەردەکەوێ وەک جارانە و هیچ نەگۆڕاوە. کەچی لە کاریش لای دەبەی!

- کوڕم! پیاوی زیرەک ئەو کەسە نییە کە باشە و خراپە لێک جیا بکاتەوە؛ ئەو کەسەیە کە دوو خراپە لێک جیابکاتەوە و بزانێ کامەیان زەرەری کەمترە. ئەگەر ژیان هەمیشە ئێمەی لەنێوان چاکەو خراپە دانایە، ئەوە ئاسان بوو، بەڵام جاری وا هەیە دەمانخاتە نێوان دوو خراپەوە، دەبێ بزانین کامەیان سووکترە و کەمترە. من پێم وتی ئەوانە لە چ کاتێکدا هاتن و شکاتیان لە سەعد کرد. ئەگەر من مرۆڤێکی دادگەر لاببەم و دادگەرێکی تر لە جێگەیدا دابنێم، ئەوە ستەمکاری نییە؛ شتێکە بارودۆخ وا دەخوازێ. جاری وا هەیە خەڵک زۆر لە بەرپرس گرنگترە. ئەگەر من خودی سەعدم سەرپشک بکردایە لەنێوان ئەوەی کە والی بێت و ئاژاوەیەک دروست بێت، یان لە والییەتی لای ببەم و ئاژاوەیەک کپ ببێتەوە، بێگومان دووەمیانی هەڵدەبژارد. جارجار دەبێ کاتەکان دیاری بکەی، کات و بارودۆخی وا هەیە وەک ڕەشەبای شوومە. تەماشای سروشت بکە، جاری وا هەیە ڕەشەبایەکی بەهێز دار و درەخت دەشکێنێ و تەنانەت لە بنیان دێنێ. ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دارەکە بەرابەر ئەو ڕەشەبایە دەوەستێ. تەماشای گژوگیایش بکە، لە بەرابەر ڕەشەبادا کەمێک خوار دەبێتەوە، بەڵام هەر ڕەشەباکە نەما، یەکسەر ئەویش ڕاست دەبێتەوە. پێغەمبەر

سەرمەشق بوو بۆ ئێمە، پێم وتی کە لە ڕۆژی حودەیبەدا چی ڕووی دا، چۆن پێغەمبەر مەرجەکانی ئەوانی پەسەند کرد. من یەکێک بووم لەوانەی کە ئەو ڕۆژە لەبەر خوا و پێغەمبەری خوا زۆر تورە بوون، بەڵام دوای ئەوەی ڕەشەباکە تێپەڕی، زانیم نەرمونیانی لەگەڵ لاوازیدا جیایە. نەرمونیانی لەگەڵ هێزا دژی یەک نین، پێغەمبەر ئەو ڕۆژە عومەری فێر کرد!

ـ سەلام وصەڵاواتی خوا لە پێغەمبەر بێت. قوربان لەبارەی دیاریکردن و لابردنی والیەکان پرسیارم کرد. دەمەوێ بزانم تۆ بەدواداچوونت بۆ والیەکان دەکرد تا بزانی چی دەکەن و چی ناکەن؟ یان ئەوەندەت بەس بوو کە ئەو کاتەی دەتکردن بە والی، بە باشی دەتناسین و دەتزانی پیاوی چاکن و موسڵمانی پاکن؟

ـ ئەوەندەم بەس نەبوو؛ بەدواداچوونم بۆ دەکردن، بزانم وەک خۆیان بە چاکی ماون؟ دەترسام و دەمگوت: نەکا شەیتان لە خشتەیان بەرێت. من بانگەشە و دروشمێکم هەبوو، دەمگوت: "هەموو ڕۆژێک والیەک بگۆڕم، لەوە باشترە تاقە ڕۆژێک والیەکی ستەمکار لەسەر تەختی ویلایەت بێت!"

دیسان دەمگوت: "هەر کاربەدەستێکی من ستەم لە خەڵک بکات و، پێی بزانم و قسە نەکەم، ئەوە من ئەو ستەمەم کردووە!"

ڕۆژێک بەوانەی دەوروبەری خۆمم وت: "ئێوە ڕاتان چییە ئەگەر من بە ڕای خۆم باشترین کەس بکەم بە گەورەتان و، پێی بڵێم: 'دادگەربە!' ئایا بەوەندە ئەرکی خۆمم جێبەجێ کردووە؟"

وتیان: "بەڵێ."

وتم: "نەخێر، وا نییە. دەبێ چاودێریی وردی بکەم، بزانم ئەوەی من ویستوومە، دەیکا یان نایکا!"

من بۆچوونێکی تایبەتیی خۆمم هەبوو، لەو کاروبارەی کە پەیوەندیی بە دابونەریتی ناوچەیی هەبوو، کاربەدەستەکانم سەرپشک دەکرد. بەڵام لە کاروباری گشتیدا وانەبوو، چاودێریی هەڵس و کەوت و ڕەفتاریانم دەکرد.

- چۆن ئەمەت دەکرد؟

- من کەسانێکی نهێنی و تایبەتیم هەبوون، ڕاستەخۆ پەیوەندییان بە خۆمەوە هەبوو، چاودێریی والی و کاربەدەست و تەنانەت خەڵکیشیان دەکرد.

ـــ وا دەردەکەوێ شتێک وەک ئەمەی ئەم سەردەمە بووە کە پێی دەڵێن: "ئاسایش،" بەڵام مەبەستەکان جیاوازن و دەگۆڕێن. مەبەستی تۆ لە دانانی ئەو کەسانە چی بوو؟

ـــ مەبەستی سەرەتا و کۆتاییم پاراستنی ئاسایش و پارێزگاری بوو لە حوکوومەت. من مەبەستم ئەوە نەبوو کە جاسوسی خەڵکم بۆ بکەن و بەشوێن عەیب و عاری خەڵکدا بگەڕێن و، ترس و لەرز بخەنە نێو دڵی خەڵکەوە. یەکێک لە کارە گرنگەکانیان ئەوە بوو: بە وردی چاودێریی کاری کاربەدەستانیان دەکرد، بۆیە من وەک چۆن دەمزانی کاربەدەستەکانی لای خۆم لە شاری مەدینەدا چی دەکەن و چی ناکەن، ئاوایش دەمزانی کاربەدەستە دوورەکان چی دەکەن و چی ناکەن!

لە هەر جێگەیەک باکوور یان باشوور، ڕۆژئاوا یان ڕۆژهەڵات، دوور یان نزیک کاربەدەستێکم هەبا، ئەوا کەسێک یان زیاتر بە وردی چاودێرییان دەکرد و هەر شتێک لەم پەڕو ئەو پەڕی دەسەڵاتی مندا قەومابا، بە باشی ئاگام لێ بوو.

هەموو جارێکیش داوام لە والی و کاربەدەستان دەکرد وەفدێک بنێرن بۆلام تا خۆم لە نزیکەوە پرسیاری شار و کاروباریان لێ بکەم؛ پرسیاریان لێ بکەم لە بارەی داهات و باج و خەراجەوە، لە بارەی والییەکەیان، باشە یا خراپ! ستەمکارە یا دادگەر؟!

هەر داهاتێکیان هەبووایە و بۆ مەدینەیان بناردایە، منیش دەمگوت: "دەبێ دە دانە پیاویش لەگەڵ ئەو باج و داهاتانەدا بێن، با پرسیاریان لێ بکەم و شایەتی بدەن کە ئەو دەستکەوت و داهاتانە داگیر نەکراون و بە زۆر لە کەس نەسەنراون و ستەمیان تیا نییە!" ئەمە دەبووە هۆی ئەوەی کە ئەگەر خوانەخواستە والییەک لە دڵدا پێی خۆش بێ ستەم بکا، نەوێرێ ستەمەکەی بکا. ئەگەر ستەمێک بکرایە، ئەوا یەکسەر ئەو کەسانەی کە دامنابوون بە نهێنی چاودێریی والی و کاربەدەست و خەڵکیش بکەن، پێیان دەگەیاندم!

ئێمە نامەبەری تایبەتمان هەبوو، هەموو جارێ بەو نامەبەرانەدا نامەم بۆ کاربەدەستەکان دەنارد. بەو نامەبەرانەم گوتبوو: "هەرجار نامەی منتان برد بۆ کاربەدەستێکی دوور، لەناو خەڵکی ئەو شارەدا جاڕ بدەن بڵێن: 'ئێمە نامەبەرین، هەرکەس نامە بۆ عومەر دەنێرێ، بۆی دەبەین.'"

ئەگەر کەسێک نامەی بۆ من بنووسیایە، ئەوا زۆر بەبێ ترس نامەی دەنووسی و دەینارد، چونکە والی و کاربەدەست بە هیچ شێوەیەک بۆیان نەبوو خۆیان لەو کارەدا هەڵبقورتێنن. تەنانەت نامەبەرەکە خۆیشی نەیدەزانی چی لە نامەکەدا نووسراوە. پێم گوتبوون: "دەبێ نامەم بە داخراوی بە دەست بگەیەنن و، نابێ هەڵتەکابێ." بەم شێوە خەڵک هەر گلەیی و گازندەیەکیان هەبووایە، زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی بۆ منی بنێرن. جا هەرکات لەو جۆرە نامانەم بە دەست گەشتبا، خۆم دەمخوێندنەوە و پرس وڕاوێژم دەکرد و کام کارە هەق بووایە، دەمکرد.

لەوەش زیاتر من موحەممەدی کوڕی سەلەمەی ئەنصاریم کردبوو بە لێکۆڵەر و چاودێر بەسەر هەموو کاربەدەستانی حوکوومەتەوە، چاودێریی هەموو والییەکانی دەکرد، لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکردن، لە سکاڵا و گلە و گازندەی خەڵکی دەکۆڵییەوە!

خۆ کاتی حەجکردن هەر مەپرسە، خەڵک بە لێشاو لە هەموو لایەکەوە بۆ حەجکردن دەهاتن و، منیش هەموویانم دەبینی و پرسیارم لە هەموویان و لە بارەی هەموو شتێکەوە لێ دەکردن. من کاتی حەجکردنم کردبوو بە کاتی لێپرسینەوە و لێپێچینەوە، کردبووم بە کاتی گوێگرتن لە قسەی ناودڵی هەموو چینەکانی خەڵک. لە وەرزی حەجدا هەموو جۆرە خەڵکێک کۆ دەبوونەوە، هەبوو سکاڵا و گلە و گازندەی هەبوو. تەنانەت ئەوانەی کە من کردبوونم بە چاودێر، لە کاتی حەجدا لەوانیشم دەپرسیەوە. دەبوو هەموو والییەکان هەموو ساڵێک لە کاتی حەج کردندا خۆیان بێن بۆلای من و، ڕاپۆرتی کار و بەڕێوەبردن و... پێشکەش بکەن. بزانم چییان کردووە و چییان نەکردووە؟

لەوەش زیاتر، لە دوادوایی خەلافەتمدا بڕیارێکم دەرکرد، وتم دەبێ خۆم بگەڕێم بەسەر هەموو ویلایەت و والییەکاندا و زۆر لە نزیکەوە خەڵک و والی و کاروباری ویلایەتەکان چاودێری بکەم؛ بۆ ئەوەی تەواو دڵنیا ببم.

لە دڵی خۆما وتم: "ئەگەر خوا تەمەنی پێدام، ئەوا یەک ساڵی ڕەبەق بەناو خەڵکی سادە و هەژار و جووتیار و کاسبکاردا دەگەڕێم و دەیاندوێنم، لەوانەیە ئەوانە داواکارییەکیان هەبێ و والییەکان نەیەڵن ئەو داواکارییە بە من بگا. دەڕۆم بۆ شام، دوو مانگ لەوێ دەمێنمەوە؛ دەڕۆم بۆ جەزیرە، دوو مانگ لەوێ دەبم؛ دوایی دەڕۆم بۆ کوفە، دوو مانگیش لەوێ دەبم؛ لەوێیشەوە دەڕۆم بۆ بەصرە، دوو مانگ لەوێ دەبم. ئا بەم شێوەیە ساڵێکی تەواو دەگەڕێم تا بە وردی هەموو شتێک ببینم و بزانم!"

- بە خوا قوربان، ئەو ساڵە ساڵێکی باشە. تۆیش پیاوێکی باشی. دەی گەورەم ئێستە پێم بڵێ، لە سەردەمی تۆدا دادوەری و قەزاوەت چۆن بوو؟

- چ لایەنێکت بە دیاریکراوی بۆ باس بکەم؟

- قەزاوەت چۆن بوو؟ چۆنت ڕێک خستبوو؟ لەنێوان تۆ و دادوەرەکاندا چی گوزەراوە؟

- باشە پێت دەڵێم!

خـوای گەورە قورئـانی بـۆ پێغەمـبەرﷺ نـاردووە. ئەم قورئـانە شـەریعەت و دادوەری و بڕیاردانی تیایە. پێغەمبەرﷺ خۆی کێشە و ئاریشەی خەڵکی کۆتایی پێ دێنا و بڕیـاری دەدا، شـەرعی خـودای پیادە دەکـرد، بـۆ ئەو کـارانەیش داوای هاوکاری لە هەندێ لە هاوەڵان دەکرد، بۆ نموونە مەعازی وەک دادوەر و مامۆستا نارد بۆ یەمەن، هەروەها عەلیی کوڕی ئەبوو تالیبیشـی نـارد. ئەبوو بەکریش بەو شێوەیە کاری کرد، خۆی بەپێـی قورئـان و فەرمـوودە بڕیـاری دەدا، بەڵام بە هـۆی سـەرکردایەتیکردنی جەنـگ و گەڕانـدنەوەی ئەوانەی کە لە ئیسـلام هەڵـگەڕانەوە، سـەرقاڵی ڕووی تـێ کـرد. دادوەری و قەزاوەت لەو شـار و لادێیـانەی کە هەڵنەگەڕابووەنەوە، وەک خۆی مایەوە و بەردەوام بوو. تا ئەو کاتەی ئەبوو بەکر لە دونیـادا مـابوو، هەر خەریـک بـوو بـۆ گەڕانـدنەوەی ئەو ناوچـانەی لە ئـایین وەرگەڕابـوونەوە. تـا مـردن خەریـک بـوو، زۆربەی کاروبـاری وەک سـەردەمی پێغەمبەرﷺ لێکردەوە، ئیتر مەرگ مۆڵەتی نەدا و گەشتەوە بە پێغەمـبەرﷺ. داوام وایە خوای گەورە منیش لەگەڵ ئەواندا کۆ بکاتەوە و بمانخاتە نێو بەهەشتی گەورە و نەبڕاوەی خۆی.

- ئامین! خوایە گیان ئامین!

- خوا تۆیش بخاتە بەهەشتەوە و بە خزمەت پێغەمبەرتﷺ بگەیەنێت، کوڕم! ... با بێینەوە سەر قسەکەی خۆمان... کاتێ من خەلافەتم گرتە دەست، یەکەم جار داوەریم لەنێوان خەڵکدا دەکـرد، بڕیـار و فەتـوام دەدا، بەڵام دوای ئەوەی کە دەوڵەت و حوکوومەتی ئیسلامی بەرفـراوان بـوو و عەرەب و عەجەم تـێکەڵ بـوون، ئیتر من ماوەی ئەوەم نەما خۆم خەریکی ئەو کـارانە بـکەم، ئیتـر وازم لە دادوەری هێنا، دەستمکرد بە دانانی دادوەر بۆ هەموو ویلایەتەکان ئەبـودەردام کـردە دادوەری مەدینە، شورەیحی کەندیم کردە دادوەری کوفە، عوسـمانی کـوڕی ئەبولعاصـم کـردە دادوەری میصر؛ ئەبوو موسای ئەشعەریم کردە دادوەری بەصرە.

- مووچەت بۆ ئەوانیش دیاری کرد؟

- بێگومان بەڵێ، مووچەم بۆ والییەکان دیاری کرد بۆ ئەوە نان پەیداکردن نەبێتە بەرگری لە بەڕێوەبردنی کارەکانیان، هەروەها مووچەم بۆ دادوەرەکانیش بڕییەوە بۆ ئەوەی ئاتاجی کاسبی و نان پەیدا کردن نەبن و خەریکی دادوەری خۆیان بن، بە باشی گوێ لە خەڵک بگرن و کێشەکانیان چارەسەر بکەن.

- ئەی چاودێری ئەوانیشت دەکرد؟

- ئەیچۆن! بەڵێ چاودێری ئەوانیشم دەکرد. ئەو چاودێرانەی کە پێشتر باسمان کردن، تەنیا چاودێریی والییەکانیان نەدەکرد، بەڵکو چاودێریی دادوەرەکانیشیان دەکرد. تەنانەت چاودێرییان لەسەر ئەوانەیش دەکرد کە کارێکی بچووک و ئاساییان بە دەستەوە گرتبێ. پێیشم وتی: من لە کاربەدەستەکان بەدگومان نەبووم، بەڵام بۆ تەواو دڵنیا بوونەوە ئەو چاودێرانەم دانابوو. دادوەرییش وەک کاربەدەستی و بەرپرسیارێتی گرنگە، دەبێ چاودێریی ئەوانیش بکرێت.

- ئەی ئامۆژگاریت دەکردن وەک ئەوەی ئامۆژگاریی بەرپرسەکانت دەکرد؟

- بێگومان بەڵێ! بە بیرمدا نایەت تاقە کەسێکم بۆ کارێک ڕاسپاردبێ و ئامۆژگاریم نەکردبێ.

- لەو ئامۆژگاریانە هیچت لە بیرە بۆم باس بکەی؟

- ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکێشێ و بە ئاسانی کۆتایی نایەت، یەک دانەت بۆ دەگێڕمەوە، ئەو کاتەی ئەبوو موسای ئەشعەریم کردە دادوەری بەصرە، ئامۆژگاریم کرد.

- چیت پێ گوت؟

- نامەیەکم بۆ نارد تێیدا نووسیبووم:

"لە بەندەی خوا عومەری کوڕی خەتتابەوە بۆ ئەبوو موسای ئەشعەری، سڵاو و ڕەحمەتی خوات لێبێ، پاشان:

"دادوەری فەرزێکــی گەورە و پـتەو و قــایمە، سـوننەتێکی گــرنگە. هەرکــات دادوەرییەک بە بەڵگەوە هاتە لای تۆ، باش لێی تێبگە. قسە هەرچەند هەقیش بێ، مادەم جێبەجێی نەکەی، هیچ قیمەتێکی نییە! لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانتدا بە یەکچاو سەیری خەڵک بکە، بـا لەبەر ستەمکاریت پیـاوی دەسـەڵاتدار مرخـت لـێ خـۆش نەکەن و، پیاوی هەژاریش لێت نەترسێ!

"هەرکەس داواکـارە، دەبـێ بەڵـگەی ڕوون و ئاشـکرای هەبـێ، ئەو کەسەیشـی داوای لەسەر تۆمـار کـراوە، دەبـێ سوێند بخـوا(و پاکـانەی خـۆی بکـا.) سـوڵح و ڕێککەوتن لەنێوان موسڵماناندا دروستە، بەو مەرجەی حەڵاڵ حەرام نەکەن و حەرام حەڵاڵ نەکەن. ئەگەر دوێنێ بڕیارێکت دەرکرد و ئەمڕۆ بۆت دەرکەوت هەڵە بووە، نەکەی پەشیمان بوونەوە بە عەیبە بزانی و پاشگەز نەبیتەوە، گەڕانەوە بۆ سەر هەق و ڕاستی، زۆر لە مانەوە لەناو هەڵە و چەوتی مەزنترە و باشترە!

"تێگەشتن! تێگەشتن! ئەگەر هات و شتێک لەنێو دڵتدا دەهـات و دەچـوو، هـیچ بەڵگەیەکت لە قورئان و فەرمووده دەست نەکەوت، ئەوا تێگەشتن و بیـر و هۆشـی خۆت بە باشی بەکار بێنە!

"هەموو شتە هاوویێنە و وێکچووەکان بزانە و بە پێـودانگی ئەوانە شـتە تازەکـان هەڵبسەنگێنە و دوایی بزانە کامەیان لەلای خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویسـە، بەوەیان بڕیار بدە!

"ماوەیەک ماف بدە بە داواکار، با بـۆ بەڵـگەی خـۆی بـگەڕێ، ئەگەر بەڵـگەی تەواوی هێنا، ئەوا مافەکەی بۆ دەگەڕێنیتەوە، ئەگەرنا داواکەی پشتگوێ دەخرێـت. ئەگەر وا بکەی، ئەوا گومانت بۆ دروست نابێ و بەرچـاوڕوون دەبـی و داواکـاریش ناتوانێ هیچ بیانوویەک بێنێتەوە! موسڵمانان زۆربەیان عادل و ڕاستگۆن، قسەیان لێ وەربگرە، تەنیا ئەوانە نەبێ کە لەسەر تاوان داریان لێ درابێ، یان سوێندی درۆیان لێ دەرکەوتبێ، یـان کەسـێک کە جـێگەی متمـانەی خەڵـک نەبـێ. خـوای گەورە ئاگاداری نهێنییەکانی ناو دڵیشە، بەڵگەی گوماناوی و لێڵی ناوێ!

"نەکەی هەرگیز لە کاتی دادوەریدا تووڕەبی، یان نیگەران و قەلەق ببی. هەرگیز ئازاری خەڵک نەدەی. لە کاتێکدا هەقت نیشان دەدەن، پێت ناخۆش نەبێ و ئینکاری نەکەی، ئەو هەقەی کە خوای گەورە پاداشتی لەسەر دەداتەوە و دەیکاتە توێشوو بۆ قیامەت، ئەوە لە هەموو شتێ باشترە. هەرکەس بەینی خۆی و خوای خۆی نیەتی ناو دڵی پاک بێ، ئەوا خوای گەورەی بەسە کە پشتیوانی بێ، پێویستیی بە خەڵک نابێ!

"هەرکەسیش بە قسەی ساف و لووس پێچەوانەی هەق جوڵایەوە، خوای گەورە ئابرووی دەبا، سڕ و نهێنییەکانی هەڵدەماڵێ، چاوەڕوانیی چی لە پاداشتی خەڵکی دەکەی؟

"سڵاوی خوات لێبێ."

- یا ئەڵلا! ماشەڵلا! کورە قوربان تۆ تەواو سەردەمی خۆت پێشخستبوو. من پێم وایە کە پێویستە ئەم نامەیە لە هەموو دادگاکاندا هەڵبواسرێ، هەموو دادوەرێک بیخوێنێتەوە، تۆ قسەیەکی وات کردووە هیچت نەهێشتووەتەوە. زۆر بەکورتی و پڕمانایی، ئەگەر من تۆم نەناسیایە، دەمگوت: هەرگیز باوەڕ ناکەم ئەم قسانە قسەی تاکە کەسێک بێت، بەڵکو کۆمەڵێک دادوەری زۆر زانا هەستاون و بە یەکەوە ئەم نامەیان نووسیوە، بۆیە ئاوا ئەوەندە پڕمانا و بەهێزە!

- ئەوە بەهرەیەکی خوایە، دەیبەخشێت بەو کەسانەی کە خۆی بیەوێت.

- پاک و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی تۆی هێنا و، قسەکانت هێندە پاراون، وەک سیحر کاریگەرن. قوربان مۆڵەت دەدەی لەسەر ئەم نامەیە بووەستم، ئەم نامەیە نابێ هەروا بە سەریا تێپەڕین.

- فەرموو چ پرسیارێکت بۆ هاتووەتە پێش بیکە!

- مەبەستت چی بوو لە: "دادوەری فەرزێکی گەورە و پتەو و قایمە، سوننەتێکی گرنگە؟"

- خوای گەورە ئەم خەڵکەی دروست کردووە و کردوونی بە چەند بەشێکی جیاوازەوە، بیروڕا و بۆچون و ئارەزووی جیاوازیان هەیە، بەرژەوەندیی جیاوازیان هەیە، ژیری و ئاوەزیان وەک یەک نییە. ئا لەبەر ئەوە هەڵسەنگاندنیشیان بۆ کاروبارەکان لە یەکتر جیایە، بۆیە کێشە دەکەوێتە نێوانیانەوە، دژایەتی زۆر دەبێ، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ (١١٨) إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ﴾ هود: ١١٨ - ١١٩ واتە: "بەردەوام ئەو خەڵکە لە ئایین و بەرنامە و بۆچووندا لە یەکتری جیاوازن، مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت بیگرێتەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش خوای گەورە دروستی کردوون(یانی لەبەر ئەوە دروستی کردوون بەزەیی بەواندا بێتەوە)."

دەی مادەم وایە، دەبێ کەسێکی دادوەر لەنێوان خەڵکدا دادوەری بکا، ئەگینا ئاژاوە و گێچەڵ لەنێوانیاندا پەیدا دەبێ، ئەو کاتە زۆردار بێزۆر دەخوا. بۆیە خوای گەورە دادوەریی واجب کردووە، دادوەری واجبە نەک سوننەت. دادوەر سەرپشک نییە لەنێوان دادوەریکردن و دادوەرینەکردندا، خوا دەفەرمووێ: ﴿فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ﴾ ص: ٢٦ واتە: "لەسەر بنچینەی هەق و ڕاستەقینە دادوەری لەنێوان خەڵکدا بکە."

ئەوەیش کە من وتم: "فەرزێکی گەورەو پتەو و قایمە، سوننەتێکی گرنگە." ئەوە مەبەستم ئەوەیە کە حوکمی دادوەر ئەو بڕیارەیە کە خوا لە قورئاندا دایبەزاندوە و پێغەمبەر لە سوننەتەکانیدا بە کاری هێناوە.

- ئەی مەبەستت چییە لە: "هەرکات دادوەرییەک بە بەڵگەوە هاتە لای تۆ، باش لێی تێبگە"؟

- پێویستە دادوەر بە باشی لەو سکاڵایە تێبگا کە هێنراوەتە بەردەمی. پێش ئەوەی هیچ قسەیەک بکا، دەبێ بە باشی لێی بکۆڵێتەوە، نابێ پێش ڕوونبوونەوەی ڕاستی، قسە بکا. بڕیاری دروست و نیەتپاکی دوو شتی زۆر مەزنن کە خوای گەورە بەخشیویەتی بە بەندەکانی، تەنانەت لە دوای بڕواهێنان بە خوا، هیچ شتێ

بەقەد ئەو دووانە گرنگ نییە! ئەو دووانە لاقی ئیسلامن، ئیسلام لەسەر ئەو دوو لاقە وەستاوە، مرۆڤ هەر بەو دووانە دەتوانێ خۆی لە ڕێگەی چەوت و گومڕا بپارێزێ و ببێتە یەکێک لەو کەسانەی کە خوای گەورە نیعمەتی پێ بەخشیون! ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا دەیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست.

ـ ئەی مەبەستت چییە لە: "قسە هەرچەند هەقیش بێ، مادەم جێبەجێی نەکەی، هیچ قیمەتێکی نییە"؟!

ـ دەبێ دادوەر زوو بڕیاری خۆی بدا و قەزیەکان کۆتایی پێ بهێنێ، نابێ ئەوەندە دوای بخا، بیمرێنێ. دەبێ دادوەر بە هێزی حوکوومەت و سوڵتەوە کارەکانی جێبەجێ بکا، ئەگەر وا نەبێ، با تا بەیانی دادوەر بڕیار دەر بکا، کەس گوێی بۆ ناگرێ! خوای گەورە مەدحی ئەو کەسانەی کردووە کە بەهێزن و لە دیندا چاوکراوە و ڕاستگۆن، دەفەرمووێ: ﴿ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٥﴾ ﴾ ص: ٤٥ واتە: "ئەی پێغەمبەر! باس و یادی بەندە بەڕێزەکانمان: ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب بکە، هەموویان دەستێکی باڵایان هەبوو لە گەیاندنی ئایینی خوادا، دەستێکی باڵایان هەبوو لە چاکە و چاکەکاریدا، هەروەها بەرچاوڕوونی و شارەزاییی تەواویان هەبوو لە هەموو ڕوویەکەوە."

مەبەستی خوای گەورە لە دەستی باڵا، هێز و دەسەڵاتە؛ مەبەستیشی لە بەرچاوڕوونی، بەرچاوڕوونییە لە ئاییندا.

ـ ئەی مەبەستت چییە لە: "لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانتدا بە یەکچاو سەیری خەڵک بکە، با لەبەر ستەمکاریت پیاوی دەسەڵاتدار مرخت لێ خۆش نەکەن و پیاوی هەژاریش لێت نەترسێ"؟!

ـ مەبەستم ئەوەیە کە جیاوازیی نەکا لەنێوان ئەو دوو کەسەی کە هاتوون بۆلای دادوەر، دەبێ وەک یەک لێیان بڕوانێ. ئەگەر بەڕێزەوە وەک یەک لە هەردووکیانی ڕووانی، ئەوا ئەوانیش بە چاوێکی ڕێزەوە سەیری ئەو دەکەن. ئەمە وەک ئەو نامەیە

وایە کە بۆ موعاوییەی کوڕی ئەبوسوفیانم نووسی و وتم: "مرۆڤە لاوازەکان هێندە لە خۆت نزیک بکەرەوە هەتا وایان لێدێ کە ترسیان دەشکێ و زمانیان دەکرێتەوە و زاتی قسەکردن دەکەن." مرۆڤی بەهێز ئەگەر زانیی دادوەر لەگەڵیدایە و لە خۆی نزیک دەکاتەوە، ئەگەر تاوانبار بوو تاوان زیاتر دەکا. مرۆڤی لاوازیش ئەگەر زانیی کە دادوەر لێی ناپرسێتەوە—ئەگەر خاوەن هەقیش بێ،—زات ناکا باسی بکا و زۆر جاریش چاوپۆشی لە هەقی خۆی دەکا. من هەرگیز فرمان بە شتێک ناکەم کە خۆم نەیکەم. جارێکیان من و ئوبەی کێشەیەکمان هەبوو، زەیدی کوڕی سابتمان کرد بە دادوەر. وتم بە زەید: "بۆیە ئێمە هاتوین بۆلای تۆ، ببی بە دادوەر." زەید لە جێگەی خۆی ڕاست بووەوە و مەوجێکی بۆ من فڕێدا .و وتی: "ها گەورەی موسڵمانان لەسەری دابنیشە!"

منیش وتم: "کورە کاکە زەید گیان! هەر لە سەرەتای دادوەریەکەتدا تاوانت کرد، ئوبەی لە کوێ دادەنیشێ، دەبێ منیش لەوێ بم. ئەمڕۆ لەلای تۆدا نابێ من لە ئەو گەورەتر بم!"

من ئەمە لە پێغەمبەرەوە فێر بووم، دایکی ئیمانداران ئوم سەلەمە گێڕایەوە: "پێغەمبەر فەرموویەتی: 'هەرکەس بوو بەدادوەر لەنێوان موسڵماناندا، با لە تەماشاکردن و هێماکردن و دانیشاندنی کەسەکاندا دادگەر بێ!' "

ـ ئەی قوربان مەبەستت چییە لە: "هەموو شتە هاووێنە و وێکچووەکان بزانە و، بە پێوانگی ئەوانە شتە تازەکان هەڵسەنگێنە و، دوایی بزانە کامەیان لەلای خوا و پێغەمبەری خوا خۆشەویسە، بەوەیان بڕیار بدە"؟

ـ من ئامۆژگاریم کردووە کە ئیجتیهاد بکا و قیاس بەکار بێنێ. زۆر قەزیە هەیە مرۆڤ دەبێ ژیری و ئاوەزی خۆی بۆ بخاتە کار، دەبێ ئیجتیهادی بۆ بکا، قیاس بەکار بێنێ. بزانێ ئایا شتی لەو جۆرە ڕووی داوە؟ ئەگەر ڕووی داوە، ئەمەیش بەپێی ئەو شتە لێک بداتەوە، ئەوە قیاسە، بزانێ چ شتێ لەو مەسەلەیە نزیکە و ڕووی داوە، چونکە قەزیەکان زۆرن، دەقەکان کەمن. کە وابوو، دەبێ

ئیجتیهاد و قیاس بەکار بهێنرێ و، ئەوەیش لەسەر بنەما گشتیەکانی قورئان و فەرمووده. جا بۆ ئەو مەبەستە، دادوەر دەبێ ژیری بەکار بهێنێ، دەبێ بیر و هزری خۆی بخاتە کار، دەبێ حوکم لە قەزیەکانی تر هەڵهێنجێنێ. ئەمە کار و بەرنامەی خەلیفەی یەکەم بووە، کاری هاوەڵان بووە، ئەوان قیاسیان بەکار هێناوە، شتەکانیان وەک هاوێنەکان حیساب کردووە، بۆیە دەرگای ئیجتیهادیان بۆ خەڵکی تر کردووەتەوە، ڕێگەیان بۆ خۆش کردوون، ئا لەبەر ئەوە موجتەهیدی نیەت پاک و زانا، هەمیشە هەر خێری تووش دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "هەرکات دادوەر ئیجتیهادی کرد و پێکای، ئەوە دوو خێری بۆ دەنووسرێ، ئەگەریش نەیپێکا، خێرێکی بۆ دەنووسرێ."

- ئەی مەبەستت چی بوو لە: "ئەگەر دوێنێ بڕیارێکت دەرکرد و، ئەمڕۆ بۆت دەرکەوت هەڵە بووە، نەکەی پەشیمان بوونەوە بە عەیبە بزانی و پاشگەز نەبیتەوە، گەڕانەوە بۆ سەر هەق و ڕاستی، زۆر لە مانەوە لەناو هەڵە و چەوتی مەزنترە و باشترە"؟

- مەبەستی سەرەکی لە دادوەری، هەڵوەشاندنەوەی شتە ناهەقەکان و مافدانە بە شتە هەقەکان، بۆیە پێویستە دادوەر ئەوپەڕی خۆی ماندوو بکا بۆ گەشتن بە هەق. ئەگەر بڕیارێکی دا و، دوایی بۆی دەرکەوت بڕیارەکەی هەڵە بووە، دەبێ دان بە هەڵەکەیدا بنێ و شتە ڕاستەکە دەربخا، گەڕانەوە بۆلای شتە ڕاستەکان گەورەیی مرۆڤ دەردەخا، مانەوە لەناو جەغزی بەتاڵدا و دان نەنان بە ڕاستیدا، ئەوە خۆبەلزانی و تەکەببورە، هیچ شتێکیش وەک خۆبەزلزانی نابێتە لەمپەری چوونە بەهەشت، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "هەرکەس بە ئەندازەی تۆزقاڵێک فیس و تەکەببوری لە دڵدا بێ، ناچێتە بەهەشتەوە."

ئێمەیش وتمان: "قوربان! پیاوی وا هەیە کە پێی خۆشە جلوبەرگەکانی جوان بێ، نەعل و پێڵاوی جوان بێ!"

فەرمووی: "ئەوە خۆبەزلزانی نییە، خۆبەزلزانی ئەوەیە کە دان بە هەقدا نەنێی و خەڵک بە کەم بزانی."

منیش ئامۆژگاریی ئەبوو موسام کرد کە: "نەکەی دان بە هەقدا نەنێیت، ئەگەر هەقت بۆ دەرکەوت و دانت پیا نەنا، ئەوە خەڵکت بە کەم زانیوە."

- ئەی مەبەستت چی بوو لە: "موسڵمانان زۆربەیان عادل و ڕاستگۆن. قسەیان لێ وەربگرە، تەنیا ئەوانەی نەبێ کە لەسەر تاوان داریان لێ درابێ، یان سوێندی درۆیان لێ دەرکەوتبێ، یان کەسێک کە جێگەی متمانەی خەڵک نەبێ"؟

- خوای گەورە ئەم ئومەتەی پێغەمبەری ﷺ کردووە بە ئومەتێکی میانەڕەو و شاهید بەسەر ئوممەتانی پێشووەوە. میانەڕەوی بریتیە لە دادگەری. موسڵمانان لەناو یەکدا دادگەرن، تەنها ئەوانەیان نەبێ کە شتێکی وایان لێ دەرکەوتبێ کە ببێتە لەمپەر بۆ شایەتی، ئەو لەمپەرەیش ئەوەیە کە شایەتیی درۆی دابێ، ئەوە ئیتر شایەتیی لێ وەرناگیرێ، یان لەبەر تاوانێکی گەورە داری حەدی لێ درابێ، ئەوە خوای گەورە ڕازی نییە شایەتییان لێ وەربگیرێ، یان لەوانەیە ئەو شایەتییە لەبەر بەرژەوەندییەک بێت، وەک شایەتیدانی کۆیلە بۆ گەورەکەی خۆی، لەوانەیە ئەو کۆیلە لە ترسدا یان لەبەر بەرژەوەندی شایەتی بۆ گەورەکەی بدا. هەروەها شایەتیدانی خزم بۆ خزم ئەگەر شوبهە و تۆمەتێک بوو، ئەوە وەرناگیرێت، ئەگینا وەردەگیرێت.

- ئەی مەبەستت چییە لە: "ماوەیەک ماف بدە بە داواکار، با بۆ بەڵگەی خۆی بگەڕێ. ئەگەر بەڵگەی تەواوی هێنا، ئەوا مافەکەی بۆ دەگەڕێنیتەوە، ئەگەرنا داواکەی پشت گوێ دەخرێت. ئەگەر وا بکەی، ئەوا گومانت بۆ دروست نابێ و بەرچاوڕوون دەبی و، داواکاریش ناتوانێ هیچ بیانوویەک بهێنێتەوە"؟

- ئەو دادوەرەی کە دادگەرە، دەبێ ماوەیەک مۆڵەت بدا بە داواکار تا بتوانێ بەڵگە و شتی خۆی ئامادە بکا. ئەو کەسەی داواکارە، لەوانەیە بەڵگەیەکی هەبێ کە ئێستا ئامادە نەبێ، شایەتێکی هەبێ لە سەفەردا بێ، ئەگەر دادوەر پەلەی پێ

بکا و زوو بڕیار بدا، ئەوا دادپەروەر نەبووە. بۆیە داواکار بۆی هەیە داوای ماوەیەک بکا کە تێیدا بتوانێ شایەت و بەڵگەی خۆی ئامادە بکا، ئەو ماوەیە دیاری نەکراوە، بۆنموونە نابێ دادوەر بڵێ: "تەنیا سێ ڕۆژ مۆڵەتت هەیە!" ئەویش بە سێ ڕۆژ کارەکانی بۆ جێبەجێ نەکرێت. خۆ ئەگەر دادوەر سوور دەیزانی ئەو بەڵگە و شایەتانەی ئەو باسیان دەکا، پێویستییان بە سێ ڕۆژ نییە، ئەوە دەتوانێ ماوەی سێ ڕۆژی بۆ دابنێ، بۆ نموونە ئەگەر بەڵگەکان یان شایەتەکەی لە ماڵدا بوون، یان شایەتەکەی خەڵکی ئەو شارە بوو، لەوێیش بوو، واتە لە سەفەر نەبوو، ئەوە ئەو کاتە پێویستە دادوەر زوو قەزیەکە کۆتایی پێ بێنێ و بە کراوەیی نەیهێڵێتەوە!

- ئەی قوربان مەبەستت چییە لە: "هەرکەس داواکارە، دەبێ بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای هەبێ. ئەو کەسەیشی داوای لەسەر تۆمار کراوە، دەبێ سوێند بخوا(و پاکانەی خۆی بکا)"؟

- ئەم قسە تەفسیری ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْحِكْمَةَ وَفَصْلَ ٱلْخِطَابِ ﴿٢٠﴾﴾ ص: ٢٠ واتە: "حیکمەت و دانایی و قسە و فەرمانی بەجێمان پێ بەخشی."

**فصل الخطاب** لە ئایەتەکەدا بریتیە لە بەڵگەی بەهێزی داواکار لەسەر داوالەسەرتۆمارکراو، یان بریتیە لە سوێندی داوالەسەرتۆمارکراو ئەگەر هات و داواکار بەڵگەی بەهێزی نەبوو. ئەسڵ لە دادگادا ئەوەیە کە یەکەم جار داواکار بەڵگەی خۆی پێشکەش بکا، ئەگەر نەیتوانی بەڵگە پێشکەش بکا، ئەوا داوالەسەرتۆمارکراو سوێند دەخوا؛ چونکە ئەسڵ وایە مرۆڤ بەری بێ لە تاوان!

ئەگەر کەسێک داوای ئەوەی کرد کە مافێکی لەسەر کەسێکی تر هەبوو، بەڵام بەڵگەیشی بە دەستەوە نەبوو، ئەوە دەبێ دادوەر ئەو کەسە لە دادگادا ئامادە بکات و پێی بڵێ: "فلان کەس! فلان داوای لەسەر تۆ تۆمار کردووە." جا ئەگەر لایەنی دووەم دانی بە تاوانەکەی خۆیدا نا، ئەوا دادوەر بڕیاری خۆی دەردەکا، ئەگینا

لایەنـی دووەم سـوێند دەخـوا و پاکـانە بـۆ خـۆی دەکـا و، ئیتـر مەلەفـی قەزیەکە دادەخرێت. دادوەر لە دونیادا دەبێ بە بەڵگە و دەلیلەوە بڕیـاری خـۆی بـدا، بەڵام لەو دونیا ئەوە دادگای خوا کـار دەکـات، دادوەری هەرەگەورە و ڕاستەقینە خـوای گەورەیە، فرمان بە زمـان و دەسـت و لاق و ئەنـدامەکانی مـرۆڤ دەدا کە شـایەتی بدەن، مافی کەس لەوێ پێشێل نابێ و نافەوتێ!

خۆ ئەگەر دادوەر هەقی بە کەسێک دا کە شـایانی ئەو هەقە نەبـوو، ئەوە ئیتـر کۆتاییی دونیا نییە، حەڵاڵ بوونی حەرامیش نییە، دادوەریش مـرۆڤە و بە ژێـری و ئاوەزی خۆی، بەپێی بەڵگە بڕیار دەردەکا، جا ئەگەر کەسێک لەژێر سەقفی دادگادا مافێکی نابەجێی وەرگرت، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا تۆڵەی لێ دەسەنرێتەوە!

تەنانەت پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "منیش وەک ئێوە مـرۆڤم، ئێـوە کێشـەکانتان دێنـنە لای مـن، لەوانەیە یەکێکتـان قسـەزانتر بـێ لەوی تـر، بەڵـگەی جـوانی بەدەستەوە بێ، منیش بە گوێرەی قسەکانی مافی پێ بدەم! جـا ئەگەر مـن مـافم بە یەکێک دا و خاوەن مافیش نەبوو، ئەوە پارچەیەک ئاگرم پێداوە!"

- ئەی قوربان مەبەستت چی بوو لە: "خوای گەورە ئاگاداری نهێنییەکانی نـاو دڵیشە، بەڵگەی گوماناوی و لێڵی ناوێ"؟

- من زۆر جار دەمگوت: "هەندێ کەس لە سەردەمی پێغەمـبەرداﷺ بە وەحـی بڕیاری لەسەر دەدرا! ئێستە وەحی و سروش تەواو بووە، نەما! ئێمەیش بە گـوێرەی کردارەکانتان بڕیارتان لەسەر دەدەیـن. جـا هەرکەس کـرداری باشـی هەبـوو، ئـێمە بڕیاری لە قازانج دەدەین، لە خۆمانی نزیک دەکەینەوە. خـۆ ئەگەر لە دڵـدا نیەتـی باشەیشی نەبوو، ئەوا ئیمە پێی نازانین. هەرکەسـیش کـردەوەی خـراپ بـوو، ئـێمە بڕیاری لە دژ دەردەکەین، هەرچەند خۆیشی بڵێت: 'مەبەست و نیەتم چاکەیە!' "

کەس بۆی نییە هیچ بڕیارێک لەسەر کەسێکی تر بدا مەگەر بەپێی ئەو کـردەوانەی نەبێ کە دەبینرێن، دڵەکان وەک خانووی دەرگا گـاڵەدراون، نـازانین چییـان تیـایە، تەنیا خوا دەزانێ چی لەنێو دڵدایە. ئێمە ناتوانین دڵی کەس بخوێنینەوە تا بزانین

چی تیایە، ئێمە وەک وتم بە گوێرەی کردەوە بڕیار دەدەین، ئەگەر کردەوەی چاک بوو، ئەوە لای ئێمە بە چاکەکار دەناسرێ، ئیتر لە دڵدا چ شتێکی مەبەستە ئەوە حەواڵەی خوا دەکرێ، ئەگەریش کردەوەی خراپی هەبوو، ئەوە بە خراپەکار دەناسرێت، ئیتر لەوەولایش حەواڵەی خوا دەکرێت. جارێک پێغەمبەر ﷺ داری حەددی لە بادەخۆرێک دا، پیاوێک نەفرەتی لەو بادەخۆرە کرد، وتی: "نەفرەتی خوات لێ بێ! چ کارێکت کردووە."

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "نەفرەتی لێ مەکەن! من تەنیا ئەوەندە دەزانم کە ئەو پیاوە خوا و پێغەمبەری خوای خۆش دەوێ!"

پێغەمبەر دەیزانی ئەو پیاوە خوا و پیغەمبەری خۆش دەوێ، بەڵام ئەو خۆشەویسییە نەبووە هۆی ئەوەی داری حەددی لێ نەدا و تۆڵەی لێ نەسەنێتەوە! پیاویش هەبوو دووڕوو بوو، وەک عەبدوڵلای کوڕی سەلول، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە گوێرەی کردەوەکانی لەگەڵیدا دەجوڵایەوە، بە ڕوواڵەت نوێژی دەکرد و خۆی بە موسڵمان نیشان دەدا.

هەرچی لە بارەی شوبوهات و گومانیش هەیە، ئەوە ئایینی ئیسلام ڕێزی مرۆڤ دەگرێ، ناکرێ بە گومان و قسەی لاوەکی مافی پێشێل بکرێ، چونکە ئەو قسە گوماناوییانە زۆر جار درۆن، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞ﴾ الحجرات: ١٢ واتە: "ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە! خۆتان زۆر بپارێزن لەگومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناه و تاوانن (بۆیە حەق وایە لەهەموو گومانێک خۆپارێزبین.)"

پێغەمبەریش فەرموویەتی: "بە گوێرەی توانا تۆڵە لە کۆڵ موسڵمانان بکەنەوە، ئەگەر بەڵگەیەکی هەبوو بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ نەسەنرێتەوە، ئەوا لێی قەبوڵ بکەن. ئەگەر سەرکردە لە بەخشیندا هەڵە بکا و بە هەڵە کەسێک ببەخشێ، لەوە باشترە لە تۆڵە سەندنەوەدا هەڵە بکا و بە هەڵە تۆڵە لە یەکێک بسەنێتەوە!"

کەوابوو تۆڵە لە هیچ کەسێک ناسەنرێتەوە مەگەر بە بوونی بەڵگەیەکی بەهێز و بێگومان، یان دەبێ بە گوێرەی بەڵگەیەک تاوانبار بکرێ کە وا ئەو بەڵگەیە ئەو تاوانەی لێ بخوێنرێتەوە، وەک ئەوەی کچێک یان بێوەژنێک دوو گیان ببێ، یان پیاوێک بڕشێتەوە و بادە هەڵبێنێتەوە! ئەمە ئیتر بەڵگەی ناوێ و دیارە کە کچەکە یان بێوەژنەکە زینای کردووە و، پیاوەکە بادەی خواردووەتەوە.

- ئەی قوربان مەبەستت چی بوو لە: "نەکەی هەرگیز لە کاتی دادوەریدا تووڕەببی، یان نیگەران و قەلەق ببی. هەرگیز ئازاری خەڵک نەدەی، لە کاتێکدا هەقت نیشان دەدەن، پێت ناخۆش نەبێ و ئینکاریی نەکەی. ئەو هەقەی کە خوای گەورە پاداشتی لەسەر دەداتەوە و دەیکاتە توێشوو بۆ قیامەت، هەرکەس بەینی خۆی و خوای خۆی نیەتی ناو دڵی پاک بێ، ئەوا خوای گەورەی بەسە کە پشتیوانی بێ، پێویستی بە خەڵک نابێ! ؟

ئەمە وەک ئەو وەسێت و ئامۆژگارییەیە کە بۆ شورەیحی کوڕی حارسم کرد کاتێ کردم بە دادوەر، پێم وت: "هەرگیز بە دەم توڕەبوونەوە لەنێوان دوو کەسدا دادگەری نەکەی!"

واجبە لەسەر دادوەر لە کاتی دادوەریدا مێشکی ساف بێ، دوور بێ لەو شتانەی کە دەبنە هۆکاری ئەوەی کارەکانی بە تەواوی نەکا، وەک برسێتی، تینوێتی، توڕەیی، دڵەڕاوکێ... بۆ ئەوەی حاڵەتێکی نەفسیی وای بەسەردا نەیەت بەپەلە بڕیارێکی نادروست دەربکا!

ئەگەر دوو کەس دژی یەک سکاڵایان تۆمار کردبوو، نابێ دادوەر بەلای هیچ یەک لەو کەسانەیدا دابتاشێ، هەرچەند لە دڵدا یەکێکیانی زیاتر خۆش بوێ، دەبێ ئەو خۆشەویسیە نەبێتە هۆی ئەوەی کە زیاتر گرنگیی پێ بدا. دیسان ئەگەر ڕقی لە یەکێکیان بوو، نابێ ئەو ڕقە ببێتە هۆکاری ئەوەی لە کاتی دادوەریدا پشتی تێ بکا و گرنگیی پێ نەدا!

دادگا شوێنی ئەوەیە کە مافی تیا بۆ خاوەن ماف بگەڕێنرێتەوە، شوێنی خۆشەویسی و ڕقلێبوونەوە نییە. جا بۆ ئەوەی دادوەر دادگەر بێت، دەبێ ڕق و کینە و خۆشەویسی لە دڵی خۆیدا نەهێڵێت!

- ئەی قوربان مەبەستت چی بوو لە: "سوڵح و ڕێککەوتن لەنێوان موسڵماناندا دروستە، بەو مەرجەی حەلاڵ حەرام نەکەن و حەرام حەلاڵ نەکەن"؟

- من زۆر جار دەمگوت: "ئەگەر دوو کەس کێشەیەکیان هەبوو، لێیان بگەڕێن با خۆیان کێشەکەیان حەل بکەن، چونکە بڕاندنەوەی کێشە لە دادگادا دەبێتە هۆی ڕق و کینە لە دڵی هەردوو لایەن، بە تایبەتی ئەوەی کە خۆی بە دۆڕاو دەزانێ!"

من نامەیەکەم بۆ موعاویە نووسیبوو وتبووم: "سووربە لەسەر ئەوەی کە خەڵک خۆیان لەناو یەکدا پێک بێن و سوڵح و ئاشتی بکەن، ئایینی ئیسلامیش لە زۆر ئایەت و فەرموودەدا هانی خەڵک دەدا بۆ ئەوەی پێک بێن و ئاشتی بکەن، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا ﴾ الحجرات: ٩ واتە: "ئەگەر دوو دەستە، یان دوو تاقم لە موسڵمانان بوو بە شەڕیان، ئەوە دەستبەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە."

دیسان دەفەرمووێ: ﴿ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ﴾ النساء: ١٢٨ واتە: "هیچ گوناهیان لەسەر نییە و کارێکی چاکە ئەگەر نێوان خۆیان چاک بکەن و لەسەر شێوازێک ڕێک بکەون. هەمیشە ڕێککەوتن و تەبایی شتێکی چاک و پەسەندە."

دیسان دەفەرمووێ: ﴿ لَّا خَيْرَ فِى كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ﴾ النساء: ١١٤ واتە: "لە زۆربەی چپە و سرتە و قسە نهێنییەکانیاندا هیچ خێرێک بەدی ناکرێت و تیایاندا نییە، مەگەر چپەی ئەو کەسەی کە فەرمان بدات بە بەخشنێک، چاکەیەک، یان ڕێکخستن و چاکسازی و ئاشتبوونەوەیەکی نێوان خەڵکی."

پێغەمبەری خوایش ﷺ دەفەرمووێ: "خەڵکینە! شتێکتان پێ بڵێم کە هەرکەس بیکا پلەیەک لە سەرووی ئەو کەسانەوە دەبێت کە نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگرن؟"
وتمان: "بەڵێ قوربان!"
فەرمووی: "ئاشتکردنەوەی خەڵک! ئاژاوەدروستکردن لەنێوان خەڵکدا، هەڵپاچە! مەبەستم ئەوە نییە بڵێم: قژ هەڵدەپاچێ! مەبەستم ئەوەیە دین هەڵدەپاچێ!"
دیسانەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "ئاشتیکردن و سوڵح لەنێوان خەڵکدا دروستە (خێرە و.) مەگەر ئەوەی کە حەڵاڵێکی تیا حەرام بکرێت یان حەرامێکی تیا حەڵاڵ بکرێت. موسڵمانانیش دەبێ بەڵێنی خۆیان ببەنە سەر، مەگەر ئەو بەڵێنەی کە حەڵاڵێکی تیا حەرام بکرێت یان حەرامێکی تیا حەڵاڵ بکرێت."
سوڵحی حەرام بۆ نموونە وەک ئەوەی کە پیاوێکی ئازادی تیا بکری بە کۆیلە! یان لەسەر سووخۆری و ڕیبا ڕێکبکەون! یان لەسەر ئەوە پێک بێن کە واجبێکی دینی واز لێ بێنن! یان حەددێکی شەرعی پەک بخەن! ئەو جۆرە سوڵح و پێکهاتنانە هیچیان دروست نین.
با باسی سوڵح و پێکهاتنی حەڵاڵیشت بۆ بکەم، وەک: دوو کەس کە کێشەیەکیان هەیە ڕێک بکەون کە کێشەکەیان بە شەرع یەکلایی بکەنەوە! ئەمە باشترین ڕێککەوتن و دادوەرییە! دڵە تۆراوەکان ئاشت دەکاتەوە، ماف بۆ خاوەن ماف دەگەڕێنێتەوە!
ـ خوای گەورە بتپارێزێ قوربان! قسەکانت ئەوەندە گرنگن، ئەگەر کەم بوون وەک سیحر کار لە مرۆڤ دەکەن، ئەگەر درێژیش بوون، هەمووی ڕوونکردنەوەی جوانن! جا بە هەر بارێکدا بێ، هەر باشە!
ـ سپاس کوڕم! خوا ڕاوەستاوت بکات.
ـ دەی قوربان ئێستە ئیتر باسی نامەکە تەواو بوو، شتێکم لەناو دڵدایە پەیوەندیی بەم باسەوە هەیە!

- چییە؟

- باسی هەندێ لەو حەدد و تۆڵەسەندنەوانەیە کە تۆ بە جێت هێناوە!

- باسی کامەیانت بۆبکەم؟

- شتێکم لە بارەی تۆ و موتیعی کوڕی ئەسوەدەوە بیستووە، پێم خۆشە باسی ئەوە بکەی!

ــ ڕۆژێک یەکێکیان هێنا بۆلای من بادەی خواردبوو، تەماشا دەکەم بە شانازییەوە تاوان ئەنجام دەدا!

پێم وت: "دەتنێرم بۆلای پیاوێک بەزەیی پیاتدا نەیەتەوە!"

ناردم بۆلای موتیع، موتیع خۆی لە دادگادا فەرمانبەر بوو، زۆر بێڕەحم و بێسۆز بوو. پێم وت: "موتیع! بەیانی هەشتا دار لەم پیاوە بدە لە تۆڵەی ئەوەی کە شەرابی خواردووەتەوە!"

بۆ بەیانیی ڕۆژی دوایی ڕۆشتم بۆلای موتیع، تەماشا دەکەم زۆر بە توندی لێی دەدا.

پێم وت: "خوا بتگرێ! خۆ کوشتت! ئەوە چەند دارت لێداوە؟"

وتی: "شەست!"

منیش وتم: "دەی بیست دارەکەیتری لێ مەدە!"

ئیتر موتیع وازی لێ هێنا.

- قوربان حەز ناکەم بەسەر ئەم چیرۆکەدا تێبپەڕم، دەمەوێ پرسیارت لێ بکەم!

- فەرموو.

- بۆچی ئەو پیاوەت نارد بۆ ئەوەی دلڕەقترین کاربەدەست تۆڵەی لێ بکاتەوە؟

- چونکە زۆر بێمنەت بوو، زۆر جار ئارەقی دەخواردەوە و لەسەر ئارەقخۆری لێیان دەدا. وتم ئەم جارە بیدەمە دەست موتیع، ئیتر تۆبەی پێ دەکا.

- ئەی قوربان ئەمە تۆڵەیە یان داری حەد؟

- پەنا بە خوا کورم! من چیم بەلای ئەو پیاوەوە هەبوو تا لەبەر خۆم تۆڵەی لێ بسێنمەوە؟ ئەو پیاوە گاڵتەی بە دین دەهات، حەرامی بۆ خۆی حەڵاڵ کردبوو، ئەوەی کە قەدەغە کرابوو ئەو بۆی دەڕۆشت. خوای گەورەیش داری حەددی داناوە بۆ ئەو جۆرە کەسانە. منیش بە گوێرەی بڕیاری خوا داری حەددم لێ دا. سەبارەت بەوەش کە بۆچی دام بە دەستی موتیعەوە، ئەوە من دەمزانی موتیع توندە، پێم وتی: "وتم بەڵکو تۆبە بکا!" دەمویست واز لەو کارە دزێوە بێنێ. خۆ ئەگەر نەیانگرتایە و نەیانهێنایە بۆلای من، ئەوا من هەر نەمدەناسی. پێم خۆشبوو لە کاتێکی ئاواد نەیبینم، بەڵکو لە شوێنێکی باشدا و لەسەر کارێکی باش بیبینم.

- ئەی بۆچی هەر ئەو شەوەی گیرا دارتان لێ نەدا؟ بۆچی وتت بە موتیع: "سبەی داری لێ بدە؟"

- چونکە داری حەد نابێ لە کاتی سەرخۆشیدا لە ئارەقخۆر بدرێ، دارلێدان بۆ ئەوەیە کە تەمبێ ببێ، ئیتر واز لەو کارە بێنێ. ئەگەر لە کاتی سەرخۆشیدا لێی بدەن، ئەوە ئەو کاتە وای لێ دێ کە هەموو مەبەستێکی ئێمە تەنیا هەر ئازاردانی خەڵک بێ و بەس! پەندوەرگرتن لە دارلێداندا نییە. ئێمە مافی ئەوەمان نییە لە خۆمانەوە لە خەڵک بدەین. ئەو حەدلێدانەیش عیبادەتە، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی ئەو کارە دەکا، جارێکی تر نەیکاتەوە—بۆ پاراستنی کۆمەڵگایە. منیش ویستم سەرخۆشییەکەی نەمێنێ، پاشان لێی بدرێ. چەند کەسێکیش بە دیارەوە بن بۆ ئەوەی باش تەریق ببێتەوە و خەجاڵەت بێ و کاری وا دووبارە نەکاتەوە!

- ئەی بۆچی بۆ بەیانییەکەی ڕۆشتی بۆ سەیرکردنی موتیع و ئەو پیاوە؟

- ئەی عومەر کەی دانیشتووە و خەڵکی پشت گوێ خستووە؟

- قوربان تۆ خۆت لە کاتی هەموو لێدانێکدا ئامادە دەبووی؟

- نەخێر! ئەوە هەر ناکرێ، چونکە من کارم زۆر بوو. من ڕۆژانە سەرم لە مزگەوت، بازاڕ، کۆڵانەکانی شار، خەزێنەی گشتی، ئاژەڵانی زەکات و ئەو جۆرە شوێنانە دەدا، جارجاریش دەڕۆشتم بۆ ئەو شوێنەی کە حەدیان لە خەڵک دەدا.

- ئەی بۆ وتت بە موتیع: "خوا بتگرێ! خۆ کوشتت! ئەوە چەند دارت لێداوە"؟

- چونکە زۆر بە توندی لێی دەدا. داری حەد نابی زۆر توند بێ، ئەگەر ئەو پیاوە بەرگەی ئەو دارانەی نەگرتایە چی؟

- قەیناکا، مادەم ئەو ئەوەندە گوێی بە حەرام نەدەدا با بمردایە؟

- نابێ کوڕم! ئێمە دەبێ داری حەد وەک ئەوەی شەرع دیاری کردووە لێی بدەین، نە توندتر نە شلتر. خۆشترین ڕۆژ بۆ منیش ئەو ڕۆژانەن کە هیچ کەس تۆڵەی لێ ناکرێتەوە و داری لێ نادرێت؛ ئەو ڕۆژانەی کەس ئارەق ناخواتەوە، کەس زینا ناکا، کەس دزی ناکا. حەد بۆ ئەوەیە کە خەڵک تەمبێ ببێ، نەک بۆ تۆڵەی شەخسی و کوشتن و...

- بەڵام خۆ تۆ بیست دارت بۆ کەم کردەوە؟ دەبوو عارەق خۆر هەشتا داری لێ بدرێت!

- بەڵێ ڕاستە! دەبوو هەشتا داری لێ درابا، بەڵام بەو شێوەیەی کە شەرعییە، من تەماشام کرد، موتیع زۆر بە توندی لێی دەدا، بۆیە بیست دارم بۆ کەم کردەوە!

- کورە قوربان تۆ زۆر بەسۆزی! تەنانەت لە کاتی حەددەرکردنیشدا بەسۆزی!

- ئەی دەبێ وابم! ئەو خەڵکە هەمووی بەندەی خوایە! خوای گەورەیش منی کردووە بە چاودێریان و خۆی تەماشا دەکا بزانێ من چی دەکەم؟ من بە کۆڵێ ستەم و دڵڕەقییەوە بچمەوە بارەگای خوا؟ نابێ!

- نا بە خوا تۆ واناکەی.

- هەرگیزیش وام نەکردووە!

ـ قوربان! بیستوومە پیاوێکی سەرخۆش هاتووەتە خزمەت جەنابت و سکاڵای لە ئەبوو موسای ئەشعەری کردووە، چیرۆکەکە چییە و چۆنە؟

ـ من و عەبدوڵڵای کوڕم لە عەمرە بووین، پێکەوە بە تەنیا پیاسەمان دەکرد، سوارێک بەرەوڕووی ئێمە هات، وەک بە دوای ئێمەدا بگەڕێ ئاوابوو.

بە عبدوڵڵام وت: "وا بزانم بە دوای خۆماندا دەگەڕێ!"

پیاوەکە گەشت پێمان و دەستی کرد بە گریان، زۆر گریا.

منیش وتم: "برا ئەوە چییە؟ بۆ ئاوا دەگریت؟! ئەگەر قەرزاری، قەرزەکەت دەبژێرم! ئەگەر لە کەسێک دەترسی، ئەوا پەنات دەدەم؟! ئەگەر بە ناهەق کەسێکت کوشتووە، ئەوە ئیتر شتێکی ترە و دەبێ بکوژرێیتەوە. ئەگەر لە دەست دەرودراوسێ بێزاری، ئەوا لە شوێنێکی تر نیشتەجێت دەکەم؟!"

وتی: "قوربان من بەنی تەمیمیم. ڕۆژێک شەرابم خواردەوە، ئەبوو موسا گرتمی و جەڵدەی لێ دام، دەم و چاوی ڕەش کردم، بەناو خەڵکدا گێڕامی، دوایش وتی: 'کەس لەگەڵیدا دانەنیشێ و کەسیش لەگەڵیدا نان نەخوا!' "

منیش پێم وت: "ئەی تۆ چیت کرد؟"

وتی: "دڵ و دەروونم هانم دەدەن لەنێوان سێ کاردا یەکیان هەڵبژێرم."

منیش وتم: "چی و چی؟"

وتی: "یا شمشێرێک هەڵدەگرم ئەبوو موسا دەکوژم، یان دێم و تۆ بمنێرە بۆ شام لەوێ کەس نامناسێ، یان خۆم ڕادەستی دوژمن دەکەم و ئەوان هەم قسەم لەگەڵدا دەکەن و هەم نانم لەگەڵدا دەخۆن!"

منیش بە خوا خەریک بوو لە خەفەتا دادەچۆڕام، پێم وت: "من پێم خۆش نییە پڕ بە دونیا زێڕم هەبێ، بەڵام تۆ شتی وا بکەی. لە سەردەمی نەفامیدا من شەرابخۆرترین کەس بووم، بە خوا شەرابخواردن وەک زینا خراپ نییە!"

نامەیەکم بۆ ئەبوو موسا نووسی و وتم:

"سڵاوی خوات لێ بێ، دوای سەلام؛ فڵان کەسی کوڕی فڵان کەسی تەمیمی ئەوەی بۆ باس کردم کە تۆ چیت لێ کردووە. بەو خوایە جارێکی تر ئیشی وا بکەی، سەروچاوت ڕەش دەکەم، بەناو خەڵکدا دەتگێڕم. ئەگەر دەتەوێ وات لێ بکەم، یەک جاری تر ئیشێکی وا بکە! فرمان بکە بە خەڵکیش کە هەم قسەی لەگەڵدا بکەن و هەم نانی لەگەڵدا بخۆن!

دووسەد دیرهەمم پێ بەخشی و نامەکەم پێداو وتم: "دەی براکەم بەرەو ماڵ وەڕێ بکەوە، یاخوا بە سەلامەتی بڕۆیتەوە!"

- بە خوا ئەمەیش چیرۆکێکی تری سەرسووڕهێنەر بوو، هیوادارم گەورەم ڕێم پێ بدا کەمێک لەسەری بوەستین.

- چ پرسیارێکت لەم چیرۆکەوە بۆ گەڵاڵە بووە؟

- تۆ بە عەبدوڵلات فەرموو: "وابزانم بە دوای خۆماندا دەگەڕێ!" پێم سەیرە! تۆ تەنانەت لە سەفەرەی عەمرەیشدا دەرگات لەسەر خەڵک دانەخستبوو، لەوێیش بەرۆکیان دەگرتی و سکاڵایان لا دەکردی!

- کوڕم! عەمرە سوننەتە، بەڵام بەڕێکردنی کاروباری خەڵکی لەسەر کاربەدەست فەرزە، دەبێ من مافەکانیان بۆ بگەڕێنمەوە و یارمەتیی ستەملێکراوان بدەم و ببمە پەنا و پاڵپشت بۆ هەژار و لاوازان.

– ڕاست دەفەرمووی قوربان! ئەگەر ئەو پیاوەیش بیزانیایە تۆ ئاوا نیت، نەدەهات بۆ خزمەتت.

– جگە لە ئیمان، چ شتێکی باش لای خوا هێندەی ئەوە باشە کە خەڵک هیوایان پێت هەبێ. ستەملێکراو بێت بۆلات بۆ ئەوەی مافی بۆ وەربگریتەوە، ئاتاج و هەژار بێت بۆ ئەوەی یارمەتیی بدەی، ترسێنراو بێت بۆلات بۆ ئەوەی پەنای بدەی، بێکەس بێت بۆلات بۆ ئەوەی ببی بەکەسی، لێقەوماو بێت بۆلات بۆ ئەوەی ببیتە مایەی دڵخۆشی بۆی.

- بە خوا هیچ! پێم سەیر بوو ئەوەندە بە خوڕ لای تۆ گریا، تۆیش بێ ئەوەی لێی بپرس.ی فەرموت: "ئەگەر قەرزاری بۆت دەبژێرم، ئەگەر لە کەسێک دەترسی پەنات دەدەم."

- کوڕم! خەڵک پێویستیان بە یەکێکە لە داواکاری لەم و لەو ڕزگاریان بکا. پێویستی و موحتاجی تاڵە، ئێمەیش دوو جار تاڵاوی پێ بدەین؟ تاڵاوی ئاتاجی و تاڵاوی داواکاری، نا بە خوا عومەر هەرگیز وا ناکا.

- زۆرم پێ سەیر بوو ئەو نامەیەت بۆ ئەبوو موسا نووسی، هەرگیز نەمبیستووە گەورەی وڵاتێک لەبەر خاتری کەسێکی ئاسایی، تەمبێی کاربەدەستێکی ژێر دەسەڵاتی خۆی بکا.

- عومەر لەگەڵ هەقدایە، ئیتر هەق لە هەرکوێ و لای هەرکێ بێت. ئەگەر کەسێک هەقی بەسەر منەوە بوو، ئەوا خۆم یەکەم کەسم هەقەکەی بۆ بسەنمەوە. ئەگەر کەسێکی ئاسایی هەقی لای کاربەدەستێکی من بوو، ئەوا یارمەتیی ئەو کەسە دەدەم هەتا هەقی خۆی وەردەگرێتەوە، هەرچەند ئەو هەقە لای سەرکردەیەکی گەورەیش بێ.

- بە خوا ئا ئەوە دادگەرییە، بەڵام قوربان تۆ وا نازانی کەمێک لەگەڵ ئەبوو موسادا توند بووی؟

- ئەی تۆ وا نازانی کە ئەبوو موسا لەگەڵ ئەو پیاوە داماوەدا زۆر توند بووە؟ کوڕم! ئێمە دەمانەوێ خەڵک ڕاست بکەینەوە نەک بیانشکێنین، دەمانەوێ بەرەو ئیسلامیان بگێڕینەوە نەک ڕاویان بنێین. دەبێ ئەوەیان لا دروست بکەین کاتێ ئێمە حەددێکی شەرعییان بەسەردا دەردەکەین، ئەوە تۆڵە سەندنەوە نییە لەبەر خۆمان. دەبێ ئەوەیان تێبگەیەنین کە حەددەرکردن میهرەبانییە، دەبێ لەسەرخۆ و هێمن بین. ئەوان ئەگەر خۆشەویسییان لە ئێمە ڕادەبینی، دەبێ ئێمەیش جێ ئومێدی ئەوان بین.

- بەڵێ قوربان! میهرەبانی و لەسەرخۆیی هەروایە. بەم جۆرەی تۆ فەرموت، کاربەدەستان دەتوانن دڵی خەڵک بەرەولای خۆیان کەمەندکێش بکەن. بە دادگەری، بە سۆز و بەزەیی، نەک بە شیر و تیر!

- ڕاست دەکەی کوڕم ! بە دادگەری و سۆز و بەزەیی!

- قوربان باسی ئەو پیاوە قیبتیەم بۆ بکە کە موسڵمان بوو، دوایی لەگەڵ عەمری کوڕی عاص کە والی میصر بوو دەمەقاڵەیەکیان بوو، ئەویش هات بۆ خزمەت جەنابت و سکاڵای لە عەمر کرد.

- ئەو پیاوە وەک خۆت وتت میصری بوو، گاوریش بوو، دوایی ئیمانی هێنا و بووە موسڵمان. دوایی کێشەیەک کەوتە نێوان ئەو پیاوە و عەمری کوڕی عاصەوە. عەمر بەوی وتبوو: "موونافیق!"

- ئەی پیاوەکە چیی کرد؟

- هات بۆلای من، وتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان! عەمر پێی وتووم: 'موونافیق!' منیش سوێندم خواردووە ئاو لەسەرم نەکەوێ و سەرم شانە نەکەم و چەوری نەکەم هەتا دەگەمە خزمەتت! بە خوا گەورەم من موونافیق نیم، من موسڵمانم!"

- ئەی تۆ چیت کرد قوربان؟

- نامەیەکم بۆ عەمر نووسی و، وتم:

"لە بەندەی خودا عومەری کوڕی خەتتابەوە بۆ عەمری کوڕی عاص، سڵاوی خوات لێ بێ. پاشان: فلان کەس دەڵێ گوایە تۆ پێت وتووە: 'موونافیق!' ئەوا من مۆڵەتم داوە ئەگەر دوو کەس شایەتیی بۆ بدەن، دەبێ چل دار لە تۆ بدا!"

- ئەی دواتر چی ڕووی دا؟

- پیاوەکە گەڕایەوە بۆ میصر، ڕۆشتە مزگەوتەوە و بە دەنگی بەرز هاواری کرد: "سوێندتان دەدەم بە خوا، هەرکەس ئەو ڕۆژە گوێی لێ بوو کە عەمر بە منی وت موونافیق، با هەستێتە سەرپێ!"

کۆمەڵێکیان هەستان و شایەتییان بۆ دا.

- ئەی دوایی چی ڕووی دا؟

- دوای ئەوە پیاوەکە نامەکەی منی دابووە دەست عەمر— قسە دێ قسە دەبرێ، من قانونێکی وام دانابوو کە هەرکات نامەم بۆ والی و کاربەدەستان ناردبا و ناوەڕۆکی نامەکە بۆ قەزاوەت بووایە یا بڕاندنەوەی کێشە و ئاریشەیەک بووایە، دەبوو بە بەرچاوی خەڵکەوە نامەکە بخوێننەوە، بەڵام ئەگەر نامەی نێوان خۆمان بووایە ئەوە شتێکی تر بوو، عەمریش بە بەرچاوی خەڵکەوە نامەکەی خوێندەوە.

- ئەی دواتر چی ڕووی دا؟

- یەکێک لە ئامادەبووان هەستابوو، بەتوڕەییەوە بەو پیاوەی وتبوو: تۆ دەتەوێ گەورەمان دارکای بکرێ؟

پیاوەکەش وتبووی: "من نامەی گەورەی ئیماندارانم پێیە."

- دەی لەو کاتەدا چی ڕووی دا؟

- هاوڕێکەی عەمر پارەیەکی زۆری دابوو بە ئەو پیاوە بۆ ئەوەی لە عەمر ببورێ و داری لێ نەدرێت.

بەڵام پیاوەکە وتبووی: "بە خوا پڕی ئەو مزگەوتە پارەم بدەنێ، نامەوێ!"

- دەی قوربان چی ڕووی دا؟

- پیاوەکە هەستی کردبوو کە عەمری کوڕی عاص نایەوێ فرمانەکەی من جێبەجێ بکا، وتبووی: "من وادەزانم کە فرمانی گەورەی ئیمانداران لێرە جێبەجێ ناکرێ." پاشان هەستابوو لە مزگەوت ڕۆشتبووە دەرەوە.

عەمر بە خەڵکەکەی وتبوو: "بیگەڕێننەوە!"

- دوای ئەوەی گەڕایەوە، چی ڕووی دا؟

— عەمر لە بەردەم پیاوەکە دانیشتبوو، قامچییەکی دابووە دەستی. پیاوەکە وتبووی: "ئێستە لە دەستت دێ نەهێڵی لێت بدەم؟"

عەمر وتبووی: "نەخێرا کاری خۆت بکە."

ئالەو کاتەدا پیاوەکە بە عەمری وتبوو: "دەی ئەوا لێت دەبورم، هەتا کوڕی خەتتاب مابێ و لە مەدینەدا بێ، کەس ستەمی لێ ناکرێت!"

ـ ئەو پیاوە چەند جوامێر بووە، دوای ئەوەی توانای ئەوەی هەبوو تۆڵە بکاتەوە، لە عەمر خۆش بوو!

ـ بەڵێ کوڕم! جوامێر بوو. لێبوردن لە کاتی دەسەڵاتدا سیفەتی پیاوی جوامێرە. من بە دوو شتی ئەو پیاوە سەرسام بووم:

یەکەم: بوێر بوو. ئەو هەمووە دەشت و بیابانەی لە میصرەوە تا مەدینە بڕی بۆ ئەوەی هەقی خۆی وەربگرێتەوە.

دووەم: دوایی دەرکەوت ئەو پیاوە بۆ تۆڵەسەندنەوە نەهاتبوو، ئەگینا تۆڵەی خۆی دەکردەوە، بۆ ئەوە هاتبوو تا مافی هیچ کەسێک پێشێل نەکرێت، کەرامەتی خەڵک نەڕوشێندرێ.

ـ بەڵام ببورە قوربان، بڕیارەکەی جەنابت بەرابەر عەمر توند نەبوو؟!

ـ کوڕم! ئەمە شەرعی خوایە، من کار بە شەرع دەکەم. مەڕوانە میرغەزەب لە کەسێکی سەرخۆش دەدا. بڕوانە سەرخۆشەکە، بزانە چۆن خۆی بەدەستی خۆی عەقڵ و بیر و هۆشی لە خۆی سەندوەتەوە. بڕوانە بزانە لە کاتی سەرخۆشیدا چۆن لەگەڵ ژن و منداڵیدا هەڵسووکەوت دەکا. مەڕوانە دەستێک لەسەر دزیکردن بڕاوەتەوە، بڕوانە پیاوێک زۆر بە ناڕەحەتی و بە عەرەقی نێوچاوانی پارە و سامانێکی پەیدا کردووە و، لەولاوە یەکێک بە ئاسانی دەیبا! دەیدزێ! ئەو شتەی کە دز لە ماڵی یەکێکی دەدزێ، کێ دەڵێ شتەکە هیی خودی خاوەن ماڵەکەیە؟! کێ دەڵێ هیی کەسێکی تر نییە و، لەوێ بە ئەمانەت داینەناوە؟! کێ دەڵێ ماڵی بێوەژنێکی هەتیوبار نییە؟! مەڕوانە ئەو وردەبەردانەی لە زیناکار دەدرێن! پێش ئەوە بڕوانە ئەو هاوسەرەی کە بەناهەق نامووسی براوە. بڕوانە ئەو منداڵانەی کە حەیای دایکیان براوە، ئەو پیاوەی کە حەیای کچەکەی براوە. کوڕم! هیچکەس ئەوەندەی

خوا بەندەکانی خوای خۆش ناوێ؛ خوا دەزانێ چی بۆ ئەو خەڵکە باشە بۆیە لەسەریان فەرز دەکا، خوا هیچ شتێک بێسوود فەرز ناکا. ئەگەر لە تۆڵە باشتر هەبا، خوا ئەوەی فەرز دەکرد نەک تۆڵەسەندنەوە.

- ڕاست دەفەرمووی قوربان! بەڵام خۆ عەمر نە نامووسی کەسی بردبوو و نە ماڵی کەس!

- ڕاستەکەی، بۆیە منیش تۆڵەی دز یان تۆڵەی زیناکارم بۆ دیاری نەکرد، تۆڵەی ئەو تاوانەم بۆ دیاری کرد کە خۆی کردبووی. ئەگەر بەرپرسێک پیاوێک لە دین دەربکا و بە مونافیقی بناسێنێ و وای نیشان بدا موسڵمان نییە، ئەمە ئەگەر ئازاردان نییە، چیی پێ دەوترێ؟! کێ دەڵێ حەیابردنی کەسێک، لە بێدیننیشاندانی کەسێک گەورەترە و بقەترە؟!

- لەوانەیە عەمر شتێکی لەو پیاوە دیبێ!

ــ نە عەمر و نە غەیری عەمر ناتوانن شتێکی وا ببینن کە کەسێک خۆی نەیکردبێ. مادەم ئەو پیاوە شادەی هێناوە، نوێژ و جەماعەت دەکا، زەکات دەدا، ئیتر موسڵمانە، یەکێکە وەک ئێمە، مافی لەسەرمانە، هەرچی بۆ ئێمە ڕەوابێ، بۆ ئەویش ڕەوایە. ئێمە فرمانمان پێنەکراوە دڵی خەڵک توێ توێ بکەین بزانین چییان تیایە، ئەوە پەیوەندیی بە خوای گەورەوە هەیە و کاری ئەوە. ئێمە دەبێ بە ڕواڵەت چی دەبینین، حوکم بەوە بکەین(وەک دەڵێن: شەرع زاهیر بینە).

- ڕاست دەفەرمووی قوربان! ئێستە دەمەوێ پێش ئەوەی ئەم باسە کۆتایی پێ بێنین و باسێکی تر بکەینەوە، سێ پرسیارت لێ بکەم.

- چییە کوڕم بپرسە؟

ــــ یەکەم: خەبەری ئەو پیاوە چییە کە ڕۆژی ڕزگاربوونی شاری توستەر(شوشتەر) لە دین وەرگەڕایەوە؟

- ئەو پیاوە پیاوێکی موسڵمان بوو، لەنێو ڕیزی سەربازانی ئیسلامدا بوو، دوای ڕزگاربوونی شوشتەر لە دین وەرگەڕایەوە - پارێزراو ئەو کەسەیە کە خوا دەیپارێزێ، شێتیش ئەو کەسەیە کە خوا عەقڵی دەداتە دەست خۆی - موسڵمانان هەر ئەو ڕۆژە کوشتوبوویان.

- ئەی تۆ چیت کرد؟!

- چەند کەسێک تۆمەتبار بوون بە کوشتنی، نامەیەکم بۆ نووسین، وتم:

" کورە با بتانبردایەتە نێو خانوویەکەوە، دەرگاتان لێ داخستبا، هەموو ڕۆژێک نانێکتان پێ بدایە، و داوای تەوبە و پەشیمانیتان لێ بکردایە. خوایە! من لەم کارە بێئاگام، فرمانم بە شتی وا نەکردووە، بە کاری لەوجۆرەیش ڕازی نیم! "

- ئەی قوربان ئەوە تۆڵە سەندنەوە نەبووە، نابێ مورتەد بکوژرێ؟

- با تۆڵەیان لێ سەندەوە.

- ئەی تۆ بۆچی تووڕە بووی؟

- نەدەبوو ئەوەندە بە خێرایی بیکوژن، من دەمویست دوای بخەن.

- بۆچی؟

- لەوانەیە گومانێکی لە دڵدا دروست بووبێ، لەوانەیە کەسێک لە خشتەی بردبێ، با بمایەتەوە و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکردایە. ئەگەر بەڵگەی هەبا، ئەوا بەڵگەکانیان پووچ دەکردەوە. ئەگەر دوودڵی هەبا، ئەوا دڵیان یەکلا دەکردەوە. تۆ پێت خۆشە کەسێک ماوەیەکی زۆر موسڵمان بێت و دوایی بچێتە ئاگرەوە؟

- نەبەخوا پێم خۆش نییە.

- منیش پێم خۆش نییە. ئا لەبەر ئەوە تووڕە بووم. ئەگەر داوای تۆبەیان لێ بکردایە و تۆبەی نەکردایە ،منیش پێم ناخۆش نەدەبوو، دەمگوت: "خۆی ئەوەی هەڵبژاردووە." ئەگەر داوای تۆبەیان لێ کردبا و، ئەویش تۆبەی بکردایە و دیسانەوە موسڵمان ببایەتەوە، ئەوە لەوە باشتر بوو کە پیاوێکی کافر بێت و موسڵمان ببێ.

- بە خوا گەورەم تۆ زۆر دڵسۆزی، زۆر!

- کوڕم ئێمە دەمانەوێ دەستی خەڵک بگرین و بەرەو لای خوای بێنین، نەک ببینە لەمپەر لەنێوان خوا و خەڵکدا، دەی ئیتر ئەم باسە تەواو؟

- بەڵێ قوربان تەواو.

- پرسیاری دوایی چییە؟

- باسی ئەو پیاو و ژنەی کە بە ناهەق پیاوێکیان کوشت.

- بەڵێ شتی وا ڕووی دا.

- چۆن بوو؟

- ئەوە پیاوێک لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێکی تریان کوشت - وەک خۆت وتت، - پیاو و ژنەکەیان گرت و بۆلای منیان هێنان. یەکەم جار نەمویست تۆڵەیان لێ بسەنمەوە.

- بۆچی قوربان؟

- لە دڵی خۆمدا دەمگوت: "چۆن دوو کەس لە تۆڵەی تاقەکەسێکدا دەکوژرێنەوە؟!"

- ئەی دوایی چیت کرد؟

- پرسم بە عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب کرد.

- ئەی ڕای ئەو چۆن بوو؟

- وتی: "گەورەی ئیمانداران! هەردووکیان بکوژەوە."

منیش وتم: "دوو کەس لە جیاتی یەک کەس؟!"

ئەویش وتی: "بەڵێ گەورەم! ئەگەر چەند دزێک پێکەوە مانگایەک یان حوشترێک بدزن، دەستی هەموویان نابڕیتەوە؟!"

منیش وتم: "با."

ئەویش وتی: "چونکە ئەو کەسانە لە تاوانێکدا هاوبەشن بۆیە دەستیان دەبڕیتەوە، هەرکەسەو تۆڵەی خۆی لێ سەنراوەتەوە. ئەم دووانەیش لە کوشتنی کەسێکی بێتاواندا هاوبەشن، هەرکەسەو تووشی خوێنڕشتنێک بووە بە حەرامی، ئەمەیش وەک ئەو نموونەی پێشوو!"

- ئەی تۆ چیت کرد گەورەم؟

- منیش بە گوێی عەلیم کرد، ڕاست دەکا، ئەمەیش وەک ئەویتر!

- بە خوا گەورەم خاکێتی تۆ زۆر سەرسامی کردووم، لە قورئاندا حوکمێکی ڕوون و ئاشکرات لەم بارەوە دەست نەکەوت، دیسان لە فەرموودەیشدا دەستت نەکەوت، پێت شەرم نەبوو پرست بە عەلی کرد، ئەمە ئەوپەڕی خاکێتیە!

- کوڕم ئەمە خوێنە خوێن! خوێن لە هەموو شتێک گرانترە. دواتر، هەرکەس پرس بە خەڵک بکا، پرس بە عەقڵی ئەو خەڵکە دەکا، دەی نموونەی وەک عەلی کوا لەکوێ هەیە؟!

- ڕاست دەفەرمووی قوربان!

- ئەم باسەیش تەواو بوو یان ماوە؟

- قوربان تەواو.

- دەی با خۆم شتێکی تری وەک ئەم نموونەیەت بۆ بگێڕمەوە.

- فەرموو قوربان گیان و، دڵم لەلاتە!

- ژنێکی خەڵکی صەنعا مێردەکەی ڕۆشتبوو بۆ سەفەرێکی دوور، کوڕێکی لە ژنێکی تری هەبوو ناوی ئوصەیل بوو. کاتێ پیاوەکە لە سەفەر بوو، ژنەکەی لەگەڵ پیاوێکدا دەستیان تێکەڵ کردبوو، بە پیاوەکەی وتبوو: "ئەم منداڵە بکوژە! با پێمان نەزانێ و باسمان نەکا." ئەویش وتبووی: "چۆن کاری وا بکەم؟" ژنەکەیش وتبووی: "دەی ئیتر منیش لەگەڵتدا نابم." پیاوەکەیش لە گوێی کردبوو، لەگەڵ برادەرێکی خۆی و ژنەکە و خزمەتکارێکی ژنەکەدا بە هەموویانەوە کوڕەکەیان کوشتبوو، پارچە پارچەیان کردبوو، خستبوویانە ناو پێستەوە و فڕێیان دابووە نێو

کۆنە بیرێکی وشک و بێئاو لەو پەڕی ئاواییدا. دوایی ژنەکە دەستی کردبوو بە قیژەقیژ و هاوار و وتبووی: "کوڕی مێردەکەم دیار نەماوە." خەڵکی ئاوایی دەستیان کردبوو بە گەڕان بە دوای کوڕەکەدا، چەند کەسێک بەدەم گەڕانەوە بە تەنیشت بیرەکەدا تێپەڕیبوون، پیاوێک تەماشا دەکا لەناو ئەم بیرەدا خەرەنگەز و مێشی سەوز دێنە دەرەوە، یەکسەر هەستی کردبوو وتبووی: "ئەم بیرە تەرمی تیایە." خزمەتکاری ژنەکەیش لەوێدا بوو، لەرزی لێ هاتبوو، ئەوانیش گومانیان لێ کردبوو و گرتبوویان. ڕۆشتبوونە خوارەوە و تەرمی منداڵەکەیان دۆزیبووەوە. خزمەتکارەکە دانی بە تاوانەکەدا نابوو. تاوانبارەکان هەموویان گیران و دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا. ئەو دەمە یەعلا لە صەنعا والی بوو، نامەیەکی بۆ من نووسی و دەنگوباسەکەی بۆ گێڕابوومەوە و پرسی کردبوو کە چییان لێ بکەین؟ منیش بۆم نووسی: "بە خوا ئەگەر هەموو خەڵکی صەنعا دەستیان لەو تاوانەدا هەبێ، هەر هەموویان لە تۆڵەدا دەکوژمەوە!"

- لە تۆڵەی کوشتنی منداڵێکدا هەموویانت کوشتەوە؟

- ئەی چۆن، ئەوانە دوو تاوانی زۆر گەورەیان کردبوو، کوشتنی منداڵێکی بێتاوان و خیانەت لە پیاوێکی داماو!

- وەڵڵا وایە گەورەم! دە بە خوا کارێکی باشت کرد قوربان!

- هیچی تر ماوە بپرسی؟

- شتێک کە زۆر دەکێشێ.

- بیڵێ کوڕم، بیڵێ.

- جارێک لە شوێنێک کتێبێکم خوێندەوە تیای نووسرابوو: "عومەر شەرعی خوای پەک خستووە. ساڵی قات و قڕییەکە یاسای دەستبڕینەوەی هەڵوەشاندەوە. پاشان دەپرسن: چۆن عومەر دەتوانێ کارێکی ئاوا بکا؟! ئەوە نییە خوا خۆی دەفەرمووێ:

﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَـٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ ﴾

المائدة: ٣٨ واتە: 'پیاو و ئافرەتی دز دەستیان ببڕن لە تۆڵەی ئەو دزیەی کردوویانە. ئەمە تۆڵە و تەمێکردنێکە لەلایەن خواوە، جا خوا باڵادەستی کاردروستە.' ئەم تۆڵەسەندنەوە لە سەردەمی پێغەمبەر و دواتریش لە سەردەمی ئەبوو بەکردا هەبووە، ئیتر عومەر چۆن دەتوانێ ڕایوەستێنێ؟!"

- کورە ئەوانە لە کەرەکانی ماڵی خۆیان بێ ئەقڵ ترن!

- بۆچی گەورەم؟!

— چونکە ئەوانە لە مانای دروستی ئیسلام تێنەگەشتوون، وەک ئەو مانا دروستەی کە ئێمە لە ئێستا و کاتی خۆیدا تێدەگەین. ئەوانە خۆیان هیچیان لە پێغەمبەرﷺ نەبیستووە، وا تێدەگەن کە عومەر بەم کارە بیدعەی داهێناوە. نا بە خوا ئەوە بیدعە نییە؛ شوێنکەوتنی سوننەتە!

- چۆن چۆنی گەورەم؟!

- ڕاستت کرد ئەم بابەتە قسەی زۆر گەرەکە، دەی بێتاقەت مەبە و باش گوێ بگرە تا بۆت باس بکەم.

- حەددم چییە قوربان بێتاقەت ببم، تا بەیانی قسەم بۆ بکەی نالێم: بەسە. فەرموو گەورەم گوێبیسم!

— مێژووی مرۆڤایەتی - بەلای ئەو کەسانەی بە باشی شارەزای مێژوون و دادپەروەر و قسەڕاستن، نەک بەلای ئەوانەی کە هەر تانەباز و ڕەخنەی بێجێ دەگرن - هیچکات بیر و باوەڕو یاسا و ڕێسایەکی نەدیوە وەک ئیسلام ڕێزی مرۆڤ بگرێ، وەک قورئان و فەرمووده باس لە ڕێزی مرۆڤ بکا. ئیسلام مرۆڤ وەک مرۆڤ تەماشا دەکا، ئیتر سەیری شکڵ و شێوە و موڵک و سامان ناکا. سەروەت و سامان پێوەری ڕێزگرتن نییە. من هەمیشە پۆشاکەکانم پڕ بوو لە پینە، دەمزانی خوای گەورە تەماشای ڕەنگ و ڕوخسار ناکا، تەماشای نێر و مێ ناکا، تەماشای باری کۆمەڵایەتی ناکا، فلان سەرۆکە و فلان خزمەتکار. خوا سەیری شتێک دەکا

هەموو کەس وەک یەک هەیەتی، سەیری دڵ دەکا. من زۆر جار وتوومە: "بیلال گەورەی ئێمەیە." گەورەکەیشمان بیلالی کڕییەوە و ئازادی کرد! خۆ بیلال لە سەردەمی نەفامیدا کۆیلەی ئومەیەی کوڕی خەلەف بوو!

بەڵام خەڵک تێڕاونینێکی تریان بۆ مرۆڤ هەیە، زۆر جیاوازە لە تێڕوانینی ئیسلام!

ئەو ڕێزەی لە مرۆڤ نراوە لە ئیسلامدا، ئەو بناغەیەیە کە هەموو یاساکانی لەسەر داڕێژاوە. تۆڵەیش بۆیە دانراوە بۆ پاراستنی ئەو بناغە و یاسایانە. ئیسلام پێنج شتی دیاری کردووە کە دەبێ بۆ هەموو کەسێک بەبێ جیاوازیی چینایەتی پارێزراوبێ، بۆ ئەوەی ئەو دروشمەی ئیسلام هەڵیگرتووە، زیندوو بێت نەک دروشمێکی کلۆر و پووچ، ئەو پێنج شتە ئەمانەن:

ئایین، گیان، عەقڵ، کەرامەت و نامووس، ماڵ. کۆی ئەم پێنج شتە ڕێز و کەرامەتی مرۆڤ دابین دەکەن!

بۆ پاراستنی ئەم پێنج شتە تۆڵە دانراوە بۆ ئەو کەسانەی کە دەست درێژی دەکەنە سەر یەکێک لەم پێنجانە - گیانی بسێنێ، یان نامووس و کەرامەتی، یان ماڵ و سامانی.

لەمانەدا ئیسلام جیاوازیی نەکردووە کە ئەو تەعەدایە یەکێکی تر بیکا یان خودی کەسەکە. بۆیە تۆڵە دانراوە بۆ شەرابخۆر؛ پێش هەموو شت تەعەدای لە عەقڵی خۆی کردووە، ئەوە ئیسلام بەرپرسە لە پاراستنی کەرامەتی، هەرچەند بە تۆڵەیەکی سەختیش بێ!

خوای گەورە دروستکەری مرۆڤە، باش مرۆڤ دەناسێ، دەزانێ مرۆڤ سروشتی وایە کە مل قوت بکاتەوە بۆ داگیرکردن و دابڕینی ئەو شتانەی کە موڵکی کەسێکی ترن. هەروەها خۆشەویسیی هاوسەر و سەروەت و سامان و هەموو خۆشی و چێژێکی دونیا بۆ خەڵک ڕازێنراوەتەوە، بە شێوەیەکی وا ڕازێنراوەتەوە کە چووەتە نێو قولایی ویژدانییەوە. هەروەها جاری وا هەیە مرۆڤ بە شێوەیەکی وا حەزی لە دەستدرێژی و شاڵاوبردنە کە ویژدان و ئەخلاق بەرگرییان پێ ناکرێ.

لەبەر ئەوە، خوای گەورە چەند تۆڵەسەندنەوەیەکی داناوە بۆ ئەوەی کەرامەتی مرۆڤەکان وەک خۆی بمێنێتەوە و بەر مەترسی نەکەوێ، بۆ ئەوەی ماڵ و سامانی هیچ خاوەن ماڵ و سامانێک داگیر نەکرێت، بۆ ئەوەی کەس بە ئارەزووی نەفس و هەوای خۆی نەکا و تەعەدا لە کەس نەکا، بۆ ئەوەی مانای کەرامەت وەک خۆی بمێنێتەوە - کەرامەتی ستەمکار و ستەملێکراو.

بۆیە و لەبەر ئەمانەیە کە تۆڵەسەندنەوە لە تاکەکان، ژیانەوەیە بۆ کۆمەڵگا. ئەو کەسەی بە ناهەق خوێنێکی ڕشتووە، ئەگەر خوێنی ڕژێنرایەوە، ئیتر خوێنرێژان دەوەستێ یان تەواو کەم دەبێتەوە، کەس تەما ناکاتە ناموسی هیچ کەسێکی تر. تا تۆڵەیش توندتر بێ، کابرای خراپەکاریش زیاتر دوودڵ دەبێ لە خراپەکردن، بۆیە زیاتر و توندتر بەرابەر هەوا و ئارەزووە خراپەکانی دەوەستێتەوە. بەم جۆرە کەرامەتی بەشی هەرە زۆری مرۆڤایەتی پارێزراو دەبێ، بە تایبەت کەرامەتی کۆمەڵگا. ئا لەبەر ئەوەیە کە تۆڵەسەندنەوە ڕەوایە و، دینی ئیسلام تۆڵە لە خراپەکار دەسەنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەیشدا کە ڕەچاوی بەرژەوەندیی کۆمەڵگا دەکرێت، ئیسلام دادگەرییەکی ڕەهای وای هەیە کە تەنانەت ئەو دادگەرییە مرۆڤە تاوانبارەکانیش دەگرێتەوە. بۆ سەندنەوەی تۆڵە چەند مەرجێکی داناوە، بۆ ئەوەی بزانێ کە تاوانبار بۆچی تاوانی ئەنجام داوە؟ بۆ نموونە لە دزیکردندا چەند مەرجێک هەن، دەبێ ئەو مەرجانە بێنەدی ئەمجا دەستی دز دەبڕێتەوە، ئەگەر یەکێک لەو مەرجانە نەهاتەدی، دەستی دز نابڕێتەوە!

- ئەو مەرجانە چین؟

- دەبێ نرخی ئەو شتەی دزراوە بگاتە ڕادەی ئەوەی کە شایانی ئەوەبێ دەستی دزی بۆ ببڕنەوە، ئەگەر کەسێک هێلکەیەکی دزی، دەستی نابڕینەوە، بەڵام دەبێ تەمبێ بکرێت.

مەرجێکی تر ئەوەیە کە ئەو شتەی دزراوە، دەبێ لە شوێنێکی باش و پارێزراودا هەڵگیرابێ تا دز بە ئاسانی نەچێتە سەری، بۆ نموونە ئەگەر خاوەن ماڵ کەسێکی بردە ماڵەوە و متمانەی پێی هەبوو و پارە و سامانەکەی هەڵنەگرت و گوێی نەدایێ، پاشان میوانەکە شتەکانی دزی، ئەوا دەستی نابڕینەوە، چونکە خاوەن ماڵ سستیی کردووە و ماڵەکەی خۆی باش هەڵنەگرتووە!

دیسان، ئەگەر کەسێک سامانی خۆی لە مزگەوتدا یان گەرماوی گشتیدا یان لە خان یان شوێنێکی گشتیدا دانا و کەسێک بردی، ئەوا دەستی نابڕێتەوە، چونکە ئەو کەسە ئەو کاتە بە دز لە قەڵەم نادرێت، بەڵکو خائینە، خائینیش دەستی نابڕێتەوە، پێغەمبەر فەرموویەتی: "لیس علی الخائن قطع. واتە: دەستی خائین نابڕدرێتەوە."

دیسان دەستی کفندز نابڕێتەوە، چونکە گۆڕ شوێنی شت هەڵگرتن نییە. هەروەها ئەگەر شتێک لەو دەرودەشتە تاقەت کرابوو[1]، دوایی کەسێکی تر بردی، ئەوا دەستی نابڕدرێتەوە. زۆربەی ئەو شتانەی خەڵک پێی دەڵێ دزین، دەستی تیا نابڕدرێتەوە.

من و چەند هاوەڵێکی تریش پێمان وا بوو ئەو تەڕە و میوانەی وا زوو تێک دەچن وەک ترێ، خورمای تەڕ، میوە بەگشتی، ئەوە دەستبڕینەوەیان تیا نییە. دیسان گۆشتدزین، چێشتدزین، گەنمدزین پێش ڕنینەوە، چۆلەکە و باڵندەدزین، یان ئامێری مۆسیقا بەگشتی ئەمانە دەستبڕینەوەیان تیا نییە، پێغەمبەر فەرموویەتی: "لا قطع فی ثمر و لا کثر. واتە: میوەدزین یان دزینی شیلە و چەوری خورما(کاتێک بە دارەوەیە و نەچنراوەتەوە) دەستبڕینەوەیان تیا نییە."

هەرکەس لە خەزێنەی دەوڵەت دزیی کرد، دەستی نابڕدرێتەوە، چونکە ئەو جۆرە کەسانە پێیان دەوترێ تالانچی نەک دز؛ ماڵی دەوڵەت مافی هەموو کەسە، مافی دزەکەیشی تیایە، کەوابوو وەک ئەوە وایە دزی لە ماڵی خۆی بکا، بۆیە دەستی نابڕدرێتەوە - ئەو شتەی دزیویەتی گومانی تیایە کە هیی خۆیەتی یان هیی خۆی نییە، شەرعی خوایش بە گومان و گومانکاری جێبەجێ ناکرێ، ئەوانە دەبێ

---
[1] تاقەتکردن: شاردنەوە

تەمێ بکرێن. جارێک لە شام پیاوێک لە خەزێنەی دەوڵەت دزیی کردبوو، ئەبوو عوبەیدە نامەیەکی بۆم نووسی، پرسی پێ کردم.

منیش وتم: "نابێ دەستی ببڕنەوە، چونکە ئەو پیاوە لە خەزێنەدا بەشدارە(هەرچەندە زۆر کەمیش بێت.)"

هەرکەس دزیی لە خزمی زۆر نزیکی خۆی کرد، وەک دایک و باوک، دەستی نابڕدرێتەوە، چونکە ئەمەیش دیسان گومانی تیایە، خۆی بەشدارە لەوماڵە یان نا؟ هەرچەند بەو کارە دەوترێ دزی، بەڵام دیسان دەستبڕینەوەی تیا نییە!

دیسان ئەگەر پێش ئەوەی دزەکە دزیەکەی بکا، گیرا؛ ئەوا دەستی نابڕێتەوە.

دیسان دەستی دز نابڕدرێتەوە هەتا دوو جار خۆی دان بە دزیەکەیدا نەنێت، بە یەکجار دانپیانان دەست نابڕدرێتەوە.

کەوابوو وەک دەزانین چەند مەرجێکی زۆر دانراوە بەبێ ئەوەی ئەو مەرجانە بێنەدی، دەستی دز نابڕدرێتەوە. ئەو مەرجانە کۆمەڵە مەرجێکن، هەندێکیان پەیوەندییان بە دزەوە هەیە، هەندێکیان بە شتە دزراوەکەوە، هەندێکیان بە شوێنی دزیەکەوە، هەندێکیان بە سیفەتی دزیەکەوە.

- چۆن وایە قوربان؟

— بۆ نموونە ئەوەی پەیوەندیی بە دزەکەوە هەیە، دەبێ دزەکە عاقڵ بێ، پێگەشتوو(بالغ) بێ. کەوابوو دەستی منداڵ نابڕدرێتەوە، چونکە پێنەگەشتووە و بالغ نەبووە. هەروەها دەستی شێت نابڕدرێتەوە، چونکە عەقڵی نییە و کەسێکیش عەقڵی نەبێ، هیچ تەکلیفێکی لەسەر نییە!

- باشە گەورەم تێگەشتم!

- دەی ئێستە گەشتینە ئەسڵی مەبەست!

ئەوەی کە تۆ خوێندووتەتەوە لە بارەی دەستنەبڕینەوە لەو ساڵەی کە قاتوقڕی بوو، ئەوە شتێکی تایبەت بوو، قاعیدەیەک هەیە دەڵێ: "زەرورەت شتە حەرامەکان حەڵاڵ دەکا!"

خۆ من کەسم نەناردبووە سەر ڕێگاکان و بانگەواز بکەن بڵێن: هۆ خەڵکینە کێ دەیەوێ دزی بکا با بیکا، عومەر بە هۆی قات و قڕییەوە دەستبڕینی ڕاوەستاندوە!

ئەگەر دەوڵەمەندێکیان بهێنایە و بیانگوتایە دزی کردووە، دەستیم دەبڕیەوە، ئەگەر سەد جار ساڵی گرانی و قاتوقڕی بایە!

وەستاندنی حوکمی دەستبڕینەوە لەبەر ئەو گومان و شوبهانە بوو کە باسکران. دیسان لەبەر زەرورەت و ناچاری بوو، زەرورەت و ناچاری وەک وتمان، حوکمەکان ڕادەگرن هەرچەند لە کاتی خۆشی و فەرحانیشدا بێ!

دەی ئیتر شتی زۆرم بۆ باس کردی، با بۆ زیاتر ڕوونبوونەوەیش، نموونەیەکت بۆ بێنمەوە.

- دەی فەرموو گەورەم زۆرم پێ خۆشە!

- بە پشتیوانی خوا! جارێک چەند کۆیلەیەکی حاتەبی کوڕی ئەبوو بەلتەعە وشترێکی پیاوێکی موزەینەییان دزیبوو، کۆیلەکانیان گرت، هێنانیان بۆلام. منیش تەماشا دەکەم ئەمانە زۆر برسین - حاتەب گوێی نەدابوونێ و بەخێوی نەکردبوون- بۆیە دەستی هیچیانم نەبڕی و، بە حاتەبم وت:

"بەخوا بمزانیبا ئێوە کاریان پێ دەکەن و تێریان دەکەن و ئەوانیش دەست بۆ حەرام دەبەن، دەستی هەموویانم دەبڕی، بەڵام بە خوا دەبێ سزایەکی وات بدەم، پێی برسی ببی!"

وتم بە کابرای موزەنی: "نرخی وشترەکەت چەندە؟"

وتی: "چوارسەد!"

بە حاتەبم وت: "ئادەی هەشتسەدی بدەرێ."

- یانی لەبەر ئەوەی ئەو کۆیلانە ناچار بوون دزی بکەن، تۆ دەستت نەبڕینەوە، وانییە قوربان؟

ـ با کورِم وایە! من لێرە بە گوێرەی ئەو قاعیدەیە ڕەفتارم کرد کە پێم وتی: "زەرورەت شتە حەرامەکان حەلاڵ دەکا!"

دیسان بە گوێرەی بیر و باوەڕە گشتیەکانی قورئان ڕەفتارم کرد، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (١٧٣)﴾ البقـــــرة: ١٧٣ واتە: "(خوای پەروەردگار) تەنها مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەراز و ئەو ماڵاتانەی کە ناوی غەیری خوایان لە کاتی سەربڕیندا لەسەر هێنراوە، لێتانی حەرامی کردووە. جا ئەگەر کەسێك پێویستی ناچاری کرد بەخواردنیان بێ زیادەڕەوی و لە سنوور دەرچوون، ئەوە هیچ گوناهێکی لەسەر نییە. بەڕاستی خوا زۆر لێخۆشبوو و بە بەزەیی و دلۆڤانە."

ئا لەبەر ئەوە مرۆڤی داماو و برسی و لێقەوماو مافی ئەوەی بەسەر کۆمەڵگاوە هەیە کە بژێویی ژیانی بۆ دابین بکەن. کەسێک لەبەر برسێتی و پاراستنی گیانی خۆی دزی کردبێ، ئەوە کەی تەعەدایە؟! ئەگەر تەعەدایەک لەناودا هەبێ، ئەوە کۆمەڵگایە نەک کەسە داماو و ناچارەکە. لە سەردەمی خەلافەتی مندا ساڵێک قاتوقڕی و برسێتی هەموو وڵاتی گرتەوە، منیش بە گوێرەی توانای خۆم بەرگریم لە ژیانی خەڵک کرد، بەڵام خۆ مرۆڤ لەگەڵ چارەنووس و قەزا قەدەردا هیچی پێ ناکرێ، بۆیە ئەگەر کەسێک لە بەر برسێتی و ناچاری دزیی کردبێ، ئەوە تەعەدای لە کەس نەکردووە. مادەم تەعەدایشی نەکردووە، ئیتر مەرجەکانی دەستبڕینەوەی تیا نایەتێ جێ و، نابێ دەستی ببڕدرێتەوە. هەروەها کۆیلەکانی حاتەب، ئەوانە جۆرە تەعدایەکیان لێ کرابوو، برسی کرابوون، بۆیە برسێتی پاڵی بەو داماوانەوە نابوو بچن بۆ پاراستنی گیانی خۆیان، دزی بکەن. لەوانەیە ئێستە بۆت ڕوون بووبێتەوە کە بۆچی سزاکەی حاتەبم دوو هێندە کردەوە؟!

دوای ئەوەی باسی قاعیدەی "الضرورات تبيح المحظورات"م بۆ کردی و وتم: ئەمە قاعیدەیەکە لە قورئان و فەرموودەوە سەرچاوەی گرتووە و ئەمە وای لێ کردم کە دەستبڕینەوە ڕاگرم، ئەوا دەگەینە باسی مەبدەء و قاعیدەیەکی تری کە زۆر گرنگە، هیچی لەم قاعیدەیە کەمتر نییە، ئەویش قاعیدەی: "الحدود تدرأ بالشبهات"ـە، واتە: سزائاییینییەکان بە هۆی شوبهە و گومانەوە جێبەجێ نابن.

من گومانێکی گەورەم لا دروست بوو کە نابێ سزا بەسەر دزدا بسەپێنین، چونکە لەبەر ئەوە نەبوو کە هەر دز بن و حەزیان لە دزی بێ، بەڵکو لەبەر ناچاری دزییان دەکرد. منیش بەم کارەم هیچ یاسایەکی ئاییینیم پەک نەخستبوو. خۆی هەر لە بنەڕەتدا ئەو سزایەیان لەسەر واجب نەدەبوو!

با بگەڕێینەوە سەر قسەی پێشوومان: زۆربەی ئەو شتانەی ئەو ساڵە دزران، ماڵی شەخسی نەبوون، بەڵکو ماڵی گشتی بوون. دزینی ماڵی گشتی لە کاتی فەرحانی و هەرزانیشدا دەستبڕینەوەی تیا نییە، چ جای ساڵی تەنگانە و ناڕەحەتی! چونکە کابرا سووکە گومانێکی هەیە و دەڵێ: "ئەم ماڵە ماڵی گشتییە و، منیش بەشێکم تیای هەیە." پێشتریش باسی ئەمەم بۆ کردی، دەی ئیتر چۆن دەستم بڕیبا؟!

یەکێکی تر لە بنەماکانی ئایین ئەوەیە کە کۆمەڵگا دەبێ دەستەبەر(کەفیل)ی یەکتر بن، بەومانایەی کە ئەگەر یەکێک لەنێو کۆمەڵگادا لێی قەوما و تووشی تەنگانەیەک هات، دەبێ کەسانێک بچن بە دەمیەوە و لە داماوی و بێنەوایی ڕزگاری بکەن، ئەگینا هەموویان گوناهبار دەبن، ئەوکاتە لێقەوماوەکەش دەتوانێ بە ئەندازەی نەفەوتانی خۆی، شت لە کۆمەڵگا بسەنێت.

ساڵی قاتوقڕیەکەیش بێگومان شتێکی کاتی بوو، خەڵکی لێقەوماو و داماو زۆر بوون. دەبوو کۆمەڵگا بەگشتی چاوی لە لێقەوماوان و هەژاران بێ. لە کاتی ئاوادا ناچین بە تایبەت تەماشای حاڵی دزەکە بکەین و لێی بکۆڵینەوە، تا بزانین دەسبڕین دێتە جێ یاخود نا. ئەمە پەیوەندیی بە سزای ئاییینییەوە هەبوو، سزا

ئاییینیەکانیش بە بەڵگەی گوماناوی جێبەجێ ناکرێن، ئەوەندە بەس بوو کە دادوەر بڵێت: لەوانەیە ئەم دزە فەقیری و هەژاری و داماوی ناچاریان کردبێ دزی بکا. ئیتر ئەمە خۆی بۆخۆی دەبێ بە گومان و جێبەجێکردنی سزاکە پەکی دەکەوێ!

- خوای گەورە گەورەمان ڕاوەستاو و سەرکەوتوو بکات. بە خوا تۆ پەی بە شتی وا دەبەی کە هیچ کەسێکی تر پەی پێ نابا.

- سپاس بۆخوا، ئێستە پێم بڵێ، ئەم خاڵەمان کۆتا پێ هێنا و تەواو بۆت ڕوون بووەوە؟

- بەڵێ قوربان! خوای گەورە ڕاوەستاوت بکا.

- تۆیش کوڕم ! یانی ئیتر تەواو ناگەڕێینەوە سەر ئەم خاڵەی کە تەواومان کرد؟

- ئەم باسە دادەخەین قوربان، بەڵام وەک دەزانی، باسێک کۆتا پێ ناهێنین تا دەرگای باسێکی تر نەکەینەوە، چونکە من هەموو ڕۆژێک تۆم دەست ناکەوێ. من بەردەوام بە هیوابووم کە تۆ باسی دوو خاڵم بۆ بکەی، دوو خاڵ کە پەیوەندییان بە سیاسەت و بەڕێوەبردنی کاروباری حوکمڕانی و دەوڵەتەوە هەیە. دوای ئەو دوو خاڵە بە یەکجاری باسەکە دادەخەین و نایەینەوە سەری، من وا دەزانم تا ئەو دوو خاڵەم بۆ ڕوون نەبێتەوە، بە تەواوی سوودم لەم باسانە وەرنەگرتووە.

- دەی کوڕم پرسیاری چی دەکەی بیکە، باسی حوکمڕانییە یا هەر شتێکی تر.

- مەبەستمە لە بارەی ئەو دیوانانەوە پرسیارت لێ بکەم کە داتمەزراندن؟

- لە چ ڕوویەکەوە؟

- چۆن بیرۆکەی دامەزراندنی دیوانەکانت بۆ هات؟ دوای ئەوەی بڕیارتدا، شکڵ و هەیکەلی دیوانەکان چۆن بوون؟

- باشە، هەرچی لە بارەی بیرۆکەکەیە، ئەوە لە ساڵی پانزەیەمی کۆچیدا بوو، ئەو ساڵە ئەبوو هورەیرە لە بەحرەینەوە گەڕایەوە، پێنجسەد هەزار دیرهەمی هێنایەوە. منیش وتارێکم بۆ خەڵک خوێندەوە و وتم:

"سامانێکی زۆرمان بۆ هاتووە، ئەگەر دەتانەوێ بە پێوانە پێتان بدەم، ئەوا بۆتان دەپێوم! ئەگەر دەتانەوێ بە ژمارە بێ، ئەوا بە ژمارە بەشتان دەدەم! ئەگەر بشتانەوێ بە کێشانە بێ، ئەوا بۆتان دەکێشم!"

پیاوێک هەستاو گوتی: "گەورەم! بینووسەوە با بە نووسین بێ."

ئیتر لەو قسەوە منیش بیرۆکەی دامەزراندنی دیوانم بۆ هات و دەستم کرد بە دامەزراندنی دیوان.

ئەمە لەبارەی بیرۆکەوە. لەبارەی چۆنییەتی دیوانەکانیشەوە، ئەوە بەم شێوەی خوارەوە بوو:

**یەکەم دیوانی نامە و نامەبەری(پۆستە و گەیاندن):**

هەر لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتەوە لە مەدینەدا نامەبەر هەبوو. پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ پاشا و سەرۆک و کاربەدەستەکان دەنووسی و بە مۆری تایبەتیی خۆی مۆری دەکردن و بۆی دەناردن، بەڵام دیوانی تایبەتیی بۆ دروست نەکردبوون. لە سەردەمی ئەبوو بەکریشدا هەرچەند نووسەری تایبەتی بۆ نامە دانا، بەڵام دیوانی دانەمەزراند و وەک سەردەمی پێغەمبەرﷺ وابوو، بەڵام من دیوانی تایبەتم بۆ نامە و نامەبەری دانا. حوکوومەتی ئیسلامی بەرفراوان بووبوو، دەبوو دیوانی تایبەت بە نامە و نامەبەری هەبێ بۆ ئەوەی پەیوەندی لەنێوان شارەکان و پایتەختی وڵاتدا کە مەدینەی نوورانی بوو، ئاسان بێت، هەروەها پەیوەندیی نێوان والییەکان ئاسان بێت، دیسان پەیوەندیی نێوان سەرکردە سەربازییەکانی میسر و عێراق و وڵاتی فارس و شام ئاسان بێت. نامەم بۆ موعاوییە نووسی کە لە هەموو شوێنەکان نیشانە دابنێت بۆ ئەوەی نامەبەرەکان سەریان لێ تێک نەچێ- هێماکانیش ئاگر بوون، فەرمانبەری تایبەتیشم بۆ ئەو مەبەستە دامەزراند، سوتەمەنیم بۆ دابین کردن، لەنێوان هەر دوانزە فەرسەخێکدا[1] دیوانێکم دامەزراند، لە هەر دیوانێکدا پاسەوانی تایبەتی و نان و خواردن بۆ پاسەوان و ئالیک بۆ ئاژەڵەکان و ئاویش هەبوو.

---

[1] فەرسەخێک پێنج کیلۆمەترە. دوانزە فەرسەخ شەست کیلۆمەترە.

**دووەم دیوانی بەخشین:**

ئەم دیوانەم بۆ ژماردنی فەرمانبەران و موڵک و ماڵی دەوڵەت دانا و، بۆ نووسینەوەی ئەوەی کە هەر تاکێکی وڵات شایانی چەندە، پێی بدرێ. پێشتر پێم وتی کە لەنێوان خەڵکاندا لە بارەی مووچەوە جیاوازی هەبوو. ئەو کەسانەی کە بەردی بناغەی ئایینی ئیسلام و تێکۆشەر و یارمەتیدەری پێغەمبەر بوون. دەبوو لە کەسانێک کە تازە موسڵمان بوون، یان هەتا دوێنێ دوژمنی ئیسلام بوون، جیاواز بن. نامەوێ هەمووی بە وردی دووبارە بکەمەوە.

**سێیەم دیوانی سەربازی:**

دامەزراندنی ئەم دیوانە پەیوەندیی بە بڵاوبوونەوەی سوپای ئیسلامەوە هەبوو بە وڵاتاندا، دەبوو ناوی هەموو سەربازەکان تۆمار بکرێن، تا بزانین چەندن؟ بزانین چەند سەرباز زیاد دەبێ؟ کاروباریان چۆن ڕێک بخرێت؟ چۆن و چییان پێ ببەخشین؟

ئەم دیوانە چەند مەرجێکی هەبوو:

١- مەرجی سەرباز: دەبوو سەرباز باڵغ، ئازاد، موسڵمان، ساغ و سەلامەت بووایە، توانا بووایە و شارەزایی جەنگیی هەبووایە.

٢- ناوی خۆی و باوک و باپیری و، ماوەی چەندە کە مسوڵمان بووە؟ لەم دیوانەدا ناوی هەموو ئەوانەم بە گوێرەی نزیکێتی لە پێغەمبەرەوە ڕێکوپێک کرد، دوایی کێ زووتر موسڵمان بووە. ئەگەر دوو کەس وەک یەک بایان، ئەوا ئەوەیان کە توانای لاشە و لیاقەی بەدەنی زۆرتر بایە، لە پێشتر بوو. ئەگەر لەوەشدا وەک یەک بووبان، ئەوا بە گوێرەی تەمەن. ئەگەر لەوەش وەک یەک بان، ئەوا بە گوێرەی ئازایەتی لە جەنگدا.

٣- بەخشین بە گوێرەی پێویستی: ئەوەیش بریتی بوو لە بەخشین بە گوێرەی پێویستیی ئەو سەربازە، یارمەتیی ئەو سەربازە، ئەو شوێنەی کە ئەو سەربازەی تێدایە، چونکە جێگاکان جیاوازن، جێگەی خۆش هەیە و جێگەی پڕ زەحمەتیش هەیە.

**چوارەم دیوانی ئیستیفا:**

ئەم دیوانە بۆ ژماردنی ئەو داهاتانە بوو کە بۆ خەزێنەی دەوڵەت دەهاتن، چونکە سەرچاوەکانی داهات جیاواز بوون، سامانی دەوڵەت لە زیادبووندا بوو ــ کاروبار زۆر بوو. ئەمە دەستپێکێک بوو بۆ دروستکردنی وەزارەتی دارایی و ئابووری لە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامیدا. من زۆر گرنگیم بە ئەو داهاتانە دەدا کە دەهاتنە نێو خەزێنەوە، سوور بووم لەسەر پاراستنیان، سوور بووم لەسەر بەخشینیان بەو کەسانەی کە پێیان ڕەوایە. بە خوا من ڕێک وەک سەرپەرشتیکاری هەتیو مامەڵەم لەگەڵ ئەو سەروەت و سامانەدا دەکرد، کەسێک کە سەرپەرشتیاری هەتیو بێ، چۆن چاو دەبڕێتەماڵی هەیتو؟! منیش ڕێک ئەوەندەی پیاوێکی ئاسایی مووچەم هەبوو، ئەو پارانەی کە هیی وڵاتانی گاور و فارس بوون و لە زێڕ دروست کرابوون و نەخشیان پێوە بوو، وەک خۆی هێشتمنەوە و دەستکاریم نەکردن، بەڵام لەسەر ئەو دراوانە وشەی "جائز"م دەنووسی، ئیتر ئەمە نیشانە بوو بۆ ئەوەی کە ساختە نییە. لەوەش زیاتر، سکەمان لێدا و دراوی ئیسلامیمان لە چاپدا، لەسەر دراوەکان وشەی (الحمدلله)مان هەڵکۆڵی، لەسەر هەندێکیشیان (لا اله الا الله)مان هەڵکۆڵی!

ئەمە بە کورتی باسی دیوانەکان بوو، هیچی تر هەیە بتەوێ بیزانی؟!

ـ قوربان زۆر بە جوانی باست کردن، هیچم نەماوە بیپرسم، تەنیا یەک پرسیار نەبێ.

ـ چییە؟

ـ خوێندوومەتەوە حوکوومەتی ناوەندی کە لە مەدینە بووە، خۆی بە تەنیا هەڵدەسا بە بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری، هیچ حوکوومەتێکی تر و ویلایەتێکی تر بەشدار نەبووە. لە سەردەمی تۆدا کاروباری دەوڵەت وای خواستووە کە بڕیار هەر بە دەست ناوەندەوە بێت! تەنانەت تۆ ڕێگەیەکت گرتبووە بەر کە نموونەی لە مێژوودا نییە و شۆڕ بووەتەوە بۆ کاروباری شارەکان، بۆ نموونە موسڵمانان لە شارە تازەکاندا بۆ دروستکردنی شوێنێک بۆ بووژانەوەی هەژاران، مۆڵەتیان لە تۆ خواستووە! لەم بارەوە گەورەم چی دەفەرمووێ؟

- ئەمە بە جۆرێک لە جۆرەکان دروستە، بەڵام زێدەڕەوییشی تیایە و دەتوانم بە ئاسانی ڕەتی بکەمەوە.

- چۆن؟

- لە بارەی ئیشرافی پایتەخت بە سەر شارەکانەوە و، بەڕێوەبردنی شارەکان، ئەوە موهیممەی خەلیفە و ڕاوێژکارانی خەلیفەیە، خەلیفە ئەگەر بڕیارێکی دروستی لا بێ و ئەو بڕیارە دەرنەکا، ئەی چی بکا؟! ئەگەر پێشگیری لە خراپە و کاری کرێت(منکر) نەکا، ئەی چی بکا؟! هەموو سەرۆکەکانی ئەم دونیایە ئەمە ناکەن؟ ئەی تەنانەت خێڵ و هۆزەکان سەرۆک و گەورەیان نییە و هەموو ورد و درشتێکی خێڵ و هۆزەکە نایەتەوە لای ئەو سەرۆکە؟ کەس بەبێ ئەوانە بڕیار دەدا؟

- بەڵێ قوربان وایە کە جەنابت دەیفەرموویت.

- منیش هەر ئەمانەم کردووە، بەڵام من چاودێرم زیاتر بووە، بە وردی بە کاروبارەکاندا چوومەتەوە، چونکە هەموو ئەو کاربەدەستانە لە بەردەم مندا لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێ و منیش لای خوا لێپرسینەوەم لەگەڵدا دەکرێ. هەڵەی ئەوان پێش ئەوان، هەڵەی منە. ئەگەر ئەوان هەڵەیەکیان هەبێ، من ناتوانم پۆزش بێنمەوە و بروبیانوو دروست بکەم. دەی ئیتر چۆن من لەسەر ئەوان لێپرسینەوەم لەگەڵدا بکرێ، بەڵام من نەزانم چی دەکەن و چی ناکەن؟

لە بارەی ئەوەی کە گوایە والییەکان تەنانەت دەسەڵاتی دروستکردنی خانوویەک یان ڕێگەوبانێکیان نەبووە، ئەوە هیچ ڕاست نییە، دوورە لە لۆژیک و ڕاستیەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە من ڕام وا بوو کە شارەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و شێوازێکی نوێ و شارستانییەتێکی مۆدێرن دروست بکرێن، وەک لە دروستکردنی شاری بەصرەدا وامان کرد. من والییەکانم سەرپشک کردبوو کە چی بە باش دەزانن بیکەن. لەوانەیە قسەکە لەوێوە سەرچاوەی گرتبێ کە ئەگەر والییەکان هەڵە و کەموکوڕییەکیان لە بیناسازیدا هەبا، من لێپرسینەوەم لەگەڵدا دەکردن و هەڵەکانم پێ ڕاست دەکردنەوە! لە بەرابەریشدا پاداشی ئەو والییانەم دەدایەوە کە لە

کارەکانیان سەرکەوتوو بوون. من چۆن پاداشی کەسێک نەدەمەوە کە برسیەک تێر بکا، بێلانە و یانەیەک نیشتەجێ بکا و نەهێڵێ ئاربێشە و کێشەکانیان بگات بە من؟!

ئەبوو عوبەیدە نامەیەکی بۆ من نووسی و ڕاوێژی بە من کرد لە بارەی دروستکردنی چەند دەروازەیەکەوە لە پشتەوەی دوژمن. منیش وەڵامم دایەوە و وتم:
"تۆ خۆت لەوێی و ئاگاداری کاروباری و، من لێرەوە هیچ نازانم. تۆ دوژمنەکان دەبینی و، من نایانبینم، چاوەکانت هەموو شتێکت بۆ باس دەکەن!"

دەی برا لەمە زیاتر چیم بکردایە؟! ئەو ڕاوێژی بە من دەکرد و چاوەڕێی فرمانی من بوو. منیش ئەوم سەرپشک کرد و کارەکانم بە خۆی سپارد! وتم: "تۆ لە من شارەزاتری!"

جارێکیش نامەیەکم بۆ موحەممەدی کوڕی سەلەمە نووسی و هانم دابوو بۆ تێفکرین و بیرکردنەوە لە شتەکان و، پاشان خۆی بڕیار بدات، بۆم نووسیبوو:
"بەهێزترین کەس لە بڕیارداندا ئەو کەسەیە کە کەسی نییە پرسی پێ بکات و خۆی بڕیارێک دەدا!"

دەی ئەمە هاندان نییە بۆ ئەوەی ئەگەر شتێکی نوێ هاتە پێشەوە، خۆی بیری لێ بکاتەوە و پاشان بڕیاری لەسەر بدا؟!

- بەڕەودڵلا قوربان.

- با شتێکی تریشت پێ بڵێم: کەرێکم هەبوو، سواری کەرەکەم بووم و ملی ڕێگەم بەرەو شام گرتە بەر. موعاوییەی کوڕی ئەبوو سوفیانم پێ گەشت، موعاوییە لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکدا و بە سەنسەنە و تەنتەنەوە بەڕێ کەوتبوو، هەر منی بینی لە کەژاوەکەی دابەزی و وتی: "سڵاوی خوا لە گەورەی ئیمانداران!"

منیش وەڵامم نەدایەوە و ملی ڕێگەم گرتە بەر، چونکە ڕقم لەو سەنسەنە و تەنتەنەیە بوو. عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: "ئەوە بۆ ئاوا لەگەڵ موعاویەدا دەجوڵێیتەوە؟ ئا وەڵامی بدەرەوە!"

منیش لام کردەوە بە لای موعاوییەدا و وتم: "ئەوە ئەم هەمووە سەنسەنە و تەنتەنەیە هیی تۆیە؟!"

وتی: "بەڵێ."

منیش وتم: "خەڵکیش هەژارن و ڕۆژانە دێنە بەر دەرگای تۆ و داوای شتت لێ دەکەن؟"

وتی: "بەڵێ."

منیش وتم: "قوڕبەسەرت! دەی بۆ وا دەکەی؟!"

وتی: "ئێمە لە شوێنێکین کە دوژمنی زۆر لێیە، پڕە لە جاسوس، ئەگەر ئاوا نەکەین و سەرباز و چەک و چۆل لەگەڵ خۆماندا هەڵنەگرین، جاسوسەکان خەبەرمان لێ دەدەن و دوژمن بە چاوێکی سووک سەیرمان دەکەن و حسابمان بۆ ناکەن. بۆیەیش دەرگاوانمان هەیە لەبەر ئەوەی خەڵکی ئاسایی بە چاوێکی سووکەوە سەیرمان نەکەن. من کاربەدەستی تۆم، ئەگەر بفەرمووی زیاتری بکەم، ئەوا زیاتری دەکەم؛ ئەگەریش بفەرمووی وەک خۆی بێ، با وەک خۆی بێ؛ ئەگەریش دەفەرمووی کەمی بکە، ئەوا کەمی دەکەم."

منیش وتم: "لە بارەی هەرشتێکەوە پرسیارت لێ بکەم خۆتی لێ دەدزیتەوە! ئەگەر ئەم قسانەت ڕاست بن، ئەوە تۆ کەسێکی ژیری؛ ئەگەر درۆیش بن، ئەوە فرتوفێڵت بەکار هێناوە. نە فرمانت پێ دەکەم، نە نەهیت لێ دەکەم!"

ئێستە تۆ وانازانی کە یەکەم جار بە کاری خۆم هەستاوم؟! لێپرسینەوەم لە موعاوییە کرد، دواتریش ئەوم سەریشک کرد، چونکە وتم: نە فرمانت پێ دەکەم نە نەهیت دەکەم، یانی خۆت چی بە باش دەزانی وا بکە!

- بەڕەوەڵڵا قوربان وایە! تۆ بە تەواوی بە کاری خۆت هەستاوی. دواتریش سەرپشکت کردوون بۆ ئەوەی چی بە باش دەزانن بیکەن.

- بەڵێ. وەک دەزانی من وام کردووە.

- بە خوا چاکت کردووە.

- ئەم باسە تەواو؟

- بەڵێ گەورەم، تەواو.

- هیچی تر هەیە پرسیاری لەبارەوە بکەی؟

- بەڵێ گەورەم! خاڵێک ماوە، دوای ئەم خاڵە بە یەکجاری باسی سیاسەت کۆتایی پێ دەهێنین و ناچینەوە سەر سیاسەت.

- چییە؟

- ئەو کارانەی کە لە سەردەمی خەلافەتی خۆدتا کردووتن و هێشتا بەردەوام تا ئێستایش ماون.

- وەک چی؟

- پێنج شتت بۆ باس دەکەم: دەرکردنی جولەکە لە خەیبەر، دانانی ساڵی کۆچی. هێنانەوەی مەقامی ئیبراهیم بۆ شوێنی خۆی، کۆکردنەوەی خەڵک بۆ ئەوەی نوێژی تەراویح بە کۆمەڵ بکەن، گەورە کردنی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ.

- بەڵێ ئەوانە هەمووی من کردوومن، چ شتێکت لەبارەی ئەمانەوە دەوێ؟

- دەمەوێ بزانم چۆن ئەمانە ڕوویان دا؟

- باشە! بۆت باس دەکەم، لە کوێوە دەست پێبکەین؟

- دەرکردنی جولەکە لە خەیبەر، چۆن و لەبەر چی؟

- باشە! با دەست پێبکەین. پێغەمبەر ﷺ خەیبەری بە هێزی چەک ئازاد کرد، شەڕ و کوشت و کوشتار ڕووی دا، ئیتر خەیبەر بووبە دەسکەوت، دەسکەوتیش پێنج یەکی بۆ پێغەمبەر ﷺ بوو. دوایی بانگی کردنەوە و پێی فەرموون:

"ئەگەر حەز دەکەن، هەرکەس لەسەر باخ و بێستانی خۆی دەهێڵمەوە و کاری تیا بکا، بەڵام دەبێ بەربەنیوەیی بێ، ئێمەیش هەرکات بمانەوێ، دەتوانین دەرتان بکەین!"

ئەوانیش ڕازی بوون...

پێغەمبەرﷺ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ڕەواحەی دەنارد بەروبوومەکەی بە یەکسانی دابەش دەکرد. دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ، ئەبوو بەکریش هەمان ڕێکەوتنی پێغەمبەریﷺ نوێ کردەوە، پێی وتن: "بەربەنیوەیی کار بکەن، هەرکات بمانەوێ دەرتان دەکەین." دوای ئەبوو بەکریش منیش هەمان ڕێککەوتنم لەگەڵدا نوێ کردنەوە!

- ئەی دواتر چی بووە هۆی دەرکردنیان؟

- پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشیی سەرەمەرگدا فەرمووی: "لە جەزیرەی عەرەبی دوو ئایین پێکەوە کۆ نابنەوە!"

ویستم ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر جێبەجێ بکەم، بانگم کردن، وتم: "هەرکەس لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێککەوتنی کردووە، با ڕێکەوتننامەکەی بێنێ بۆی تازە بکەمەوە و وەک خۆی بمێنێتەوە، هەرکەسیش ڕێکەوتنی نەکردووە، با خۆی ئامادە بکا بۆ ڕۆشتن!"

ئەوانەی هیچ ڕێککەوتنێکیان نەبوو، دەرمکردن؛ ئەوانەیشی ڕێککەوتنیان هەبوو، مانەوە.

پاش ماوەیەک عەبدوڵلای کوڕی عومەر، زوبەیری کوڕی عەوام، میقدادی کوڕی ئەسوەد ڕۆشتن بۆلایان بۆ بەشکردنی بەروبووم، پاش ئەوەی گەشتنە ئەوێ هەریەکەو بەرەو ئەو جێگەیە ڕۆشت کە بۆی دانرابوو، دوای ئەوەی شەو داهات، هێرشیان کردە سەر عەبدوڵلا و دەستێکیان شکاند و بەستیانەوە! بەیانی میقداد و زوبەیر عەبدوڵلایان بە بەسراوی دیبوو، کردیانەوە و هێنایانەوە بۆ مەدینە.

هەر کە هەواڵەکەم بیست، وتم: "ئا ئێستا ئیتر دوو ئایین لە جەزیرەی عەرەبدا کۆ نابنەوە!"

دوایی هاوارم کرد و وتم: "الصلاة جامعة." خەڵک کۆبوونەوە، چوومە سەر مینبەر وتم:

"خەڵکینە! پێغەمبەرﷺ لەگەڵ جولەکەدا لەمەڕ خەیبەر ڕێکەوتنی کردبوو، خاڵێکی ئەوە بوو هەر کات بمانەوێ، دەریان دەکەین. هەر خودی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "دوو ئایین لە جەزیرەی عەرەبدا کۆ نابنەوە." ئێستە چەند کەسێکیان تەعەدایان لە عەبدوڵلا کردووە، دەستیان شکاندووە، بەستوویانەتەوە، ئێستە دەمەوێ دەریانبکەم و فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ جێبەجێ بکەم کە فەرمووی: "دوو ئایین لە جەزیرەی عەرەبدا کۆ نابنەوە." ئیتر دوای ئەوە دەرمکردن.

- باشت کرد قوربان! ئەوانە کارێکی خراپیان کردبوو، بەڵام پێم بڵێ ئەگەر وایان نەکردایە، دیسان دەرت دەکردن؟

- لەوانەیە! چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەرمﷺ هێنایەدی. خۆی ویستی ئەو کارە بکا، بەڵام ئیتر نازانم لەبەر چی نەیکرد؟ منیش وەک سەردەمی پێغەمبەرﷺ لەگەڵیان جوڵامەوە، وەک ئەبوو بەکر، بەڵام خوای گەورە ویستی ئارەزووەکەی پێغەمبەر بێنێتەدی و، ئەوانە بە شەق بکرێنە دەرەوە.

- بە خوا چاکتان کرد، کورە ئەوانە لە هەرکوێیەک بن، هەر ئاژاوەچی و فیتنە و فەسادن، ئێمەیش فرمانمان پێکراوە هەتا ئەوان باش بن، ئێمەیش باش بین.

- بەڵێ وایە.

- دەی قوربان با واز لەوان بهێنین و باسی شتێکی تر بکەین. چۆن چۆنی مێژووی کۆچیت دانا؟

ـ پیاوێک لای من سکاڵای لە پیاوێکی تر کرد، وتی: "قەرزێکم لایەتی، کاتی دانەوەی هاتووە و نایداتەوە." نووسراوێکیشی پێبوو، نووسرابوو: "دەبێ مانگی شەعبان قەرزەکە بدرێتەوە." منیش وتم: "کام شەعبانە؟ شەعبانی ئێستا یان هیی پار یان هیی ساڵی داهاتوو؟"

ئیتر بیرۆکەی دانانی ساڵم بۆ هات. هاوەڵانم کۆ کردەوە و باسەکەم لەلا درکاندن، وتم: "با ئێمەیش سەرە ساڵێکمان هەبێ، کاتێکیش نامە بۆ والی و کاربەدەستان دەنووسین، ساڵەکەی تیابێ و بزانین چ ساڵێکە."

یەکێکیان وتی: "با سەری ساڵی فارسی بکەین بە مێژوو بۆ خۆمان!"

سەری ساڵی فارسەکان بەپێی هاتنە سەر تەختی پاشاکانیان بوو، من ئەمەم بەلاوە ناخۆش بوو.

یەکێکیان وتی: "با ساڵی ڕۆمی بێت."

ساڵی ڕۆمی لەو ساڵەوە دەست پێ دەکا کە عیسا پێغەمبەر لە دایک بووە. ئەم ڕایەم پەسەند کرد، بەڵام وتم: "من دەیبەستم بە پێغەمبەرەوە و ساڵی لە دایک بوونیشی ناکەم بە سەری ساڵ."

یەکێک وتی: "با ساڵی بوونە پێغەمبەر، سەری ساڵ بێ."

یەکێکی تر وتی: "با ساڵی وەفاتی بێ."

منیش وتم: "نەخێر، با ساڵی کۆچکردن بکەین بە سەری ساڵی خۆمان، ئەو ساڵەی کۆچ ڕووی دا، هەق و ناهەق لە یەکتر جیا بوونەوە، دەوڵەتی ئیسلام لە دایک بوو."

خەڵکەکە ئەم ڕایەیان لا پەسند بوو، منیش بڕیارم لەسەر دا.

ـ ئەی قوربان! بیرۆکەی دانانی مێژووی کۆچی تەنیا بۆ ئەوە بوو کە مێژووی فارس و ڕۆم بەکار نەهێنن یان لە بەر شتی تریش بوو؟

- ئەگەر هەر لەبەر ئەوەیش بێ، کەم نییە و کارێکی باشە، بەڵام شتی تریش هەبوو.

- وەک چی؟

- خوای گەورە مانگی کردووە بە کاتژماردن بۆ خەڵک. بە گوێرەی گۆڕانی مانگ، خواپەرستی خۆیان ئەنجام دەدەن، مامەڵە و کار و کاسبی دەکەن. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞ﴾البقرة: ١٩٧ واتە: "حەجکردن لە چەند مانگێکی دیاریکراودا دەبێت."

پێویستە خەڵک لەسەر ئەم مێژووە کار بکات بۆ ئەوەی مانگەکانی لا ڕوون بێت!

دیسان خوای گەورە لە بارەی ڕەمەزانەوە دەفەرمووێ: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ﴾ البقرة: ١٨٥ واتە: "هەرکەسێک لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی، با ئەو مانگە بەڕۆژوو بێ."

ئەم ڕۆژووگرتنە خواپەرستییەکی تایبەتە و لە کاتێکی تایبەتدا دەکرێ، ئەو مانگەیش دەبێ بە گوێرەی سەرەتای دەرکەوتنی مانگ تا کۆتاییهاتنی مانگ بێت، کە ئێستا وا باوە پێی دەڵێن: "مانگی عەرەبی؛" ئەو مانگەی کە بووەتە بنەمای مێژووی ئیسلامی.

دیسان بە مانگی عەرەبی ماوەی عیددەی ژنی شوومردوو، ماوەی تەڵاق، کەفارەتی درێژخایەن وەک کەفارەتی زیهار و کەفارەتی کوشتنی بە هەڵە، دەزانرێ.

ئا لەبەر ئەوە مانگەکانی حەج، ڕۆژوو، جەژنەکان و، هەموو کاتەکانی تر بە گوێرەی دەرکەوتنی مانگی یەکشەوە و تەواوبوونی مانگ دەزانرێت، نەک بە گوێرەی خۆر.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾ التوبة: ٣٦ واتە: "بێگومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوانزە مانگە، لەکتێبی خوادا (لە لوح

المحفوظ)دا دیاریکراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، چوار مانگی بە حەرام داناوە(واتە جەنگ تیایدا نابێت بەرپا ببێت.) هەر ئەوەیە ئایین و بەرنامەی ڕاست و دروست."

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێ هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە خواپەرەستیەوە هەیە، بە گوێرەی مانگی ساڵی کۆچی بێت نەک بە گوێرەی مانگی ساڵی فارسی یان ڕۆمی، هەرچەند ساڵی ئەوانیش هەر دوانزە مانگە، بەڵام مانگی ئەوان جاری وا هەیە سی ڕۆژە و جاری وا هەیە زیاتر لە سی یان کەمتر لە سی ڕۆژە. مانگەکانی ساڵی کۆچی هیچیان لە سی ڕۆژ زیاتر نین، هەرچەند جارجار مانگی وا هەیە لە سی کەمترە و دەبێتە بیست و نۆ ڕۆژ، ئەو مانگانەیش کە بیست و نۆ ڕۆژن دیاری کراو نین، بەڵکو بە گوێرەی کەم و زیادی مانگ ئەوانیش کەم و زیاد دەبن.

بیستوومە لە ئایینەکانی پێش ئیسلامیشدا هەر بە گوێرەی ئەو مانگە کاریان کردووە کە بەپێی دەرکەوتن و تەواوبوونی مانگ بووە نەک بەو مانگەی کە پەیوەندیی بە خۆرەوە هەبووە! بەڵام دواتر شوێنکەوتەی ئەو ئایینانە بە ئارەزووی خۆیان دەسکاریی ئایینەکەیان کردووە و زیاد و کەمیان لێ کردووە. تەنانەت دەسکاریی تەورات و ئینجیلیشیان کردووە و ئەو دوو کتێبە وەک خۆیان نەماونەتەوە، جا دەسکاریی ئەو دوو کتێبە پیرۆزە کرابێ، ئیتر چۆن دەسکاریی ساڵپێو و ڕۆژژمێر ناکەن؟!

ئەو ساڵپێو و ڕۆژژمێرەی کە خوای گەورە پێشتر بۆ ئەوان و دواتریش بۆ ئێمەی دیاری کردووە، باشترین و تەواوترین ساڵپێو و ڕۆژژمێرە، دوورە لە دڵەڕاوکێ و دوودڵی و دڕدۆنگی، چونکە مانگ بە چاو دیارە، باشترین شتێکیش کە ببێتە مایەی دڵنیایی، ئەوەیە کە بە چاو دیار بێ، هەر لەبەر ئەوەیش ناونراوە هیلال. وشەی هیلال لە زمانەوانیدا یانی ئەو شتەی کە مرۆڤ لای ڕوون و ئاشکرا بێ، ئیتر بە چاو بیبینێ یان بە گوێ بیبیسێ.

- ڕاست دەفەرمووی قوربان!

- دەی کوڕم! ئێستە وەڵامی پرسیارەکەت بە ڕوونی وەرگرتەوە؟

- خوا خێرت بۆ بنووسێ! سەر بەزیادەوە وەڵامم وەرگرت.

- ئامین، خوا خێری تۆیش بنووسێ کوڕم!

ــ ئێستە مۆڵەتم دەدەی لێت بپرسم کە مەقامی ئیبراهیم پێغەمبەر چۆن هێنراوەتە ئەو شوێنەی خۆی؟

- بەڵێ کوڕم! پێشتر مۆڵەتم دای لێم بپرسی، گوێ بگرە با پێت بڵێم.

- دەی قوربان فەرموو! هەموو گیانم وەک گوێ چاوەڕێی بیستنە.

- هەتا خەلافەتی من مەقامی، ئیبراهیم لکا بوو بە دیواری کەعبەوە، من بە خەڵکم وت:

"سوێند بە خوا! من دەزانم جێگەی ئەم مەقامی ئیبراهیمە ئێرە نەبووە، کاتی خۆی قورەیشییەکان لە ترسی لافاو هێنایانە بن دیواری کەعبە، ئەگەر جێگەکەی خۆییم بزانیایە دەمبردەوە بۆ ئەوێ." لەو کاتەدا پیاوێکی بنەماڵەی عائیدی کوڕی عەبدوڵلای مەخزومی هەستاو وتی: "گەورەم! بە خوا من شوێنە ڕاستەقینەکەی خۆی دەزانم. کاتێ قورەیش ئەم بەردەیان هێنایە ئێرە کە تۆ دەیبینی. من بە گوریسێک جێگەکەم پێوا، سەرێکی گوریسەکەم لای ڕوکنی بەیت و دەرگای بەیت دانا، دوایی ئەو شوێنەی کە گەشتە مەقامەکە، گرێیەکم لەو شوێنەدا، ئێستەش گوریسەکەم ماوە و گرێکەیشی پێوەیە!"

- ئەی تۆ چیت کرد قوربان؟

- وتم: "گوریسەکەم بۆ بێنن." شوێنەکەم پێ پێوا، جێگەی ڕاستەقینەی مەقامی ئیبراهیممان دۆزیەوە. مەقامم هێنایەوە شوێنی ڕاستەقینەی خۆی. وتم: "خەڵکینە! خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ البقرة: ١٢٥، واتە: 'مەقامی ئیبراهیم کە شوێنی تایبەتی خواپەرستی ئەو بووە، بیکەنە جێگای خواپەرستی و نوێژ.' "

- دەی قوربان مادەم وایە، بۆچی پێغەمبەرﷺ ئەو مەقامەی نەهێنایەوە شوێنی خۆی؟

- پرسیارێکی جوانە! وەڵامەکەی لای عومەری کوڕی خەتتابە، گوێ بگرە:

بۆچی پێغەمبەرﷺ ئەو مەقامەی نەهێنایەوە جێگەی خۆی؟ ئەوە لەبەر ژیریتی و زانایی و دانایی پێغەمبەری خوا بوو. دەک خۆم و دایک و باوکم بە قوربانی بین. عایشە شتێکی گێڕاوەتەوە نەک تەنیا پەیوەندیی بە مەقامەوە هەیە، بەڵکو پەیوەندیی بە تەواوی کەعبەوە هەیە، پێغەمبەرﷺ بە عایشەی فەرمووە:

"عایشە! ئەگەر لە بەر خزم و هۆزەکەت نەبوایە کە تازە موسڵمان بوون و هێشتا لە سەردەمی نەفامیەوە نزیکن، ئەوا فرمانم دەکرد کەعبە بڕوخێنن. ئەو بەشەی کەعبە کە تەرک کراوە، ئەویشم دەخستەوە سەر کەعبە. لاشیپانەی دەرگای کەعبەم دەخستە سەر زەوی. دوو دەرگام بۆ دروست دەکرد، دەرگایەک لە ڕووی ڕۆژهەڵات و دەرگایەک لە ڕوی ڕۆژئاوا، لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئیبراهیم دایڕشت چاکم دەکردەوە. خزمەکانی تۆ دوای ئەوەی لافاوەی کەعبەی ڕوخاند، ئەوەندە پارەی حەڵاڵیان نەبوو کەعبەی بە تەواوی پێ چاک بکەنەوە، بەو شێوەیەی کە ئێستا تۆ دەیبینی، چاکیان کردەوە."

عایشە وتی: "بۆچی ئێستا دەرگاکەی بەرزە و لەسەر زەوی نییە؟"

- فەرمووی: "لەبەر ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان هەرکەسیان بیەوێ بچێتە ناو کەعبەوە و هەرکەسیشیان نەویست نەچێتە ناو کەعبەوە. لەبەر ئەوە نەبووایە کە دڵیان شتێ دەکا، ئەوا جەدریشم دەخستە ناو کەعبەوە، مەبەستی لە جەدر حیجری ئیسماعیل بوو."

- کەواتە شێوەی کەعبە لە سەردەمی ئیبراهیمدا وەک ئێستا نەبووە؟

- بەڵێ وەک ئێستا نەبووە، وەک ئەوە بووە کە پێغەمبەرﷺ باسی کردووە. دوو دەرگای هەبووە، حیجری ئیسماعیل لەناو کەعبە بووە، بەڵام لە سەردەمی قورەیشدا لافاو کەعبەی ڕوخاند. قورەیشییەکان ویستیان کەعبە نۆژەن بکەنەوە، بڕیاریاندا

تەنها پارەی حەڵاڵ بۆ نۆژەنکردنەوەی کەعبە بێنن، پارەیەک کە بە سووخۆری و فرۆفێڵ و حەرام پەیدا نەبووبێ. هەرچییان هەبوو کۆیان کردەوە، بەڵام بەشی نەکرد؛ بەم شێوەی ئێستا نۆژەنیان کردەوە. پێغەمبەر ویستی کەعبە بڕوخێنێ و وەک سەردەمی ئیبراهیمی لێ بکاتەوە، بەڵام خەمی ئەوەی هەبوو دڵی ئەو تازە موسڵمانانەی کە لە دوای فەتحی مەککە هاتبوونە نێو بازنەی ئیسلامەوە بێشێ. ئا لێرەوە زانایی و دانایی و لەسەرخۆیی پێغەمبەر دەردەکەوێ. پاڵنان بە خراپەوە لە کردنی چاکە لە پێشترە(درء المفاسد مقدم على جلب المصالح.) ئەو پێی وابوو ئەو چاکەیە خراپە و دڵئێشانی بە دوادا دێت، بۆیە وازی لێ هێنا. مەقامیش لەو جێگەیەی مایەوە و دەسکاریی نەکرا تا سەردەمی خەلافەتی من.

ئەبوو بەکریش بۆیە دەسکاری نەکرد، چونکە ماوەی خەلافەتی ئەو دوو ساڵ و نیو بوو. ئەو دووساڵ و نیوە خەریکی جیهاد بوو. ماوەیەک لەگەڵ ئەوانەدا جەنگا کە لە ئیسلام وەرگەڕابوونەوە، ماوەیەکیش خەریکی ڕزگارکردنی چەند ناوچەیەک بوو. جیهادکردن لە نۆژەنکردنەوەی کەعبە گرنگتر بوو.

- ئەی قوربان خۆ لە ماوەی خەلافەتی جەنابتدا ئەو نزیکییە لە سەردەمی نەفامیدا نەما کە پێغەمبەرﷺ لەبەر ئەوە کەعبەی نۆژەن نەکردەوە، تۆ بۆ کەعبەت نۆژەن نەکردەوە؟

- لە بارەی مەقامی ئیبراهیمەوە کردم، بەڵام ئیتر سەبارەت بە خودی کەعبە بۆم ڕێک نەکەوت.

- خوای گەورە کارەکانت لێ وەربگرێ.

- ئامین خوایە گیان، خوا کارە باشەکانی تۆیش وەرگرێ کوڕم!

- دەی قوربان ئێستە کاتی ئەوە هاتوە کە باسی چۆنییەتیی نوێژی تەراویحم بۆ بکەی، چۆن ئەو نوێژەت کرد بە نوێژی بە کۆمەڵ؟

- پێغەمبەر چەند شەوێک بەرنوێژیی نوێژی تەراویحی بۆ کردین، دواتر نەدەهاتە مزگەوت و لە ماڵدا بە تەنیا نوێژی دەکرد. هۆکاری ئەوەمان لە پێغەمبەر ﷺ پرسی، فەرمووی:

"ترسام خوای گەورە تەراویحتان لەسەر فەرز بکات و ئێوەیش نەتوانن بیکەن."

هەتا پێغەمبەر لە ژیاندا مابوو، ئێمە هەرکەس بۆ خۆی و بە تاک تاک نوێژی تەراویحمان دەکرد. لە سەردەمی ئەبوو بەکریشدا هەروا بوو، بەڵام لە سەردەمی خەلافەتی مندا، من شەوێکی ڕەمەزان بۆ مزگەوت دەڕۆشتم، تەماشام کرد خەڵک لەناو مزگەوتدا پرژوبڵاون، چەند کەسێک بە تاک تاک نوێژیان دەکرد، لەولاوە یەکێ نوێژی دەکرد و چەند کەسێک لە پشتیەوە بە کۆمەڵ نوێژیان دەکرد، لە لایەکی تریش بەو جۆرە، من پێم ناخۆش بوو لە یەک مزگەوتدا خەڵک ئاوا پرژوبڵاو بن و هەرکەس بۆ خۆی بێ. لە دڵی خۆمدا وتم: "چەند باشە ئەو خەڵکە هەمووی بە یەکەوە لە پشت سەری قورئانخوێنێکی بە ئەزموونەوە نوێژەکەیان بکەن!"

پاشان فرمانم کرد بە ئوبەیی کوڕی کەعب بەرنوێژییان بۆ بکا و، هەموویان بە یەکەوە نوێژی تەراویح بکەن، ئیتر ئاوای لێ هات کە دەیبینی.

- خوای گەورە پاداشتی گەورەی ئیمانداران بداتەوە و، لەگەڵ پێغەمبەر و ئەبوو بەکردا لە بەهەشتدا کۆی بکاتەوە، وەک چۆن ئێمەی لە نوێژدا کۆ کردەوە!

- ئامین خوایە ئامین! خوا تۆیش بە بەهەشت و دیداری حەزرەت ﷺ شاد بکا.

- ئێستە گەشتینە کۆتا پرسیار و، ئیتر باسی حوکم و سیاسەت و والی و ئەمانە کۆتایی پێ دێت و، بە توتووش ناچینەوە سەری.

- مەبەست لە پرسیاری کۆتایی فراوانکردنی مزگەوتە؟

- بەڵێ.

- دەی گوێ بگرە.

- فەرموو قوربان، گیانم لاتە.

- خەڵکی مەدینە زۆر بوو، مزگەوتی پێغەمبەرﷺ جێگەی ئەو حەشاماتەی نەدەکردەوە. منیش بیرۆکەی ئەوەم بۆ هات کە مزگەوت گەورە بکەم، بیرم دەکردەوە کە چۆن و لەکوێوە دەست پێبکەم، وای بۆ چووم کە دەبێ ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ و ماڵی عەبباسی مامی پیغەمبەر تێک بدەم و بیدەمە دەم مزگەوت، دوایی وتم: "ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەر ئەوە گونجاو نییە و نابێ دەستکاری بکرێن." بۆ ئەو مەبەستە هەستام ماڵی چەند هاوەڵێکم کڕی کە ماڵەکانیان نزیکی مزگەوت بوون، ماڵی عەبباسم هێشتەوە، ڕۆشتم بۆلای عەبباس و وتم:

"باوکی فەزڵ! مزگەوت بچووکە و جێگەی خەڵکی تیا نابێتەوە، چەند خانوویەکم لە دەوروبەری مزگەوتدا کڕیوە، دەمەوێ بیدەمە دەم مزگەوت و فراوانی بکەم، تەنیا خانووەکەی تۆ و خانووی خێزانەکانی پیغەمبەر ماوە، سەبارەت بە خانووی خێزانەکانی پیغەمبەر ئەوە نابێ دەستکاری بکرێن، دەمێنێتەوە خانووەکەی تۆ! پێم بفرۆشە با بیدەمە دەم مزگەوت!"

وتی: "ئیشی وا ناکەم."

منیش وتم: "سێ بژاردە دەخەمە بەردەمت، کامیانت لا پەسەندە، من پێی ڕازیم.

یەکەم: بە چەندە پارە دەتەوێ، پێم بفرۆشە.

دووەم: لە کوێی مەدینەدا حەزت لێیە، پارچە زەوییەک دیاری بکە، دەیکڕم و دەیکەم بە خانوو بۆت.

سێیەم: بیکە بە خێر بۆ مزگەوت و موسڵمانان، با مزگەوت فراوان بکەین."

وتی: "هیچیان ناکەم."

منیش وتم: "با لەنێوان من و تۆدا داوەرێک هەبێ."

وتی: "باش! با ئوبەی کوڕی کەعب داوەری بکا."

من و عەبباس ڕۆشتین بۆلای ئوبەی و چیرۆکەکەمان بۆ گێڕایەوە، وتمان: "تۆ داوەر بە، هەردوو لامان بە داوەریی تۆ ڕازین!"

ئوبەی وتی: "ئەگەر حەز بکەن، ئەوا فەرموودەیەکی پێغەمبەرتان ﷺ بۆ دەگێڕمەوە."

وتمان: "فەرمووا!"

وتی: "پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا فەرمانی کرد بە داوود فەرمووی: 'بڕۆ خانوویەک دروستە بکە با یادی منی تیا بکرێ.' داوود نەخشەی خانویەکی کێشا، سووچێکی خانووەکە دەکەوتە بەر خانووی پیاوێکی بەنی ئیسرائیلی، بە پیاوەکەی وت: 'ئەم خانووەم پێ بفرۆشە!' پیاوەکە ڕازی نەبوو. داوود لە دڵی خۆیدا وتی: 'بەزۆر لێی دەسەنم.' خوای گەورە سروشی بۆ داوود ناردو فەرمووی: 'داوود! من فرمانم بە تۆ کردووە کە خانوویەک دروست بکەی یادی منی تیا بکرێ. ئێستە تۆ دەتەوێ ماڵێکی داگیرکراو بکەی بە خانوو بۆ من؟! من هیچ شتێ لە هیچ کەس داگیرناکەم! ئەوا سزات دەدەم، سزاکەیشت ئەوەیە کە ئیتر نامەوێ تۆ خانووم بۆ دروست بکەی!' داوود وتی: 'دەی خوایە گیان! با سولەیمانی کوڕم بۆت دروست بکا.' خوای گەورە فەرمووی: 'باشە، با کوڕەکەت دروستی بکا.' "

منیش بە یەکجاری ڕووم کردە ئوبەی و پێم وت: "من بۆ شتێک هاتم بۆلای تۆ و، تۆ شتێکی لەوە گرانترت دا بەسەرما!"

- ئەی دواتر چیت کرد گەورەم ؟!

- وتم بە عەبباس: "بڕۆ، ئیتر باسی خانووەکەت ناکەم."

عەبباسیش وتی: "دەی مادەم وایە، ئەوا خانووەکەم کردە خێر بۆ موسڵمانان، با مزگەوت فراوان بکرێت. تۆ ببی بە ناحەزی من! نا شتی وا هەرگیز نابێ!"

خوای گەورە پاداشی بداتەوە، خانووەکەی بەخشی و ڕۆشت لە شوێنێکی مەدینەدا زەوییەکی کڕی. منیش ڕۆشتم و زەوییەکەم بۆ کرد بە خانوو.

- کورە قوربان تۆ هەموو جارێک من سەرسام دەکەی؟!

- بۆچی؟

- تۆ خەفەت بۆ ئەو خەڵکە دەخۆی و دەڵێی: مزگەوتەکەیان بچووکە و بە باشی جێگەیان نابێتەوە!

— رۆڵە! من بۆیە بووم بە سەرکردەیان، خەمیان بۆ بخۆم. کورم! سەرکردایەتیکردن تەکلیفە نەک تەشریف. زەوی زەوی خودایە. من ویستم مزگەوت فراوان بێ بۆ ئەوەی بە ئاسانی خوا پەرەستی تیا بکرێ.

- قوربان کارێکی چاکت کرد.

دیسان ئەوەیش سەرسامی کردم کە تۆ خەلیفە بووی، زۆر بە خێرایی چەند بژاردەیەک دەخەیتە بەردەم عەبباس و سەرپشکی دەکەی!

- ئەی چۆن کاری وا نەکەم؟ خەلیفە بۆیە خەلیفەیە کە داکۆکی لە ئایین و دونیای خەڵکی بکا. منیش بۆیە ویستم مزگەوت فراوان بێ بۆ ئەوەی داکۆکی لە دینی خەڵک بکەم، بۆیەیش سێ بژاردەم نایە بەردەم عەبباس بۆ ئەوەی داکۆکی لە دونیای عەبباس بکەم.

- پێم سەیر بوو کاتێ عەبباس زەویەکەی نەدا بە تۆ، چۆن بە زۆر لێت نەسەند، خۆ تۆ بۆ خۆت نەبوو، بەڵکو بۆ سوودی گشتی بە کارت دەهێنا!

- من کارێکی وا لەگەڵ هیچ کەسێکی ئاساییدا ناکەم. ئەی چۆن لەگەڵ مامی پێغەمبەردا کارێکی وا دەکەم؟ عەبباس یەکێک بوو لەو کەسانەی کە مووچەی تایبەتییان هەبوو، ئەوەیش لەبەر ئەوەی مامی پێغەمبەر بوو.

- شتێکی تر منی سەرسام کردووە: تۆ خۆت بڕیار بە دەست بووی، کێشە و ئاریشەکان لای تۆ بە کۆتا دەگەشت، ئیتر تۆ چۆن خۆت ڕۆشتی بۆلای یەکێکی تر تا کێشەکاتان ببڕێنێتەوە؟

- ئێ منیش وەک ئەو خەڵکەم، پیاوێکم وەک هەموو پیاوەکانی تر. هەرچەند خەلیفەش بم، بەڵام دیسان هەر مرۆڤێکم وەک ئەوان. ئەی باشە هەرکاتێ دوو مرۆڤ لەسەر شتێک کێشەیەکیان هەبێ، ناچن بۆلای دادوەرێک تا کێشەکەیان بۆ یەکلایی بکاتەوە؟

- با بەرێ وەڵلا.

- دەی منیش وامکرد. تەنانەت عەبباسم سەرپشک کرد خۆی کێ دەکا بە داوەر بیکا. ئەگەر ئوبەی نەبایە و کەسێکی تر بایە، دیسان من پێی ڕازی دەبووم. تۆ خۆت دەزانی من چەنێک ئوبەیم خۆش دەوێ، چەندە متمانەم پێی هەیە. ئەوە نییە من کردم بە بەرنوێژ بۆ نوێژی تەراویح؟

- با ! ئەوەم پێ سەیرە تۆ ئەوەندە لە ئاست هەق و ڕاستیدا ملکەچی، کاتێ ئوبەی وەڵامی ئێوەی دایەوە، تۆ یەکسەر بە عەبباست وت: "برۆ، ئیتر تر من باسی ئەو زەوییە ناکەم."

— دەی من چۆن یەکەم جار بە دادوەرێک ڕازی ببم و، دواییش بە گوێی نەکەم؟! شتی وا ڕوونادا. زیاد لەوەیش، ئوبەی کێشەکەی بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ براندەوە. دەی عومەر چۆن زات بکا کە فەرموودەی پێغەمبەر پشت گوێ بخا، یان بە بڕیار و حوکمی پێغەمبەر ڕازی نەبێ؟ دواتریش تۆ نازانی کە دوای ئەوەی هەق ڕوون بووەوە، پێشێلکردنی هەق چ سەرەنجامێکی هەیە؟

- چ سەرەنجامێکی هەیە؟

— پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "هەرکەس بە ئەندازەی تۆزقاڵێک، فیس و خۆبەزلزانی لەنێو دڵیدا هەبێ، ناچێتە بەهەشتەوە!"

ئێمەیش وتمان: "ئەی پێغەمبەری خوا! پیاوی وا هەیە پێی خۆشە پۆشاکەکانی جوان بێ، پێڵاوەکانی جوان بێ!"

فەرمووی: "ئەمە فیس و خۆبەزلزانی نییە، فیس ئەوەیە هەق بشاریتەوە، مافی خەڵک بشاریتەوە و پێشێلی بکەی."

منیش مەبەستم لە فراوانکردنی مزگەوت، ڕەزامەندیی خوا بوو، ئیتر چۆن لەبەر ڕەزامەندیی خوا، سەرپێچیی فرمانی خوا بکەم؟!

- بە خوا قوربان، جارێکی تر هیچ دایکێک ڕۆڵەی وەک تۆ ناوێنێ، نا بەخوا، تۆ و هاوێنەی تۆ لەم دونیایەدا هەر یەک جار پەیدا دەبن.

- خوای گەورە سەرکەوتووت بکا کورِم! ئێستە پێم بڵێ ئەم باسە دابخەین؟

- بەڵێ قوربان دایدەخەین.

- دەی ئێستە دوای ئەوەی دەرگایەکی گەورەمان لە باسی سیاسەت و حوکم و... داخست، لە چ بارەیەکەوە پرسیار دەکەی؟

- باسی شتێک کە لەم باسانەوە زۆر دوور نییە!

- ئەی کۆتایی نەهات؟!

- با قوربان لێ بووینەوە! بەڵام کەمێک ماوە. من هەرجار بمەوێ پرسیاری شتێکی نوێ لە جەنابت بکەم، دیسان بە ناچاری ئەگەر کەمێکش بێت، هەر لەو شتەی نزیک دەبمەوە کە کۆتاییمان پێ هێنا. هەرچەند بمەوێ دووربکەوەمەوە، بەڵام دیسان قسەکردن لە خزمەت جەنابتدا مرۆڤ بۆلای دەوڵەت و حوکمڕانی ڕادەکێشێ - بیلامانێ وەک مەڕی لێوار خەلەم لێهاتووە؛ مەڕێ لە لێوار خەلەدا بلەوەڕێ، هەرچەند خۆی بپارێزێ، ئاخریەکەی هەر قەپێ خەلە دەخوا. - با گەورەم بە لوتف و میهرەبانیی خۆی وەڵامم بداتەوە و، ئەگەر دیسان کەوتمەوە ناو باسەکە، وابزانێ کۆتاییمان پێهێناوە!

- دەی کورِم ! چی دەڵێی بیڵێ قەیناکا.

- دەمەوێ باسی گەورەترین سیفەتی جەنابت بپیسم - باسی دادگەری. هەرجار و لە هەر کوێ باسی دادگەری هاتە ناو، ئەوا یەکسەر ناوی عومەری کوڕی خەتتاب سەرترۆپکی ناوانە، ناکرێ باسی عومەر نەکرێ. دیسان هەرجارێ باسی عومەر کرا، مرۆڤ یەکسەر دادگەریی بیر دەکەوێتەوە، وەک شەنگڵەبەرەکەتەتان لێهاتووە.

- سیفەتی مرۆڤ لە کاتی هەڵوێستیدا دەردەکەوێ. وا دەردەکەوێ کە تۆ لە هەڵوێستەکانی من شارەزا بی، چ هەڵوێستێکت پێ باشە با باسی بکەین؟

- هەڵوێستەکانت زۆرن گەورەم، مادەم دەبێ لە یەکێکیانەوە دەست پێ بکەین، با لە باسی ئەو کافرانەوە دەست پێ بکەین کە لە سەردەمی خەلافەتی تۆدا لەگەڵ دەوڵەتی موسڵماناندا بەڵێن و پەیمانیان لەنێوانتاندا هەبوو، واتە ئەهلی زیممە.

- بە دەستنیشانکراوی کام لایەنت بۆ باس بکەم؟

- ڕزگارکردنی بەیتولمەقدیس، ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە لەنێوان ئێوە و کافرانی ئەوێ نووسرایەوە و بە بەڵێننامەی عومەری ناوبانگی دەرکرد. ئەم کارە چۆن کرا و چۆن سەری گرت؟

- ئەبوو عوبەیدە لە ئازادکردنی دیمەشق بووەوە، شام بەگشتی بوو بە ماستی مەییو. ئەبوو عوبەیدە نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی ئیلیا، داوای لێ کردن کە موسڵمان بن، یان سەرانە بدەن، یان جەنگ! پێغەمبەر بەو جۆرە دەستی بە غەزا دەکرد و ئێمەیش وەک ئەومان دەکرد، ئەمە شەرعی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوایە و کاری ئەبوو عوبەیدە خۆی نییە.

خەڵکی ئیلیا وەڵامیان نەدایەوە و بە قسەی ئەبوو عوبەیدە ڕازی نەبوون...

ئەویش سەعیدی کوڕی زەیدی وەک سەرپەرشتیکاری دیمەشق دانا و بە خۆی و سوپاکەیەوە ڕووی کردە ئیلیا، گەشتە دەوێ و گەمارۆی شاری دا. ئەوانیش یەکسەر داوای سوڵح و ڕێککەوتنیان کرد و مەرجیشیان ئەوەبوو کە من خۆم بڕۆم و لەگەڵیان ڕێککەوتن بکەم.

- دوایی چی ڕووی دا؟

- ئەبوو عوبەیدە نامەی بۆ نووسیم و باسەکەی گێڕایەوە. منیش پرسم بە چەند کەسێک کرد، عوسمانی کوڕی عەففان وتی: "کاری وا نەکەی ! با لووتیان بشکێ و، لەوە زیاتر ڕسوا ببن."

عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب پێی وابوو بڕۆم و ڕێکەوتنیان لەگەڵدا بکەم، دەیگوت: "خۆت بڕۆی، بۆ سوپای موسڵمانان باشترە و کارئاسانییە و گەمارۆکە کۆتایی پێ دێت!"

- دەی تۆ بە قسەی کامیانت کرد؟

- خوای گەورە خستیە دڵمەوە کە بە قسەی عەلی بکەم. بە سوپایەکەوە بەرەو لای ئەوان کەوتمە ڕێ، عەبباسی مامی پێغەمبەرم کردە سەرکردەی سوپا، تا گەڕانەوەیش عەلیی کوڕی ئەبوو تالیبم کردە بەڕێوەبەری مەدینە.

- دوایی چی ڕووی دا؟

- بە خۆم و بە سوپاوە گەشتینە شوێنێک پێی دەڵێن: "جابیە،" نامەیەکم بۆ سەرکردەی سوپاکانی تر نووسی کە بێن بۆ ئەوێ بەدەممانەوە. هاتن، سەرەتا یەزیدی کوڕی ئەبوو سوفیان، ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح، خالیدی کوڕی وەلید گەشتن پێم، پۆشاکی ئاوریشمییان لە بەر کردبوو، منیش تووڕە بووم و خەریک بوو قسەی توندیان لەگەڵدا بکەم. ئەوانیش وتیان: "چەک و سیلاحمان پێیە و پێویستە لە جەنگدا ئەم پۆشاکانە لە بەر بکەین، ئیتر منیش هێمن بوومەوە."

عەمری کوڕی عاص و شەرەحبیلی کوڕی حەسەنە نەبێ، هەموو سەرکردەکان لای من کۆ بوونەوە، ئەو دووانەیش سەرکردایەتیی سوپاکەیان دەکرد کە گەمارۆی ئیلیایان دابوو. لەو کاتەدا کۆمەڵێک ڕۆمی هاتن و شمشێری هەڵکێشراویان بە دەستەوە بوو، چەند کەسێکی سوپاکەی ئێمە ویستیان بڕۆن پێشیان پێ بگرن، بەڵام من نەمهێشت.

وتم: "بوەستن! ئەوانە داوای ئەمان دەکەن!"

بەرەو ڕوویان ڕۆشتین، تەماشا دەکەین کۆمەڵێک سەربازن لە بەیتولمەقدیسەوە هاتوون، داوای ئاشتی و سوڵح و ئەمان دەکەن. هەر کە زانیبوویان من ڕۆشتووم بۆ ئەوێ، هاتبوون بۆ لام. منیش داواکەیانم پەسەند کرد. دوایی بەرەو بەیتولمەقدیس کەوتینە ڕێ. بە ئاشتی چوینە ناو بەیتولمەقدیسەوە، بەڵێننامە و پەیماننامەیەکم بۆ نووسین، ئەو بەڵێننامە بە بەڵێننامەی عومەری ناوی دەرچوو.

- چیت تیا نووسی؟

- نووسیم:

"بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

ئەمە ئەو بەڵێننامەیەیە کە بەندەی خودا، گەورەی موسڵمانان لەگەڵ خەڵکی ئیلیادا نووسیویەتی:

ئێمە ئەمان دەبەخشین بە گیان و ماڵ و کەنیسە و خاچەکانیان، نابێت هیچ کەس لە کەنیسەکانیان نیشتەجێ بکرێت و نایشبێ کەنیسەکانیان بڕوخێنرێ، نابێت سووکایەتی بە کەنیسەکانیان بکرێت، نابێت سووکایەتی بە چاکەکانیان بکرێت، نابێت لە مەڕ ئایینەوە زۆریان لێ بکرێت، نابێت زەرەر بە کەسیان بگەیەندرێت، نابێت هیچ جولەکەیەک لەگەڵ مەسیحیەکاندا لە ئیلیا نیشتەجێ ببێت. دەبێت خەڵکی ئیلیا وەک خەڵکی مەدائین سەرانە بدەن، دەبێت ئەوانیش دز و چەتە و ڕۆمی لە ئیلیا دەربکەن، هەرکەسێکی ڕۆمی پێی خۆشە لە ئیلیا بار بکا، ئەوە تا دەگاتە شوێنی مەبەستی خۆی، بە باشی پارێزگاری لێ دەکەین. هەرکەسیش لە ئیلیادا دەمێنێتەوە، بە باشی دەیپارێزین. دەبێت ئەوانیش وەک خەڵکی ئیلیا سەرانە بدەن، هەرکەسێکی ئیلیایی دەیەوێ لە ئیلیا بار بکا و لەگەڵ ڕۆمەکاندا بڕوا و، کەنیسە و خاچ بە جێبهێڵێ، ئەوە تا دەگەنە شوێنی مەبەست خۆیان، ماڵ و منداڵ و کەنیسە و خاچیان پارێزراو دەبێت. هەرکەس ناوەڕۆکی ئەم پەیماننامە جێبەجێ بکا، ئەوا بەڵێنی پێ دەدەین بە بەڵێنی خوا و پێغەمبەری خوا و خەلیفەکانی پێغەمبەر و موسڵمانان، ئەگەر هاتوو سەرانەیان دا.

ئەم بەڵێننامەیە لە ساڵی پانزە بە شایەتیی خالیدی کوڕی وەلید، عەمری کوڕی عاص، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و موعاوییەی کوڕی ئەبوو سوفیان نووسراوە."

- بە خوا قوربان! چەندە مێژووم خوێندبێتەوە و سەرکەوتنم دیبێت، ئەوانەی کە سەرکەوتوون هەمیشە شکاوەکانیان بە تەواوی لەناو بردووە، هیچیان نەهێشتووەتەوە، ماڵ، منداڵ، سەروەت و سامان. هەرچی سەیری ئەم ڕێکەوتننامەیەی تۆ دەکەم،

زیاتر لە ئایینی ئیسلام دڵنیا دەبمەوە، زیاتر بۆم دەردەکەوێ ئەم ئایینە لەلایەن خوداوە هاتووە و هیچ گومانێک هەڵناگرێ. تۆ بۆ ئەوەندە نەرمونیان بووی لەگەڵ ئەوانەدا؟

- کورم! ئەوە ئەو ئایینەیە کە تۆ خۆت وتت: دڵنیاییم بەرابەری زیاد بووە. ئەمە ئایینێک نییە عومەر دایهێنابێت، منیش هەر بەپێی شەرع و ئایین مامەڵەم لەگەڵدا کردن، هەرچی خوا پێی ڕازی بێ، ئەوەم پێداون.

- قوربان با وای دانێین کە شتەکە پێچەوانەیە و ئەوان سەر دەکەون، دەبێت ئەوانیش وەک ئێمە بن؟ دەبێت مامەڵەیان وەک مامەڵەی خۆمان؟

- دەی ئێمە کەی ئایین لە خەڵکەوە وەردەگرین؟! کەی بە شوێن پێی ستەمکاردا دەڕۆین؟! کەی بە گوێی یاخی و لەخوادوورەکان دەکەین؟! هەرکەس دژی ئێمە بێ، ئێمە تەنیا بەپێی شەرعی خوا مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین. خوا هەرشتێکیان پێ ڕەوا ببینێ، ئێمەیش پێیان ڕەوا دەبینین، هەرچیشیان پێ ڕەوا نەبینێ، ئێمەیش پێیان ڕەوا نابینین. ئێمە شوێنکەوتەی پێغەمبەرێکین کە خوا کردوویەتی بە مایەی سۆز و ڕەحمەت بۆ گشت کەسێ. ئێمە لە کاتی وادا سۆز و بەزەیی بەکار دەهێنین کە بە گومانی هیچ کەسێکدا نایەت، لە کاتی دەسەڵات و زاڵبووندا زیاتر بەسۆزین. ئێمە بۆ یەکجاریش چییە بۆ پەیداکردنی سەروەت و سامان، بۆ ژن، بۆ کەلوپەل و، بۆ هیچ شتێکی تری دونیایی بەشداری جیهادمان نەکردووە؛ ئێمە تەنیا بۆ ئەوە جیهادمان کردووە کە خەڵک بەرابەری خوای گەورە ملکەچ بێ. ئەگەر لە گوێمان بکەن، ئەوا ئەوانیش وەک ئێمە چیمان هەبوو، ئەوانیش هەیانە، لە چی خۆمان پاراست، ئەوانیش دەپارێزی.. ئەگەریش بەرانبەرمان وەستانەوە، ئەوە ئیتر حوکم حوکمی خوایە، ئایینی خۆیان بۆ خۆیان، چۆن داهونەریتی ئایینی خۆیان بەجێ دەهێنن ئازادن، کەنیسە و مەعبەدی خۆیان بۆ خۆیان، بەڵام دەبێ تەنیا ئیسلام حوکمی کۆمەڵگا بکا، هەر مرۆڤێک و ئایینی خۆی. ئەو دەمەی دەگا بە خوا، ئەگەر

لەسەر ڕێی ڕاست بوو، ئەوا پاداشتەکەی وەردەگرێ، ئەگەریش گومڕابوو سزاکەی وەردەگرێ. زەوی زەویی خودایە، خوا بۆیە پیغەمبەرانی ناردووە، بۆ ئەوەی خەڵک بەندایەتی بۆ بەندە نەکا، بەڵکو تەنیا بۆ خودای بکا.

- لەو جێگەی کە دەبوو شمشێر بەکار بێنی، سۆز و بەزەییت بەکار هێنا! ئەوە چۆن وابوو؟

- ئەی تۆ خۆت نەتگوت: "مێژووم خوێندوەتەوە، تا ئێستا هیچ هێزێکی سەرکەوتوم نەدیوە وەک ئیسلام باش بێ بۆ هێزی بەرابەر"؟

- با.

- دەی ئەمە ئەوەیە. غەزای بەدر یەکەم غەزایەک بوو کە جیاوازیی لەنێوان هەق و ناهەقدا کرد، لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ ئێمەی فێری ئەوە دەکرد کە غەزاکردن وەک نوێژ و ڕۆژوو و حەجکردن و زەکات، ئەویش عیبادەت و خواناسیە. خوا نوێژ و زەکات و حەج و ڕۆژووی ڕێک بەو شێوە دەوێ کە فەرزی کردووە، بە شێوەیەکی تر نایەوێ، بە هەمان شێوە جیهادیشی ڕێک وەک ئەوە دەوێ کە فەرزی کردووە. بە گوێرەی قورئان و سوننەت بێ، ئێمە بە شێوەیەکی ئیسلامیانە جەنگ بۆ ئیسلام دەکەین، ئیتر هەقمان نییە کەسانی تر چی دەکەن و چی ناکەن، ئەگەر ئێمە و ئەوان لە ئاکار و ڕەوشتدا وەک یەک بین، ئیتر جیاوازیمان چییە؟

- ڕاست دەفەرمووی قوربان! تۆ فەرموت: "پێغەمبەرﷺ ئەوەی فێر کردین کە جیهادیش وەک نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەجە،" من بە باشی مەرجەکانی نوێژ و ڕۆژوو دەزانم، دەزانم ڕۆژوو بەچی دەشکێ و بەتاڵ دەبێتەوە، دەزانم پایەکانی حەج چەندە، دەیشزانم مرۆڤ چەند پارە و سامانی هەبێ ئەمجا زەکاتی لەسەرە، دەیشزانم دەبێ زەکاتەکەی چۆن بدا، بەڵام جیهاد چۆنە؟! پێغەمبەر چۆنی فێر کردن؟!

- پێغەمبەرﷺ هیچ سوپایەکی بۆ جیهاد نەدەنارد تا بە باشی ئامۆژگاریی نەکردنایە، ئامۆژگاریی ئەو سوپایەت بۆ باس دەکەم کە پێغەمبەرﷺ بۆ غەزای موئتەی ناردن، فەرمووی:

"داواتان لێ دەکەم و ئامۆژگاریتان دەکەم کە لە خودا بترسن: بەرابەر ئەو موسڵمانانەی لەگەڵتانن باش بن، بەناوی خودا غەزا دەست پێ بکەن، جەنگ لە پێناوی خودا و لەگەڵ ئەوانەدا بکەن کە کافرن، ناپاکی و ستەم لە کەس مەکەن، دزی و خیانەت مەکەن، منداڵ مەکوژن، ژن مەکوژن، پیر و پیرەک مەکوژن، هەرکەس خەڵوەنشین بوو مەیکوژن، نزیک باخە خورما مەکەونەوە، دار مەبڕنەوە، خانو مەڕوخێنن."

جارێکیان لە خزمەت پیغەمبەرﷺدا لە غەزایەکدا بووین، کۆمەڵێک خەڵکی بینی کۆبوونەتەوە و سەیری شتێک دەکەن، پیاوێکی نارد بزانێ ئەوە چییە، فەرمووی: "برۆ بزانە ئەوانە بۆچی کۆبوونەتەوە و سەیری چی دەکەن؟"
پیاوەکە ڕۆشت و، هاتەوە وتی: "تەماشای ژنێکی کوژراو دەکەن."
پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "نابێ ژن بکوژرێت."

خالیدی کوڕی وەلید لە پێشەوەی سوپا بوو، پیاوێکی بۆلای خالید نارد و فەرمووی: "بە خالید بڵێ نابێ ژن بکوژن و نابێ ئەو کەسانەیش بکوژرێن کە بە زۆر هێنراون یان بە کرێ گیراون."

- بە خوا قوربان ئەم ئامۆژگاریانە دەڵێی بۆ کەسانێک کراون کە بیانەوێ بۆ دیدەنی و سەردان بڕۆن نەک بۆ جەنگ، چەند ئامۆژگارییەکی مرۆڤانن! پێویستە هەموو مرۆڤێک لە بەرابەر ئەو کەسەی ئەم ئامۆژگارییەی کردووە، چۆک دانێت. دەبێ بەزەیی و مرۆڤایەتی لە کاتی جەنگدا لە پێغەمبەرﷺ فێر بن.

- وەڵڵا ڕاست دەکەی وایە.

- گەورەم ! لە ئیسلامدا جەنگ بەدیلی نییە؟

ـ جەنگ لە ئیسلامدا لە هەموو ئایین و قانوون و ڕێکخراوەکانی تر جیایە.
هەرکەس دەیەوێ کە لە بارەی جەنگ لە ئیسلامدا شارەزا بێ، دەبێ لە پێشدا لە خودی ئیسلام شارەزا بێ، بۆ ئەوەی ئەم جەنگە قیاس نەکاتە سەر جەنگەکانی تر!

ـ چۆن قوربان، مەبەستت چییە؟

ـ ئەو پاڵنەرانەی کە لە ئیسلامدا جەنگ دروست دەکەن، ڕوون و ئاشکران. هیچ کەسێکی خاوەن ویژدان ئینکاریی ئەوە ناکا، ئەو پاڵنەراش بریتین لە بەرەنگاربوونەوەی دوژمن، داکۆکیکردن لە گیان، پاراستنی ئەو ئایین و بیروباوەڕەی کە کافرەکان دەیانەوێ ڕەتی بکەنەوە، پاراستنی بانگەشەی ئیسلامی تا دەگا بە هەموو کەسێک، تەمێکردنی ئەو کەسانەی کە بەڵێن و پەیمان دەشکێنن.

سەرەڕای ئەمانەیش ئامانجەکانی جەنگ لە ئیسلامدا هەر هەمووی چاک و مەزنن. لەگەڵ ئەوەیشدا ڕۆژێک لە ڕۆژان ئیسلام مەراقی جەنگ و شەڕی نەبووە، ئێمە دەچووین بۆ جەنگ و داوامان لە خەڵک دەکرد بڕوا بە خوا بێنێ، ئەگەر بڕوایان هێنابا، ئەوا وەک خۆمان حسابمان بۆ دەکردن، هەرچەند ئێمەیش سەرکەوتوو و براوە بووین، دەی ئیتر هیچ ئایینێک هەیە وەک ئیسلام جیاوازی لەنێوان براوە و دۆڕاودا نەکا؟!

ـ نەوەڵڵا ئیسلام نەبێ کەس کاری وا ناکا.

ـ با بەیتە شیعرێکت بۆ باس بکەم، هیچ جەنگ و تێکپرژانێک بە قەد سەرە دەرزیەک سۆز و بەزەیی پیغەمبەری ﷺ کەم نەدەکردەوە، بە خوا پیغەمبەر لە کاتی ئاشتییدا چەندە بەسۆز بوو، لە کاتی جەنگیشدا ئاوا بەسۆز بوو؛ بەزەیی بەو کافرانەدا دەهاتەوە کە بە تۆپزی و زۆر نێردرابوون بۆ جەنگ. لە جەنگی بەدردا پیغەمبەر ﷺ عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب و زوبەیری کوڕی عەوام و سەعدی کوڕی ئەبوو وەقاص و چەند هاوەڵێکی تری نارد بۆ سەر ئاوی بەدر بۆ ئەوەی دەنگ و باسێک لەسەر قورەیش بێننەوە، چەند منداڵێکی قورەیشی لەوێ بوون ئاویان بۆ سەرکردە کافرەکانیان دەبرد: یەکێکیان ئەسلەمی کۆیلەی بەنی جوماح بوو، یەکێکی

تریان عەریزی ئەبوو یەسار کۆیلەی بەنی عاص بوو. هەردووکیان لەلایەن عەلی و هاورێکانییەوە گیران و هێنرانە خزمەت پێغەمبەرﷺ. پێغەمبەر ئەوانی دوور خستەوە و زۆر بە هێمنی و ڕووخۆشیەوە لەگەڵ ئەو دوو کوڕە دوا، دەنگوباسی قورەیشی لێ پرسین، لەگەڵ ئەوەیشدا کە لە گەرمەی جەنگدا بووین. بەڵام پێغەمبەر ئەوانی بە دیل نەگرت، هەردووکیانی ئازاد کرد، دەیشیزانی کە ئەو دووانە دەنگوباسی موسڵمانان بۆ کافران دەبەنەوە، بەڵام چونکە تەمەنیان گەورە نەبوو؛ گوێی نەدانێ و بەرەڵلای کردن.

دیسان ئەگەر بیزانیایە کەسێک لەبەر بارودۆخێکی تایبەتی هاتووەتە جەنگ بەرابەر موسڵمانان، ئەوا بەزەیی پیا دەهاتەوە و بە هێمنی و سۆزەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، وەک ئەو مامەڵەیەی کە لە جاری یەکەمدا لەگەڵ ئەبوو عیززەی جوحمیا کردی.

- ئەبوو عیززە کێیە و بۆچی فەرموت: "لە جاری یەکەمدا"؟ مەسەلە چییە؟

- ئەبوعیززە پیاوێک بوو لە جەنگی بەدردا دیل کرا، شاعیر بوو. لە خزمەت پێغەمبەردا لاڵایەوە بۆ ئەوەی بەزەیی پیا بێتەوە.

وتی: "ئەی موحەممەد! من پێنج کچم هەیە، من هیچ شتێکیش شک نابەم کە خۆمی پێ بکڕمەوە و ئازادبم، بمکە بە خاتری کچەکانم! بەڵێنت پێ دەدەم کە جارێکی تر دژی ئێوە نەجەنگم."

پێغەمبەرﷺ ئازادی کرد.

غەزای ئوحود هاتە پێشەوە، سەفوانی کوڕی ئومەییە ڕۆشتبوو بۆلای ئەبوو عیززە پێی وتبو: "با بڕۆین بۆ جەنگ!"

ئەبوعیززە وتبووی: "من بەڵێنم بە موحەممەد داوە کە دژی ئەو و ئایینەکەی نەجەنگم!"

صەفوان پێی وتبوو: "من بەڵێنت پێ دەدەم ئەگەر هاتی بۆ جەنگ و جەنگای و کوژرای، کچەکانت وەک کچی خۆم بەخێو بکەم! هەتا من مابم ناهێڵم هیچ زیانێکیان پێ بگا، ئەگەریش زیندوو مایتەوە و نەکوژرای، ئەوا ئەوەندەت پێ دەبەخشم کە خەنی ببی."

بەو جۆرە صەفوان تا ڕازی کرد و چووبووە بنکڵێشەی و، هاتبووە جەنگ.

- ئەی دوایی چی ڕوییدا؟

- ئەبوو عیززەمان بە دیلی گرت. ئەو ڕۆژە تەنیا ئەومان بە دیلی گرت، هاوردمانە خزمەت پیغەمبەرﷺ ، ئەبوعیززە وتی:

"ئەی موحەممەد! من کچم زۆرە و بە زۆر منیان هێناوە! ئەم جارەیش منەتم بە سەردا بکە و ئازادم بکە!"

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەی بەڵێن و پەیمانەکەت کوا؟ نا بە خوا جارێکی تر لە مەککە سەر ناخەیتە سەر سەرین، دوایی بڵێی: 'دوو جار بە موحەممەدم ڕابوارد! موسڵمان دوو جار لە کونێکەوە ناگەزرێت.'"

ئەوە بۆیە پێم وتی: "لە جاری یەکەمدا!"

وەک زانیت ئەو پیاوە یەکەم جار ئازاد کرا، بەڵام پەیمان و بەڵێنەکەی بەجێ نەگەیاند، جاری دووەم دەبوو سزای خۆی وەربگرێ.

جا من پێشتر وتم بەیتەشیعرێک، ئەمە لەتی یەکەمی بەیتەکە بوو:(کوا لەتی یەکەمی بەیتەشیعرەکە؟!)

- ئەی لەتی دووەمی قوربان!

- لەتی دووەمی ئەوەتە: خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ المائدة: ٨، واتە: "ڕق و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەک هەڵتاننەنێت لە دادپەروەری لابدەن، دادپەروەربن، ئەوە نزیکترە لە تەقوا و خواناسیەوە."

ئەم ئایەتە ئەوە دەریدەخا کە کفری کافر وا ناکا کە ئەو کافرە دادگەرنەبێ.
ڕەوا نییە ئێمە لاشەی کوژراوانی ئەوان بشێوێنین، هەرچەند ئەوان لاشەی شەهیدەکانی ئێمە بشێوێنن.

لە جەنگی ئوحوددا کافرەکان لاشەی شەهیدکراوی حەمزەی مامی پێغەمبەریان شاواندبوو، بەڵام ئەمە وای نەکرد لە پێغەمبەر کە ڕەفتاری لەو جۆرە بنوێنێ. پێغەمبەر زۆر لەوە گەورەتر بوو کە تەقلیدی کافرەکان بکا. ئەو هەر لەسەر خۆشڕەفتاری و باشکرداری خۆی مایەوە، هەرچەند مامی شەهید کرابوو، لاشەکەی شێوێندرابوو، بەڵام هێشتا بە ئێمەی دەفەرموو: "هەرگیز کاری لەو جۆرە نەکەن بە کوژراوەکانیان!"

ـ صەلات و سەلامی خوای لێبێ، چ پێغەمبەرێکی مەزنە! خوا خۆی فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم: ٤، واتە: "بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت و خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێوێنە و مەزنیت."

بەڵام قوربان پێم بڵێ، ئەو ڕەفتارەی تۆ لەگەڵ خەڵکی ئیلیا چ پەیوەندییەکی بە ئاکاری جەنگەوە هەیە؟ ئەگەر کارەکە لەسەر پاراستنی گیان و ماڵ و زەوییەوە بوەستایە، ئەوە دەمانوت: "ئەمە ئاکاری ئیسلامە، بەڵام تۆ بەڵێنت پێدان کەنیسە نەڕووخێنرێ، خاچ نەشکێنرێ، تەنانەت بەڵێنت پێدان هەرکەس بیەوێ بڕوا، خاچی خۆی بگرێ بە دەستەوە و کەس بۆی نییە نە نزیکی خۆی و نە نزیکی خاچەکەی بێتەوە."

ـ ئەوەیش ئاکار و ئەخلاقی ئیسلامە ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ﴾ البقرة: ٢٥٦، بە هیچ جۆرێک زۆرکردن لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئایینیدا نییە.

ئایینی ئیسلام دەیەوێ خاچی نێو دڵەکان بشکێنێ، نەک خاچی ناو دەستەکان، دەیەوێ دڵەکان لە شیرک پاک بکاتەوە، نەک دار و دیوار!

ـ لەبەر ئەوە لە کەنیسەکەی ئەواندا نوێژت نەکرد؟

- بەڵێ لەبەر ئەوە بوو.

- ئەو ڕۆژە چی ڕووی دا؟

- کە ڕۆشتمە نێو بەیتولمەقدیسەوە و لە حەوشەکەیدا دانیشتم، کاتی نوێژ هات، بە پاتریکم وت: "دەمەوێ نوێژ بکەم!"

ئەویش وتی: "هەر لە جێگەی خۆتدا نوێژ بکە!"

منیش چوومە دەرەوە و بە تەنیا نوێژم کرد، کە لە نوێژ بوومەوە بە پاتریکم وت: "دەزانی بۆچی لە دەرەوە نوێژم کرد؟"

وتی: "نەخێر."

وتم: "ئەگەر لەنێو کەنیسەدا نوێژم کردبا، دوایی موسڵمانەکان دەیانکرد بە جێگە نوێژ و دەیانگوت: 'عومەر ئا لێرەدا نوێژی کردووە!' "

- ئای قوربان چەند بەسۆزی! تۆ خەفەت بۆ دادگەریی دوای خۆیشت دەخۆی!

- ئەی چۆن کاری وا نەکەم، من بە زیندوویی ستەم ڕەت بکەمەوە، ئەی بۆ هۆکارەکانی ستەم ڕەت نەکەمەوە؟!

- قوربان کەسانی دوای خۆت خستووەتە تەنگانەوە(هەرچی بکەن ناگەن بە تۆ.)

- ئەوانی پێش منیش وابوون.

- خوای گەورە لەگەڵ هەردوو دۆستەکانت کۆت بکاتەوە.

- ئامین خوایە گیان ئامین.

- ئەی قوربان ئەو دەنگ و باسەی عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەی عەمر چییە کە لەگەڵ کابرایەکی قیبتیدا پێشبڕکێی کردبوو؟

- ڕۆژێک لە مزگەوتدا دانیشتبووین، لەناکاو پیاوێکی قیبتی لە میصرەوە هاتبوو، خۆی کرد بە ژووردا، وتی: "گەورەی موسڵمانان لە کوێیە؟"

وتم: "ها منم!"

وتـی: "ئەی گەورەی ئیمانـداران! والـی پێشـبڕکێیەکی ئەسپسـواریی سـازدابوو، ئەسپەکەی من لە هەمـوو ئەسـپەکانی بـردەوە، مـوحەممەدی کـوڕی عەمـری والیـی جەنابت ئەسپەکەی منی لێ بوو بە ئەسپەکەی خۆی و وتی: 'بە خوا ئەسـپەکەی من براوەیە!'

"ئەسـپەکان نزیـک بـوونەوە بـاش تەماشـامان کـردن، ئەسـپەکەی مـن بـوو نەک ئەسپەکەی موحەممەد!

"موحەممەد لە داخدا هەڵیکوتایە سەر من و بە قامچییەکەی، چەند قامچییەکی لێدام و وتی: 'دەبگرە! من کوڕی بەڕێزترین پیاوم!' "

- ئەی قوربان تۆ چیت کرد؟

- بە خوا هەر ئەوەندەم پێ وت، وتم: "دانیشە تۆ براوەی، سەرکەوتووی!"

دوایی ناردم بە شوێن عەمر و کوڕەکەیدا بێن بۆ مەدینە بـۆلای مـن. هـاتن. بە بەرچاو هەموو خەڵکەوە وتم:

"کوا کابرای میصری لە کوێیە؟"

وتی: "ئەمەتام گەورەی موسڵمانان!"

وتم: "ئا ئەو قامچییە بێنە، بیکێشە بە سەری کوڕی بەڕێزترین پیاودا!"

- ئەی میصرییەکە چی کرد؟

- قامچییەکەی هەڵگرت، دای لە کـوڕی عەمـر، بە دڵـی خـۆی کوتـای، منـیش بەردەوام پێم ئەوت: "لێی بدە! لە کوڕی بەڕێزترین پیاو بدە!"

- دوای ئەوە چی قەوما؟

- کابرا وازی لە کوڕەکەی عەمر هێنا، منیش وتم: "دەی ئێسـتە لە عەمـر خـۆی بدە، بە خوا کوڕەکەی عەمر پشتی بە دەسەڵاتی عەمر بەستبوو بۆیە لێی دای!"

پیاوەکە وتـی: "ئەی گەورەی موسڵمانان! مـن لەو کەسـەم دا کە لە منـی داوە، پێویست ناکا لە باوکی بدەم!"

منیش وتم: "بە خوا ئەگەر لێت بدایە، دەسمان نەدەگرتی هەتا خۆت وازت نەهێنایە!"

- ئەی دوای ئەوە چیت کرد؟

- ڕووم کردە عەمر و پێم وت: "ئەی عەمر! ئەوە کەی ئەو خەڵکەتان کردووە بە کۆیلە، لە کاتێکدا خۆیان بە ئازادی لەدایک بوون؟!"

- قوربان ئەم بەسەرهاتە دەبێ بە ئاوی زێڕ لەسەر پەڕی زیو بنووسرێتەوە. دادگەری لەمە گەورەتر نابێ، هەرگیز نەمبیستووە هیچ کۆمەڵێک تۆڵەی خەڵک لە خۆی بکاتەوە.

- کوڕم! دادگەری ئەوەیە کە بۆ خەڵک بەو شتانە ڕازی بیت کە بۆ خۆت پێیان ڕازیت. خۆیشت چیت بۆ خۆت پێ ناخۆشە، بۆ خەڵکیشت پێناخۆش بێ. هەرکەس شتێکی بۆ خۆی پێناخۆش بێ و بۆ خەڵکی پێی خۆشبێ، یان بە پێچەوانەوە، ئەوە دادگەر نییە، ئەگەر سەدجاریش داکۆکی لە دادگەری بکا و خۆی بە دادگەر بناسێنێت. کردەوە وتەکان تاقی دەکاتەوە، هەرکەس بە کردەوە وتەکانی پشت ڕاست کردەوە، ئەوە بەرزی دەکەینەوە. هەرکەسیش قسەی زل و جوان و کردەوەی خراپی هەبوو، ئەوە قسەکانی لێ وەردەگرین و خۆی بە زەویدا دەدەین. هەرگیز قسەیەکی باش پشت گوێ ناخەین هەر لەبەر ئەوەی خاوەنی قسەکە خۆی کاری بەو قسەیە نەکردووە، هەرکەسیش قسەی باشی کرد و کاری پێکرد، ئەوا لە جێی خۆی دەیهێڵینەوە.

- بە خوا ئەوە دادگەرییە، ئەرێ قوربان! بەبۆچونی تۆ، بۆچی ئەو کابرا قیبتیە ئەو هەمووە دەشت و چۆڵ و بیابانەی بڕی و هاتە خزمەتت؟

- ئەو بیستبووی من تەرازووی دادگەریم داناوە، هەرگیز قسەیەکی هەق ڕەت ناکەمەوە، هەرچەند ڕقم لە خاوەنی قسەکەش بێ. هەرگیزیش پاڵپشتی لە ستەم ناکەم، هەرچەندە ستەمکارەکەیشم خۆش بوێ. بە خوا من قیبتیەکەم لە عەمر و کوڕەکەی عەمر خۆشتر نەدەویست، بەڵام خۆ دادگەری بە گوێرەی خۆشەویسی و

ڕکلێبوونەوە نییە، بە گوێرەی هەق و ناهەقییە، خۆشەویسی وامان لێ ناکا بمانخاتە نێو ناهەقیەوە؛ ڕکلێبوونەوەش وامان لێ ناکا هەق نەڵێین!

- ئەی بۆ ناردت بە دوای عەمر و کوڕەکەیدا، ئەی نەدەبوو نامەیەک بۆ عەمر بنووسی بۆ ئەوەی تۆڵە لە کوڕەکەی بکاتەوە و کۆتایی بە کێشەکە بهێنی؟

- ئەگەر ئەو پیاوە نامەی بۆ من نووسیبا، منیش نامەم بۆ عەمر دەنووسی، بەڵام ئەو خۆی هات و سکاڵای کرد، پێم خۆش نەبوو تۆڵە سەندنەوەکەی لە جێگەیەکی تر بێ، دەبوو لەو جێگەیە بێ کە سکاڵای تیا کراوە. دواتر ئەگەر ئەو پیاوە قیبتیە موسڵمان بووایە، لەوانەیە بە نامە کارەکەم حەل بکردایە، وەک بەسەرهاتی پیاوەکە کە بادەی خواردبوو و ئەبوو موسا زۆر بە توندی تۆڵەی لێ سەندبووەوە و، هات و لای من سکاڵای کرد، من هەر بە نامە ناردنێک کێشەکەم بنبڕ کرد، من خۆم ویستم دڵنیا بم و خۆم بپارێزم.

- لە کێ دڵنیا بی و لە کێ خۆت بپارێزی؟

- دڵنیا بم کە ئەهلی زیممە ستەمیان لێ ناکرێ و زەلیل ناکرێن و، خەلیفە پشتیوانیانە ئەگەر هات و هەق لای ئەوان بوو و، خەلیفە دژی ئەوانە، ئەگەر ناهەق بوون!

پێش هەموو کەس خۆم لە کاربەدەستەکان بپارێزم، با کەسیان نەڵێن: ئەمە کافری زیممی بوو، ئەوە خەلیفە بە شتێک ڕازی بووە کە بۆ موسڵمانان ڕازی نەدەبوو. بە خوا من بەڵێن و پەیمانی خۆم ناشکێنم، ئەو کەسانەی کە کافری زیممین، لە دادگای ئیسلامدا وەک موسڵمان حیسابیان بۆ دەکەین، مافی خۆیانیان پێ دەدەین، هەرکەس لەسەر هەق بوو و، پەنای بۆ ئێمە هێنا، ئەوا یارمەتیی دەدەین، هەرکەسیش لەسەر ناهەق بێ، تۆڵەی لێ دەکەینەوە!

ـ بەڵام قوربان! عەمری کوڕی عاص تاوانی چی بوو؟ بۆ بە کابرای قیبتیت فەرموو کە قامچیی لێ بدا؟ خۆ عەمر لە کابرای نەدابوو، باوەڕ ناکەم بە کاری کوڕەکەیشی ڕازی بووبێ تا بڵێین ئەویش بەشدارە؟!

ـ کوڕم! وابزانە کە موحەممەدی کوڕی عەمر بە کۆچانی باوکی لەو قیبتییەی داوە، من وا گومان دەبەم کە نەفسی موحەممەد بە موحەممەدی وتبێ: "تۆ کوڕی گەورەی میصری، چۆن دەشێ کەسێکی ئاسایی لێت بباتەوە؟"

منیش ویستم هەم عەمر و هەم هەموو والییەکانی تر ئاگادار بکەمەوە کە نابێ هیچ خزمێکیان هەر لەبەر ئەوەی خزمی ئەوانە، ئەو خزمایەتیە بۆ ستەمکاری بەکاربێنێ! من خۆم وام بە باش زانی، دڵم ئاوا ئاوی خواردەوە. من پێش ئەوەی کاربەدەستان و منداڵەکانیان داگایی بکەم، هەر بەو جۆرە خۆم و منداڵی خۆمم دادگایی دەکرد!

ـ مەبەستت چییە قوربان؟

ـ من دەمگوت: "ئەگەر پێشەوا و ڕابەر مافەکانی خوای گەورە بپارێزێ، ئەوا خەڵکیش هەموویان دەیپارێزن، بەڵام ئەگەر پێشەوا و ڕابەر هەر خەریکی مافخواردنی ئەم و ئەو بن، خەڵکەکەیش وا دەبن!"

بۆیە من زۆر بە توندی لێپێچینەوەم لەگەڵ خۆم و ماڵ و منداڵی خۆمدا دەکرد، چونکە دەمزانی چاوەکان هەموویان ڕوویان کردووەتە من. ئەگەر منیش هەر خەریکی ئەوان بم، ئەوا لە ڕۆژی پەسڵاندا لێپێچینەوەم لەگەڵدا دەکرێ و، لەسەر زەویشدا لە زمانی خەڵک سەلامەت نابم!

جا لەبەر ئەوە هەرجارێ من شتێکم لە خەڵک قەدەغە بکردایە، یەکسەر دەهاتمەوە بۆ ماڵی خۆم و بە ماڵ و منداڵم دەوت:

"من فلان شت و فیسار شتم لە خەڵک قەدەغە کردووە، وەک چۆن باڵندەی گۆشتخۆر چاوی لە پارچە گۆشتێکە، ئاوا خەڵکیش چاویان لەسەر ئێوە دەبێ، ئەگەر ئێوە ئەو قەدەغانە بشکێنن، خەڵکیش دەیشکێنن، ئەگەر ئێوەیش لەو

قەدەغانە بترسن، ئەوا خەڵکیش لێیان دەترسن. بە خوا هەر خزمێکی خۆم کارێکی قەدەغەکراو بکا، ئەوا لەبەر ئەوەی خزمی خۆمە، دووجار سزای دەدەم، ئیتر ئێوەیش کەیفی خۆتانە. هەرکەس دەیەوێ، ئەوا با خۆی بپارێزێ و، کێیش نایەوێ خۆی بپارێزی، با خۆی نەپارێزێ، تاوانی بە ئەستۆی خۆی!"

من تەنانەت لە ماڵ و منداڵ و خزمە نزیکەکانی خۆم قەدەغە کردبوو کە سوود لەو شتە گشتیانە وەربگرن کە بۆ سوودی گشتی دانرابوون. دەترسام لە هەق لا بدەن و دوایی خۆیان بە خاوەنی ئەو شوێنانە بزانن. جارێکیان عەبدوڵلای کوڕم وشترێکی کڕیبوو، بۆ لەوەڕان تێکەڵی ئەو ڕانە وشترەی کردبوو کە ماڵی دەوڵەت بوو. لەگەڵ ئەو وشترانەدا دەلەوەڕا، لەگەڵ ئەوان ئاوی دەخواردەوە، وشتر قەڵەو بووبوو، عەبدوڵلا هێنایە بازار بیفرۆشێ...

بە ئیرادەی خوا منیش ئەو ڕۆژە لە بازاڕ بووم، چاوم بە وشترەکە کەوت، وتم: "ئەم وشترە قەڵەوە هیی کێیە؟"

وتیان: "هیی عەبدوڵڵای کوڕتە!"

بە عەبدوڵلام وت: "بەهـ بەهـ کاک عەبدوڵلا! کوڕی گەورەی موسڵمانان! ئەم وشترە چییە ئەوەندە قەڵەوە؟!"

ئەویش وتی: "ئەوە وشترە و کڕیومە، منیش وەک ئەو هەمووە خەڵکە تێکەڵی وشترەکانی دەوڵەتم کردبوو، بۆ خۆی لەوەڕاوە و قەڵەو بووە!"

منیش وتم: "ئێ شوانەکان بڵێن: 'وشترەکەی کوڕی خەلیفە باش بلەوەڕێنن! وشترەکەی کوڕی خەلیفە ئاو بدەن!' یەڵلا عەبدوڵلا وشترەکە بفرۆشە و بنمایەکەی هەڵگرەوە و هەرچی قازانجی هەبوو، بیخەرە نێو سندووقی دەوڵەتەوە!"

- دەی قوربان خۆ عەبدوڵلا تاوانی نەکردبوو، تەنیا وشترەکەی قەڵەو بووبوو، ئەوە تاوانە؟!

- نا، وشتر لەوەڕاندن تاوان نییە، وشتر قەڵەوبوون خراپەکاری نییە، بەڵام ئەگەر لە زەوی خۆیدا بیلەوەڕاندایە، منیش وام نەدەکرد!

- ئەی قوربان خەڵکی تریش وەک ئەویان نەکردبوو؟! وشترەکانیان تێکەڵی وشترەکانی دەوڵەت نەکردبوو؟!

- با! خەڵکی تریش وای کردبوو.

- ئەگەر جگە لە وشترەکەی عەبدوڵلا، وشترێکی قەڵەوی ترت دیبا، وات دەکرد؟

- نەخێر! وام نەدەکرد.

- ئەی بۆ لەگەڵ عەبدوڵلا وات کرد.

- ئەگەر ئەو وشترە هیی کوڕی خۆم نەبووایە، هەقم نەبوو بە سەریەوە، با هەر بۆ خۆی لەوەڕابا و قەڵەو بووبا، بەڵام من سوور دەزانم شوانەکان لەبەر خاتری من، باشتر چاودێری وشترەکەی عەبدوڵلایان کردووە. من ڕازی نابم کوڕەکەم بە گۆچانی باوکی وشترەکەی خۆی قەڵەو بکا! نابێ شوانەکان باشتر ئەو وشترە بلەوەڕێنن یا تێراوی بکەن هەر لەبەر ئەوەی کە وشتری کوڕی خەلیفەیە!

- خۆ پاریزیش تا ئەو ڕادەیە قوربان!

- ئەی بۆ نا! سبەی ئەگەر خوای گەورە لێی پرسیم و فەرمووی: عومەر! ئەوە بۆچی وشتری کوڕەکەی تۆ قەڵەو بووبوو و وشتری ئەو خەڵکەیش هەمووی لاواز، من ئەو کاتە چ وەڵامی پەروەردگار بدەمەوە؟

- دەی یانی ئەوە دادگەرییە و تەواو ئاوایە؟! ئەو ڕۆژەی کوڕەکەی عەمر ئەو کارەی کرد، هەر لەبەر ئەوەی کوڕی عەمر بوو، تۆ سزات دا. دواتر وشترەکەی عەبدوڵلات بینی و قازانجەکەیت لێ سەندەوە و خستە ناو سندووقی دەوڵەتەوە، یانی بە یەک چاو سەیری کوڕی خەڵک و کوڕی خۆت دەکەی؟

- بەڵێ بە خوا وایە. هەرکەس وەک خۆی تەماشای تۆیشی کرد، ئەوە ستەمت لێ ناکا.

- دوور لە تۆ قوربان ، تۆ و ستەم کوجا مەرحەبا؟! ئەم چیرۆکە زۆر کاری تێ کردم. بۆیە پێم خۆشە زیاتر لە بارەی خۆپارێزیی تۆوە ببیسم. هیچی تر هەیە بۆم بگێڕیتەوە؟

- بەڵێ، زۆرم لایە.

- دەی قوربان فەرموو! زۆر تامەزرۆم بیبیسم.

- عەبدوڵلای کوڕم لە جەنگی جەلەولادا بەشداریی کرد. ئەو جەنگە یەکێک بوو لەو جەنگانەی کە لەگەڵ سوپای فارسدا ڕووی دا، لەوێ بایی چل هەزار دیرهەم مەڕی کڕیبوو، دوای ئەوەی گەڕایەوە و، من بەم کارەم زانی، عەبدوڵلام لە خۆم نزیک کردەوە.

پێم وت: "ڕۆڵە! ئەگەر من لە لێواری ئاگردا بم و خەریک بن بمخەنە ناو ئاگرەوە، دوایی یەکێک بێت و پێت بڵێ: 'ئەگەر چل هەزار بدەی باوکت ڕزگار دەکەین،' تۆ چل هەزارم بۆ دەدەی؟"

وتی: "باوکە گیان! بە خوا هەر شتێک تۆ ئازار بدا، نەک چل هەزار، بەڵکو ئامادەم هەمووماڵی دونیا بدەم و لێت دوور بخەمەوە!"

منیش وتم: "من وەک ئەو کاتەم لە بەرچاو بێ کە ئەو کڕین و فرۆشتنەتان تێدا کردووە ئاوایە. دڵنیام ئەوان وتوویانە: 'ئەمە عەبدوڵلای کوڕی عومەرە! هاوەڵی پێغەمبەرە! کوڕی خەلیفەیە، خۆشەویسترین کەسی خەلیفەیە - لە ڕاستیشدا هەر وایە.- 'جا ئەوان لە بەر ئەم هۆکارانە پێیان خۆش بووە کە مەڕوماڵاتەکەیان بە هەرزان بە تۆ بفرۆشن و، بە هیچ شێوەیەک قازانجت لێ نەسەنن. منیش دابەشکار و بەرپرسم. بڕۆ بپرسە بزانە ئەگەر ئەو ڕانە هیی بازرگانێکی قورەیشی بووایە، چەندە قازانجی لەو مەڕانە دەکرد؟ من لەوە زیاترت پێ دەدەم، هەموو دیرهەمێ دیرهەمێک قازانجت پێ دەدەم!"

- ئەی عەبدوڵلا چی وت؟

ـ لە هەڵوێستێکی ئاوادا عەبدوڵلا هەرگیز بێ گوێیی باوکی ناکا!

ـ ئەی تۆ چیت کرد؟

ـ بانگی بازرگانەکانم کرد، عەبدوڵلا هەرچی کڕیبوو، هەمووم فرۆشت بە چوارسەد هەزار دیرهەم. هەشتا هەزارم دا بە عەبدوڵلا، هەر دیرهەمێک دیرهەمێک قازانج. ئەوەیشی کە مایەوە(کە بریتی بوو لە سێ سەد و بیست هەزار دیرهەم) نارم بۆ سەعدی کوڕی ئەبوو وەقاص بۆ ئەوەی دابەشی بکا بە سەر خەڵکدا.

ـ بە خوا تۆ زۆر سەیری قوربان! ئەوەندە خۆپارێزی! بە خوا ئەگەر کەسێکی تر ئەو قسەیەی بکردایە، گومانم لێ پەیدا دەکرد، بەڵام تۆ تۆی، شەیتان لە ترست دەردەپەڕێ، بە هەر ڕێگەیەکدا بڕۆی، شەیتان بە ڕێگەیەکی تردا دەڕوا. قسەکانت کردەوەکانتە، کردەوەکانت قسەکانتە، بەڵام قوربان وانازانی لە خۆپارێزیدا زیادەڕەویت کردووە؟!

ـ ئەی ئەو ڕانەی کە بە عەبدوڵلا فرۆشراوە، بەو پارەیەی کە پێی فرۆشرا، لەبەر ئەوەی کە هاوەڵی پێغەمبەرە و کوڕی خەلیفەیە و خۆشەویسی خەلیفەیە، ئەوە زەرەر نییە بۆ موسڵمانان؟

ـ دەی قوربان ئەگەر وا بووایە، ئەمە باش! بەڵام تۆ چوزانی لەبەر ئەو هۆکارانە بە هەرزان پێی فرۆشراوە؟

ـ کوڕم! خۆپارێزی ئەوەیە کە لە ترسی تووشبوون و تێوەگلان بە حەرامەوە، حەڵاڵ بکەی بە دە بەشەوە، واز لە نۆ بەشی بێنی. خۆ ئەگەر بەو جۆرەیش نەبوو کە من گومانم هەیە، ئەوا نە عەبدوڵلا و نە من هیچ زەرەرێکمان نەکردووە، پارە دێی و دەچێ، دونیا ڕوو دەکاتە مرۆڤ و پشتی تێ دەکا. ئەی ئەگەر گومانەکەی من ڕاست دەرچێ و پێیشم وایە ڕاستە، ئەی نەترسم لە ڕۆژی پەسڵاندا لێپێچینەوەم لەگەڵدا بکەن؟

- بە خوا گەورەم! کەسی وەک تۆ زۆر لەو ڕۆژە دەترسێ و، کەسی وەک جەنابت دەگمەنە!

- کوڕم! لەو دونیا هەموومان بە تاک تاک دەچینە بەر بارەگای دادگای خوا و خزمەتی پەروەردگار، ئەگەر ئەو هەمووە خەڵکە هەر هەمووی دادگەر بووبێ و من بە تەنیا ستەمکار، ئەوا دادگەریی ئەوانە هیچ دادێکی من نادا. ئەگەریش هەموویان ستەمکار بووبن، تەنیا من دادگەر بووبم، ئەوا ستەمی ئەوان زەرەر لە من نادا،.من برای ئامین نیم، خەڵک هەرچییان کرد و هەرچییان وت، هەر بڵێم: ئامین، ئەو برا ئامینانە هەمیشە پاشکۆی خەڵکن. ئەگەر خەڵک چاک بوو، ئەوانیش چاکە دەکەن؛ ئەگەریش خەڵک خراپ بوو، ئەوانیش خراپەکار.

- نا قوربان دوور لە تۆ، گەورەم! هیچی تر هەیە باسی بکەی؟

- بەڵێ شتی ترم لایە!

- دەی گوێم گرتووە فەرموو!

- پیاوێک لە مەدینە هەبوو ناوی موعەیقیب بوو، کاربەدەستی من بوو، کردبوومە بەرپرسی خەزێنەی شاری مەدینە. ڕۆژێک من و عاصمی کوڕم پێکەوە بووین، موعەیقیب هات بۆ لام.

وتم: "موعەیقیب دەزانی ئەمە چی کردووە؟"

وتی: "نەوەڵڵا گەورەم."

وتم: "ڕۆشتوە بۆ عێراق، لەوێ وتوویەتی: 'من کوڕی خەلیفەی موسڵمانانم." داوای شتی لێ کردوون، جامێکی زیو و هەندێ کەلوپەل و شمشێرێکی نایابیان پێداوە!

عاصم وتی: "باوکە! من وام نەکردووە، هەر چووم بۆلای کۆمەڵە خەڵکێک و داوای هیچم نەکرد، ئەوان خۆیان پێیان داوم."

منیش وتم: "ئادەی موعەیقیب! ئەو شتانە هەر هەمووی هەڵبگرە و بیبە بیانخەرە ناو خەزێنەوە!"

- دەی قوربان خۆ عاصم دەڵێ: "من داوای هیچم نەکردووە،" ئیتر تۆ بۆ هەر دەڵێی داوات کردووە؟

- با داوایشی نەکردبێ، ئەگەر کوڕی خەلیفە نەبووایە، هیچیان پێ دەدا؟!

- لەوانەیە! چونکە ئەوە دیارییە.

- ئەگەر عاصم کوڕی من نەبووایە و، باوکی خەلیفە نەبووایە، ئەوە دەمگوت دیارییە، بەڵام سوێند بە خوا! مادەم کوڕی خەلیفەیە، نابێ شتی ئاوا لە ماڵی مندا بوونی هەبێ. ئەگەر سوور بیشزانم دیارییە، هەر ناهێڵم. ئەی کوڕم پێم نەوتی: "خۆپارێزی ئەوەیە کە لە ترسی تووشبوون و تێوەگلان بە حەرامەوە ،حەڵاڵ بکەی بە دە بەشەوە، واز لە نۆ بەشی بێنی"؟!

- با قوربان!

- ئەی ئیتر ئەم بگرەوبەردەیەت لە چییە؟

- قوربان داوای لێبوردن دەکەم! مەبەستم مشتومڕ و چەلەحانێ نییە، مەبەستم ئەوەیە باش لە مەبەستت تێبگەم!

- دەی باشە قەیناکا.

- دەی قوربان هیچی ترت لایە لەم باسانە؟

- بەڵێ، هێشتا لامە!

- دەی فەرموو گەورەم! گیانم لاتە.

- عەبدوڵلا و عوبەیدوڵلای کوڕم هەردوو لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بەرەو عێراق ڕۆشتن، لە کاتی گەڕانەوەدا گەشتبوون بە ئەبوو موسای ئەشعەری، والیی بەصرە، ئەبوو موسا بەخێرهاتنی کردبوون...

دوایی وتبووی: "ئەگەر بمتوانییایە خزمەتێکتان بکەم، دەمکرد!"

کەمێک بێدەنگ دەبێ و دوایی دەڵێ: "ئا دەتوانم!"

ئەوانیش وتیان: "چییە؟"

وتبووی: "هەندێ پارەم لایە، هیی خەزێنەیە و دەمەوێ بینێرم بۆ خەزێنەی مەدینە، ئێوە بیبەن، لێرە شتی پێ بکڕن و، لە مەدینە شتەکان بە قازانج بفرۆشنەوە و پارەکە بدەنە دەست باوکتان و، قازانجەکەیش بۆ خۆتان!"

- ئەی ئەوان چییان کرد؟

- قسەی ئەبوو موسایان پەسەند کردبوو، پارەکەیان وەرگرتبوو، هەموویان دابوو بە شتومەک، هاتنەوە مەدینە و شتەکانیان فرۆشت و قازانجێکی باشیان کرد. دواتر پارەکەیان هێنایەوە بۆ من و قازانج بۆ خۆیان!

- چەن ئەمین بوون! پارەکەیان بە تەواوی هێنایەوە؟!

- هەر ئاوا بە سووکی سەیری مەسەلەکە دەکەی؟!

- ئەی چۆن سەیری بکەم گەورەم؟!

- زۆرە زۆر.

- چییە؟

- هەردووکیانم موحاسەبە کرد!

- چۆن؟

- پێم وتن: "ئەوە ئەبوو موسا لەو پارە بەشی هەموو سوپاکەی داوە؟"
وتیان: "نەخێر!"

وتم: "دەی دەبێ پارەکەیش و قازانجەکەیش بێنن!"

- ئەی ئەوان چییان وت؟

- عەبدوڵلا بێدەنگ بوو، ئەو هەرگیز قسەی لە قسەی مندا نەدەکرد، بەڵام عوبەیدوڵلا وتی: "چۆن شتی وا دەبێ قوربان؟ ئەی ئەگەر پارەکەمان ون بکردایە پێت نەدەبژاردین؟ ئەگەر کەمی بکردایە نەماندەبژارد؟"

- دەی قوربان عوبەیدوڵلا ڕاست دەکا!

- ئەگەر بە گوێرەی دادگەری بێ، وایە ڕاست دەکا، بەڵام ئەی خۆپاریزی کوا؟ لە کوێیە؟

- دەی قوربان خۆپارێزی ئا لەم کارەدا چییە و چۆنە؟

- ئەگەر ئەبوو موسا پارەی بە هەموو سوپاکە دابا، ئەوا منیش دەمگوت: قەیناکا، ئەوانیش وەک ئەو هەمووە خەڵکە! وەک ئەو خەڵکە پارەیان وەرگرتووە و شتیان کڕیوە و فرۆشتویانە و قازانجیان کردووە. بەڵام بۆ تەنیا پارە بە کوڕەکانی من دەدرێ؟ ئەوە لەبەر ئەوەیە کوڕی خەلیفەن! ئەوە لەبەر من ئەبوو موسا پارەی پێ داون!

- ئەی تۆ چیت کرد؟

- دیسان وتم: "پارەکەیش و قازانجەکەیشی بێننەوە!"

- ئەی ئەوان چییان کرد؟

- دووبارە عەبدوڵلا بێدەنگ بوو، عوبەیدوڵلا هاتەوە دەنگ!

- ئەی کێشەکە چۆن کۆتایی پێ هات؟

- پیاوێک لەوێ دانیشتبوو، وتی: "گەورەم! من شتێک دەڵێم: با قازانج بە نیوەیی بێ، پارەکە بێننەوە، قازانجەکەیش بکەن بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ خەزێنە و بەشێکی بۆ خۆیان!"

منیش قسەی ئەو پیاوەم پەسەند کرد و بە گوێم کرد!

- ئای قوربان! خۆپارێزی خۆپارێز! دادگەری! لەوێنەت نییە!

- ڕاوەستاو و پایەدار ئەو کەسەیە کە خوای گەورە ڕاوەستاو و پایەداری بکا، داماویش ئەو کەسەیە کە خوا حەواڵەی لای خودی کەسەکەی بکا!

- گەورەم ! هیچی تر هەیە؟

- بەڵێ، هەگبەکە خاڵی نەبووە.

- دەی فەرموو قوربان!

- دوو ڕووداوە لەنێوان من و ئوم کەلسومی ژنم کە کچی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب بوو و، هەروەها عاتیکەی کچی زەید کە ئەویش هەر ژنم بوو. ئەمەت بۆ باس دەکەم بۆ ئەوەی بزانی کە من جیاوازیم نەکردووە لەنێوان ژن و منداڵ و

کەسوکاری خۆم و خەڵکدا، بە یەک ترازوو شتەکانم پێواوە، چیم بۆ خۆم کێشابێ، بۆ خەڵکیشم کێشاوە، پێشتریش پێم وتی: "هەرکەس وەک خۆی حیسابت بۆ بکا، ئەوە ستەمت لێ ناکا!"

- دەی قوربان ئەوا من گوێم گرتووە، بزانم ئەو دوو ڕووداوە چین؟

- ڕووداوی یەکەم: پاشای ڕۆم هەستی بەوەکرد کە ئایینی ئیسلام بەربڵاو بووە و گەشەی کردووە، دەیزانی بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ شام بگەڕێنێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی، بۆیە وازی لە جەنگ هێنا و نامەیەکی بۆ نووسیم، لەنێوانماندا نامەبەر هەبوو، ئوم کەلسومی ژنم کە کچی عەلی بوو، عەترێکی نایاب و هەندێ کەلوپەلی ژنانەی دابوو بە نامەبەرەکە تا وەک دیاری لە لایەن ژنی خەلیفەوە بیبا بۆ ژنی پاشای ڕۆم. منیش بەم کارەم نەزانیبوو. دوایی ژنی پاشای ڕۆم دەست و پەیوەندی خۆی کۆ کردبووەوە و وتبووی: "ئەمانە دیاریی ژنی خەلیفەی موسڵمانان و کچەزای پێغەمبەرەکەیانە، بۆ منی ناردوە. منیش دەمەوێ دیاری بۆ ئەو بنێرم."

ئەوانیش پێیان وتبوو: "دەی کارێکی باش دەکەی!"

شاژن ملوانکەیەکی زۆرزۆر نایابی بۆ ئەم کەلسوم بە دیاری نارد.

نامەبەرەکە نامەی پاشا و ملوانکەی شاژنی هێنایەوە.

من ملوانکەکەم بینیی و وتم: "ئەمە چییە؟"

وتی: "قوربان ژنەکەی تۆ دیاری بۆ شاژن ناردبوو، ئەویش ئەم دیارییەی بۆ ئەو ناردووە."

پێم وت: "لای خۆت هەڵیبگرە تا بزانم چی لێ بکەم."

- ئەی دوایی چیت کرد قوربان؟

- بانگی خەڵکم کردو وتم: "الصلاة جامعة!"

خەڵک کۆبوونەوە، دوو ڕکات نوێژمان بە کۆمەڵ کرد و دوایی وتم: "هەر کارێکی من کە بەبێ پرس و ڕاوێژ بکرێ، خێری تیا نییە. ئێوە ڕاتان چییە لەسەر

دیارییەک کە ئوم کەلسوم ناردوویەتی بۆ شاژنی پاشای ڕۆم؟ ئەویش ئا ئەم ملوانکەیەی وەک دیاری بۆ ئوم کەلسوم ناردوە؟"

ملوانکەکەم پیشانی هەر هەموویان. داهەندێکیان وتیان: "ئەوە ملوانکەی خۆیەتی و دیاری بە دیاری! خۆ تۆ ناتوانی حوکم بە سەر شاژنی ڕۆمدا بکەی و ئەویش لە تۆ ناترسێ!" هەندێکی تر وتیان: "ئێمە پۆشاکمان دەکرد بە دیاری بۆ ئەوەی لەبەر بکرێ، دەماننارد بۆ ئەوەی بفرۆشرێت و پارەمان دەسکەوێ." منیش وتم: "بەڵام نامەبەرەکە نامەبەری موسڵمانانە، نامەکە نامەی موسڵمانانە، موسڵمانان لە دڵی خۆیاندا بە چاوێکی گەورەوە تەماشای ئوم کەلسوم دەکەن! "

- دوایی چیت کرد گەورەم؟

- فرمانم کرد کە ئەو ملوانکەیە بخرێتە نێو خەزێنەی دەوڵەتەوە و نرخی ئەو دیارییانەی کە ئوم کەلسوم بۆ شاژنی ناردبوون، پێم دایەوە.

- ئەی قوربان پێغەمبەر ﷺ خۆی دیاری نەدەنارد بۆ خەڵک و، خەڵکیش دیارییان نەدەنارد بۆ ئەو؟

- با وابوو.

- ئەی قوربان پاشا موقەوقیس مارییەی قیبتی وەک دیاری نەنارد بۆ پێغەمبەر ﷺ و پاشتر ماریە موسڵمان بوو، پێغەمبەریش ئازادی کرد و دوایش مارەی کرد، خوای گەورەیش کوڕێکی پێ بەخشی و ناوی نا ئیبراهیم؟

- با ئەوەیش وابوو.

- ئەی هەر خواردنێک بە دیاری بهاتایە بۆ پێغەمبەر ﷺ، لێی نەدەخوارد؟ بەڵام ئەگەر خێر بووایە تامی نەدەکرد و دەیفەرموو: "ئێوە بیخۆن، من شتی صەدەقە ناخۆم"؟

- با ئەوەیش وابوو، پێغەمبەر ﷺ وابوو.

- دەی ئیتر بۆ دیارییەک لە خێزانەکەت دەسەنیتەوە کە بۆی هاتووە و خۆی داوای نەکردووە؟

ـ من لەبەر ئەوە لێم نەسەندەوە بڵێم دیاری حەرامە، ئەگەر دیاری حەرام بووایە، چۆن خەڵکم کۆ دەکردەوە و ڕاوێژم پێ دەکردن؟ماڵی حەرام حەرامە و ڕاوێژی ناوێ، هەر بەو ڕاوێژە دەردەکەوێ کە من دیاریم پێ حەرام نییە، بەڵام بیرم کردەوە و لە دڵی خۆمدا وتم: "ئەم دیارییە مافی موسڵمانانی تێدایە." ئەوەیش لەبەر دوو هۆکار.

یەکەم: نامەبەر فەرمانبەرە، کاری فەرمانبەر دەبێ بۆ تەواوی موسڵمانان بێ نەک بۆ تاکە کەسێ. خۆ نامەبەرەکە نامەبەری ئوم کەلسوم نەبوو تا دیاری لەلایەن ئەوەوە ببا و دیاریشی بۆ بێنێتەوە! هەرچەند ئوم کەلسومیش موسڵمانە، بەڵام خۆ نامەبەرەکە هیچی هیچ کەسێکی نەدەبرد، بۆیە دیاریی ئوم کەلسومی بردبوو، چونکە ژنی خەلیفە بوو. منیش پێم ناخۆشە کەسوکاری عومەر شتی گشتی بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی بەکار بێنن. ئەگەر ئەو نامەبەرە شتی هەموو کەسێکی ببردایە و بیهێنایەتەوە، ئەوە شتێکی تر بوو!

دووەم: گەورەیی ئوم کەلسوم لەنێو دڵی شاژندا لەبەر گەورەیی موسڵمانانە؛ سوپای ئیسلام لە شامدا سەرکەوتبوو، خۆ ئەگەر پێچەوانە بووایە و سوپای ئیسلام شکابا، ئەوا هەرگیز شاژن دیاریی بۆ ئوم کەلسوم نەدەنارد. کەوابوو هەموو موسڵمانان بەشیان لەو ملوانکەدا بوو بە دوو بەڵگە:

یەکەم: موسڵمانان هاوڕێ و هاو ئایینی نامەبەرەکەن.

دووەم: شان و شکۆ، شان و شکۆی موسڵمانانە. دیاریوەرگرتنی ئوم کەلسوم، نانخواردنە بە سەر شان و شکۆی موسڵمانانەوە. منیش ڕازی نابم ماڵ و منداڵ و ژن و کەسوکارم بە سەر موسڵمانانەوە نان بخۆن.

ـ بەڵام خۆ قوربان دوای ئەوەی ملوانکەکەت لێ سەندەوە، نەتکرد بە هاوبەش لە ملوانکەکەدا، تەنیا نرخی ئەو شتانەت پێ دایەوە کە بۆ شاژنی ناردبوون.

ـ ئاخر ملوانکە دابەش ناکرێ، ئەگەر دابەشم کردبا، نرخی نەدەما، کەڵکی بەکارهێنانیشی نەدەما، ئەوکاتە هەم ستەمم لە ئوم کەلسوم دەکرد، هەم لە موسڵمانان!

- بەڵام خۆ دەتتوانی بە پارە بیخەمڵێنی و، بەشەکەی ئوم کەلسوم بدەی!

- بەڵێ دەمتوانی وا بکەم. ئەگەر ئوم کەلسوم ژنی خەلیفە نەبووایە، هەروام دەکرد، بەڵام ئەگەر پارە لە بنەماڵەی عومەر بسەنم و بیدەم بە موسڵمانان، لەوە باشترە لە موسڵمانانی بسەنم و بیدەم بە بنەماڵەی عومەر. لە بیرت نەماوە لە بارەی پارێزگارییەوە چیم پێ وتی؟

- نا، قوربان لە بیرمە، بەڵام جار لە دوای جار سەرسامتر دەبم بە کارەکانت. هەموو جارێک دەڵێم: "ئیتر تەواو، جارێکی تر کارێک ناکا سەرسام بم،" بەڵام بەردەوام سەرسامم دەکەی!

- ئەی عومەر جارێک بە خۆپارێزیەوە بڕیار بدا و جارێکی تر بێ خۆپارێزی؟! منداڵەکانی بخاتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خۆیەوە و واز لە ژنەکانی بێنێ؟!

- نا بە خوا شتی وا ناکەی!

- شتی وام هەرگیز نەکردووە و نایکەم.

- قوربان فەرموت: "دوو ڕووداو،" ئەوە یەکەم. ئەی ڕووداوی دووەم چییە و چۆنە؟

- ڕووداوی دووەم بەم جۆرە بوو:

لە بەحرەینەوە هەندێک میسک و عەنبەرم بۆ هاتبوو. منیش وتم: "خۆزگە ژنێکی وریا و لێزانم دەست بکەوتایە ئەم میسک و عەنبەرەی جوان بەش بەش بکردایە با دابەشم بکردایە بەسەر موسڵماناندا!"

عاتیکەی ژنم وتی: "ئەگەر تۆ ڕازیبی، من دەتوانم زۆر بە باشی بەش بەشی بکەم!"

وتم: "نابێ."

وتی: "بۆچی؟"

وتم: "دەترسم لە کاتی دابەش کردندا دەستت بدرێ بە میسک و عەنبەرەوە و لاملی خۆتی پێ بۆنخۆش بکەی و، بۆنی بێت بەسەر مندا و بەو هۆیەوە بەشەکەی من لە بەشی خەڵک زیاتر دەرچێ؟!"

- ئای باوکە ڕۆ! بۆنیش حساب دەکەی؟!

- بەڵێ کوڕم بۆنیش حساب دەکەم! هەرکەس نرخ بۆ وردە شت دانەنێ، دەکەوێتە داوی شتە گەورەکانەوە. نە عومەر و نە کەسوکاری عومەر بۆیان نییە بە قەد تۆسقاڵێک لە موسڵمانان زیاتر ببەن!

- بەڵام قوربان، بۆن! ئەوەیش؟!

- بەڵێ، با بۆنیش بێ!

- ئەی قوربان چیت کرد بە میسک و عەنبەرەکە؟

- دام بە ژنێکی تر بەش بەشی کرد.

- ئەی تۆ چۆن دەزانی دەستی ئەو ژنەی تر میسکاوی و عەنبەراوی نابێ و نایدا لە لاملی و مێردەکەی بۆنی ناکا؟

- من دەزانم دەبێ هەر وا بێ، ناکرێ کەسێک میسک و عەنبەر بەش بەش بکا و دستی نەدرێ بە بۆنەوە! ئێ کە دەستیشی پێوە درا، چی پێ بکا؟ دەبێ هەر بیهێنێ بە لاملیدا و لاملی پێ بۆنخۆش بکا.

- دەی مادەم وایە، ئیتر بۆچی نەتهێشت عاتیکە بەش بەشی بکا و دات بە ژنێکی تر؟

- قەیناکا، من پێم خۆشە ئەو تۆزە زیادەیە بەر کەسێکی تر بکەوێ نەک بەر کەسوکاری عومەر! هەرچەند شتەکە ناچارییە، بەڵام با ئەو ناچارییە بەر کەسوکاری من نەکەوێ.

- ئەی قوربان من پێم نەوتی: بەردەوام سەرسامم دەکەی؟! کێ وەک تۆ بیر لە شتی ئاوا دەکاتەوە؟ کورە شتی وا بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا نایەت!

- بەڵام بە خەیاڵی مندا هات! ئیتر ئاوایە کە پێم وتی.

- بە خوا هیچم بە خەیاڵا نایەت جگە لەوەی کە شاعیرێک دەبارەی موسڵمانان وتویەتی:

گەر ببنە دوژمن وەک شا بەهێزن

حوکمیان بە سەردەی هەموو وەک یەکن[1]

- بەڵێ ڕاست دەکەی موسڵمانان ئاوهان!

- بە خوا تۆیش تاجی تاج. ئەو ڕۆژەی تۆیان هەڵبژارد و تۆیان کرد بە گەورەی خۆیان، ئەوان بوون بە پادشا و تۆیش بووی بە تاجی سەریان، هەم دونیایان بردەوە و هەم قیامەت.

- خوای گەورە پاداشمان بە چاکە بداتەوە.

- ئامین! قوربان باسەکەمان بە ئەهلی زیممە دەست پێکرد، بەڵام قسە قسەی ڕاکێشا لە باسەکەی خۆمان دوور کەوتینەوە. ئیزن دەفەرمووی بچینەوە سەر باسەکەی خۆمان و بە پرسیارێک کۆتایی پێ بێنین و دواتر چەندە بە قسمەت بوو، باسی دادگەری بکەین؟

- باشە با بە دڵی تۆ بێ، چ پرسیارێک دەکەی بیکە!

- جولەکەیەکت بینی سواڵی دەکرد، باسی ئەوەم بۆ بکە!

- ڕۆژێک دام بە بەردەمماڵێکدا، سواڵکەرێک لە بەردەم ماڵەکەدا بوو، سواڵی دەکرد، دەیوت: "پەککەوتەم، پیرم، کوێرم!"

- دەستم خستە سەر شانی و وتم: "تۆ لەسەر چ ئایینێکی؟"

وتی: "جولەکە."

وتم: "بۆچی سواڵ دەکەیت؟"

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

قوم اذا استخصموا كانوا فراعنة يوما، و إن حكموا كانوا موازينا.

وتی: "بە پارەی سوالکەری سەرانە دەدەم و، خۆمی پێ دەژییەنم!"

- ئەی قوربان تۆ ئەوەت بیست چیت کرد؟

- دەستیم گرت و بردمەوە بۆ ماڵی خۆیان. بە دەستی خۆم تێرم کرد، ئاوم پێدا، زۆر بە میهرەبانی لەگەڵی دوام، هەندێ شتی پێوست بوو، پێم دا. دوایی ناردم بە شوێن خەزنەداری خەزێنەدا و پێم وت: "چاوت لەم پیاوە و هەر کەس وەک ئەم پیاوەیە بێ، بە خوا زۆر بێ ویژدانییە کە بە گەنجییەکەی بخۆین و بەپیری بەرەڵڵای بکەین!"

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَـٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَـٰكِينِ﴾ التوبة: ٦٠ واتە: "بێگومان زەکات بۆ هەژاران و نەداران و...." مەبەستی خوا لە فقراء موسڵمانانە و مەبەستی لە مساکین جولەکە و گاورە!

دوای ئەوە سەرانەم لەو پیاوە و لە هەر کەس وەک ئەو پیاوە بوو، نەسەند. نامەیشم نووسی بۆ هەموو والییەکان و پێم ڕاگەیاندن کە هەر کەس بە گوێرەی توانای خۆی نەبێ، زیاتری لێ نەسێنن و، نابێ پیروپەککەوتە سەرانەیان لێ بسەنرێت. تەنانەت دەبێ لە خەزێنە مووچەی شایستەیان بۆ دابین بکرێت!

- بە خوا قوربان دادگەری لەمە گەورەتر و زیاتر نابێ، سۆز و میهرەبانی لەمە زیاتر نابێ، پیاو بەزەیی بە کەسێکدا بێتەوە کە هاوئایینی نییە! سەرانەی لێ نەسەنێت و تەنانەت مووچەشی بۆ ببڕێتەوە!

- کوڕم! پیاوی موسڵمان بەڵێنشکێن نییە. ئەو پیاوە لە گەنجیدا بەڵێنی خۆی بەجێ هێنابوو، لە ئێستادا کوێر و پیر بووبوو، چارەی نەمابوو، ئێستە ئیتر سەرەتای ئەوەیە کە هەرچیمان لێ سەندوە، پێی بدەینەوە. دواتر، بەخشین تەنیا بریتی نییە لە ماڵ و دارایی، ئێمە ئابڕووی مرۆڤیش دەپارێزین، دڵی خەڵک ڕادەگرین، کەرامەت و شکۆی خەڵک دەپارێزین، ئابڕووبردنی مرۆڤ وەک کوشتن وایە!

- قوربان! بۆیە باشە مرۆڤ لە خزمەت جەنابتدا هەر بێدەنگ بێ و گوێ بگرێ و سەر بۆ قسەکانت ڕاوەشێنێ!

- من هەرچیم کردووە، لەبەر ڕەزامەندیی خوا کردوومە، بۆ ئەوەم نەکردووە کەس پەسنم بدا. چی بە ڕاست بزانم، دەیکەم، هەرچیش بە ناڕاست بزانم، لێی نزیک نابمەوە. جا کێ پێی خۆشە، پێی خۆش بێ و، کێیش پێی ناخۆشە، تێر ئاوی سارد بخواتەوە. لەو دونیا کەس بە فریام ناگا!

- ڕاست دەفەرمووی قوربان! گەورەم، دیسان باسی ئەهلی زیممە ماوە؟

- شتێک ماوە کە لەنێوان من و پیرەژنێکدا ڕووی دا، زۆر لە باسی پیاوە جولەکەکەی کەمێک لەمەوپێش باسمان کرد، نزیکە.

- چییە قوربان؟

- ڕۆژێک پیرەکێکی(پیرەژنێکی) جولەکە هات بۆلام، سکاڵای لە دەستەنگی و هەژاری بوو، دەیگوت: "کوڕێکم هەیە نەخۆشە، پارەم نییە چارەسەی بکەم." منیش جوان گوێم بۆ گرت تا قسەکانی تەواو کرد.

دوایی وتم: "هەستە و لەگەڵمدا وەرە!"

- بۆ کوێت برد قوربان؟

- بردم بۆ خەزێنە و، فرمانم دەرکرد مووچەیەکی وای بۆ ببڕنەوە کە بەشی بژێویی خۆیان و داوودەرمانی کوڕەکەی بکا.

- ئەی پیرەژنەکە چی کرد؟

- زۆر زۆر دڵخۆش بوو، پێی وتم: "خوا چاکەت لەگەڵدا بکا ئەی گەورەی موسڵمانان!"

- بە گەورەی موسڵمانان ناوی بردی؟

- بەڵێ، بە خوا وا ناوی بردم.

- ئەی تۆ چیت کرد؟

- منیش بە دەرفەتم زانی بۆ ئەوەی شتێکی بخەمە بەردەم کە قازانجی دین و دونیای تیابێ؟

- چی بوو گەورەم؟!

- زۆر بە سۆزەوە پێم وت: "پورێ گیان! بۆ موسڵمان نابی؟ موسڵمانبوون خێری دین و دونیای تیایە."

- ئەی ئەو چی وت؟

- وتی: "نا، ئەمەیان نا ئەی گەورەی موسڵمانان!"

- ئەی تۆ چیت پێگوت؟

- وتم: "کەیفی خۆتە و خۆت دەزانی."

ملی ڕێگای گرتە بەر و ڕۆیی، لە دڵدا سەرکۆنەی خۆمم کرد و وتم: "بۆ بەو شێوەیە لەگەڵیدا جوڵامەوە."

- بۆچی قوربان، خۆ تۆ قسەیەکی خراپت نەکرد، بۆچی سەرکۆنەی خۆتت کرد؟

- تۆ وانازانی کە من ئیستیغلالی کاتەکەم کردبێ بۆ ئەوەی ئەو داوایەی لێ بکەم؟ دەبوو لە کاتێکی تردا داوای موسڵمانبوونم لێ کردبا!

- گەورەم! تۆ شتێکت خستووەتە بەردەمی کە بۆ دین و دونیای باش بووە، خۆ داوای شتێکت لێ نەکردووە کە قازانجی خۆتی تیابێ. دیارە ئەگەر پەسەندی بکردایە، تۆیش بەش بە حاڵی خۆت بەشت لەو خێر و چاکەیەدا دەبوو، بەڵام خۆ ئێستە ئەو داواکەی پەسەند نەکردووە، تۆ گوناهبار نەبووی. تەنانەت دوای ئەوەیش کە داواکەی پەسەند نەکرد، تۆ هێشتا خێری ئەوەت بۆ نووسراوە کە بانگهێشتت کردووە.

- بە خوا ترسام ئەو داوایە لەو کاتەدا وەک زۆری لێ بێ، بە خوا لە ژیانمدا هەرچەندێ پەشیمان بووبێتمەوە، ئەوا بە ئەندازەی دوو شت پەشیمان نەبوومەتەوە:

یەکەم، ئەو ڕۆژەی کە لەبارەی ئاشتیکردن و ئاگربەس لەنێوان موسڵمانان و کافران لە حودەیبیە زۆر سەرودڵی پێغەمبەرم ﷺ گرت.

دووەمیش، ئەو ڕۆژەی کە داوای موسڵمانبوونم لەو پیرەژنە کرد. ئەو لەو ڕۆژەدا ئاتاج و داماو بوو، نەدەبوو من داوای موسڵمانبوونی لێ بکەم!

- دەی قوربان ڕۆژی حودەیبیە تۆ لەبەر خوا و پێغەمبەری خوا ئاوا نیگەران بوویت و سەرودڵی پێغەمبەرت گرت. تۆ پێت وابوو ئەو ئاگربەسە بە زەرەری موسڵمانان دەشکێتەوە. سەبارەت بە پیرەژنەکەیش، ئەوە بۆ قازانجی خۆی بووە، خەفەت بەو شتانە مەخۆ.

- خوای گەورە لە هەڵەکانی عومەر خۆش ببێ.

- ئامین! قوربان تا ئێستا ئەوانەی باسکران لەگەڵ جولەکەکاندا ڕووی دابوو، ئەی لەگەڵ گاور و مەسیحیەکان هیچت هەیە؟ ئەگەر هەیە، بۆم باس بکە و با کۆتایی بەم باسە بێنین.

- پێش ئەوەی ئەم باسە بپێچینەوە، شتێکت پێ دەڵێم.

- چییە گەورەم؟

- بیستم کە هۆزی بەنی تەغەللوب لەگەڵ والییەکەی خۆیاندا کە وەلیدی کوڕی عەقەبە بوو، ناکۆکن. بە تەواوی وەلیدیان توڕە کردبوو، بۆیە تاکە بەیتێکی پێدا هەڵدابوون، وتبووی:

هەرکات منت دی جامانەم پێچا
ئالا هەڵگرە دژی تەغەللوب[1]

منیش ترسام داخی خۆی بە سەریاندا بڕێژێ، بۆیە لە کار لامدا و یەکێکی ترم کرد بە والییان.

---

[1] عەرەبییەکەی ئاوایە:

اذا ما عصبت الرأس منی بمشوذ فغیک منی تغلب ابنة وائل.

- چاکت کرد قوربان، ئەگەر خەڵک و کاربەدەست بەیەکەوە نەیانکرا، ئەوا کاربەدەست ستەمی وا دەکات کە مرۆڤ بە خەیاڵیدا نایەت، خەڵکیش بێفرمانیی وا دەکات کە بە خەیاڵی کەسدا نەیەت. کەم کەس هەیە لە کاتی تووڕەییدا دادگەر بێت، کەم کەسیش هەیە لە کاتی ستەم و زۆردا گوێڕایەڵ بێت.

- ڕاست دەکەی کوڕم! قسەکەت جوانە! منیش لەبەر ئەوە وەلیدم لە کار لابرد.

- گەورەم هیچی تر هەیە بۆم باس بکەی؟

- ڕۆژێک بە شامدا تێدەپەڕیم، تەماشا دەکەم هەندێ گاور تووشی نەخۆشیی گولی بووبوون، منیش فرمانمدا کە مووچەیان بۆ ببڕنەوە و خواردەمەنییان پێ بدەن.

- بۆ واتکرد؟

- ئێمە بەزەییمان بە ژێردەسەکانی خۆماندا دێتەوە. ئەوانە کۆمەڵێکن لەژێر فەرمانڕەوایی مندا دەژین. منیش ناهێڵم هیچ کەس لەژێر دەسەڵاتی مندا بفەوتێ، هەرچەند بیروڕا و ئایینیشمان جیا بێت، هەر ڕازی نابم. ئەو دونیایش کێشەی من نییە و، لەوێ خوا بڕیار دەدا. بەڵام کێشە و ژیانی دونیایان لای منە، من بەرپرسم لە هەر ئازێشە و کەم وکوڕییەکیان.

- بەڵام خۆ من بیستوومە تۆ هەندێ پلەت لە جولەکە و گاور قەدەغە کردووە، وەک موسڵمانان ناتوانن هەموو کارێک بگرنە دەست، ئەمە ڕاستە؟

- بەڵێ وایە.

- بۆچی قوربان؟

- من هەندێ لە پۆستە گرنگەکانم نەدەدا بەوان، بۆ ئەوەی دادگەری بە تەواوی جێبەجێ بکرێ، ستەم لە کەس نەکرێت، من بە والی و کاربەدەستانم دەوت: "نەکەن کار بدەن بە دەست جولەکە و گاورەوە، چونکە ئەوان بەرتیل بە حەڵاڵ دەزانن و، وەری دەگرن!"

ڕۆژێک داوام لە ئەبوو موسای ئەشعەری کرد ژمێریارێک بێنێ بۆ ئەوەی دارایی و داهاتی خەزێنە حساب بکا، پیاوێکی گاوری هێنا.

پێم وت: "من پێم وتی: 'پیاوێکم بۆ بێنە کە لەو ئەمانەتەی لەسەر شانمە یاریدەم بدا،' ئێستە یەکێکت هێناوە کە دینی لەگەڵ دینی مندا جیاوازە!"

من کۆیلەیەکم هەبوو موسڵمان نەبوو، ناوی ئەسبەق بوو، پێم وت موسڵمان ببە با هەندێ کاروبارت پێ بسپێرم، لە گوێی نەکردم، منیش ئازادم کرد و پێم وت: "بڕۆ بۆ کوێ دەڕۆی ئازادی!"

- بۆچی کاروبارت نەدەدایە دەستیان؟

- چونکە خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەسەرمان کە متمانەیان پێ بکەین و نهێنیی خۆمان بخەینە بەردەستیان. کاروباری موسڵمانانیش نهێنی و متمانەی کاربەدەستە، ئەمە یەک!

دووەم، چۆن کاری موسڵمانان بدەمە دەست کەسێ کە خۆی باوەڕی پێی نەبێ.

سێیەم، بڕوا ناکەم کەس گومانی لەوەدا هەبێ کە کاروباری دەوڵەت نابی بدرێ بە دەست کەسی بێگانەوە، چونکە کەسی بێگانە دڵسۆزی دەوڵەتەکە نییە. تەنانەت لەوانەیە ڕقیشی لێی بێ. ئەگەر هاتوو کاروباری گشتییان گرتە دەست، ئەوا بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاری دەهێنن نەک بۆ بەرژەوەندیی گشتی. بڕوا ناکەم لە هیچ دەوڵەتێکدا کاروبار هەروا بەبێ مەرج بدرێ بە دەست کەسانی ناو دەوڵەتەکەوە، چ جای ئەوەی بێگانە بێ!

- وەڵلا ڕاست دەکەی گەورەم وایە! بەڵام قوربان شتێکی ترم بیستووە، دەڵێن تۆ نەتهێشتووە کە کافرەکان جلوبەرگی موسڵمانانە لە بەر بکەن، ئایە ئەمە ڕاستە؟

- بەڵێ ڕاستە.

- دەی ئەوە کەی دادگەرییە تۆ پۆشاک لەبەرکردن لە خەڵک قەدەغە بکەی؟

ـ کافری زیممی زۆربەیان خەڵکی ئەو شوێنانە بوون کە ئازاد کرابوون، موسڵمانان لەو ناوچانەدا سەرباز و سوپایی بوون، ئیتر چۆن بێڵم جل و بەرگی ئەو سەربازانە لە بەر بکەن و خۆیان وەک ئەوان دەربخەن! لەوانەیە یەکێک بە مەبەست بە جلوبەرگی موسڵمانانەوە کارێکی خراپی بکردایە و لەسەر سەربازە موسڵمانەکان حساب بکرایە!

مۆڵەت بدە با پرسیارێکت لێ بکەم تا شتەکە باشتر ڕوون بێتەوە.

ـ فەرموو قوربان بپرسە!

ـ بۆچی کافری ئەو ناوچانەی کە ئازاد کرابوون، پێیان خۆش بوو پۆشاکی موسڵمانانە بپۆشن؟

ـ نازانم! بۆچی وابوو؟

ـ ئەگەر ئایینی ئێمەیان خۆش دەویست، بۆ موسڵمان نەبوون؟ ئەو کاتە هەرچی بۆ ئێمە ڕەوا بووایە، بۆ ئەوانیش ڕەوا دەبوو! من وا گومان دەبەم ئەوانە تەنیا لەبەر ئەوە حەزیان دەکرد پۆشاکی موسڵمانانە بپۆشن، بۆ ئەوەی ئێمە وابزانین موسڵمانن و خۆیان لە هەندێ شت بدزنەوە کە دەبوو بیکەن. وەکوو خوێی ناو ئاو خۆیان لەناو موسڵماناندا بتوێننەوە، ئەگەر مەبەستیان ئەوە نەبوو، ئەی چی بوو؟

ـ باشە ئەمە بۆچوونێکی جوانە! بەڵام لە بارەی ئەو عەرەبە ڕەسەنانەی کە موسڵمان نەبووبوون چی؟ لەوانیش قەدەغە کرا؟

ـ نەخێر لەوان قەدەغە نەکرا، ئەو جلوبەرگانە پێش ئیسلام هەبووە و جلوبەرگی ڕەسەنی خۆیانە، هەرگیز بیستوتە کە عومەر جلوبەرگی تایبەتیی دیاری کردبێ بۆ جولەکەکانی خەیبەر؟

ـ نەخێر، نەمبیستووە!

ـ چونکە من نەمکردووە بۆیە نەتبیستووە، چونکە هیچ هۆکارێک نەبوو تا من وابکەم، بەڵام کافری وڵاتانی تر ئەوە هۆکارێک هەبوو، ئەوە بوو کە پێم وتی.

- ئای قوربان هەرگیز دادگەریت لێ ون نابێ.

- ئێستە بۆت ڕوون بووەوە؟

- بەڵێ قوربان، جوان ڕوون بووەوە.

- دەی ئیتر من لەم باسە بوومەوە، ئەگەر پرسیارت نەماوە با ئەم دەرگایە بە تەواوی دابخەین.

- باشە قوربان با قسەی جەنابت بێ، دایدەخەین، بەڵام باسی دادگەری هێشتا ماوە، پرسیارم زۆرە، کاتی داخستنی نەهاتووە، مۆڵەت دەدەی درێژەی پێ بدەین؟

- باشە پەنا بە خوا درێژەی پی دەدەین، چ پرسیارێکت هەیە بیکە.

- دەمەوێ بزانم لەنێوان تۆ و جەبەلەی کوڕی ئەیهەم چی گوزەراوە؟

- جەبەلەی کوڕی ئەیهەم ئاخرین فەرمانڕەوای غەسسانییەکان بوو، کاربەدەستی هیرەقل بوو، غەسسانییەکان لە شامدا دەژیان، لەژێر دەسەڵاتداریتی ڕۆمدا، ئیمپراتۆری ڕۆم بەردەوام هانی دەدان بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر جەزیرەی عەرەبی. بە تایبەت دوای ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ بوو بە پێغەمبەر و کۆچی کرد بۆ مەدینە و دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری مەدینەدا ڕاگەیاند، هۆزە عەرەبەکانی شام موسڵمان بوون، جەبەلەیش بە باشی زانی کە موسڵمان ببێ، خۆی و دەوروبەرەکەی هەموویان موسڵمان بوون، نامەیەکی بۆ من نووسی و داوای کردبوو کە بێت بۆ مەدینە، منیش زۆر خۆشحاڵ بووم.

- دوایی چی ڕووی دا؟

- جەبەلە هات بۆ مەدینە، ماوەیەک لەوێ مایەوە، منیش هەم لەبەر ئەوەی کاربەدەست و فەرمانبەدەست بوو و، هەم لەبەر ئەوەی کە تازە موسڵمان بووبوو، زۆر زۆر ڕێزم لێ دەگرت، دوایی جەبەلە ویستی حەج بکا، لە کاتی تەوافدا پیاوێکی هۆزی فەزارە نەیزانیبوو، بەبێ مەبەست پێی نابوو بەسەر داوێنی پشتەماڵەکەی جەبەلەدا، پشتەماڵ کرابویەوە!

ـ ئەی جەبەلە چی کرد؟

ـ وەک پێم وتی: ئەو تازە موسڵمان بووبوو، هێشتا خۆبەزلزانی و فیسی دەسەڵاتی لە دڵدا مابوو، تووڕە بووبوو، زللەیەکی بەهێزی لە کابرا دابوو، لووتی شکاندبوو. کابرای فەزاری هات بۆلای من و سکاڵای لە جەبەلە هەبوو.

ـ ئەی تۆ چیت کرد؟

ـ ناردم بە دوای جەبەلەدا و، هات بۆ لام. لەو بارەوە پرسیارم لێ کرد، دانی نا بەو تاوانەی کە کردبووی.

منیش وتم: "بۆچی ئەو زللەیەت لێ دا و لوتی ئەم داماوەت شکاند؟"

وتی: "بە خوا ئەوە بەزەییم پیا هاتەوە، ئەگەر لەبەر ڕێزی کەعبە نەبووایە، دەمکوشت!"

منیش وتم: "ئەوە دوو جار دانت بە تاوانی خۆتدا ناوە، یان ئەو پیاوە ڕازی دەکەی و گەردنت ئازا دەکا، یان تۆڵەت لێ دەکەمەوە!"

وتی: "چۆن کاری وا دەکەی؟! ئەو پیاوێکی سادە و، من فەرمانڕەوام!"

منیش وتم: "لە ئایینی ئیسلامدا هیچ جیاوازییەک لەنێوانتاندا نییە."

ئەویش وتی: "ئای گەورەی ئیمانداران! من وامزانی لە کاتی کافریدا چەندە بەڕێزبووم لە ئیسلامدا زیاتر بەڕێز دەبم!"

منیش وتم: "واز لەوە بێنە! ئێستە ئەگەر ئەو پیاوە ڕازی نەکەی و گەردنت ئازا نەکا، تۆڵەت لێ دەکەمەوە!"

وتی: "دەی دەبمەوە بە گاور!"

منیش وتم: "ئەگەر ببیتەوە بە گاور، دەتکوژم! چونکە تۆ تازە موسڵمان بوویت و بۆت نییە کافر ببیتەوە! هەرکەس لە ئیسلام وەرگەڕێ، دەکوژرێ!"

ـ جەبەلە چی بکردایە، هەموو ڕێگاکانت لێ گرتبوو، هەر دەبوو تۆڵەی لێ بکرێتەوە یان گەردنی ئازا بکەن!

- دوای ئەوەی زانی کێشمەکێش هیچ سوودێکی نابێ، جگە لە تۆڵە یان گەردن ئازایی، وتی: "لێم بگەڕێ با بیرێکی لێ بکەمەوە."

وتم: "بیری لێ بکەرەوە."

- دەی دوایی چ بڕیارێکی دا؟

- نەفامترین کاربەدەست بوو کە لە ژیانی خۆمدا دیبێتم، خۆی و کەسوکاری هەموویان بە شەو لە مەککە هەڵاتن بەرەو قوستەنتەنییە، بویەوە بە گاور!

- دوای ئەوە چی ڕووی دا، هاتەوە بۆ نێو ئیسلام یان بە گاوری مایەوە؟

- دوای ئەوەی نامەم نارد بۆ هیرەقل بۆ ئەوەی ئیسلام ببێ، وەڵامی دامەوە کە ئیسلام نابم، بەڵام ئاشتی و ئاگربەس دەکەم. دوای ئەوەی نوێنەرەکەی ئێمە ویستبووی بێتەوە، هیرەقل پێی وتبوو: "ئەوە کوڕە مامەکەی خۆتت لێرە بینی؟- مەبەستی جەبەلە بوو-"

نوێنەرەکەمان وتبووی: "نەخێر."

هیرەقل وتبووی: "بڕۆ بۆلای جەبەلە و، بۆم بێنە نامەیەکت دەدەمێ بۆ عومەر." نوێنەر چوبووە بەر دەرگای جەبەلە، تەماشا دەکا بە قەدماڵی هیرەقل پاسەوان و دەرگاوان و خزمەتکار لەلای ماڵیدا وەستاوە. داوای کردبوو بچێتە ژوورەوە، ئیزنیان دابوو، چوبووە ژورەوە تەماشا دەکا جەبەلە سوور دەکاتەوە، موی سەری هەموو وەک ڕۆمەکان بە بۆیاخ سوور کردبوو. بانگی نوێنەرەکەی کردبوو، دەنگوباسی موسڵمانانی لێ پرسیبوو. ئەویش زۆر بەچاکە باسی موسڵمانانی کردبوو، دوایی نوێنەرەکەمان وتبووی: "زۆر لەو کاتە زیاترین کە تۆ لامان هەڵهاتی."

جەبەلە پرسیبووی: "ئەی عومەر چۆنە؟"

نوێنەر وتبووی: "باشە!"

دوایی نوێنەرەکە ویستبووی دانیشێ، بەڵام لەسەر ئەو کورسیانە دانەنیشتبوو کە بۆیان دانابوو.

جەبەلە وتبووی: "بۆ ئەو ڕێزەت لە بەر چاو نییە کە لێمان گرتی؟"

ئەویش وتبووی: "پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردوین لەسەر کورسیەک دانیشین کە قاچەکانی لە زێڕ دروست کرابێ!"

جەبەلە وتبووی: "دڵت لە چڵک پاک بکەرەوە و لە هەر کوێ دانیشی زیانی نییە!"

ئەویش پێی وتبوو: "ئەی قوڕبەسەرت جەبەلە! ئەوە بۆ موسڵمان نابی؟ خۆ دەزانی ئیسلام چەن پاک و خاوێنە!"

جەبەلە وتبووی: "دوای ئەوەی کە لە من قەوما، دیسان موسڵمان ببمەوە؟"

ئەویش وتبوی: "بەڵێ! پیاوێکی هۆزی فەزارە زۆر لە تۆ زیاتری کرد، لە ئیسلام وەرگەڕایەوە، بە شمشێر لەگەڵ موسڵماناندا جەنگا، دوایی هاتەوە باوەشی ئیسلام، موسڵمانان وەریانگرتەوە و، ئێستە کە من لێرەم، ئەو لە مەدینەیە و موسڵمانە!"

جەبەلە وتبووی: "ئەگەر تۆ ببی بە کەفیلی ئەوەی کە عومەر کچەکەی خۆی بدا بە من و بەڵێن نامەیەکم بۆ بنووسێ کە لە دوای ئەو من ببم بە خەلیفە، ئەوا دێمەوە و موسڵمان دەبمەوە."

ئەویش وتبووی: "من نابمە کەفیلی ئەو داواکاریانەت، بەڵام دەزانم ئەگەر بێیتەوە، عومەر لێت خۆش دەبێ و، موسڵمانبوونەوەت لێ وەردەگیرێ."

- دوایی چی ڕووی دا گەورەم؟

- نازانم! من دونیام جێ هێشت و مردم و، جەبەلە هەر لەوێ بوو.

- قوربان وانازانی کە بەرابەر جەبەلە توند بووی؟

- مەبەستت چییە؟ یانی لە حوکمداندا ستەمکار بووم؟

- پەنا بە خوا گەورەم! مەبەستم ئەوەیە کە جەبەلە لە شوێنی خۆی وەک پاشا بووە، تەنیا زللەیەکی لە پیاوێ داوە، ئەویش تووڕە بووە بۆیە وای کردووە، تۆ نەتدەتوانی ئەو پیاوە ڕازی بکەی؟ ئەو کاتە ئایینی جەبەلەت دەپاراست.

- باشە من زللەم لە ئەو پیاوە دابوو تا ڕازی بکەم و گەردنی خۆمی پێ ئازا بکەم؟

- نەخێر.

- ئیتر بۆچی من بڕۆم و ڕازیی بکەم، لە کاتێکدا مافی ئەو لای پیاوێکی تـرە؟ بەڵام فیس و خۆبەزلزانی ڕێگەی پێنادەن داوای لێبوردن بکا! با ئەو لە شوێنی خۆی وەک پاشا بێت و ئەو پیاوەیش پیاوێکی ئاسایی و هیچکارە بێ. دەکرێ هەر کاربەدەستێک هەڵسێ و خەڵکی بەر زللە بات؟ لە ئاییینی ئیسلامدا پاشا و ماشا نـاخوا، هەمـوو کەس وەک یەکە، هەموومـان ڕۆڵەی ئـادەمین، ئـادەمیش لە گـڵ دروستکراوە.

- من تەنیا ویستم ئاییینەکەی بپارێزین.

- یەکەم، من نەمدەزانی بۆ شتێکی ئاوا بچووک کافر دەبێتەوە. دواتر، ئەگەر بیشمزانیایە دیسان هەر بەو شێوەیە بڕیارم دەدا بۆ ئەوەی نەبێ بە عادەت کە گەورە هەرچی بکا، قەیناکا، بەڵام پیاوی سادە و هەژار تۆڵەی لێ بسەنرێتەوە! هەر گەورەیەکمان دادگایی کرد، بڵێ: ئەگەر لێم نەبوورن کافر دەبم؟!

- لەوانەیە خۆی لەوە بە گەورەتر زانیبێ تۆڵەی لێ بسەنرێتەوە!

- ئەو فیس بەری نەدا، کەس بۆی نییە لە تۆڵە ڕابکا و خۆی بشارێتەوە. ئەو باشترە یان پێغەمبەری خوا؟

- وەڵلا بێگومان پێغەمبەر ﷺ، بە خۆم و دایک و باوکمەوە بە قوربانی بین.

- پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی غەزای بەدردا پێش ئەوەی جەنگ دەست پێ بکات، دەهات و ڕیزەکانی ئێمەی ڕێک دەخست، دارێکی ئەراکی بە دەستەوە گرتبوو، ڕیزەکانی پێ ڕێک دەکرد، دای بەلای سەوادی کوڕی غەزییە، سەواد کەمێک لە ڕیز دەرچووبوو، پێغەمبەر سیخوڕمەیەکی لە زگی سەواد داو فەرمووی:

"سەوادی کوڕی غەزییە، ڕێک بووەستە!"

سەواد وتی: "قوربان ئێشت پێ گەیاندم. خوا تۆی بۆ هەق و ڕاستی ناردووە، دەبێ تۆڵەت لێ بکەمەوە!"

پێغەمبەرﷺ زگی موبارەکی بۆ سەواد دەرخست و فەرمووی: "وەرە سەواد، تۆڵەی خۆت بکەوە!"

سەواد پڕی دایە زگی پێغەمبەر و ماچی کرد!

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەوە بۆ وات کرد سەواد؟!"

سەواد وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا، دەبینی لە چ بارودۆخێکدایین! من متمانەم بە مانی خۆم نییە، لەوانەیە بکوژرێم، ویستم ئاخر جار کە لەگەڵ تۆدا بووم، لێوم بەر پێستت بکەوێ!"

پێغەمبەرﷺ نزای خێر و چاکەی بۆ کرد و بە باشە باسی کرد.

ئێمە کەسانێکی وەهاین کە پێغەمبەرەکەمان زگی خۆی هەڵدەماڵێ بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکرێتەوە، هەرچەند پێغەمبەرﷺ بەبێ مەبەست سیخوڕمەی لە زگی سەواد دا، تەنیا دەیویست خۆی ڕێک بکاتەوە، بەڵام زگی هەڵماڵی بۆ ئەوەی سەواد تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئیتر بۆ من ڕازیبم کە پیاوێک لووتی پیاوێکی تر بشکێنێ، دوایی لێی بگەڕێین و بڵێین: قەینا ئەو پیاوە سەرۆک هۆزە، یان پیاوێکی بە دەسەڵاتە!

ئەگەر بە هۆی گەورەیی و نەسەب و پلەوە خەڵک لێبووردنی بۆ بدرایە، ئەوا پێغەمبەرﷺ لە هەموو کەس شایانتر بوو!

- ڕاست دەفەرمووی قوربان!

- ئەگەر دەتەوێ لەم بابەتە شتی ترت بۆ باس دەکەم!

- کێ لە قسەی جەنابت تێر دەبێ؟ وەڵڵا پێم خۆشە! فەرموو.

- دەی گوێ بگرە!

- بەسەرچاو گەورەم.

- ئەحنەفی کوڕی قەیس و کۆمەڵێک لە موسڵمانان بە سەرکەوتنێکی مەزنەوە گەڕانەوە. لێم پرسین: "لە کوێ کۆڵ و بارتان خستبوو؟"

وتی: "لە فلان شوێن."

منیش هەستام و لەگەڵیان ڕۆشتم بۆ نێو کۆڵ و بار و وڵاخەکانیان، بە چاو سەیری وشترو وڵاخەکانم دەکرد و دەمگوت: "ئەوە بۆ لە خوا ناترسن؟ ئەوە بۆ وا دەکەن بەم وشتر و وڵاخانە؟ ئەی نازانن ئەوانیش مافیان هەیە بەسەرتانەوە؟! ئەوە بۆ بەرەڵڵایان ناکەن بۆ خۆیان بلەوەڕێن؟!"

ئەحنەف وتی: "قوربان، ئێمە بە هەواڵێکی خۆش و سەرکەوتنێکی گەورەوە گەڕاوینەتەوە، پەلەمان بوو زوو بگەینە جێ و ئەو هەواڵە خۆشە بە ئێوە و خەڵکی شار ڕابگەیەنین!"

لەگەڵ خەڵکەکەدا ڕۆشتم، پیاوێکمان پێگەشت.

وتی: "ئەی گەورەی ئیمانداران! وەرە لەگەڵمدا یارمەتیم بدە، فلانکەس ستەمی لێ کردووم!"

قامچییەکەم بەرز کردەوە و خستمە سەر سەری و سەریم خوار کردەوە و وتم: "کاتێ عومەرتان لایە، ئیشتان پێی نییە، بەڵام عومەر خەریکی ئیش و کارێک بوو، دێن و دەڵێن: وەرە لەگەڵمدا، وەرە لەگەڵمدا!"

- ئەی دوای ئەوە چی ڕووی دا گەورەم؟

- پەلە مەکە کوڕم، ئێستا پێت دەڵێم!

پیاوەکە ڕۆشت و لەبەر خۆیەوە پرتەوبۆڵەی دەهات و سەرکۆنەی خۆی دەکرد، منیش پەنام گرت بە خوا لە شەڕی شەیتان و وتم: "ئەو پیاوەم بۆ بگێڕنەوە!"

کەهاتەوە قامچییەکەم دایە دەستی و وتم: "دەی تۆیش بە قامچییەکە لە سەرم بدە."

وتی: "نابێ! دەیکەم بە خاتری خوا و تۆ!"

وتم: "نابێ! یان لە بەرخاتری خوا و ویستی خوا، یان چیم لێ کردی وام لێ بکەرەوە."

وتی: "لەبەر خوا لێت دەگەڕێم."

پیاوەکە ڕۆشت، ئێمەیش هەموومان بەرەو مزگەوت ڕۆشتین، دوو ڕکات نوێژمان کرد، دوایی بە خۆمم وت: "هێی کوڕی خەتتاب! تۆ هیچ نەبووی، خوا کردوویتی بە شت و پلە و پایەی پێ داوی، گومڕا بووی خوا هیدایەتی دای، سەرشۆڕ بووی، خوا سەربەرزی کردی، پاشان خوا کردوویتی بە چاودێر بەسەر خەڵکەوە؛ کەچی پیاوێک دێت و داوای یارمەتیت لێ دەکا و تۆیش لێی دەدەی؟! سبەینێ چی بە خوای خۆت دەڵێی؟"

- ئێستە تێگەشتم قوربان! یانی تۆ مەبەستتە بڵێی: هەموو مافێک دەبێ بە خاوەن ماف بدرێتەوە، ئەگەر چی مستێکی زۆر سووکیش بێ، وەک ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ زگی موبارەکی هەڵمالی بۆ ئەسوەد تا مستەکەی لێ بداتەوە؟ یان هەرچەند قامچییەکی زۆر سووکیش بێ وەک ئەوەی تۆ لە سەری کابرات دا؟

- بەڵێ کوڕم! بە خوا مەبەستم ئەوەیە.

- دەی قوربان تۆ بۆیە ئەو قامچییە سووکەت لە سەری ئەو پیاوە دا، چونکە ئەو بەرۆکی گرتی بۆ کارێکی تایبەتی خۆی، لە کاتێکدا تۆ خەریکی بەجێهێنانی کاری گشتی بووی!

- با وایش بێ، ئەی پێغەمبەر ﷺ لە غەزای بەدردا ڕیزی موسڵمانانی ڕێک نەدەکرد؟ ئەوە کاری گشتی نەبوو؟ خۆ لەبەر خۆی نەبوو!

- با قوربان، ئیشوکاری گشتی بوو.

- دەی ئەوە وای لێ کرد بفەرمووێ؛ خۆ من خەریکی ئیشوکاری گشتیم با زگم هەڵنەماڵم؟!

- نەخێر گەورەم!

- دەی ئیتر چۆن عومەر تۆڵە نەداتەوە، کەچی کەسی وا تۆڵەی داوەتەوە کە زۆر لە عومەر باشتر بووە؟

- ئەی قوربان بۆچی لەسەر ئەو وڵاخ و وشترانە موحاسەبەت کردن، خۆ ئەوان دەیانەویست زوو بگەڕێنەوە و مزگێنی و مـوژدەی سـەرکەوتن بە ئێـوە و موسڵمانان بدەن؟!

- دەی ئەو وڵاخ و وشـترانەیش دروسـتکراوی خـوان، خـوای گەورە لە ژنێکـی بەدکاری بەنی ئیسرائیلی خۆش بوو، دەزانی لەبەر چی؟

- لەبەر چی؟

- لەبەر ئەوەی سـەگێکی بینـی هەڵکەهەڵکـی بـوو، زانیـی کەوا ئەو سـەگە تینـوویەتی، ژنەکە گـۆرەوییەکی لە پێـدا بـوو لە چەرم دروسـتکرابوو، هەسـتا گۆرەوییەکەی داکەند و لە چاڵاوێکدا پڕی کرد لە ئاو و سەگەکەی تێراو کـرد. ئا لەبەر ئەوەی کە ئەو ژنە بەدکارە ئەو سەگە تینووەی تێراو کرد، خوای گەورە لێـی خۆش بوو و خستیە بەهەشتەوە. ژنێکیشی خستە ناو ئاگری جەهەنـنەمەوە، دەزانـی بۆچی؟

- بۆچی قوربان؟

- لەبەر ئەوەی پشیلەیەکی بەستبووەوە، نەخۆی هیچی پێ دەدا و نە بەری دەدا خۆی شتێک بخوا، لە برسێتی تینووێتیدا تۆپی.

- ئەی قوربـان! خـوا ئەم وڵاخ و وشـترانەی بـۆ خزمەتـی مـرۆڤ دروسـت نەکردووە؟

- با، خوا بە سۆز و بەزەییەی خۆی ئەو شتانەی بۆ ئێمە دەستەمۆ کردووە، بۆ ئەوەی سـوودیان لـێ وەربگـرین، بەڵام دەبـێ ئەو سـوودوەرگرتنە بە مەرجەوە بـێ، دەبێ باش بین لەگەڵیاندا. کەی خوابەردارە تـۆ بچـی کۆمەڵێـک وڵاخ و وشـتر زۆر بەپەلە بدەیتە بەر و دواییش بیانبەسیتەوە و لێ نەگەڕێی کەمێ بلەوەڕێن و کەمێ ئاو بخۆن؟

ـ قوربـان دادگەریەکەت ئاژەڵیشـی گرتبـووەوە؟ لە بەر ئەو ئـاژەڵانە بیـرت لای سەرکەوتن نەمایەوە؟!

ـ کوڕم! تۆ ئەگەر کارێک بە جوانی و ڕێکوپێکی جێبەجێ بـکەی، نـابێتە هـۆی ئەوەی گوناهی کارێکی نیوەچڵت بشواتەوە، من سـبەی لە دادگـای خـوای گەورەدا دەوەستێنرێم و لە بارەی هەرچی شتی ژێردەسـتم هەبـووە لـێم دەپرسـنەوە، مـرۆڤ، ئاژەڵ...

ـ کورە قوربان، تـۆ نەک هەر خەلیفەکـانی دوای خۆتـت خستووەتە تەنگـانەوە، بەڵکو هەرچی کاربەدەستی دونیا هەیە لە تەنگانەدا دەبن، هەرچی بکەن ناگەن بە تۆ!

ـ من هەمیشە لە خوا دەپاڕامەوە کە لەم دونیایە بە سەلامەتی دەربچم، نە مـافم لای کەس هەبێ و نەکەس مافی لام هەبێ!

ـ دەی ئیتر ئێمە مانان چی بڵێین؟ باشـە قوربـان! ئێسـتا پـێم بڵـێ بـۆچی ئەو پیاوە وتی: "نابێ! دەیکەم بە خاتری خوا و خاتری تۆ" تۆیش وتت : "نابێ! یان لێی بگەڕێ بۆ خوا و ویستی خوا، یان چیم لێ کردی وام لێ بکەرەوە؟"

ـ ئەوە ئەو پیاوە هیچی بەلای منەوە نەبوو مەگەر ئەوە نەبێ کە وەک چۆن من بە سووکی قامچییەکم لێ دا، ئەویش بە هەمان شێوە قامچییەکم لێ بدا. ئیتر پـاک لە پـاک، ئەو بەو شـێوەیە تـۆڵەی خـۆی دەکـاتەوە، یـان لـێم دەبـوورێ، ئەو کـاتە لێبوردنەکەی لە ڕای خوایە و خوا پاداشـتی دەداتەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕای خـوا و لە ڕای خۆمدا لێم خۆش ببێ، ئەوە شتێکی باش و گونجاو نییە، پاداشتی لە خوا و منەوە بە یەکەوە دەست نـاکەوێ. لەوەیـش زیـاتر! مـن خەلـیفەم نـابێ کەس هـیچ مافێکی لای من هەبێ، ئەگەر کەسێ مـافێکی کەوتە سـەر مـن، یـان دەبـێ تـۆڵەی خۆی بکاتەوە یان دەبێ لە ڕای خوا لێم خۆش ببێ. با ئەگەر جارێکی تر لە تەک کەسێکی تردا کێشەیەکیان هەبوو و هاتنە لای من، هیچ مافێکی بەسەر منەوە نەبێ و منیش لەبەر ئەو مافە ڕووگیر ببم و نەتوانم بە باشی داوەریی خۆم بکەم!

- بە خوا گەورەم تۆ زۆر بلیمەتی! پێغەمبەر زۆر ڕاستی فەرمووە کە وتوویەتی: "هیچ بلیمەتێکم نەدیوە وەک عومەر کارەکانی بە باشی جێبەجێ بکا."

- صلی الله علیه و سلم، دەی کوڕم! ئێستە پێم بڵێ لەم بارەوە هیچی ترت بۆ بڵێم؟

- قوربان من شایانی ئەوە نیم کە کەسێکی وەک جەنابت پرسیارم لێ بکات، مرۆڤ لە قسە شیرینەکانیشت تێر ناخوا. ئەگەر زیاترم بۆ باس بکەی، سپاست دەکەم!

- دەی گوێ بگرە!

- دڵ و گیانم لەلاتە، فەرموو!

- ڕۆژێک کارم کەوتبووە بازاڕ، قامچییەکەم بە دەستەوە بوو، چونکە هەرگیز قامچییەکەم دانەدەنا، تەماشا دەکەم ئەیاسی کوڕی سەلەمە شتی بۆ فرۆشتن لەسەر جادەکەی بازاڕ داناوە و ڕێگاکەی گرتووە. منیش زۆر بە سووکی قامچییەکم بۆ داهێنایەوە، بەر لێواری پۆشاکەکانی کەوت، دوایی وتم: "دەی ئەیاس، ئا کەمێک لەسەر جادەکە دوور بکەوەرەوە!"

دواتر ڕۆشتم و ئەیاسیش بە کاری کڕین و فرۆشتنی خۆی خەریک بوویەوە، ساڵێکی پێچوو، هاتمەوە بازاڕ، دیسان ئەیاسم بینییەوە.

وتم: "ئەیاس دەمەوێ ئەم ساڵ حەج بکەم!"

وتی: "دەی باشە گەورەم!"

دەستی ئەیاسم گرت و لەگەڵ خۆمدا بردم، دەستیم بەرنەدا تا کردم بە ماڵی خۆماندا، کیسێک پارەم دەرهێنا، شەشسەد دیرهەمی تیا بوو.

وتم: "ئەیاس، ئەم پارە بۆ تۆ، ئەوە لە باتی ئەوەی پار قامچییەکم لێ دای!"

وتی: "کورە قوربان! بە خوا ئێستا تۆ دەیڵێی دەکەوێتەوە بیرم!"

وتم: "دەی بە خوا من لەبیرم نەچووە!"

- ئەڵڵا ئەڵڵا گەورەم! ئەوە هەر لەبەر سووکە قامچییەک کە تەنیا بەر جلەکانی کەوتبوو؟

- کورِم خوا دەفەرمووێ: ﴿وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ﴾ النوور: ١٥ واتە: "ئێوە وا دەزانن شتێکی سادەو ئاسانە، بەڵام لای خوا گەورە و گرانە!"

- ئاخر قوربان تۆ لەبەر خۆت لێت نەدابوو، ڕێگەی لە خەڵک گرتبوو. من وا نازانم هیچ مافێکت کەوتبێتە سەر، تۆ پارێزگاریت لە مافە گشتیەکان کردووە، ویستوتە مافی خەڵک نەخورێت، ڕێگەوبان تایبەت نییە بە کەسێک، بەڵکو شتێکی گشتییە و خەڵک هەموویان وەک یەک بەشدارن! کەس بۆی نییە بۆ خۆی داگیری بکا!

- کورِم! دەبێ هەر کەسێ ئەمری بە چاکە کرد، بە چاکی بیکا نەک بە خراپی. نابێ لە ڕێگەی خراپەوە بۆ مەبەستی باش بڕۆی، دەبێ چۆن مەبەستەکەت باش و چاک و پاکە، ئەو ڕێگەیش کە بۆ ئەو مەبەستە دەیگریتە بەر، ئاوا باش و چاک و پاک بێت.

ئەی نەدەبوو من بە شێوەیەکی نەرمونیان و لەسەرخۆ بمگوتایە: "کاکە ئەیاس گیان! جادە جادەی خەڵکە، هی تاکە کەس نییە. تۆ بۆت نییە ئەو ڕێگە بەو خەڵکە تەنگ بکەی، کەمێک بڕۆ ئەولاتر و جادەکە بەردە!" باشتر نەبوو ئاوا پێی بڵێم؟

- بەڕەوەڵڵا ئاوا باشتر بوو، بەڵام من هێشتا پێم وایە ئەوەی پێشوویش هەر ئاسایی بووە.

- من نامەوێ کەس مافێکی ئاساییشی بەسەرمەوە هەبێ. گرنگیدان بە کاروباری گشتی نابێتە بیانوو بۆ پێشێلکردنی مافی تاکە کەس. خەڵک هەموو خاوەن ڕێز و حورمەت و کەسایەتی خۆیانن، من ویستم ئەو تاوانەی کە لەسەرم بووە، لێخۆشبوونی بۆ وەرگرم. دڵی لە ئاست خۆمدا پاک بکەمەوە، نەکا ڕۆژێک لە دڵی بگرێ و لێم زویر ببێت.

- دەی بە خوا من ئیتر هیچ قسەیەکم پێ نییە، نازانم چی بڵێم، بەردەوام سەرسامم دەکەی، ئەوەندە سەرسامم دەکەی، خەریکە لە ئاستی جەنابتدا لاڵ دەبم و قسەم بۆ ناکرێ!

- دەی گوێ بگرە با لەم بارەوە سێ چیرۆکی ترت بۆ بگێڕمەوە.

- دەی قوربان بە گوێ بە چاو، بە دڵ، بە چاوی دڵ و بە گیان لە خزمەت جەنابتدام!

- ڕۆژێک لەسەر ڕێگای مەککە لەژێر دارێکدا سەرخەوم دەشکاند، گەرما تینی بۆ هێنام، جلەکانم بەسەر خۆمدا دا، پیاوێک لەولامەوە زۆر دوور نەبوو، هەستاو بانگی کرد: "هۆ گەورەی موسڵمانان! ئەوە گوێ ناگری بۆ کەسێکی ئاتاج و داماو کە گیریانداوە و چاوەڕوانی تۆیە؟"

وتم: "کێ گیری داوە؟"

وتی: "تۆ."

منیش هەستام و بە ئەسپایی قامچییەکم لێ دا.

وتی: "پێش ئەوەی گوێم لێ بگری، دەستی خۆتت وەشاند! با پەلەت نەکردایە، ئەگەر ستەملێکراو بوومایە، مافت بۆ دەسەندمەوە، ئەگەریش ستەمکار بوومایە، تۆڵەت لێ دەسەندمەوە!"

یەکسەر پەلاماری جلەکانیم دا و لێواری جلەکانیم گرت و قامچییەکەم دا بە دەستیەوە و، وتم: "تۆڵەی خۆت بکەرەوە!"

وتی: "شتی وا ناکەم!"

وتم: "نا، بە خوا دەبێ تۆڵەی خۆت بسەنیتەوە."

وتی: "من لێت خۆش دەبم!"

منیش وتم: "من جیاوازی نەکەم لەنێوان خۆم و ئێوەدا، ئەوە زۆر لەوە باشترە کە تۆڵەم لێ بکەنەوە و پێم ناخۆش بێ."

وتی: "خوای گەورە لێت خۆش بێ ئەی گەورەمان!"

دواتر منیش کارەکەی ئەوم جێبەجێ کرد و ڕۆیی.

- دەی قوربان، من وا دەزانم ئەگەر بە هێواشی بهاتایە و داواکاریی خۆی بە جەنابت ڕابگەیاندایە و ئاوا بە دەنگی بەرز بانگی نەکردیتایە و خەوەکەی پێ نەپچڕاندیتایە، تۆیش قامچیت لێ نەدەدا و، کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکرد!

- تۆ بۆچی پاکانە بۆ من دەکەیت؟ دەنگبەرزکردنەوە نابێ بە بیانوو، چونکە لەوانەیە ئەو هەر خۆی دەنگی زل بووبێ، بۆیە خەویشی لێ تێک دام، ئەو دەیزانی کە خەلیفە فەرمانبەرە و دەبێ کاروباری خەڵک ڕایی بکا، نەک بخەوێ. داواکاریەکەیشی شتێکی ئەوتۆ نەبوو، ئەوەندەی داواکاری کرێکارێک بوو کە لای کەسێ کاری کردبێ، هەر ئەوەندە بوو نەک زیاتر.

- ئای قوربان! ئەم جارەیش دەمی منت بەست! دەی دووەم چیرۆک چییە بۆم باس بکە!

- دووەم چیرۆک ئەوەیە: جارێک پیاوێکم دی تاوانێکی دەکرد، بە قامچی کەوتمە وێزەی.

وتی: "عومەر! ئەگەر چاکم کردبێ، ئەوا تۆ ستەمت لە من کردووە. ئەگەریش خراپم کردبێ، ئەوا تۆ چوزانی!"

وتم: "ڕاست دەکەی."

ئەستەغفیروڵڵایەکم کرد و، قامچییەکەم دایە دەستی و وتم: "دەی یەڵڵا تۆڵەی خۆت بکەرەوە!"

وتی: "لەبەر خوا لێت خۆش دەبم، خوا لە من و لە تۆیش خۆش بێ."

- قوربان ئەم جارەیش خۆت خستەوە بەر تۆڵە!

- من بە ناهەق لەو پیاوەم دا، ئیتر بۆ خۆم نەخەمە بەردەستی بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی بکاتەوە؟

- بەڵام خۆ تۆ بینیت گوناهی کردبوو!

- با گوناهیشی کردبێ، دەبێ تۆڵە بۆ ئەو تاوانانە بەکار بێت کە خوا تۆڵەسەندنەوەی بۆ دیاری کردوون. گوناهەکانی تر ئەوە حەواڵەی خوا دەکرێن. ئەگەر ویستی لەو مرۆڤە خۆشبێ، لێی خۆش دەبێ. ئەگەریش ویستی. ئەوا تۆڵەی لێ دەکاتەوە. کاکە! هەر جارێ هەرکەس گوناهێ بکا، دێ بە عومەر بڵێ: "ئەو گوناهەم کردووە تۆڵەم لێ بسەنەوە"؟

- بەڵام قوربان تۆ لەبەر خوا تووڕە بووبووی!

- لەبەر خوا تووڕە بووم، بەڵام تۆڵەسەندنەوەکە بەپێی ویستی خوا نەبوو. ئەگەر بە هەڵەی ئەوم بزانیایە و ڕێگەی ڕاستم پێ نیشان بدایە، ئەوە باشتر بوو لەوەی ئاوا لێی بدەم!

- ڕاستەکەی قوربان! ئەی چیرۆکی سێیەم چییە؟

- یەحیای مەککی خۆی و ژنەکەی هاتن بۆ مەدینە، دوایی لە یەک جیابوونەوە. ژنەکەی ڕۆشت هەندێ کاروباری هەبوو جێبەجێیان بکا، یەحیایش ڕۆشتە مزگەوت و دوو ڕکات نوێژی کرد و دوایی چوو بۆ زیارەتی قەبری پێغەمبەر ﷺ و سەلامی لێ کرد. دوایی ڕۆشت، لە ڕێگە گەشتەوە بە ژنەکەی، بە یەکەوە وەستان و پرسیاری لێ دەکرد کە چی کردووە و چی نەکردووە، وەک هەموو پیاو و ژنێکی تر گفتوگۆیان دەکرد، یەحیا قسەی لەگەڵ ژنەکەیدا دەکرد و من لەو کاتەدا بینیم، نەمزانی ژنی خۆیەتی، قامچییەکم لێ دا!

وتی: "گەورەم! بە خوا ستەمم لێ دەکەی، ئەوە ژنی خۆمە!"

منیش وتم: "ئەی بۆ لە پشت دەرگاوە یان لە شوێنێکی پەنا و پێچدا قسەی لەگەڵدا ناکەی؟"

وتی: "ئاخر لێرە پێی گەشتم و هەندێ پرسیارم لێ کرد!"

منیش قامچییەکەم دا بە دەستیەوە و وتم: "دەی تۆڵەی خۆت بکەرەوە!"

وتی: "نابێ!"

وتم: "دەی لێم ببورە!"

وتی: "ئەوەیش ناکەم!"

منیش دەستی یەحیام گرت و بردم بۆ ماڵی ئوبەی کوڕی کەعب، بانگم کردن، کوڕەکەی ئوبەی هاتە دەر.

وتی: "چییە قوربان؟! چیت دەوێ؟"

وتم: "بڵێ بە باوکت بێتە دەر!"

ئوبەی هاتە دەر، وتم: "ئوبەی! ئا ئەو ئایەتەی سوورەتی ئەحزاب کە ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ﴾ ی تیایە بۆم بخوێنەوە."

ئوبەی ئایەتەکەی خوێندەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾ الأحزاب: ٥٨، واتە: "کەسانێ کە ئازاری پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن، بێ ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێ، ئەوە بەڕاستی ئەوانە بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان گرتووەتە ئەستۆ."

وتم: "ئەو ئایەتە لەبارەی منەوە هاتووەتە خوارەوە؟"

وتی: "نەخێر."

منیش وتم: "من لە موسڵمانان دەدەم، ئەوان لێم نادەنەوە؛ جوێنیان پێدەدەم، جوێنم پێ نادەنەوە؛ ئازاریان دەدەم، ئازارم نادەنەوە!"

ئوبەی وتی: "با فەرموودەیەکت بۆ بگێڕمەوە کە خۆم لە پێغەمبەرﷺم بیستووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: 'لە ڕۆژی قیامەتدا کەسێک بە نوێنەریی خوای گەورە دێت و بانگ دەکا: "ئاگاداربن! کەس نامە و نووسراوی خۆی بەرز نەکاتەوە تا عومەری کوڕی خەتتاب بەرزی دەکاتەوە، دوایی تۆ دەهێنن، دەموچاوت سپی و گەش و جوانە، دەتبەن بۆلای خوای گەورە و نامەکەت بە دەستەوەیە!' "

وتـم: "ئـوبەی! سـوێندت دەدەم بە خـوا، تـۆ خـۆت ئەم فەرمـوودەیەت لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە؟!"

وتی: "بەڵێ، من چۆن درۆ بە دەم پێغەمبەر ﷺەوە دەکەم؟!"

ئیتر دەستم کرد بە گریان، زۆر گریام، ئەوەندە گریام، یەحیایش دەستی کـرد بە گریان، دوایی وتی: "لە مافی خۆم خۆش دەبم!"

- ڕەحمەتی خوات لێبێ چەند لەخواترس و ئایینداری!

ــ دەی ئێسـتە دوای ئەوەی کە باسـی لێـدانم لە کـاتی تـوڕەیی و تـۆڵە و تۆڵەکردنەوەدا بۆ کردی، باسی جەبەلەی کوڕی ئەیهەم کۆتا پێ بێنین؟ وا دەزانـم زۆرمان وت!

- قوربان کەمی تۆ هێندە مانا دارە، زۆرە، مرۆڤ لە قسەی زۆری تۆ تێر نـابێ، بەڵام با بە دڵی تـۆ بـێ، مـافی ئەو باسـەماندا، قسـە قسـەی ڕاکێشـا، بەڵام باسـی دادگەری هەر ماوە!

- دەی ئێستا پرسیاری چی دەکەی؟

- گەورەم! پێم خۆشە باسی ئەو شەوانەم بۆ بکەی کە بە ئەسپایی و نهێنـی بە ناو کوچە و کۆڵانەکانـدا دەسـووڕایتەوە تـا بزانـی ئەو خەڵـکە چ کەموکووڕییەکیـان هەیە و لەناو شاردا چی دەگوزەرێ؟

- دەی باشە، ئەگەر خوا بیەوێ بۆت باس دەکەم.

- دەی قوربان، پێت خۆشە لە کوێوە دەست پێبکەی؟

- باسی منداڵە شیرەخۆرەکە و دایکی!

- مەسەلە چییە قوربان من نایزانم؟

- کۆمەڵێک بازرگـان هـاتن بـۆ مەدیـنە، لە گۆڕەپـانێکی نزیـک مزگەوتـدا وڵاخ و وشترەکانیان یخ دا و کۆڵ و باریان لێ خست، چونکە لەو شوێنەدا کڕین و فرۆشتن دەکرا. دوایـی هـاتنە مـزگەوت و نوێژیـان دەکـرد، هەنـدێ پشـوویان دا بـۆ ئەوەی ماندوویەتی ڕێگەیان کەم ببێتەوە. من کە ئەوانم بینی، زانیم ئەمە زۆری پێ دەچێ

و وا بە ئاسانی کاروباریان تەواو نابێ، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفم لەگەڵدا بوو، پێم وت: "دێی بە یەکەوە ئەم شەو ببینە پاسەوانی ئەمانە؟ نەکا دز بێتە سەریان!"

وتی: "باشە قوربان دێم."

من و عەبدوڕڕەحمان ڕۆشتین بۆ ئەو جێگایەی کۆڵ و باریان لێ خستبوو. بۆخۆمان بە دەم پاسەوانییەوە نوێژمان دەکرد، گوێم لێ بوو دەنگی منداڵێک لە نزیکەوە دەهات، بەرەو لای دەنگەکە ڕۆشتم، تەماشا دەکەم ژنێک منداڵێکی شیرەخۆری لە باوەشە و منداڵەکە دەگری...

بە ژنەکەم وت: "لە خوا بترسە و خزمەتی ئەو منداڵە بکە، با نەگری!"

دوایی گەڕامەوە بۆلای عەبدوڕڕەحمان، دەستمان کرد بە پاسەوانی و نوێژکردن، زۆری پێ نەچوو دووبارە منداڵەکە دەستی کردەوە بە گریان، منیش هەمتر بەرەو لای منداڵەکە ڕۆشتمەوە، دیسان وەک جاری پێشوو بە ژنەکەم وت. دوایی گەڕامەوە بۆلای عەبدوڕڕەحمان، دەستمان کردەوە بە نوێژ و پاسەوانی...

شەو خەریک بوو کۆتایی دەهات، کەچی منداڵەکە هەر دەگریا، ڕۆشتمەوە بۆلای ژنەکە، پێم وت: "باوکە ڕۆ! بە خوا تۆ دایکێکی خراپی! کورە خۆ ئەو منداڵە داماوە لە ئێوارەوە یەکبین دەگری!"

ژنەکە وتی: "بەندەی خودا! تۆ ئەم شەو تەواو منت سەخڵەت کرد، من دەمەوێ لە شیری ببڕمەوە بۆیە دەگری!"

منیش وتم: "بۆچی لە شیری دەبڕیتەوە؟ خۆ هێشتا منداڵە و کاتی ئەوەی نەهاتووە شیری لێ ببڕیتەوە!"

وتی: "ئاخر عومەر بەشەخۆراک نادا بە منداڵی شیرەخۆر!"

منیش وتم: "ئەی باوکە ڕۆ! پەلەی لێ مەکە لە شیری مەبڕەوە، عومەر خۆراکی ئەو منداڵەیشت پێ دەدا."

ژنەکە منی نەدەناسی...

- ئەی دوایی چی ڕووی دا قوربان؟

- بۆ نوێژی بەیانی بە شوێنی خۆماندا گەڕاینەوە بۆ مزگەوت، بەرنوێژیم بۆ خەڵکی کرد، لەناو نوێژدا ئەوەندە گریام، خەڵک بە باشی لە قورئان خوێندنەکەم تێنەدەگەیشتن!

هەر لە نوێژ بووینەوە، هەستامە سەر پێ و ڕووم لە خەڵکەکە کرد و بە خۆم وت: "چەند داماوی عومەر! خوا دەزانێ چەند بەچکە موسڵمانت کوشتوە؟!"

دوایی جارچیم ڕاسپارد، جاڕی داو: "کەس منداڵ لە شیر نەبڕێتەوە، عومەر بڕیاری بەشەخۆراکی بۆ هەموو منداڵێک داوە."

نامەیشم نووسی بۆ هەموو والییەکان و بەوانیشم ڕاگەیاند بەشەخۆراکی منداڵی شیرەخۆر بدەن.

- چەند بەسۆزی قوربان! نەدەبوو ئەو ژنە پەلە بکا و منداڵەکەی لەبەر خۆراک لە شیر ببڕێتەوە! کارێکی خراپی کردووە!

- ئەی ئەگەر ئاتاج و داماو بێ، چی؟ لەوانەیە هەژاری وای لێ کردبێ کە پەلە بکات و منداڵەکەی لە شیر ببڕێتەوە، بۆ ئەوەی بەشەخۆراکی بدەنێ.

- ئەی نەدەبوو لێی بکۆڵیتەوە بزانی لە بەر هەژاری بووە، ئەگەر لە بەر هەژاری بووە، ئەوە یارمەتیت دەدا!

- نەخێر ئەوەندە بەس نەبوو!

- بۆچی گەورەم؟

- چونکە تەنیا ژنێک وانییە، ئەی ژنەکانی تر، من چۆن بزانم ئەوانی تر گوزەرانیان چۆنە؟ کاربەدەستی خراپ ئەو کەسەیە کە هەتا هەژاری بە خەڵکەوە نەبینێ، شتیان پی نەدا. کوڕم! دادگەری ئەوە نییە کە بەشی خەڵکی هەژار و داماو بدەین! دادگەری ئەوەیە کە نەهێڵین خەڵک تووشی هەژاری ببێت، دەبێ ئێمە ئابڕوو و کەسایەتی خەڵک بپارێزین، کارێک نەکەین خەڵک داوا بکا.

- ئەی نەدەکرا جیاتی ئەوەی بڕیارێکی خۆت هەڵبووەشێنیتەوە، نامەیەک بۆ والییەکان بنووسی و بڵێی: هەرکەس هەژارە، خۆراکی زیاتری پێ بدەن با منداڵەکەی لە شیر نەبڕێتەوە؟

- ئەی ئەگەر والییەکان ژنێکی هەژاریان نەناسیایە و هیچیان پێنەدایە، ئەو کات چی؟ ئەو ژنە لە مەدینە بوو، منیش پێم نەزانیبوو تا بەو جۆرەی بۆم گێڕایەوە پێم زانی. دواتر خۆ من ماڵی عومەر نابەخشم بە خەڵک، بە خوا ماڵی خەتتابیش نییە، ماڵی موسڵمانانە، لە خۆیانەوە بۆ خۆیانە. ئێمە تەنیا پارێزەر و خەزنەدارین، لە فەوتانی دەپاریزین، بەو جۆرەی خوا پێی خۆشە دابەشی دەکەین، بە گوێرەی پێویستی شت بە خەڵک دەدەین.

- ئاخر گەورەم، ئەگەر دەوڵەت و حوکوومەت لە بڕیاری خۆی پەشیمان ببێتەوە، سام و هەیبەتی نامێنێ!

- کوڕم ! گەڕانەوە بەرەو ڕاستی و هەق، زۆر لەوە باشترە مرۆڤ لەناو بەتاڵدا بتلێتەوە. سام وشکۆی دەوڵەت بە دادگەرییەوە بەندە، بەوە بەندە ئەگەر شتێک لە هێڵی دادگەری لایدا، یەکسەر بیخەینەوە سەر هێڵەکە، سام و شکۆ لە سووربوون لەسەر قسەی ناهەقدا نییە، ئەمجا کێ وتوویەتی کە عومەر ویستوویەتی خەڵک لە ئەو یان لە دەوڵەت بترسن؟ بە خوا من هەر ئەوەم ویستووە کە خەڵک خاترجەم و ئارخەیان بۆخۆیان بژین. ئەسڵ وایە موسڵمانان لەناو خێر و خۆشیدا بژین، مەگەر ئەوەی خۆیان نەیانەوێ. دادگەرییش ئەوەیە کە مرۆڤی بێدەسەڵات و هەژار دڵی پێی خۆشبێ، بەهێز لێی بترسێ، منیش هەر ئەوەم ویستووە، ویستوومە هیچ کەسێکی بێدەسەڵات نەترسێ و وانەزانێ کە هەر لەبەر ئەوەی بێدەسەڵاتە، ئیتر مافی دەخورێ، هیچ کەسێکی بەهێزیش لەخۆی بایی نەبێ و خەڵکی داماو نەچەوسێنێتەوە. ئەگەر خەڵک بڵێن: "عومەر بەرەو هەق گەڕایەوە،" زۆر لەوە باشترە بڵێن: "کوڕە ئەوە عومەر دەیشزانێ کە کامە هەقە، بەڵام هەر پشتگوێی دەخا و لەسەر ناهەقە." دەمەوێ ڕۆژی پەسڵان بڵێن: "ئەو عومەرەی کە لە هەڵەی خۆی

پەشیمان دەبووەوە و بەرەو هەق دەگەڕایەوە، کوا لە کوێیە؟" ئەوە لەوە باشترە بڵێن: "ئەو عومەرە لە کوێیە کە لە بەر فیز و خۆبەزلزانی، دانی بە هەڵە و کەم وکووڕی خۆیدا نەدەنا؟!"

- ڕاست دەفەرمووی گەورەم ئەوە باشترە!

- دەی بزانم پرسیاری ترت لەم بارەوە هەیە؟

- نەخێر قوربان! ئەوەی ویستم پرسیم، تێگەشتم لە جەنابت. ئیتر چیی ترت لایە لەبارەی شەوگەڕی، حەز دەکەم بیزانم؟

- باسی عەرەبێکی دەشتەکی کە ژنەکەی ژانی منداڵبوون دەیگرت!

- ئەو باسە چییە و چۆنە؟

- شەوێک بە کۆڵانەکاندا دەگەڕام تا بزانم دەنگوباسی خەڵک چییە؟ تەماشا دەکەم دەنگی ژنێک لە چادرێکەوە دێت، تا دوێنێ ئەو چادرە لەو شوێنە نەبوو! نزیک بوومەوە، تەماشا دەکەم پیاوێک لەبەر چادرەکەدا لەسەر ئەژنۆ دانیشتووە، سڵاوم لێ کرد و وەڵامی دایەوە.

دوایی وتم: "تۆ کێی؟"

وتی: "پیاوێکی دەشتەکیم، هاتووم خەلیفە شتێکم پێ بدا!"

منیش وتم: "ئەی ئەو دەنگە چییە لەم چادرەوە دێتە دەرێ؟"

وتی: "بڕۆ کاکە خەریکی کاری خۆت بە؟"

وتم: "باشە باش... بەڵام ئەو دەنگ وناڵەیە چییە؟"

وتی: "ژنێکە ژان دەیگرێ!"

وتم: "کەسی لایە؟"

وتی: "نەخێر."

بەپەلە ڕۆشتمەوە بۆ ماڵ، ئوم کەلسومی ژنم بەخەبەر بوو. پێم وت: "خێرێک هەیە، بۆ نایەی لەڕێی خوا بیکەی؟"

وتی: "چییە؟"

وتم: "ژنێکی ئاوارە ژان دەیگرێ، کەسی لا نییە."

وتی: "دەی باشە، ئەگەر تۆ حەز بکەی، دێم."

وتم: "دەی بزانە چیت پێویستە لە پەڕۆ، ڕۆن، ئارد و... بیهێنە و وەرە."

هەموو شتەکانی هێناو پێکەوە ڕۆشتین...

گەشتینە لای چادرەکەو پێم وت: "بڕۆ ژوورەوە!"

منیش هاتمەوە لای پیاوەکە دانیشتم. مەنجەڵێکمان هینابوو، خستمە سەر سێکوچکەیەک و ئاگرم لە ژێریدا کردەوە، فووم لە ئاگر کرد تا ئاگرەکە خۆش بوو، ئاردەوایەکم چاک کرد، بە تەواوی لێ نەبوومەوە، دەنگی منداڵ هاتە دەر!

ئوم کەلسوم وتی: "عومەر! مزگێنی بدە بەو پیاوە، کوڕێکیان بوو!"

هەر کە پیاوەکە گوێی لە ئوم کەلسوم بوو وتی: "عومەر! یەکسەر قیژاندی و لە ترسدا خۆی لە من دوورخستەوە!"

منیش وتم: "مەجوڵێ برا مەجوڵێ."

ئاردەواکەم هەڵگرت و لەبەر دەرگای چادرەکەدا دامنا.

وتم بە ئوم کەلسوم: "ئەو ژنە تێر بکە، داماوە ئەم شەو زۆر ئازاری هەبووە و ماندووە!"

ئوم کەلسوم ژنەکەی تێر کرد، مەنجەڵەکەی خستەوە ئەمدیو دەرگا. هەستام و لێم وەرگرت، هێنام و لەبەردەم پیاوەکەدا دامنا.

وتم: "فەرموو بخۆ! ئەم شەو هەر بەخەبەر بووی!"

دوایی ڕۆشتمەوە بەردەم چادرەکە و وتم بە ئوم کەلسوم: "هەستە با بڕۆین!"

لە کاتی خواحافیزی بە پیاوەکەم وت: "بەیانی وەرە بۆلام، بزانم چیت پێویستە با بتدەمێ؟"

- بە خوا گەورەم ئەگەر سۆز و بەزەیی پیاوێک بووایە، ئەوە تۆ دەبووی.

- خۆزگە لە کارەکەی خۆم سەربەسەر دەرچوومایە، نە گوناهبار، نە چاکەکار-هەر گوناهبار نەبم ئیتر هیچم ناوێ.

- کورە قوربان! بە خوا چاکەکاری چاکەکار! ئەرێ قوربان تۆ بەڕۆژدا هەر لە خزمەت خەڵکدا دەبووی، ئیتر بۆچی شەو نەدەحەسایتەوە؟

- باشە من تەنیا بە ڕۆژدا خەلیفە بووم؟

- نەخێر قوربان! مەبەستم ئەوە بوو بەزەیییەکت بە خۆتدا بهاتایەتەوە!

- من ئەو کاتە ئاسوودە دەبووم کە بزانم خەڵک کێشەیان چییە، بۆیان حەل بکەم. ئەگەر وا بکەم بە ڕوسووری دەچمە بەردەم پەروەردگار، خوانەخواستە ئەگەر وایش نەبم، ئەوا هەر مەپرسە!

- قوربان پاکانەت بۆ ناکەم، بەڵام جەستەت مافی نەبوو بەسەرتەوە؟

- کوڕم! خۆشی بە خۆشی دەست ناکەوێ، هەرکەس بەهەشتی بوێ، قاچی لێ هەڵدەکا و دەڕوا تا نەگاتە ئەوێ، ناحەسێتەوە!

- ئەی خۆزگەم بە دڵت، بە فامت، بە ڕۆحت، بە ئیمانت، چ کێوێکی پۆلاینی، لە پێناو پیاوەتی و جوامێریدا خۆتت لەبیر چووە، لە پێناو بەرژەوەندیی خەڵکدا، شەو و ڕۆژت خستووەتە سەر یەک.

- ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾ واتە: "بۆ ئەو کەسەیش لە مەقامی پەروەردگاری خۆی ترسابێت، دوو باخی ڕازاوە ئامادەیە!"

- خوای گەورە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەبوو بەکردا لەو باخانەدا کۆتان بکاتەوە.

- ئامین ئامین! یا خوا تۆیش بچیتە ناو ئەو باخانەوە کوڕم! لەم باسەدا هیچ شتێک هەیە پرسیاری لەبارەوە بکەی؟

- هەیە قوربان هەیە؟

- چییە پێم بڵێ!

- گەورەم! دوای ئەوەی بە حاڵی ئەو پیاو و ژنەت زانی، بۆچی بە کەسێکی ترت نەوت یارمەتییان بدەن؟ بۆ خۆت و خێزانت ڕۆشتن بۆ یارمەتییان؟

- ئەو کارە چاک بوو یان خراپ؟

- بێگومان چاک بوو!

- کاری چاکە پاداشتی هەیە یان تۆڵە؟

- بێگومان پاداشت!

- باشە بۆ چاکەکردن خەڵک بخەمە پێشەوە و خۆم لە دواوە دانیشم سەیر بکەم؟!

- مەبەستم ئەوەیە کە تۆ بە ڕۆژدا ماندوو دەبووی، ئەوە بەس بوو!

- هەر شەوێک چووبێتمە دەرەوە، بۆ ئەوە ڕۆشتووم تا بزانم کاروباری ڕۆژم چۆن بووە. کوڕم! ئەو خەڵکە لە بەردەست و ژێردەستی مندان، من لە هەموو کەس لەپێشترم بۆ یارمەتیدانیان، ئەگەر من تەمەڵی بکەم و گوێیان پێ نەدەم، خەڵکیش گوێیان پێ نادەن! ئەگەر منیش بۆ چاکە خێرابم و خەریکی کاروباری خەڵک بم، ئەوا خەڵکیش خێرا و چاکەخواز دەبن. نابێ عومەر هەم خۆی و هەم ژێردستەکانی بفەوتێنێ!

- دوور لە تۆ قوربان!

- دەی هیچت ماوە بپرسی؟

- نەخێر قوربان! تەنیا دەمەوێ بزانم لە بارەی شەوگەڕانەوە هیچ ماوە بیفەرمووی؟

- بەڵێ! باسی ئەو پیاوەی کە بەسەر دیواری حەوشەکەیاندا سەرکەوتم و چوومە ئەودیو!

- مەسەلە چییە قوربان؟ من نایزانم!

- وەک هەموو شەوەکانی تر چووبووم بۆ گەڕان و چاودێریکردنی شار، ئەو شەوە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیشم لەگەڵدا بوو، چاوم کەوت بە تیشکێ.

بە عەبدوڵڵام وت: "هەر لێرە بە! با بزانم ئەو ڕۆشناییە چییە و دێمەوە!"

بەدوای ڕۆشناییدا ڕۆشتم تا ڕێم کەوتە حەوشی ماڵێک، تەماشا دەکەم پیاوێک لە ماڵدا دانیشتووە، جامێ عارەقی لە بەردەمدایە، کچێکیش گۆرانیی بۆ دەڵێ و سەمای بۆ دەکا!

لە داخدا ئاگام لە خۆم نەما و هێرشم بردە سەر پیاوەکە و پێم وت: "هیچ کاتێک وەک ئەم شەو شتی خراپم نەدیوە، پیرەپیاوێک بە دیار مەرگی خۆیەوە دانیشتوە!"

پیاوەکە سەری بەرز کردەوە و وتی: "با، گەورەی ئیمانداران! ئەوەی تۆ کردت لە کارەکەی من خراپترە!"

وتم: "چیم کردووە؟"

وتی: "یەکەم، تۆ جاسوسیت کردووە، خوای گەورە جاسوسی لە بەندەکانی خۆی قەدەغە کردووە! ئەوەتا دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَجَسَّسُواْ﴾ الحجرات: ١٢ واتە: "بە شوێن کەموکووڕی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن." دووەم، بێ مۆڵەت هاتیتە ژوورەوە، خوا دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ النوور: ٢٧ واتە: "ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە جگە لە ماڵەکانی خۆتان، مەچنە هیچ ماڵێك هەتا پرس دەکەن(بە خاوەنەکانیان،) (دوای ئەوەی مۆڵەت دران،) سەلام بکەن لە خاوەن ماڵەکە."

منیش وتم: "وەڵڵا ڕاست دەکەی."

- ئەی دوایی چیت کرد ؟

- لە پەشیمانیدا هەر قەپم بە پەنجەی خۆمدا دەکرد و وتم: "ئەی عومەر! ئەگەر خوا لێت خۆش نەبێ، با دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکا، ئەو پیاوە لە ماڵی خۆیدا دوور

لە چاوی خەڵک، خۆی پەنادابوو، ئێستە دەڵێ: 'عومەر پێی زانیم و قاڵم لێ دەکا!'
"

- دەی دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

- ماوەیەک ئەو پیاوە نەدەهاتە کۆڕ و کۆمەڵی منەوە. دوای ماوەیەکی زۆر، ڕۆژێک لە مزگەوت بووم، ئاگام لێ بوو بە دزییەوە هات و لە دوای دواوە دانیشت!

منیش وتم: "ئا ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەن!"

بە پیاوەکەیان وت: "هەستە گەورەی موسڵمانان تۆ بانگ دەکا!"

هەستا و بەرەو ڕووم هات، لە خەیاڵی خۆیدا وای دەزانی حەیای دەبەم!

- ئەی وات نەکرد؟

- نەوەڵلا کوڕم! چۆن کاری وا دەکەم؟

- ئەی چیت کرد؟

- وتم: "دەی خاڵۆگیان لێم نزیک بەرەوە!"

ئەوەندە لە خۆم نزیک کردەوە تا لە تەنیشت خۆمدا دامنا.

دوایی وتم: "ئا گوێت بێنە قسەیەکت بۆ بکەم!"

گوێی نزیک کردەوە، پێم وت: "بەو خوایەی موحەممەدی کردووە بە پێغەمبەر، باسی ئەو شەوەم لای کەس نەدرکاندوە، تەنانەت لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش باسم نەکردووە کە ئەو شەوە لەگەڵمدا بوو."

- ئەی پیاوەکە چیی کرد؟

- ئەویش وتی: "ئا قوربان تۆیش گوێت بێنە!"

گوێم لێ نزیک کردەوە.

پێی وتم: "دەی بەو کەسەی موحەممەدی کردووە بە پێغەمبەر، منیش هەتا ئەم دەقەیە بەلای ئەو کارەدا نەچوومەتەوە!"

ئیتر منیش بە دەنگی بەرز الله اکبرێکم کرد، خەڵکیش نەیاندەزانی بۆچی الله اکبرم کردووە.

- دەی بۆچی کردت قوربان؟

- ئای پاک و بێگەردی بۆ خوا! ئەی نازانی ئەو پیاوە ئیتر تۆبەی کرد و لەو کارە نزیک نەبووەوە؟

- دەی قوربان، تۆبەی کردووە کردوویەتی، بۆ خۆی تۆبەی کردووە!

- کورە ئەوە کەی قسەیە تۆ دەیکەی؟ چۆن گوایە تاوان بکا پێمان ناخۆش بێ، بەڵام تۆبە بکا پێمان خۆش نەبێ! ئێمە ڕقمان لە تاوانە، نەک تاوانبار! بەڵام لە بەرابەریشدا چاکە و چاکەکارانمان خۆش دەوێ، ئێمە ئەگەر خراپە ببینین لەبەر خوا تووڕە دەبین، ئەگەر چاکەمان بینی پێی دڵشاد نەبین؟

- ڕاست دەکەی گەورەم! بەڵام بۆچی ئەو شەوەی بەو حاڵەوە بینیت بەرت دا؟

- چونکە نەدەبوو من بەو جۆرە برۆشتمایەتە ماڵەکەیەوە و بەو جۆرە بیبینم.

- بەڵام خۆ تازە بینیت؟

- ئەو پیاوە لە ماڵی خۆیدا دوور لە چاوی خەڵک تاوانی دەکرد! ئەو تاوانێکی کرد، بەڵام من دوو تاوان: جاسوسیم کرد، بێ مۆڵەت چوومە ماڵەکەیەوە. کاکە! ماڵی خەڵک شکۆ و ڕێزی تایبەتیی خۆی هەیە، نابێ کەس ئەو ڕێز و شکۆیە بشکێنێ!

- ئەی بۆچی لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود باسی هیچت نەکرد؟

- کوڕم! خوای گەورە گوناهی خەڵک و عەیب و عاری خەڵک دادەپۆشێ، پێی خۆشە خەڵکیش گوناھ و عەیب و عاری یەکتری داپۆشن. ئەو پیاوە نەفس زۆری پێ هێنابوو، شەیتان لە خشتەی بردبوو، لەو کاتەدا وای دەزانی باش دەکا، بۆ ئەوەی تەریق نەبێتەوە لە ماڵی خۆیدا بە نهێنی ئەو گوناهەی دەکرد، خوا تاوانەکەی داپۆشیبوو، من بۆچی قاڵی لێ بکەم؟!

- بەڵام خۆ قوربان، ئەو لە ترسدا لە ماڵدا ئەو تاوانەی دەکرد، چونکە لە دەرەوە بیکردایە، داری لێ دەدرا!

- کێ گوتوویەتی هەرکەس بە پەنامەکی تاوان بکا، ئەوە لە ترسی تۆڵە بە پەنامەکی کردوویەتی؟ لەوانەیە شەرم بکا لە بەرچاوی خەڵکدا ئەو تاوانە بکا، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "خوای گەورە لە گوناهی هەموو کەس خۆش دەبێ، ئەو کەسانە نەبێ کە بە ئاشکرا و لە بەرچاوی خەڵکدا تاوان دەکەن. جا ئەو کەسەیش کە لە ماڵدا و بەتەنیا گوناهێک دەکا و، دوایی لای خەڵکدا دەڵێ: 'دوێشەو فلان گوناهم کرد و فیسار گوناهم کرد،' ئەوەیش هەر ئاشکراکردنی تاوانە و وەک ئەوە وایە بە بەرچاوی خەڵکەوە بیکا. خوا بۆی داپۆشیوە خۆی ئاشکرای دەکا!"

- قوربان تۆ چەندێ شارەزای! چەند زیرەک و وەڵام حازری!

- دەی برا! ئەم باسە تەواو؟

- بەڵێ قوربان، با بزانم چیم بۆ باس دەکەی؟

- باسی ئەو ژنەی شەوانە بە سەر ئاوی هەڵدەگرت.

- چیرۆکی ئەو ژنە چییە؟

- وەک هەموو شەوەکانی تر شەوێک بەناو شاردا دەگەڕام، تەماشا دەکەم ژنێک کونەیەک[١] ئاوی لەسەر شانە، لێی نزیک بوومەوە و وتم: "خوا ڕەحمت پێ بکا! بۆ ئا لەم کاتەی شەودا لە ماڵ هاتوویتە دەر؟"

وتی: "من منداڵدارم! خزمەتکارم نییە، بە ڕۆژ ناتوانم منداڵەکانم جێ بهێڵم؛ شەو دێمە دەرەوە بۆ ئەوەی ئاوی خواردن بۆ ڕۆژ دابین بکەم!"

- ئەی تۆ چیت کرد؟

- بەزەییم بە حاڵیدا هاتەوە.

---

١ کونە: مەشکەی تایبەتی بۆ ئاو.

پێم وت: "بێنە ئەو کوندە ئاوەم بەرێ، با تا ماڵ بۆت هەڵگرم." کوندە ئاوەکەی پێدام، هەتا ماڵ بۆم هەڵگرت...

دوایی وتم: "سبەی برۆ بۆلای عومەر با خزمەتکارێکت بۆ دابین بکا!"

وتی: "من چۆن دەگەم بە عومەر؟"

منیش وتم: "خوا گەورەیە ئیشەڵلا دەیبینی."

- ئەی قوربان بۆ سبەینێ هات بۆلات؟

- بۆ سبەینێ هات، داوای کرد بێتە ژورەوە، مۆڵەتم پێ دا. هەر چاوی بە من کەوت، ناسیمیەوە و کێشای بە خۆیدا!

منیش خزمەتکارێک و بژێوی ژیانم بۆ دابین کرد و ناردمەوە.

- کورە قوربان تۆ بەڕاستی سەر بە زیادەوە ئەرکی خۆت بەجێهێناوە و ...

- سپاس بۆ خوا! بەڵام من پێم خۆشبوو هەموو پێداویستیی ئەو ژنە و هاووێنەی ئەو ژنە دابین بکەم، بۆ ئەوەی ئاتاجی هیچ شتێ نەبن.

- دەی قوربان چی تێدایە ئەگەر ژنێک ئاو بۆ منداڵی خۆی بباتەوە؟

- هیچ!

- دەی ئیتر بۆ خزمەتکار و پێداویستیی ژیانت پێ دا؟ کەی لەسەر دەوڵەت واجبە خزمەتکار بۆ خەڵک دابین بکا؟

- واجبی دەوڵەت ئەوەیە کە هیچ پێداویستیەک لە خەڵک مەنع نەکا. دەوڵەت دەوڵەمەند بوو، هەرچی لە خەزێنەی دەوڵەتدا هەبوو، هی ئەو خەڵکە بوو. خۆ من خزمەتکارم بۆ هەموو کەسێ دابین نەکرد، بۆ کەسێکم دابین کرد کە پێویستیی بە خزمەتکار هەبوو. ئەی نەتبینی چۆن بەو شەوە منداڵەکانی جێ هێشتبوو؟ بەو شەوە تاریکە بۆ قومە ئاوێک هاتبووە دەرەوە!

- با قوربان.

- دەی ئیتر بۆچی پارە و سامان لە خەزێنەدا بمێنێتەوە و خەڵکیش ئاتاج بن؟ بۆچی باشە؟ من پاسەوان و پارێزەری ئەو سەروەت و سامانەم. خۆ خاوەنی نیم! بزانم هەرکەس پێویستیی بە پارە و ماڵە، پێی دەدەم. هەرکەسیش پێویستیی نەبێ، پێی نادەم.

- ئەی قوربان ئەمە لەگەڵ دادگەریدا یەک دەگرێتەوە؟

- مەبەستت چییە؟

- مەبەستم ئەوەیە کە پارە دەدەی بە هەندێک و، نایدەی بە هەندێکی تر.

- شتەکە یەکجار بەو ڕەهایییە نییە. ئەو سەروەت و سامانە هیی ئەو خەڵکەیە بە یەکسانی و کەس مافی لە کەس زیاتر نییە. بەڵام خۆ پێشتر بۆم باسکردی کە چۆن خەڵکم پلەبەندی کردبوو بۆ مووچە برینەوە. ئەوانەی کە زووتر موسڵمان بووبوون، مووچەیان زیاتر بوو، ئەوانەی کە کەسوکاری پێغەمبەر ﷺ بوون، مووچەیان زیاتر بوو. لەو بارەوە زۆر دواین، حەز ناکەم دووبارە بچینەوە سەری. هەندێ جاریش هەندێ کەس مافی ئەوەی هەیە کە شتی بدرێتێ، چونکە ئاتاج و هەژارن. هەندێ کەس مافیان نییە، چونکە دارا و دەوڵەمەندن. با نموونەیەکت بۆ بێنمەوە: ئەگەر من لە جیاتی ئەو ژنە خزمەتکارێکم بۆ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف دابین بکردایە، ئەوە ستەمکاری بوو نەک دادگەری، چونکە عەبدوڕڕەحمان دەوڵەمەندە، با بۆ خۆی خزمەتکار دابین بکا. بەڵام ئەو ژنە هەژار بوو، توانای ئەوەی نەبوو خزمەتکار بە خێو بکات و مووچەی پێ بدات. ئێمەیش بە گوێرەی پێویستی خزمەتکارێکمان بۆ دابین کرد. ئەگەر یەکێکی تریش هەژار بێ و پێویستیی بە خزمەتکار بێ و خۆی نەتوانێ خەمەتکار دابین بکا، ئێمە بۆی دابین دەکەین، ئەمە دادگەرییە! تێگەشتی؟ خۆ ناکرێ هەرکاتێ دینارێکم بەخشی بە هەژارێ، بڕۆم جاڕ بدەم و، سەری زەلامێ دینارێکی پێ ببەخشم!

- بەڵێ قوربان تێگەشتم. ئەی بۆچی کونە ئاوەکەت بۆ هەڵگرت؟ با خۆی وەک هەموو شەوەکانی تر بیبردایەتەوە، بۆ بەیانییەکەی خزمەتکارت بۆ دابین دەکرد!

- ئەی بۆچی بۆی هەڵنەگرم، چییە؟.

- ئاخر تۆ گەورەی موسڵمانان نیت!

- با.

- مەبەستم ئەوەیە کە تۆ سەرکردەی یەکێک لە وڵاتە هەرە گەورەکانی ئەو سەردەمە بووی، کەچی بە شەودا کوندە ئاو بۆ ژنێک هەڵدەگری؟!

- کورە خوا بتبەخشێ، ئێستە من بەو کارەم گەورە بووم یا بچووک؟

- وەڵڵا قوربان گەورە بوویت!

- دەی ئیتر بۆ بەو شێوەیە لێم دەپرسیتەوە؟

- مەبەستم سام و هەیبەتی تۆیە قوربان، دەڵێم نەکا لە بەر چاوی خەڵک کەم بکا!

- سام و هەیبەتی من ئەوەیە کە ئەو خەڵکەی لەژێر فەرمانڕەوایی مندا دەژین، خۆشحاڵ بن و موحتاجی هیچ شتێ نەبن!

- بە خوا قوربان تۆ کەسێکی زۆر مەرد و چاکی.

- دەی هیچی تر هەیە لەم بارەوە لێم بپرسی؟

- نەخێر گەورەم!

- دەی با قسەکەی خۆمان تەواو بکەین.

- باشە قوربان! چیتر هەیە بۆم باس بکەی؟

- ئەو ژنەی کە بەردی دەکوڵاند بۆ منداڵەکانی!.

- بەرد؟!

- ئا ئا، بەردا!

- چۆن قوربان؟ خەبەر چییە؟!

- لە نزیک شاری مەدینە زەوییەکی بەردەڵان هەبوو ناوی "حەرەی واقم" بوو، لەگەڵ ئەسلەمی خزمەتکارمدا ڕۆشتین بۆ ئەوێ، لە دوورەوە ئاگرێکمان بینی.

وتم: "ئەسلەم! وا دەزانم ئەوانە ڕێبوار بن و شەو و سەرما تەنگی پێ هەڵچنیبن. با بڕۆین بزانین چییە؟"

بە خێرایی ڕۆشتین بەرەو لای ئاگرەکە، لە ئاگرەکە نزیک بووینەوە، تەماشا دەکەم ژنێکە و بڕێ منداڵی وردی لایە، مەنجەڵێکیشی خستووەتە سەر ئاگر، منداڵەکانی لە برسدا دەگرین.

منیش سڵاوێکم کرد وتم: "سڵاوتان لێ بێ ئەی خاوەن ڕۆشناییەکان." پێم ناخۆش بوو بڵێم خاوەن ئاگرەکان.

- ئای چەندە ژیر و زانای گەورەم! چەند قسەکانت پاراو و جوانن! ئەگەر خۆت نەتفەرمووبایە بۆچی وات وتووە، لێم دەپرسیت بۆچی وتت خاوەن ڕۆشنایی؟ بەڵام خۆت پێش ئەوەی من بپرسم، وەڵامت دامەوە!

- کوڕم ! ئێمە ئەگەر قسەی ڕێک و مانادار و جوان بەکار بێنین، دڵخۆش دەبین.

- ڕاست دەفەرمووی قوربان، دەی دواتر چی ڕووی دا؟

- ژنەکە وەڵامی دایەوە و وتی: "علیک السلام"

وتم: "ئیزن هەیە کەمێک نزیک ببمەوە؟"

وتی: "لەسەر خێران ! فەرموو!"

نزیک بوومەوە و وتم: "پورێ گیان ئەوە چییە؟"

وتی: "شەومان بەسەردا هاتووە و ساردە، لێرە لاماندا وە."

وتم: "ئەی ئەو منداڵانە بۆ وا دەگرین؟"

وتی: "برسییانە."

وتم: "ئەی ئەو مەنجەڵە چی تیایە لەسەر ئاگرت داناوە؟"

وتی:" ئاو و بەرد! دەیانخەڵەتێنم بۆ ئەوەی خەویان لێ بکەوێ، خوا لەنێوان من و عومەردا بێ!"

منیش وتم: "خوا ڕەحمەت پێ بکا، دەی عومەر چوزانێ بە حاڵی تۆ؟"

وتی: "ئەی چۆن دەبێتە سەرۆکمان و، نایشزانێ چیمان بەسەر دێ؟"

- ئەی تۆ چیت پێ وت گەورەم؟

- هیچم بەو نەوت، وتم بە ئەسلەم: "یەڵڵا با بڕۆین!"

- بۆ کوێ قوربان؟

- بە ڕاکردن تا عەمباری ئاردەکە ڕامکرد، قاپێ ڕۆن و تورەکەیەک ئاردم هێنا. وتم بە ئەسلەم: "بیدە بە کۆڵمدا."

ئەسلەم وتی: "من بۆت هەڵدەگرم."

وتم: "لە ڕۆژی قیامەتیشدا گوناهەکانم هەڵدەگری؟ دەی هەتیو زووبە بیدە بە کۆڵمدا."

- دوای ئەوە چی ڕووی دا قوربان؟

- ئەسلەم کۆڵەکەی دا بە کۆڵمدا، بە ڕاکردن چووینەوە بۆلای ژن و منداڵەکان، نەوەستاین تا ئەوێ.

بە ژنەکەم وت: "دەی من کەوچک ڕا دەدەم بەناو مەنجەڵەکەدا و، تۆیش ئارد."

ژنەکە ئاردی دەکردە مەنجەڵەکە و، منیش کەوچکم تێ وەردەدا، فووم دەکرد لە ئاگرەکە، دووکەڵ لەژێر ڕیشمەوە دەهاتە دەر، هەر بەو جۆرە بووم تا مەنجەڵێ ئاردەوام بۆ دروست کردن، مەنجەڵەکم داگرت، بەلەمییەکم پڕ کرد و وتم بە ژنەکە: "دەی من ساردی دەکەمەوە و، تۆیش بیکە بە دەم منداڵەکانەوە." هەروا بەو جۆرە ساردم دەکردەوە و ئەویش دەیکرد بە دەم منداڵەکانییەوە تا هەموویان تێر بوون.

دوایی ژنەکە وتی: "بە خوا خەلافەت شایانی تۆیە نەک عومەر کوڕی خەتتاب."

منیش پێم وت: "بەیانی بڕۆ بۆلای عومەر، خۆم قسەی لەگەڵدا دەکەم و باسی تۆی بۆ دەکەم."

- دەی دوایی چیت کرد؟

- من و ئەسلەم خۆمان دوور خستەوە و چووینە شوێنێک ئەوان ئێمەیان نەدەبینی، بەڵام ئێمە ئەوانمان دەبینی.

ئەسلەم وتی: "گەورەم با بڕۆین زۆر ساردە!"

وتم: "نابێ! هەتا بە چاوی خۆم نەیانبینم پێبکەنن، جێیان ناهێڵم، من بەدەم گریانەوە ئەوانم بینی، دەبێ بەدەم پێکەنینەوە جێیان بهێڵم!"

- دوایی چی قوربان؟

- منداڵەکان خەویان لێکەوت و، من و ئەسلەمیش ڕۆشتینەوە.

- ئەی دواتر.

- بەرنوێژی نوێژی بەیانیم کرد بۆ خەڵک، زۆر بە خوڕ دەستم کرد بە گریان. قسەی ژنەکەم بیر دەهاتەوە کە وتی: "عومەر چۆن دەبێتە سەرۆکمان و نایشزانێ چیمان بەسەر دێ"؟

- ئەی دوایی هات بۆ لات؟

- بەڵێ هات، داوای ئیزنی لە پاسەوان کرد، وتم: "ئیزنی بدەن بێتە ژوورەوە." کە منی بینی ناسیمیەوە، بەڵام نەیزانی من عومەرم، هەر ئەوەندەی دەزانی کە دوێ شەو یارمەتیم داوە، لەو کاتەدا عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب و عەبدوڵلای کوڕی مەسعود هاتنە ژوورەوە. وتیان: "سڵاو لە گەورەی ئیمانداران!"

- ئەی ژنە چیی کرد؟

- هەردوو دەستی خستە سەر سەری و وتی: "ئای باوکە ڕۆ! لە بەردەم گەورەی ئیمانداراندا جوێنم پێ داوە؟"

منیش وتم: "قەیناکا خوشکم، دەی ئەو ستەمەی کە لە تۆم کردووە، بە چەند پێم دەفرۆشیتەوە؟"

وتی: "ستەمی چی؟ تۆ هەر کە زانیت ئاتاجم، نەڕۆشتی تا ئاتاجیی منت دەرکرد، چاوت لە منداڵەکانم بوو کە چۆن دەگریان، نەڕۆشتی تا هەموویانت تێر کرد!"

وتم: "شتی وا نابێت، هەتا لێت نەکڕمەوە، واز ناهێنم."

داوای پارچە کاغەزێکم کرد، لەسەر کاغەزەکە نووسیم:

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان: ئەمە
ئەو کڕینەیە کە عومەر ستەمەکەی لە
فلان ژن کڕییەوە بە بیست و پێنج
دیناری زێڕ، لە قیامەتدا هەر داوایەکی
لەسەر عومەر تۆمار کرد، ئەوە عومەر
بەرییە، عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب و
عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود شایەتن!

دوایی نامەکەم دا بە عەبدوڵڵای کوڕم، وتم: "ڕۆڵە هەرکاتێ من مردم، ئەم نامە بخەرە نێو کفنەکەمەوە، با ئەو دەمەی دەگەم بە خوا، پێم بێ!"

- بە خوا ئەو ژنە نەیزانیبوو لای خۆتدا چی بە تۆ وتووە. تۆیش جار لە دوای جار سەرسامم دەکەی، قسەکانت یەک لە یەکتری سەیرترن، دەڵێی تۆ لە گڵ دروست نەکراوی، لە دادگەری دروست کراوی!

- دوای ئەوەی کە ئەو ستەمەت لە من بینی، هێشتا پاکانەم بۆ دەکەی؟

- بە خوا چاکە نەبێ، هیچم لە تۆ نەدیوە!

- چۆن؟

- کورە قوربان، تۆ زۆر دەکەی لە خۆت، باری خۆت گران دەکەی! خۆ تۆ کۆتایی دونیا نیت، هەندێ شتت لا ڕوونە و زۆر شت هەیە لێی بێ ئاگای، ئیتر بۆ وا خۆت نیگەران دەکەی؟ خەڵکیش بەربڵاو بوونە، زۆر بوون، تۆ بە هەر شتێکت زانیبێ، بە باشی بڕیارت لەسەر داوە. هیچ قسووریت نەبووە، ئیتر هەرکەس و بە گوێرەی توانای خۆی!

- ئەی تۆ چی دەڵێی لە بارەی قسەی ئەو ژنە کە وتی: "عومەر چۆن دەبێتە سەرۆکمان و نایشزانێ چیمان بەسەر دێ"؟

- دەی ئەو ژنە هەژار و ئاتاج بووە، هەرکەسیش هەژاری ڕووی تێ بکا، لە ناچاریدا کەمێک بێتەقیە و ڕوودار دەبێ. هەموو کەسێ دەیەوێ خەلیفە بۆ ئەو کار بکا، بەڵام خۆ ناکرێ، خەلیفە هیی هەمووانە!

- ئەی ئەو ژنە بەشێک نەبوو لەو خەڵکە؟

- با، بەڵام ئەویش وەک ئەو خەڵکە. تۆ کە زانیت پێویستیی بە شتە، یەکسەر بۆت دابین کرد و هیچ قسووریت نەکرد، هەر وەک ئەوانە بوو کە نامەت بۆ والییەکان دەنووسی کە ئاگاداری خەڵکە هەژارەکە بن. خۆ تۆ نەتدەزانی کێ هەژارە و کێ هەژار نییە!

- بە خوا ئەگەر من کەموکوورِیم نەبووایە، ئەو ژنە وای نەدەوت!

- قوربان هەرکەسە و لە چاوی خۆیەوە تەماشای بارودۆخ دەکا، ئەو چونکە هەژار و ئاتاج بوو، وای زانیوە خەڵک هەمووی وایە و خەلیفە ئاگای لە کەس نییە! تۆیش بە گوێرەی دادگەریی خۆت شتت پێ بەخشی، ستەمەکەت لێ کڕییەوە، هەرچەند من پێم وایە هیچ ستەمێکت لێ نەکردبوو!

- کورە تۆ دەتەوێ دڵم خۆش بکەی! ئەگینا وا نییە!

ـ نا بە خوا قوربان، من قسەی ڕاستی دەکەم! هەروایە کە من دەیلێم، ئەو ڕووداوە بە قازانجی تۆ شکایەوە نەک لە دژی تۆ!

ـ چۆن؟

ـ ئەی تۆ نەڕۆشتی بۆ یامەتی ئەو ژنە؟

ـ با.

ـ دەی کەوابوو تۆ ویستووتە پێویستیی ئەو ژنە جێبەجێ بکەی، کەوابوو تۆ سەرکردەیەکی چاک بووی، بێ ئاگا نەبووی لە خەڵک. ئەو کەسە بێئاگایە کە هەر لە ماڵەوە پاڵی لێبداتەوە، لە جێگەی خۆی نەبزوێ، بڵێ: "من هەقم چییە خەڵک چی دەکا، با بیکا." بەڵام تۆ لە شەوەزەنگێکی زۆر سارددا دەچووی، بە ناو شاردا دەگەڕای و، تەنانەت دەرەوەی شاریش، دەگەڕای بزانی کێ شتێکی پێویستە؟

ـ بەڵێ بە خوا هەر بۆ ئەوە دەچوومە دەر، دەمگوت بزانم کێ شتێکی پێویستە بۆی جێبەجێ بکەم.

ـ ئەی ئەو کاتەی ژنەکەت بینی، نەچووی بزانی چی گەرەکە؟

ـ با ڕۆشتم.

ـ دەی کە وا بوو، بێ ئاگا نەبووی لەو خەڵکە. ئەگەر تۆیش مەبەستت یارمەتیدان و چاودێری نەبووایە، نەدەڕۆشتی بزانی کێیە و چی دەوێ. تەنانەت هەر لە ماڵ نەدەهاتیتە دەرەوە. دواتر، خۆ تۆ بە کۆڵی خۆت ئاردەکەت هەڵگرت بۆیان! ڕازی نەبووی ئەسلەم هەڵیبگرێ.

پێت وت: "ڕۆژی قیامەت تۆ گوناهەکانم هەڵدەگری؟"

ـ بەڵێ وام کرد.

ـ دەی ئیتر سەرکردەیەک خۆی بڕواتە دەر و هەواڵی خەڵک بپرسێ و خۆی بە کۆڵ شتیان بۆ ببا و پێویستییان جێبەجێ بکا، کەی بێئاگایە؟ خۆ ئەگەر ئەسلەمیشت لە باتی خۆت بناردایە، ئەوەیش هەر دەبوو، بەڵام تۆ بەوەیش ڕازی نەبووی، ویستت خۆت کارەکە جێبەجێ بکەی!

- ئاخر چونکە من بەرپرسی ئەو ژنە بووم، نەک ئەسلەم!

- ئەی تۆ خۆت خواردنەکەت بۆ چاک نەکردن؟ خۆت بۆت سارد نەکردنەوە؟

- با، ئەوەیشم کرد.

- دەی ئیتر ئەو ژنە لەوە زیاتر چی لە بەرپرس دەوێ؟! خواردنی بۆ چاک بکا و بۆی سارد بکاتەوە! ئیتر لەوە زیاتر چیی دەوێ؟!

- دەیەوێ هەر لە سەرەتاوە برسیی نەبێ، نەک برسیی ببێت و دوایی تێر بکرێ؟

- دەی قوربان سوننەتی ژیان وایە، هەندێ ساغە، هەندێ نەخۆش، هەندێ تێرە و هەندێ برسی!

- ڕاست دەکەی کوڕم وایە!

- وای دابنێ کە تۆ ستەمیشت لێ کردبێ! - کە نەتکردووە - ئەی تۆ ستەمەکەت نەکڕیەوە، گەردنی خۆتت پێ ئازا نەکرد؟ شایەتت نەگرت؟

- با وابوو.

- دەی قوربان، ئیتر کەمێک بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە و ئەوەندە خەفەت مەخۆ!

- ئەی خوا بە فریات بگا، بە خوا دڵی منت خۆش کرد!

- قوربان، من ڕاستیەکەم وتووە. ئەگەر شتێکی تر بووایە، ئەوەم دەوت. حاشا کە گەورەمان کاری خراپی لێ ببینرێ!

- ئەمە گومان باشیی خۆتە.

- بە خوا قوربان تۆ خۆت باشی، دادگەری، زانای، لێهاتووی، جوامێری

- سپاس کوڕم! خوا ئاگای لێت بێ.

کەوابوو لەم باسە بووینەوە؟

- بەڵێ قوربان! دەی لەو باسی شەوگەڕانانە چیی تر هەیە بۆم بکەی، گەورەم؟

- تەواو هیچم بەبیردا نایەت.

- دەی کە وا بوو ،باسی شەوگەڕان تەواو دەکەین، درێژە بە باسی دادگەری دەدەین.

- لەسەر ئیزنی خوای گەورە، دەی بزانم چ پرسیارێکم لێ دەکەی؟

- بیستوومە پۆشاکێکت بەخشیوەتە دایکی سولەیت!

- مەبەستت چییە و چیت دەوێ؟

- دەمەوێ بزانم چی گوزەراوە؟ بۆم باس بکەی.

- ئەی تۆ خۆت نەتگوت بیستوومە؟

- با قوربان وتم، بەڵام دەمەوێ لە دەمی خۆتانەوە و، وەک خۆی بیبیسم.

- چەند پارچە جلێکم لە مەدینە بەسەر ژناندا دابەش کرد، عەبایەکی باش مایەوە. بەوانەی دەوروبەری خۆمم وت: "ئەم عەبایە بدەم بە کێ؟"

هەندێ وتیان: "بیدە بە کچەکەی پێغەمبەرﷺ کە لەلای خۆتە." مەبەستیان ئوم کەلسومی کچی فاتمەی کچی پیغەمبەرﷺ بوو.

منیش وتم: "بیدەم بە دایکی سولەیت باشترە، ئەو شایانترە."

وتیان: "بۆ؟"

وتم: "چونکە لە غەزای ئوحوددا ئەو بە مەشکە و کوندە ئاوی بۆ ئێمە دەهێنا."

- یانی دات بە دایکی سولەیت؟

- بەڵێ، دام بە ئەو.

- ئەی بۆ بەگوێی ئەوانەت نەکرد کە وتیان؛ بیدە بە ئوم کەلسوم؟

- لەبەر ئەوەی دایکی سولەیت شایانتر بوو، لە غەزای ئوحوددا ئاوی بۆ دەهێناین.

- ئەی قوربان تۆ نەتگوت: "من لە بەخشیندا خزم و کەسوکاری پێغەمبەرﷺم پێش هەموو کەس دەخست"؟

- با وتم، ئێستەیش دەیڵێم.

- ئەی ئەوە نییە نەتبەخشی بە ئوم کەلسوم؟

- ئاخر ئوم کەلسوم ژنی خۆم بوو، بەخێوکردنی لە ئەستۆی منداپە. ئەگەر بمدایە بەو، وەک ئەوە وایە بە خۆمم دابێ!

- ئاخر ئەو ژنی تۆ بوو، ئەو عەبایەیش دڵی خۆش دەکرد.

- دەی من بە ماڵ و سامانی خۆم دڵخۆشی دەکەم، نەک بە هیی خەڵک. وابزانم تۆ دایکی سولەیت بە کەم دەزانی؟!

- پەنا بەخوا! هەرگیز، بەڵام دەمەوێ بزانم بۆچی دایکی سولەیتت لە ژنەکەی خۆت بە شیاوتر زانی؟

- چونکە دایکی سولەیت یەکێک بوو لەو کەسانەی کە لە کۆنەوە موسڵمان بووبوو، بەیعەتی بە پێغەمبەرﷺ دابوو، ئەو ڕۆژەی ئەو کونە ئاوی بۆ ئێمە دەهێنا، ئوم کەلسوم هەر لەدایک نەبووبوو. دەی ئیتر کەی دادگەری وایە کەسێک کە هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە موسڵمان بووبێ، لە ئوم کەلسوم بە شیاوتری نەزانم، لە کاتێکدا بەخێوکردنی ئوم کەلسوم لەسەر خۆمە؟

- ڕاست دەکەی قوربان، داوای لێبوردن دەکەم، من تەنیا مەبەستم ئا ئەمە بوو کە ئێستا فەرمووت. دەمەویست ئەو خاڵەم لا ڕۆشن بن کە خاڵی دادگەریە. دەمەوێ بزانم حیکمەت چییە لە کارەکانتدا؟ دەمەوێ بزانم چۆن ئەو خەڵکەت بەڕێوەبردووە؟

- دەی قەیناکا کوڕم! ئێستە پێم بڵێ هیچی تر ماوە یا نا؟

- تەواو قوربان هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە.

- دەی با خۆم باسی شتێکت بۆ بکەم، تۆزێک لەم باسە دەچێ، تا باشتر بزانی من چۆن فەرمانڕەواییم کردووە؟ بزانی چۆن ئەو کەسانەی کە زووتر موسڵمان بوون، بە شیاوترم دەزانین؟ بزانی چۆن ڕێزی کەسوکاری ئەوانەیشم گرتووە؟ بزانی چۆن ڕابردووم لە بەرچاو بووە؟

- دەی قوربان ئاواتەخوازم زوو بۆم باس بکەی!

- دەی گوێ بگرە با بۆت بڵێم.

- فەرموو گیان و دڵم لاتە.

- من و ئەسلەمی خزمەتکارم چووینە بازاڕ، ژنێکی گەنجمان پێ گەشت.

وتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان! پیاوەکەم مردووە، منداڵم وردە، بە خوا نەکەوتوونەتە سەر پێ، نە کشتوکاڵێکمان هەیە نە ئاژەڵ، دەترسم کەمتیار بیانخوا، من کچی خەفافی کوڕی ئیمای غەفاریم، باوکم لە پەیمانی حودەیبییەدا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا بوو.

منیش وتم: "ئەی سڵاو لە برازای خۆشەویسم! ئا لێرە بوەستە، چاوەڕێم بە."

- بۆ کوێ ڕۆشتی قوربان؟

- ماڵی خۆمان.

- لە ماڵ چیت کرد.

- وشترێکمان هەبوو بەسترابووەوە، بارم کرد لە خواردن و جلوبەرگ، هەندێکیش پارەم خستە ناویەوە، ڕەشۆی وشترەکەم گرت و ڕۆشتمەوە بۆلای ژنەکە و، ڕەشۆی وشترەکەم دا بە دەستیەوە.

وتم: "دەی دادەکەم، لێ بخوڕە بۆ ماڵی خۆتان، ئیشەڵڵا نافەوتێن و، خوا تووشی خێرتان دەکا."

پیاوێک وتی: "کورە گەورەم شتت زۆر پێ دا!"

پێم وت: "ئەی دایک ڕۆڕۆت بۆ بکا، بە خوا باوک و برای ئەم ژنەم بە چاوی خۆم بینی گەمارۆی قەڵایەکیان دابوو تا ئێمە گەشتین پێیان و قەڵاکەمان ئازاد کرد، بۆ بەیانی بەشێکی تەواومان پێ دان!"

- ئای چەندە بەوەفای گەورەم!

- ئێستا بۆت ڕوون بووەوە کە عومەر چۆن تەماشای شتەکان دەکا؟

- بەڵێ قوربان! پێش ئەوەیش تۆ لە چاوی مندا هەر گەورە و مەزن بووی، زیاتر و زیاتریش گەورە بووی.

- دەی خوا بتپارێزێ، من تەنیا دەمەوێ بزانی کە ئەگەر بەشی کەسێکم نەدا، بە دادگەرییەوە بەشی نادەم؛ بەشی هەرکەسێکیشمدا، دیسان هەر بە گوێرەی دادگەری بەشی دەدەم.

- بە خوا منیش هەروا لێت دەڕوانم.

- دەی مادەم ئەم قسە کرا و ئەو باسە هاتە ناوەوە، شتێک هەیە با بۆت بگێڕمەوە.

- هیچ شتێکم ئەوەندەی ئەوە پێ خۆش نییە کە تۆ بفەرمووی: "گوێم لێ بگرە!" دەی قوربان گیان، دڵم لەلاتە بفەرموو.

- ڕۆژێک لە مەدینەدا دەڕۆشتم بە ڕێدا، کیژۆڵەیەکم بینی دەڕۆشت و دەکەوت، دەڕۆشت و دەکەوت.

وتم: "ئای کە گوناهە! ئای کە هەژارە! ئەوە کامتان ئەو منداڵە دەناسن؟"

عەبدوڵلای کوڕم وتی: "قوربان نایناسی؟"

منیش وتم: "نەخێر! کێیە؟"

وتی: "ئەوە یەکێکە لە کچەکانی خۆت."

وتم: "کام کچ."

وتی: "ئەوە کچی منە."

منیش وتم: "دەی هەتیو ئەو کچە بۆ وایە؟"

وتی: "ئاخر تۆ هیچمان پێ نادەی."

منیش وتم: "دەی دەکرێ من هیچت پێ نەدەم، ئیتر تۆیش شتێکیان بۆ پەیدا نەکەی؟ بەخوا جگە لەو مووچەی کە شایستەی خۆتە، هیچی ترت پێ نادەم! ئیتر بەشت دەکا یا نا، ئەوە کێشەی خۆتە! ئەوە قورئانە با لەنێوان من و تۆدا داوەر بێ."

- بەڵام قوربان خۆ ئەو کچە کوڕەزای خۆت بوو!

- دەی باشە با کوڕەزای من بێ، دەبێ باوکی بەخێوی بکا. ئەگەر منیش بمەوێ بە خێوی بکەم، دەبێ بە پارە و سامانی خۆم بەخێوی بکەم، نەک لە سامانی گشتی. ئەوە باوکی مووچەیەکی هەیە، لەوە زیاتر هیچ بە خۆیەوە نابینێ، هەروەک ئەو خەڵکە بەشی هەیە و تەواو. سەدجار کوڕی خەلیفە بێ، لەو خەڵکە زیاتر بەشی نییە.

- ئەی قوربان تۆ شتت نەدەبەخشی بە خەڵکی داماو و هەژار؟

- با! بەرەوەڵڵا بەشی فەقیر و هەژارانم دەدا.

- دەی عەبدوڵڵای کوڕت هەژار بوو، بۆ هیچت پێ نەدا.

- ئاخر عەبدوڵڵا ساغ و سەلامەت بوو، دەیتوانی کارێک بکا و بژێوی بۆ منداڵەکانی پەیدا بکا. خۆ ناکرێ هەر جارێ پیاوێکی ساغ و سەلامەت، بێ ئەوەی هیچ نوقسانییەکی هەبێ، بێت و بڵێ: "قوربان هەژارم،" منیش لەو سەروەت و سامانەی گەل شتێکی بدەمێ. بۆ ناڕوا وەک ئەو خەڵکە بۆ خۆی کار و کاسبییەک بکا؟

- ڕاست دەفەرمووی قوربان.

- دەی بزانم لەم باسە بووینەوە یا نە؟

- ئەمە تەواو بەس شتی تر ماوە.

- چی؟

- چی لەنێوان تۆ و نوعمانی کوڕی نەزلەدا هەیە؟

- مەبەستت چییە؟

- وابزانم شیعرێکی وتووە و تۆیش لەسەر ئەو شیعرە لە بەرپرسیارییەکەی دەرت کردووە؟

- باشە، ئێستە پێت دەڵێم چۆن بووە.

- دەی قوربان چاوەڕێم.

- من نوعمانی کوڕی نەزلەم کردبوو بە بەرپرسی میسان، نوعمان شاعیر بوو، ڕۆژێک ئەم شیعرەی وتبوو:

کاتی ئەوەیە کە کیژێکی جوان
بادەم بۆ بێنێ بە گۆزە و سەرشان
هەرکاتێ ویستم گۆرانی بڵێ
سەمام بۆ بکا لەسەر ڕێگا و بان
هۆ ساقی! ئەگەر شەراب دەهێنی
پیاڵە مەهێنە، بێنە بە لێوان
سەرۆک ڕقیەتی لە کۆڕی بادە
لە کەلاوە بێ یاخود دیوەخان[1]

کاتێ ئەو شیعرەم بیستەوە، وتم: "ئەرێ بە خوا حەز ناکەم. هەرکێ نوعمانی بینی پێی بڵێ: 'عومەر دەری کردووی!' خۆیشم نامەی بۆ دەنووسم دەست لە کار بکێشێتەوە.

- دەی دوایی چی ڕووی دا؟

- پیاوێکی ناسراوی خۆی پێی وتبوو کە گەورەی موسڵمانان لەسەر کار دەری کردووی، زۆری پێ نەچوو، نامەکەی منیشی گەشتبووە دەست.

- چیت بۆ نووسیبوو، گەورەم؟

- نووسیم:

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

ألا هل أتى الحسناء أن حليلها ... بميسان يسقى في زجاج و حنتم
إذا شئت غنتني دهـــاقين قرية ... و رقاصة تجثو على كـــل منسم
فإن كنت ندماني فبالأكبر اسقني ... ولا تسقني بـــالأصـغر المتثلم
لعـــل أمير المـؤمنين يسـوؤه ... تنـادمنـا بـالجوسق المتهـدم

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوْبِ شَدِيدِ ٱلْعِقَابِ ذِى ٱلطَّوْلِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ ﴾ غافر: ١ - ٣

واتە: "حا میم، هاتنە خوارەوەی ئەم قورئانە لەلایەن خوای باڵادەست و شارەزا و زاناوەیە. هەمیشە ئەو زاتە لێخۆشبووی گوناهە، وەرگری تەوبە و پەشیمانییە لە بەندە گوناهبارەکانی، تۆڵەسێنەرە، زۆر بەسەختی لە یاخی بووان و ستەمکاران، دەستەڵاتدارە و خاوەن و بەخشێنەری ناز و نیعمەتەکانە، هیچ خوایەک نییە جگە لەو، سەرەنجامیش هەر بۆلای ئەوە."

پاشان: من ئەو شیعرەی تۆم بیستەوە کە وتووتە:

سەرۆک ڕقیەتی لە کۆڕی بادە
لە کەلاوە بێ یاخود دیوەخان

ئەرێ بە خوا ڕقم لێیەتی، ئەوا تۆم لە کار لادا، لەمڕۆ بەدواوە کاربەدەست نیت!

- ئەی دوایی چی ڕووی دا گەورەم؟

- خۆی هات بۆ لام و وتی: "کوڕە گەورەم! بە خوا من لە ژیانمدا بادەم نەخواردووەتەوە، ئەوە هەر شیعرێک بووە هاتووە بە سەر زمانمدا و وتوومە."

منیش وتم: "دەزانم! بەڵام هەتا تۆ ماوی و من مابم، لای من نابی بە کاربەدەست!"

- بۆچی قوربان؟ خۆ تۆ دەتزانی بادەی نەخواردبووەوە!

- من پێم خۆش نییە کەس لەژێر دەسەڵاتی مندا بە بادە و عارەقدا هەڵبدا!

- بەڵام خۆ قسەی شاعیر تەنیا...

- دەزانم! با وایش بێ، خەڵک چاو لە سەرکردە دەکا، ئەگەر سەرکردە بە ئارەزووی خۆی کردی و بردی، خەڵکیش وا دەکەن، ئەگەریش سەرکردە نەفسی خۆی گرت و ئارەزووبازیی نەکرد، خەڵکیش نەفسی خۆیان دەگرن و ئارەزووبازی ناکەن. ئەی ئەگەر سبەی یەکێک بادەی خواردەوە و هێنایان و وتمان بۆ کاری وات کردووە و ئەویش وتی: "ئەی ئەوە نییە فلان والیی خۆت ئەو شیعرەی بەسەر بادەدا هەڵداوە...." نا، بە خوا! مادەم وای وتووە، نابێ هەرگیز لای من ببێ بە کاربەدەست.

- ڕاست دەکەی قوربان.

- دەی ئێستە بزانم چیم لێ دەپرسی؟

- پرسیاری "لای من هەرگیز نابێ بە کاربەدەست."

- مەبەستت چییە؟

- جگە نوعمان، بە کەسی ترت وتووە: "هەرگیز لای من نابێ بە کاربەدەست"؟

- بەڵێ.

- کێ بوو و، بۆچی؟

- سوپایەکم نارد و پیاوێکم کرد بە سەرکردەی سوپاکە، گەشتبوونە ڕووبارێک و ڕووبارەکە پردی بۆ پەڕینەوە نەبوو، سەرکردەکە بە سەربازێکی وتبوو: "بڕۆ ناو ئاوەکە بزانە ساردە؟ ئێمە دەتوانین لێی بدەین؟"

ئەو کاتە دونیا زۆر سارد بوو.

سەربازەکە وتبووی: "دەترسم بچمە ئاوەکە، لە سەرمدا ڕەق ببمەوە!" بەڵام سەرکردەکە زۆری لێ کردبوو کە بچێتە نێو ئاوەکە.

ئەویش بە ناچاری ڕۆشتبووە ناو ئاوەکە و، لە سەرمدا دەستی کردبوو بە: "ئەی هاوار عومەر! ئەی هاوار عومەر!"

زۆری پێ نەچووبوو لە سەرمدا ڕەق بووبووەوە و مردبوو. من لە مەدینە لە بازاڕدا بووم و ئەو هەواڵەم پێ گەشت. یەکسەر وتم: "هۆ بەڵێ هۆوا" دوایی ناردم بە شوێن ئەو سەرکردەدا و لە کار لامدا و، پێم وت: "ئەگەر نەبووایە بە عادەت، هەر ئێستە دەمکوشتی، بەڵام هەرگیز لای من نابی بە کاربەدەست!"

- دەی قوربان! خۆ ئەو سەرکردەیە لەبەر سوپاکە وای کردووە، لەبەر خەڵک، ویستوویەتی ڕێگەیەکی ئاسان بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە تیا نەچێ!

- بەڵێ ئەمە ڕاستە! بەڵام نەدەبوو خەڵک بفەوتێنێ و بیانخاتە نێو فەتەراتەوە. من پاراستنی گیانی موسڵمانانم لە ئازادکردنی وڵاتێک پێ خۆشترە.

- ئەی بۆچی ویستت بیکوژی؟ خۆ ئەو سەرکردەیە سەربازەکەی نەکوشتبوو!

- ڕاستەکەی بە شمشێر نەیکوشت، بەڵام بە فرمانێک ئەوی کوشت. بە خوا ئەگەر نەبووایە بە عادەت، هەرجارێ سەرکردەیەک فرمانی بە کەسێک بدایە و ئەو کەسە تیا بچووایە، دوایی خەڵک بیانوتایە: "ئەو سەرکردە بکوژن، کاتی خۆی عومەریش لەبەر شتێکی وا سەرکردەیەکی کوشت." ئەوا دەمکوشت، بەڵام چی بکەم، شەڕ و جەنگ ناخۆشە، بڤەیە، نەمویست بەر بۆ خەڵک شل بکەم. دوایی سەرکردەکان لە ترسی تۆڵە هیچیان پێ نەدەکرا و سەربازەکانیش زاڵ دەبوون بەسەر سەرکردەکاندا و بە گوێیان نەدەکردن.

- پاک و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی ئەو هەمووە زانیارییەی داوە بە تۆ! تۆ تەنیا خەمی ئێستا ناخۆی، بەڵکو خەمی داهاتوویش دەخۆی!

ـ کوڕم! نابێ سەرۆک تەنیا چاوی لە ئێستا بێ و، ئایندەی لە بەرچاو نەبێ، دەبێ سەرۆک دووربین بێ.

ـ ڕاست دەکەی قوربان.

ـ دەی بزانم ئەم باسە کۆتایی هات؟

ـ بەڵێ گەورەم.

ـ چ پرسیارێکی ترت لایە؟

ـ پێم خۆشە باسی ئەو ژنەم بۆ بکەی کە هات شکاتی لەو والییە کرد کە ناوی موحەممەدی کوڕی سەلەمە بوو.

ـ باشە، جوان گوێ بگرە با بۆت باس بکەم!

ـ دەی فەرموو قوربان، هەموو گیانم دەکەم بە گوێ بۆ بیستنی قسەکانت.

ـ جارێکیان لە سێبەری دارێکدا خەوتبووم، لەناکاو کۆمەڵە کەسێک هاتن، لەناو خۆیاندا سکاڵاو شکات و داواکارییان هەبوو، وەک سکاڵاو شکاتی نێوان کاربەدەست و خەڵکی ئاسایی وابوو، لەناکاو ژنێکی دەشتەکی هات و کارێکی بە من هەبوو، کە ئەو خەڵکەی بینی لەلای مندا کۆبوونەتەوە، بەوەدا منی ناسیبوو، هات بۆلای من، وتی: "من ژنێکی هەژارم! بڕێ کوڕم هەس، گەورەی موسڵمانانیش موحەممەدی کوڕی سەلەمەی کردگە بە والی ئێمە، ئەویش هیچمان ناداتێ، بەڵکو پێی بێژی شتێکمان بداتێ!"

ـ داوای لە تۆ کرد کە داوا لە والییەکەت بکەی شتێکی پێ بدا؟!

ـ بەڵێ، قیڕاندم وتم: "یەرفە ئا بانگی موحەممەدم بۆ بکە!"

ژنەکە وتی: "ئەگەر تۆ خۆت لە تەکما بێی، ئەوە فرە خاسترە و لە گوێت ئەکا!"

وتم: "باشە ئەگەر خوا بیەوێ، ئەوا دەڕۆین!"

ـ ئەی دواتر چی ڕووی دا قوربان؟

ـ یەرفە ڕۆشت بۆلای موحەممەد وتی: "گەورەی موسڵمانان بانگت دەکا!" موحەممەد هات و لای من وەستا و، سڵاوی کرد.

ژنەکە شەرم دایگرت.

بە موحەممەدم وت: "بە خوا من لە خۆم وایە باشترینەکانم کردووە بە کاربەدەست، سبەی خوا پرسیاری لە بارەی ئەم ژنە لێ کردی، چ وەڵامێکی دەدەیتەوە؟"

ـ ئەی وەڵامی موحەممەد چی بوو، قوربان؟

ـ هیچی نەوت، چاوی پڕ بوو لە فرمێسک، بە خوا موحەممەد کاربەدەستێکی باش بوو.

ـ ئەی تۆ چیت وت گەورەم؟

ـ وتم: "خوای گەورە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کرد بە پێغەمبەر و ناردی بۆ ئێمە، ئێمەیش باوەڕمان پێ کرد، شوێنی کەوتین. دوای ئەو ئەبوو بەکر بوو بە خەلیفە، ئەویش تا مردن بە ڕێچکەی پێغەمبەردا ڕۆشت. ئەبوو بەکریش منی کرد بە خەلیفە، منیش باشترینەکانتانم کرد بە والی، دەی مووچەی ئەم ساڵ و پاریشی پێ بدە و، نازانم لەوانەیە نەتنێرمەوە و کەسێکی تر بکەم بە والی!"

دوایی وتم: "وشترێکم بۆ بێنن." بارم کرد لە ئارد و زەیت و دام بە ژنەکە و، پێم وت: "بگرە، ئەمە بەرە بۆ خۆت و دوایی لە خەیبەر وەرەوە بۆلام، ئێمە بۆ ئەوێ دەچین."

ـ دەی لە خەیبەر هات بۆ لات؟

ـ بەڵێ هات، دوو وشتری ترم بۆ بار کرد و پێم دا. وتم: "ئەمەیش بگرە، نامەیەکیشی تیایە، وتوومە بە موحەممەد مووچەی پار و ئەم ساڵت پێ بدا."

ـ یانی موحەممەدت لەسەر کار هێشتەوە؟

- بەڵێ، موحەممەد پیاوێکی ڕاستگۆ و دەستپاک بوو، کەم کەس هەبوو وەک ئەو وا بێ.

- ئەی بۆچی وتت: "لەوانەیە نەتنێرمەوە و، کەسێکی تر بکەم بە والی"؟

- ئەوە لێپێچینەوە بوو، بە خوا چەندە بەرانبەر ئەوان توند بووم، زۆر لەوە زیاتر بەرابەر خۆم توند بووم. لەبیرتە باسی ئەو شەوەم بۆ کردی کە ژنەکە بەردی نابووە سەر ئاگر، چەندە سەرکۆنەی خۆم کرد؟

- بەڵێ قوربان لەبیرمە. چاکت کرد موحەممەدت لەسەر کار هێشتەوە!

- ئەی چۆن! خوا پاداشی بداتەوە پیاوێکی باش بوو.

- خوا پاداشی تۆیش بداتەوە گەورەم!

- ئامین، خوا پاداشی تۆیش بداتەوە کوڕم! دەی بزانم ئەم باسە تەواو؟

- بەڵێ گەورەم تەواو!

- دیسان لە بارەی دادگەرییەوە پرسیارت هەیە؟

- بەڵێ، دەمەوێ بزانم دەنگوباسی ئەو وشترە چی بوو کە سەرت بڕی بۆ هاوڕێکانت، بەو بۆنەوە عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ دڵخۆش بوو؟

- ئەوە وشترێکی زەکات هەبوو، لاقی شکابوو، چارەسەری نەبوو، منیش ناچار سەرم بڕی و هەندێ خەڵکم دەعوەت کرد بۆ خواردنی گۆشتەکەی.

عەبباس پێی وتم: "خۆزگە هەموو جار ئاوات بکردایە!"

منیش وتم: "بە خوا ئێمە ناتوانین دەس بە ماڵی دەوڵەتەوە بدەین، مەگەر ئەوەی کە لە ڕێگەی هەقەوە وەریبگرین، لە ڕێگەی هەقدا دایبنێین، مەنعی هەقیش نەکەین!"

- مەبەستت چی بوو قوربان؟

- مەبەستم ئەوە بوو کە من بۆم نییە وشترێکی زەکات سەر ببڕم، بیدەم بە هاوڕێکانم و، خەڵکی تر بێبەش بن. ئەوەی کە هیی خەڵکە، دەبێ بدرێ بە خەڵک و جیاوازی تیا نەکرێ. هەرچییش هیی خەڵک نەبێ، نایاندەمێ، وەک چۆن لەو شتانەی هیی ماڵ و منداڵەکەم نەبووە، نەمداونێ.

ـ دەی قوربان خۆ ئەوە شتێکی ئەوەندە گەورە نەبوو، وشترێ بوو!

ـ نەک وشتر، ئەگەر دەنکە خورمایەکیش بێ دروست نییە. ئەگەریش بە ئەندازەی کێوێک زێڕیان لای من بێ و، هیی خۆیان بێ، هەرهەموویان دەدەمێ و، تۆزقاڵێکی لێ لانابەم.

ـ باشە قوربان تۆ باشتری لێ دەزانی!

ـ زانین هەموو شتێ نییە کوڕم! ئەو خەڵکە زۆربەی زۆری زانایە، بەڵکو لەخواترسان و خۆپارێزی شەرتە. با شتێکی تری لەوە سەیرترت بۆ بگێڕمەوە.

ـ چییە قوربان؟

ـ ڕۆژێکی ساماڵ بوو، زۆر گەرم بوو، خۆر بە گڕ و تیشکی خۆی هەموو لەمەکانی داخ کردبوو، وەفدێک لە عێراقەوە بە سەرۆکایەتی قەیسی کوڕی ئەحنەف هاتن، بە دوای مندا دەگەڕان، کاتێ منیان دۆزییەوە، مێزەرەکەم لەسەرم داکەندبوو، جبەکەیشم لە ناوقەدم پێچابوو، خەریک بووم وشترێکی زەکاتم دەرمان دەکرد، کاتێ ئەحنەفم بینی، وتم: "ئەحنەف! جبەکەت داکەنە و وەرە یارمەتیم بدە، با ئەم وشترە چارەسەر بکەین، ئەم وشترە بەشی بێوەژن و هەتیو و هەژارانی تیایە!"

پیاوێک منی بینی و ئەو کارەی پێ سەیر بوو، وتی: "کورە قوربان! ڕەحمەتی خوات لێ بێ بۆ بە ڕەنجبەرێک ناڵێی ئەو کارەت بۆ بکا، بۆ خۆت دەیکەی؟"

منیش وتم: "چ ڕەنجبەرێک لە من و ئەحنەف بەندەتر و ڕەنجبەرترە؟! هەرکەس ببێ بە بەرپرسی موسڵمانان، ئەوە بووە بە ڕەنجبەریان. چۆن واجبە ڕەنجبەر کار بۆ گەورەکەی خۆی بکا، ئاوایش واجبە سەرکردە کار بۆ خەڵکی خوار خۆی بکا!"

ـ دەی قوربان بە خوا ئەو پیاوە ڕاستی کرد، با یەکێکی تر خەریک بووایە!

ـ درۆی نەکردووە، بەڵام ئامۆژگاریی چاکیشی نەکرد، دەبوو بیگوتایە: "با گەورەی موسڵمانان بە هەموو هێزی خۆیەوە کار بۆ ژێردەستەکانی خۆی بکا، بە مرۆڤ و ئاژەڵەوە."

- دەی گەورەم با کاری دەرمانکردنی وشترەکەت بخستایەتە ئەستۆی کەسێکی تر و، خۆت خەریکی کاری خەڵک بوویتایە، خەڵک دەتوانێ لە جیاتی تۆ وشتر تیمار بکا، بەڵام ناتوانن کاری خەڵکی جێبەجێ بکەن!

- دەی تۆ بیستووتە کاری خەڵکم پشت گوێ خستبێ لەبەر کاری وشتر؟

- نە بە خوا!

- ئەی بۆ وا دەڵێی؟

- قوربان ببورە! من بە بۆچونی خۆم وام وت!

- دەی قەیناکا کوڕم، بەڵام بزانە من ئەو کاتە توانا و تاقەتی کارکردنم بوو، کاتەکەیش کاتی پشوودان بوو، وتم: "مادەم ئێستە کاتی پشوودانە و، منیش بێکارم و ماندوویش نیم، با هەستم ئەم وشترە تیمار بکەم."

- ئەی بۆ وەک وشترەکەی پێشوو سەرت نەبڕی؟

- ئەوەی پێشوو بە داوودەرمان چارەسەر نەدەبوو، بەڵام ئەمەیان چارەسەری هەبوو. ئیتر بۆ سەری ببڕم و، بیدەم بە خەڵکێک و بێن بۆ خۆیان جەفەنگ لێدەن؟ با لە جیاتی ئەوەی سەری ببڕم، دەرمانی بکەم و هەژاران و هەتیو و بێوەژنەکان سوودی لێ وەربگرن!

- ڕاست دەفەرمووی قوربان!

- هەر لە بارەی وشتری زەکاتەوە شتێکی تر هەیە با بۆت باس بکەم.

- چییە قوربان؟

- وشترێکی زەکات بەرەڵلا بوو، بەناو کۆڵانەکانی مەدینەدا ڕام دەکرد بە دوایدا، عەلیی کوڕی ئەبوو تالیبم پێ گەشت.

وتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان! ئەوە بۆ کوێ ڕا دەکەی؟"

منیش وتم: "وشترێک لە وشترەکانی زەکات بەر بووە و، منیش بە دوایدا ڕا دەکەم."

عەلی هەردوو دەستی خۆی توند پرواند و وتی: "کوڕە قوربان تۆ کارێکی وا دەکەی کە هەرکەس دوای تۆ بوو بەخەلیفە، هەرچی بکات پێت نەگات."

منیش وتم: "سوێند بەو کەسەی موحەممەدﷺی کردووە بە پێغەمبەر! ئەگەر بزنێک بە لێوار ڕووباری فوراتدا بەر ببێ و بڕوا، لە ڕۆژی قیامەتدا تۆڵە لە عومەر دەکرێتەوە."

- قوربان! گەورەمان بە دوای وشترێکدا ڕای دەکرلاد؟!

- ئەی بۆ چی تێدایە؟ مەگەر من پاسەوانی ماڵ و سامانی خەڵک نیم؟

- با قوربان! بەڵام با یەکێکی تر بە دوای وشتردا ڕای بکردایە.

- دەی پاسەوان دەبێ بە دوایدا ڕا بکا نەک کەسێکی تر.

- ئای گەورەم! کارەکانت چەن سەیرن!

- بۆ؟!

- مەبەستم ئەوەیە چەندە ئازاری خۆتت داوە لە پێناو خەڵکدا!

- کوڕم! خوای گەورە کارێکی داوەتە دەستی من، خوایش بە تەنیام جێ ناهێڵێ. یارمەتیم دەدا، خوا دەزانێ من چەندە سوورم لەسەر ڕاپەڕاندنی کارەکانم.

- بە خوا وایە. تۆ زۆر سووربووی لەسەر ڕاپەڕاندنی کارەکانت بە باشی و نەتهێشتووە مافی کەس پێشێل بکرێت.

- دەی پێم بڵێ ئەم باسە کۆتایی هات؟

- ئەگەر گەورەم باسی تری لا نەبێ، بەڵێ کۆتایی هاتووە!

- من هیچم بە خەیاڵدا نایە، ئەگەر تۆ شتێک دەزانی بیڵێ!

- شتێکم بیستووە گوایە ڕۆژێک سەلمانی فارسی لە کاتی وتاری هەینیدا لەسەر پۆشاکێک قسەی پێ بڕیوی. ئەوە چۆن بوو؟

- باشە، گوێ بگرە، ئێستە بۆت دەگێڕمەوە.

- فەرموو قوربان، گیان و دڵم لەلاتە.

- بڕێکی زۆر جلوبەرگی نوێم بۆ هات، منیش بەشم کردن بەسەر خەڵکیدا، هەموو پیاوێک پۆشاکێکی بەرکەوت، منیش وەک ئەو خەڵکە پۆشاکێکم بۆ خۆم هەڵگرتەوە، منیش هەر وەک ئەوان، حیسابی تاکە کەسێکم بۆ خۆم کرد نەک زیاتر.

- دەی سپاس بۆ خوا قوربان بەس نەبوو ئەم جارەیان خۆتت بێبەش نەکرد!

- ئای چەندە زۆرن ئەو کەسانەی کارەکانی عومەر لە بەرچاوی عومەر جوان دەکەن!

- بە خوا ڕاست دەکەم قوربان. بە خوا ئەگەر هیچت بۆ خۆت دانەنایە، پێم سەیر نەبوو.

- نا وام نەکرد، بەڵام بزانە، ئەگەر تاکە کەسێک بەری نەکەوتایە، ئەوا ئەو کەسە خۆم دەبووم!

- ئێ دەی منیش هەر لەبەر ئەوە وام وت.

- دەی باشە با قسەکەم تەواو بکەم!

- فەرموو قوربان!

- هەینیی دوای ئەو ڕۆژە ڕۆشتمە سەر مینبەر وتارم دەدا، دوو دەس پۆشاکم لەبەردا بوو، وتم: "خەڵکینە! گوێ بگرن و گوێڕایەڵ بن."

سەلمان وتی: "نە گوێ دەگرین، نە گوێڕایەڵ دەبین!"

زۆرم بەلاوە سەیر بوو، وتم: "بۆچی باوکی عەبدوڵڵا؟"

وتی: "ئاخر تۆ هەرکەسە و یەک دەست پۆشاکت پێ داوە، بەڵام دوو دەستت بۆ خۆت بردووە."

منیش وتم: "پەلە مەکە باوکی عەبدوڵڵا!"

دوایی هەر لەسەر مینبەرەوە هاوارم کرد: "هۆ عەبدوڵڵای کوڕم! هۆوا!"

عەبدوڵڵا وتی: "بەڵێ گەورەم ئەمەتام!"

وتم: "سوێندت دەدەم بەخوا! ئەو دەستە پۆشاکەی لە ژێرەوەیە هیی تۆ نییە؟"

وتی: "با، بەرەوەڵڵا!"

سەلمان وتی: "دەی ئێستە بڵێ با گوێ بگرین و، فرمان بکە با گوێڕایەڵ بین!"

- دەی باشە سەلمان بۆچی بۆ دەستەپۆشاکێ ئاوای کرد؟

- بۆ نەیکا؟ ئەویش پیاوێک نییە وەک من؟

- با.

- ئەی باشە سەروەت و سامانی موسڵمانان هیی هەمووان نییە؟ هەموویان هاوبەش نین؟ گەورەی ئیماندارانیش وەک هەر تاکێکی تر یەک بەشی نییە و تەواو؟

- با قوربان وایە!

- دەی دەبێ لە جیاتی ئەوەی کە دەڵێی: "سەلمان بۆ وای کرد؟!" بڵێی: ئافەرین سەلمان! لە منت کەوێ چەن بە غیرەت بووی! چۆن داکۆکیت لەسەروەت و سامانی خەڵک کرد!

- مەبەستم ئەوەیە ئەگەر کارەکە بەو جۆرەیش بووایە کە سەلمان گومانی برد، نەدەبوو ئاوا بە بەرچاوی عالەمەوە بەڕووی تۆیدا بدا، دەبوو دوایی بە ئەسپایی بە خۆتی بگوتایە!

- بە خوا من ئەوەم پێ خۆشترە تا ئەوەی بە ئەسپایی و نهێنی بە خۆمی بڵێ!

- بۆچی قوربان؟!

- با خەڵک فێر بن داوای مافی خۆیان بکەن، بەرپرسەکان دادگایی بکەن، ئەمە یەک. دووەم، لەوانەیە کەسێکی تریش هەمان گومانی سەلمانی بردبێ. سێیەم، ئەمە ئیتر دڵی هەموو لا خاوێن و ساف دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر بە ئەسپایی و دووبەدوو پێی گوتبام و، منیش بۆم ڕوون بکردایەتەوە، ئەوانی ترم چۆن تێگەیاندبا؟ ئەو کاتە خەڵک گومانیان وا دەبرد کە گەورەی موسڵمانان دەستە پۆشاکێکی بۆ خۆی بردوە!

- چەن سەیری قوربان! تۆ بە شێوەیەک هەق ڕووبەڕووی خۆت دەکەیتەوە، دەڵێی هەرگیز بەلای هەقدا نەچووی!

- نا کوڕم هەڵەی! پێم وانەبوو ئاوا بیر بکەیتەوە؟!

- چۆن قوربان؟

- من بۆیە هەق ڕووبەڕووی خۆم دەکەمەوە، لەبەر خۆم، من نەفسی خۆم خۆش دەوێ، من بار لە نەفسی خۆم دەنێم. بڕوا بکە هیچ کەس شتی بەتاڵ لە نەفسی خۆی بار ناکا مەگەر ئەو کەسەی کە خۆی بە هیچ بزانێ، یا بە خەیاڵی خۆیشی خۆی بە گەورە زانیبێ. نەفس بە کاری هەق نەبێ، بە هیچ شتێکی تر ڕێزی لێ ناگیردرێت، هیچ و پووچترین کەس ئەو کەسەیە کە خۆی بە گەورە و زل بزانێ، ئیبلیس تەنیا لەبەر خۆبەزلزانی لە ئاسمان دەرکرا!

- ڕاست دەکەی قوربان! من مەبەستم لەو قسەیەی کە کردم هەر ئەوە بوو کە سەرسامیی خۆم نیشان بدەم.

- منیش مەبەستم لە وەڵامەکە تەنیا ئەوە بوو لەوە تێبگەی کە عیززەت و سەربەرزی لە هەقدایە، هەرچەند ئەو هەقە بە زیانی تۆیش بێت، سەرشۆڕیش لە کاری بەتاڵدایە، هەرچەند براوەیش بیت!

- دەی قوربان ئەمە لە جەنابت فێر بووم و، بە ئیزنی خوا هەرگیز فەرامۆشی ناکەم!

- دەی بڵێ بزانم لەم باسە بووینەوە یا نە؟

- بەڵێ قوربان تەواو.

- دەی بزانم چیی ترت دەوێ؟

- دەمەوێ بزانم لە نیوان تۆ و هورموزان چی گوزەراوە؟

- چیت مەبەستە؟

- لەو کاتەوە کە شاڵاوی برد تا ئەو ساتەی فرتوفێڵی کرد بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکا، من وام خوێندووەتەوە. پێم خۆشە لە زاری خۆتەوە بیبیسم، لەوانەیە شتەکە وانەبێ کە من بیستوومە!

- باشە گوێ بگرە، ئێستە بۆت دەگێڕمەوە کە چی ڕووی داوە!
- بەسەر سەر و چاو!
- هورموزان سەرکردەیەکی سوپایی لێهاتوو بوو، موسڵمانان گەمارۆیان دابوو، زانی کە کار لە کار ترازاوە و ڕێی هەڵاتنی نییە، بۆیە داوای ئەمانی کرد و بەڵێنی بە موسڵمانان دا. موسڵمانانیش ئەمانیان دا. ئەو هەر لەبەر فرتوفێڵ وای کردبوو، خۆت دەزانی جەنگیش هەمووی فرتوفێڵ و لێزانینە! زۆری پێ نەچوو پەیمانی شکاند، زۆر لە سەربازی موسڵمانانی بە کوشتن دا، موسڵمانان کۆ بوونەوە و، پشتیان بە خوا بەست و خوایش یارمەتیدان. فارسەکان شکان - هورموزان یەخسیر کرا!

سەرکردەی سوپای موسڵمانان وای بەباش زانیبوو کە هورموزان بنێرێت بۆ مەدینە بۆلای من، تا من بزانم چی لێ بکەین؟ کۆمەڵێک سەرباز هێنایان، سێ کەس لەوانە بریتی بوون لە ئەنەسی کوڕی مالیک، موغەیرەی کوڕی شوعبە، ئەحنەفی کوڕی قەیس.

کە لە مەدینە نزیک بوونەوە، جلوبەرگەکەی هورموزانیان کردەوەبەری—هەمووی ئاوریشم بوو، تاجی لەسەردا بوو، تاجەکەی بە یاقووت ڕازێنرابووەوە، بازنە و خرخاڵی زێری پێوە بوو، شمشێرەکەی بە ئاوی زێڕ ئاو درابوو، بەو جۆرە هێنایانە نێو شاری مەدینە تا خەڵک بزانن کە موسڵمانان سەرکردەیەکی ئاوا بە سەنسەنە و تەنتەنەیان بەزاندوە و؛ خەڵک بزانێ کە خوای گەورە چۆن موسڵمانان سەر دەخا.

- دەی پاشتر چی ڕووی دا؟

- بەو جۆرە کە باسم کرد، هێنایانە نێو مەدینەوە، چوبوونە ماڵی ئێمە بە دوای مندا. من لە ماڵ نەبووم. پرسیاری منیان کردبوو، پێیان وتبوون: "لە مزگەوتە، وەفدێک لە کوفەوە هاتووە، لای ئەوانە."

لەو کاتەدا وەفدەکە دەهاتن بەرەو مزگەوت، لە نزیک مزگەوت برێک منداڵ گەشتبوون پێیان، وتبوویان: "بە دوای گەورەی موسڵماناندا دەگەڕێن؟"

وتبوویان: "بەڵێ."

ئەوانیش وتبوویان: "لە مزگەوتە، نووستووە."

وەفدەکە هەموویان لای مزگەوت مابوونەوە، ئەنەس و ئەوانیش هورموزانیان هێنابوو گەشتبوونە مزگەوت. خەڵکێکی زۆر کۆبووەوە بۆ ئەوەی بزانن کە من هورموزانم بینی، چی دەکەم؟!

ئەو هەموو خەڵکە بەجارێ هاتنە نێو مزگەوتەوە، بەڕاست و چەدپا بە دوای مندا دەگەڕان. لە سوچێکدا نووستبووم، قامچییەکەم لەنێو دەستمدا بوو- خۆت دەزانی نە پاسەوانم هەبوو نە دەرگاوان.-

- دوایی چی ڕووی دا قوربان؟

- هورموزان هاتە نێو مزگەوتەوە، خۆی ئامادە کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کەسەی کۆشکی قەیسەری تێک شکاندووە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کەسەی سوپایەکی وای ناردووە سەرلەبەری سوپای فارسی تێک شاندووە، دەیویست ئەو پیاوە ببینێت کە نەخشەی جەنگی لە مەدینەوە کێشاوە و، نەخشەیەکی وا بووە کە هیچ سەرکردەیەکی فارس نەیتوانیبوو نەخشەی وا بکێشێ، نەخشەیەکی وا بوو کە نەیانتوانی بەرەنگاریی ببنەوە؛ ئەو نەخشەیەی کە نەخشەکانی ئەوانی پوچەڵ کردەوە و هەموویانی تێک شکاند. پێشتر بە باشی باسی فارسەکانم بۆ کرابوو بۆیە وەک ئەوانم دیبێ ئاوابوو، خوای گەورە یارمەتی دابووم کە نەخشەیەکی پڕبەپێست بکێشم.

هورموزان وتی: "کوا عومەر؟"

وتیان: "ئا ئەوەیە."

بە بینینی من تەواو واقی وڕما، پۆشاکێکی زۆر سادە، نە پاسەوان، نە دەرگاوان، ئەو یەزدگوردی دیبوو، کە دەچوون بۆلای یەزدگورد، کرابوون بە چەند چینەوە، دەبوو لە دوورەوە لە خزمەتیدا بوەستن، نزیکترین کەس لە یەزدگوردەوە کە چینی بەرپرسە گەورەکان و وەزیرە مەزنەکان بوون دەبوو پێنج گەز لێیەوە دووربن. دواتر

چینی فەرماندە جەنگاوەرەکان و زانایان بوو دەبوو ئەوان دە گەز لە یەزدگوردەوە دوور بن. ئینجا چینی گۆرانیبێژ و چاوەش و ئەوانە بوون دەبوو پانزە گەز لێیەوە دووربن. ئەگەر کەسێک بیویستایە قسەی لەگەڵدا بکا، نەدەبوو لەوەی کە بۆی دیاری کراوە زیاتر نزیک ببێتەوە، دەبوو هەر کە دەڕۆشتە ژوورەوە لە بەردەمیدا چۆک دابدا و سەری تەواو لە زەوی نزیک بکاتەوە و، هەتا یەزدگوردیش ئیزنی نەدا، قسە نەکات. هەرکەسیش قسەی لەگەڵدا بکردایە، بە هیچ شێوەیەک ناوی نەدەهێنا، چونکە ناوهێنانیان بە سووکایەتی دەزانی. زیاد لەوەش، دەبوو بە پارچە پەڕۆیەکی سپی دەمامک بکەن بۆ ئەوەی هەناسەی دەمیان کەش و هەوای ژووری یەزدگورد پیس نەکا!

- ئەی قوربان دوایی چی ڕووی دا؟

- خەڵک بە هێواشی قسەیان دەکرد بۆ ئەوەی من خەبەرم نەبێتەوە.

هورموزانیش تاوێ ناتاوێ دەیوت: "ئەی کوا پاسەوان؟ ئەی کوا دەرگاوان؟"

ئەوانیش دەیانگوت: "نە پاسەوانی هەیە نە دەرگاوان."

ئەویش وتی: "نە پاسەوانی هەیە و نە دەرگاوان؟! دەی کەوابێ ئەمە پێغەمبەرە!"

ئەوانیش وتیان: "نا پێغەمبەر نییە، بەڵام خەلیفەی پێغەمبەرە ﷺ!"

من لەم دەمە قاڵییە بە ئاگا هاتم، دانیشتم، کاتێ ئەوم بینی، پرسیم: "هورموزانە؟"

وتیان: "بەڵێ."

وتم: "پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە ئاگر! سپاس بۆ ئەو خوایەی بە هۆی ئایینی ئیسلامەوە ئا ئەمە و نموونەکانی ئەمەی سەرشۆڕ کردووە. ئەی موسڵمانان! دەست بگرن بەم ئایینەوە! بە ڕێچکەی پێغەمبەر ﷺدا بڕۆن! دونیا و خۆشیی دونیا فریوتان نەدا، دونیا زۆر فێڵبازە."

وتیان: "ئەمە پاشای ئەهوازە، قسەی لەگەڵدا بکە."

منیش وتم: "نەخێر هەتا ئەو جل وبەرگەی لە بەردا لانەبا، قسەی لەگەڵدا ناکەم."

بردیان و جل وبەرگەکەیان لە بەردا لابرد و دەستێ جلی سادەیان لە بەر کرد و هێنایانەوە.

وتم: "هورموزان! چۆن توانیت پەیمان شکێنی بکەی و لەگەڵ خوای خۆتدا درۆ بکەی؟"

وتی: "عومەر! ئێمە و ئێوە لە سەردەمی نەفامیدا هەڵدەپڕژاین بە یەکدا، ئێمە سەر دەکەوتین، چونکە خوا نە پشتی ئێمەی دەگرت و نە پشتی ئێوە، بەڵام لەو کاتەوە کە خوا پشتی ئێوە دەگرێ، ئێمە بەردەوام شکست دەهێنین!"

وتم: "ئەوکاتە ئێوە یەک بوون و، ئێمە ناتەبا!" دووبارە وتم: "بۆچی درۆت لەگەڵ ئێمەدا کرد؟ بۆچی پەیمانت شکاند؟" جار لەدوای جار ئەمەم پێ دەگوت.

وتی: "دەترسم پێش ئەوەی پێت بڵێم، بمکوژی!"

وتم: "مەترسە!"

وتی: "دەی من ئاوم دەوێ."

وتم: "ئاوی بۆ بێنن."

جامێ ئاوی گرت بە دەستەوە، دەستی دەلەرزی!

وتی: "دەترسم لە کاتی ئاوخواردنەوەدا بمکوژن!"

وتم: "نا قەیناکا، هەتا نەیخۆیتەوە کەس ناتکوژێ."

ئیتر یەکسەر جامە ئاوەکەی لار کردەوە و ڕژاندی.

وتم: "ئاوی بۆ بێنن! نابێ بە تینوێتی بکوژرێ!"

وتی: "ئاوم ناوێ، من ویستم بەو ئاوە مانەوەی خۆم مسۆگەر بکەم!"

وتم: "من دەتکوژم، مانەوەی چی؟"

وتی: "ئاخر تۆ بەڵێنت پێ دام!"

وتم: "درۆ دەکەی!"

ئەنەس وتی: "وەڵڵا ڕاست دەکا قوربان!"

وتم بە ئەنەس: "قوڕ بەسەرت! ئەوە مەجزەئە و بەرائی شەهید کردووە، چۆن پەنای دەدەم؟ بە خوا یان بەڵگە بۆ ئەو قسەیت دەهێنیتەوە یان سزات دەدەم!"

ئەنەس وتی: "تۆ وتت قەیناکا کەس دەستت لێ نادا تا هەموو شتێکم بۆ نەگێڕیتەوە، کەس ناتکوژێ تا ئاوەکەت نەخۆیتەوە(ئاوەکەیشی ڕژاند تازە ئیتر هەرگیز ناخورێتەوە، کەواتە هەرگیز ناکوژرێ!)

کۆمەڵێ کەس پشتگیری ئەنەسیان کرد.

بە هورموزانم وت: "تۆ منت فریو دا. بە خوا من بۆ موسڵمان نەبێ، بۆ کەس فریو ناخۆم."

هورموزان موسڵمان بوو و، لە مەدینە نیشتەجێ بوو.

- هەر لەبەر قسەیەک نەتکوشت؟ تا ئەو ڕادەیە بەڵێنی خۆت دەپارێزی؟

- تۆ ئەگەر بە کارەکەی من سەرسامی، ئەوە بۆ قسەکەی ئەنەس زیاتر سەرسام بە!

- بۆچی؟

- ئاخر هورموزان برایەکی ئەنەسی کوشتبوو، دەبوو ئەو زیاتر لەسەر کوشتنی هورموزان سوور بێ. بەڵام کە گوێی لێ بوو من وام وتووە، ئیتر تۆڵەی لە بیردا نەما، دەیوت: "دەبێ بەڵێنی خۆت ببەیتەسەر!" ئەنەس بکوژی براکەی خۆی ڕزگار کرد!

- وەڵڵا ڕاست دەکەی گەورەم! بەڵام خۆ تۆ دەتتوانی بیکوژی، هەرچەند ئەنەسیش ناڕازیبا، قسەی ئەنەس وەک ڕاوێژ بوو نەک فرمان! فرمان فرمانی تۆ بوو، تۆ بۆت هەبوو هەر ڕایەک پێچەوانەی ڕای تۆ بووایە، پەسندی نەکەی!

- من ئەو ڕایەی ئەنەس و ئەوانم پێ تەواو بوو.
- دەی تۆ چوزانی؟ لەوانەیە هورموزان لە ترسی شمشێر موسڵمان بووبێ؟!
- ئێمە نەهیمان لێ کراوە کە دڵی خەڵک توێ توێ بکەین و تەماشای بکەین، چوزانین دڵی چی تێدایە، ئەی باسەکەی ئوسامە و پێغەمبەرﷺ نازانی؟
- باسی چی؟
- پێغەمبەرﷺ کۆمەڵێک هاوەڵی ناردە سەر حورقەی جوهەینی، بەیانیی زوو هاتبوونە سەر کانی و ئاوەکانیان، کە ئوسامە و ئەوانیان بینیبوو، لە ترسدا بڵاوەیان لێکردبوو. ئوسامە و پیاوێکی ئەنصاری یەکێ لەو پیاوانەی ئەوانیان گرتبوو، ویستبویان بیکوژن، پیاوەکە وتبووی: "لا الە الا اللە!" پیاوە ئەنصارییەکە وازی هێنابوو، بەڵام ئوسامە کوشتبووی!
دوای ئەوەی گەڕانەوە، پێغەمبەرﷺ دەنگوباسەکەی بیست، فەرمووی: "ئوسامە! ئەو وتی: 'لا الە الا اللە' چۆن کوشتت؟"

ئوسامە وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا! لە ترسی شمشێرەکەم وتی: 'لا الە الا اللە.' "

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "باشە تۆ دڵی ئەو پیاوەت لەت کرد تا بزانی لە ترسدا وای وتووە؟"

پێغەمبەرﷺ بەردەوام لە بەر خۆیەوە دەیفەرموو: "دوای ئەوەی وتی: 'لا الە الا اللە' هەر کوشتی!" ئەوەندە دووبارەی کردەوە، ئوسامە خۆزگەی دەخواست کە لەوە و پێش موسڵمان نەبووایە و تازە ئیمانی بهێنایە، بۆ ئەوەی تووشی ئەو کارە نەبووایە!

- قوربان ئا بەو ڕادەیە؟
- کورە لەوەش زیاتر کوڕم!
- چی قوربان؟

ـ میقدادی کوڕی ئەسوەد بە پێغەمبەری ﷺ ی وت: "ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر لەگەڵ کافرێکدا بوو بە شەڕمان و شمشێرێکی دا لە دەستم دەستێکی منی قرتاند، دوایی پەنای بردە بەر دارێک و وتی: 'ئەوا باوەڕم بە خوا هێنا!' من بیکوژم یا نە؟"

فەرمووی: "نەخێر، نابێ بیکوژی."

وتی: "ئاخر قوربان! دەستێکی منی قرتاندبێ! دوایی موسڵمان بووبێ!"

فەرمووی: "نەخێر مەیکوژە! ئەگەر بیکوژی، ئەو وەک ئەو کاتەی تۆی لێدێ کە نەتکوشتبوو، تۆیش وەک ئەوت لێدێ ئەو کاتەی کە بڕوای نەهێنابوو!"

ـ کەواتە ئەوە شەرعی خوایە قوربان؟!

ـ ئەی وا دەزانی من کار بە شتێکی غەیری شەرع دەکەم؟

ـ نە قوربان! بەڵام دەمەوێ زیاتر بۆم ڕوون بێتەوە!

ـ لەوەش زیاتر ئەو هورموزانە من وا دەزانم بوو بە موسڵمانێکی باش، بەقەد چاوتروکانێ لە ئایین دوور نەکەوتەوە!

ـ قوربان تۆ باشتر دەزانی، من نازانم!

ـ دەی هیچ پرسیارێکی ترت لایە؟

ـ قوربان هەرچی پرسیارم هەبوو لە بارەی دادگەرییەوە هەرهەموم پرسی!

ـ یانی تەواو؟

ـ بە ئیزنی خوا تەواو! سپاسی جەنابت دەکەم کە ئەوەندە خۆڕاگر بووی و وەڵامی پرسیارەکانی منت دایەوە!

ـ واز لەو قسانە بێنە! ئێستا پێم بڵێ، دوای ئەوەی باسێکی گەورەمان داخست و زۆری لەسەر ڕۆشتبووین، لەبارەی چ شتێکەوە پرسیارت هەیە؟

ـ دەخوازم کە هەندێ پرسیاری شەخسی لە گەورەم بکەم!

ـ دەتەوێ لە چ بارەیەکەوە بپرسی؟

ـ قوربان جەنابت دەزانی کە خەڵک دەمی ناوەستێ، هەندێ کەس زمانیان دەڵێی قامچییە، بگرە دەڵێی شمشێرە، ئەگەر تاکە کەسێ لە قسە و قسەلۆکی خەڵک پارێزراوبا، ئەوا پێغەمبەرﷺ پارێزراو دەبوو. تۆ خۆت باش دەزانی چییان بە پێغەمبەرﷺ دەگوت، خۆت دەزانی کە قورەیشیەکان چۆن پێیان دەوت: "شێتە، جادوگەرە،" ئەو ناوونـاتۆرانەی کە بۆ پێغەمبەریانﷺ هەڵدەواسی، خۆیان لە خۆیاندا سەبوورین بۆ هەرکەسێکی بێتاوان و بوختانبۆکراو. تۆیش یەکێکی لەو کەسانەی کە بوختانیان بۆ کردووە، بەڵام قوربان با ئەوەیش بڵێم کە دار هەتا پڕ بەر و بەرخۆش نەبێ، بەردی تێ ناگیرێت، تۆ نەک داری، بەڵکو دارستانێکی پڕ بەر و بەرهەمداری، بۆیە سەیر نییە ئەگەر خەڵکانێک هەبن بەردت تێ بگرن، بوختانت بۆ بکەن، بە خوا من دەزانم تۆ بێتاوانی، زۆر لەوە گەورەتری کە ئەوانە پێت دەڵێن، دەریایش بە دەمی سەگ گڵاو نابێ، بەڵام من پێم خۆشە وەڵامی ئەو بوختانانە لە خۆت ببیسم.

ـ من هیچم نییە بیڵێم، تەنیا ئەوە نەبێ کە وەک ئیبراهیم پێغەمبەرﷺ ئەو ڕۆژەی فڕەیان دایە نێو ئاگرەوە فەرمووی: "حَسْبِيَ اللّٰهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ" خوام بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە." منیش هەروا دەڵێم!

بەڵام کێشە نییە با بزانم چییان پێ وتووم؟ دوایی پێت دەڵێم کە ئەو قسانە چەندە دوورە لە ڕاستیەوە، دەی بزانم چیت پێیە؟

ـ دەڵێن: "عەبدوڕڕەحمانی کوڕت بادەی خواردووە و تۆیش ئەوەندەت لێ داوە مردووە!" ئەو دەنگوباسە تا چەند ڕاستە گەورەم؟ با پێش ئەوەی تۆ وەڵامم بدەیتەوە، ئەوەیش بڵێم کە بە خوا من دەزانم وانییە، وەک تاوانبارێک لێت ناڕوانم، بەڵام حەز دەکەم لێت بپرسم، چاک دەزانم کاری وا لە تۆ ناوەشێتەوە!

ـ باشە! هەموو ڕووداوەکەت لە سەرەتاوە بۆ دەگێڕمەوە. دوایی تۆ خۆت بڕیار بدە، بزانە کاری خراپم کردووە؟ بزانە ناهەقیم کردووە؟ لام وایە ئەوانەی ئەو قسەیان کردووە، ترش و خوێیان پیا کردووە، ژاریان تێکەڵ بە هەنگوین کردووە!

- فەرموو قوربان گیان و دڵم لەلاتە!

- عەبدوڵلا و عەبدورڕەحمانی کوڕم هەردوو ڕۆشتن بۆ میسر بۆ غەزاکردن، سەردەمی والییەتی عەمری کوڕی عاص بوو، کەسێک ڕۆشتبوو بە عەمری وتبوو: "عەبدوڵلا و عەبدورڕەحمانی کوڕانی عومەر هاتوون بۆ ئێرە بۆ غەزا!"

عەمر وتبووی: "لە کوێن؟"

ئەویش وتبووی: "لەو پەڕی شار."

من پێشتر نامەیەکم بۆ عەمر نووسیبوو، پێم وتبوو: "نەکەی هەرگیز کەسێکی خزمی من بێت بۆلای تۆ و، تۆیش لەبەر ئەوەی خزمی منە کارێکی وای بۆ بکەی کە بۆ خەڵکی تری نەکەی! ئەگەر کاری وا بکەی، خۆم دەزانم چیت پێ دەکەم!"

عەمر لە ترسی ئەو نامەیە، نە هیچ دیارییەکی بۆ ناردبوون و نە خۆیشی ڕۆشتبوو بۆ لایان...

کار بەو شێوەیە بوو، تا ڕۆژێک پیاوێکی هاوڕێی عەمر بە عەمری وتبوو: "عەبدورڕەحمانی کوڕی عومەر و ئەبوو سەروعە لە بەردەرگان داوای هاتنە ژوورەوە دەکەن!"

عەمر وتبووی: "با بێنە ژوورەوە!"

ئەوانیش زۆر بە داماوی و زەلیلی چووبوونە ژورەوە...

بە عەمریان وتبوو: "داری حەدمان لێ بدە، ئێمە دوێشە و عارەقمان خواردووەتەوە و سەرخۆش بووین!..."

- ئەی قوربان عەمر چی کردبوو؟

- هەندێ قسەی پێ وتبوون و دەری کردبوون.

عەبدورڕەحمان وتبووی: "ئەگەر داری حەدمان لێ نەدەی بە باوکم دەڵێم، ئیتر خۆت دەزانی!"

عەمریش دەیزانی ئەگەر داریان لێ نەدا، من لەسەر کاری لادەبەم و لێی توڕەش دەبم...

عەمر دەیویست بە گوێیان بکا و داریان لێ بدا، ، لەو دەمەدا عەبدوڵلای کوڕم خۆی کردبوو بە ژووردا.

عەبدوڵلا بە عەمری وتبوو: "باوکم پێی وتووم بۆ کارێکی زۆر پێویست نەبێ، نەیەم بۆ لات. ئێستە هاتووم بڵێم: نابێ سەری عەبدوڕڕەحمانی برام بە بەرچاوی خەڵکەوە بتاشی! بەڵام قەیناکا داری لێ بدە!"

چونکە ئێمە جگە لە دارکاری، سەری عارەق خۆریشمان بە بەرچاوی خەڵکەوە دەتاشی.

ـ ئەی عەمر چی کرد؟

ـ لە حەوشی ماڵی خۆیاندا دوور لە چاوی خەڵک داری لێ دابوون. دوایی عەبدوڵلا، عەبدوڕڕەحمانی بردبووە ژوورەوە لەوێ سەریان تاشی، بەڵام سەری ئەبوو سەروعەیان لە حەوشەدا تاشیبوو.

ـ تا ئێرە هیچ کێشەیەک نابینم، هیچ شتێک نە لە تۆ و نە لە عەمر و نە لە کوڕەکانت و نە لە ئەبو وسەروعە! بۆ ئەو بوختانەیان بە تۆ کردووە؟

ـ پەلە مەکە کوڕم! چیرۆکەکە تەواو نەبووە.

ـ ببورە قوربان. ئەوە لە تاو خۆشەویسیم بۆ جەنابت و لە داخی قسە و قسەلۆک ئەوەندە پەلەم کرد! دەی فەرموو قوربان چیرۆکەکە تەواو بکە!

ـ باشە قەیناکا! پاشماوەی چیرۆکەکە ئەمەیە: من لە مەدینە بەسەرهاتەکەم بیستەوە. ئەوانیش هێشتا هەر لە میسر بوون. لای عەمری کوڕی عاص! نامەیەکم بۆ عەمر نووسی. وتم:

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبـان،
لە بەندەی خودا، گەورەی ئیمانـداران،
عومەری کوڕی خەتتابەوە بۆ تاوانباری
کوڕی تاوانبـاری کـوڕی تاوانبـار! پـێم
سـەیرە چـۆن زاتـت کـرد قسـەی مـن
بشـکێنی! چـۆن ئەوەنـدە ڕووقـاییمی
بەرابەر من! مـن ئەو هـاوەڵانەم نەکـرد
بە والـی کە لە غەزای بەدردا بەشـدار
بوون، ئەوانە هەموویان لە تۆ باشـترن،
بەڵام مـــن تـــۆم هەڵبـــژارد! چـــونکە
دەمگوت: پیاوێکی توندو تۆڵە، وریـایە!
بەڵام کـــارەکەت بەو گەنـــدەڵییانەت
بـــۆگەن کـــردووە. مـــن دەبـــێ تـــۆ لە
والییەتی دەر بکەم! بەڵام دەرکردنێکـی
خـــراپ، ئەوە لە مـــاڵی خۆتـــدا داری
حەد لە عەبـــدوڕڕەحمان دەدەی و هەر
لەوێـــش ســـەری دەتاشـــی؟! خـــۆ تـــۆ
دەتزانی ئەوە پێچەوانەی ویستی منە،
عەبـــدوڕڕەحمانیش وەک هەرکەســـێکی
ئاســـایی وایە و نـــابێ لەگەڵ هـــیچ
کەسێکدا جیـاوازی بکرێـت. چـی بە
خەڵکـی تـر دەکەی، بە هەمـان شـێوە
دەبـــێ بە ئەویـــش بکرێـــت! بەڵام تـــۆ

وتـــووتە: "ئەوە کـــوڕی گەورەی ئیماندارانە!...

خۆ تۆ دەزانی کە من لەبـارەی ئەو تۆڵەســـەندنەوانەی پەیوەنـــدییان بەشـــەرعەوە هەیە لەبەر ڕەزامەنـــدیی خـوا نەرمـی لەگەڵ کەسـدا نـانوێنم، جیـاوازی لەنێـوان کەسـدا نـاکەم. بە گەشتنی ئەم نامەیە، عەبدورڕەحمان لە عابایەک دەپێچی و بە سواری کەر بۆم دەنێریتەوە با بزانێ چ کارێکی خراپـی کردووە!

- دەی قوربان بە گەشتنی نامەکە، عەمر چی کرد؟

- نامەکەی بۆ عەبدوڵلا و عەبدورڕەحمان خوێندبووەوە، بەو شێوەیەی خۆم وتـم، عەبـدورڕەحمانی نـاردەوە. نـامەیەکی بـۆ مـن نووسـی و داوای لێبـووردنی کردبـوو، دابووی بە عەبدوڵلا، عەبدوڵلایش لەگەڵ عەبدورڕەحماندا هاتەوە بۆ مەدینە!

- ئەی دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

- عەبدورڕەحمان هات بۆلای من، عابـایەکی زبـری قورسـی پێـوە پێچرابـوو، بە حاڵ دەیتوانی بجولێ.

وتم: "عەبدورڕەحمان! ئەوە فلان کارو فیسار کارت کردووە؟! بە خوا دەبێ داری حەدت لێ بدرێ!"

عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: "قوربان داری لێ دراوە، ئیتر بەسە."

- دەی قوربان عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف ڕاستی کرد، چیـت کـرد بە گـوێی ئەوت کرد؟

- نەخێر، بەڵکو بە دیار چاوی خەڵکەوە، وەک ئەوەی کە شەرعییە، داری حەدم لە عەبدورڕەحمان دا، دوایی لێی گەڕام، دوای ئەوە یەک مانگی ڕێک ساغ و سەلامەت هیچ عەیبێکی نەبوو، دەهات و دەچوو، هاتوچۆی ناو بازاڕ و خەڵکی دەکرد. دوای ئەوە قەزا و قەدەر نەخۆش کەوت، بەو نەخۆشییەوە گیانی سپارد، ئیتر نە کاریگەریی ئەو دارانە بوو نە هیچ!

- دەی قوربان خۆ ئەم بەسەرهاتە شانازییە بۆ تۆ نەک خراپە! خوا ڕووی ئەو کەسە ڕەش بکا ئەو بوختانەی بۆ تۆ هەڵواسیوە، چ درۆیەکی ناحەزیان بۆ کردووی؟! بەڵام قوربان، وانازانی کەمێک بەرانبەر کوڕەکەت ڕەق بووی؟ من هەقم بەو قسە و قسەلۆکانە نییە کە هەڵیانواسیوە، زانیم ئەوانە هەمووی درۆن، ئەمە پرسیارێکە و خۆم دەیکەم؟

- من تەنیا بەپێی شەرع جوڵاومەتەوە، هیچ زیادەڕەوییەکم نەکردووە. تۆ پێت خۆشە عومەر بە بەرچاوی خەڵکەوە داری حەد لە کوڕی خەڵک بدا، بەڵام کوڕەکەی خۆی لە ژوورەوە و لە حەوشی ماڵی عەمر داری لێ بدرێت؟

- نەوەڵلا! بەڵام خۆ تازە دارەکەی لێ درا!

- لێی درا! بەڵام بەو جۆرە نەبوو کە خوا دەیەوێ!

- قوربان شتێکی تر ماوە.

- چییە؟

- من وەک چۆن لە تۆ دڵنیام و دەزانم پیاوێکی زۆر باشی، ئاوا لە کوڕەکانیشت دڵنیام! بیستوومە عەبدورڕەحمان شەرابی نەخواردبوو، ئەو ئاوجۆ یان شەربەتی ترێی خواردبوو، کەچی شەراب دەرچوبوو- نەیزانیبوو شەرابە. هەروەها ئەبوو سەروعەیش. ئەبوسەروعە یەکێکە لەو پیاوانەی لە غەزای بەدردا بەشدار بوو، بەڵام دوای ئەوەی خواردیانەوە و سەرخۆش بوون، زانییان شەراب بووە، خۆیان داوایان کرد کە داری حەدیان لێ بدرێت، ئەوان دەیانتوانی تەنیا تۆبە بکەن و قسە

نەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی حەزیان دەکرد تەواو پاک بنەوە و هیچ گوناهێکیان بە سەرەوە نەمێنێ، بۆیە داوایان کرد داریان لێ بدرێ!

- من پێم دوور نییە وابێ، نەمپرسی بزانم چ جۆرە شەرابێکیان خواردووەتەوە. خۆیان چووبوونە لای عەمر و داوایان کردبوو داریان لێ بدا، منیش هەر بە گوێرەی داواکارییەکەی خۆیان جوڵامەوە. ئەگەر بە قسەی تۆ بێ، ئەوە بە خوا دوو پیاوی شەریفن و هیچ تاوانێکیان نییە، ئەگەریش وا نەبێ، خۆ تۆڵەی خۆیان وەرگرتەوە.

- ڕاست دەفەرمووی قوربان.

- لەم بارەوە هیچی تر ماوە بپرسی یان تەواو؟

- من هیچم نەماوە.

- ئەی شتێکی وەک ئەمە نەماوە لەبارەیەوە بپرسی؟

- قوربان دەڵێن: "عومەر نەصری کوڕی حەججاجی لە مەدینە دەرکردووە، بەبێ ئەوەی نەصر هیچ گوناه و تاوانێکی هەبێ، تەنیا تاوانی ئەو ئەوە بووە کە زۆر جوان بووە!" شتی وا ڕووی داوە، ئەگەر ڕووی داوە بۆچی؟

- کورە ئەوانە چونکە تێناگەن و شارەزای بڕیاردان و شەرع و دادوەری و ئەم شتانە نین، هەر لە خۆوە قسە دەکەن و نازانن چی بووەتە هۆکار!

- قوربان من لەم قسەی جەنابتەوە وا تێدەگەم کە مەسەلەکە ڕاستە؟

- بەڵێ ڕاستە! بەڵام لەبەر ئەوە نەبوو کە ئەوان دەیڵێن! ئەوانە هەق و ناهەقیان تێکەڵ کردووە، قسەی هەق دەکەن و مەبەستیان پێی ناهەقە! ئیتر یان هیچ نازانن یان نیەتیان خراپە!

- دەی قوربان هەرچۆنێک بێ گرنگ نییە، دەمەوێ بزانم باسەکە چۆن بووە؟

- من شەوێک بە ناو کۆڵانەکانی مەدینەدا دەگەڕام، دەمویست بزانم دەنگوباسی ئەو خەڵکە چییە؟ گوێم لە ئافرەتێک بوو دەیوت:

خۆزگە شەراب و بادە هەبووایە
نەصری حەججاجم لەلا بووایە
ئەوەندە جوانە بۆ یەک بینینی
گەر گیان ببەخشی وەک پولێک وایە
بە (جوانیّ) بڵێی: تۆ وەک نەصر وای
شاگەشکە دەبێ، شفای قەت نایە
تەماشا چاوی چەن جادووبازە!
باڵای وەک شمشاد، برۆی هەودایە
لە تاو ئەو پرچەی قەرارم نەما
جێگام هەر دەڵێی کا و مێرووی تیایە[1]

بۆیە وتم: "نابێ لە مەدینەدا کەسێک هەبێ کچان لە ژووری تایبەتیی خۆیانەوە ئاخی بۆ هەڵبکێشن و گۆرانیی بۆ بڵێن!"

بۆ بەیانی وتم: "نەصری کوڕی حەججاجم بۆ بێنن."

کاتێک هێنایان، تەماشا دەکەم جوانترین مرۆڤە، لە جوانیدا دەدرەوشایەوە، مرۆڤی لە خشتە دەبرد، قژێکی جوانی پێوە بوو هەر مەپرسە، پێم وت: "بیـروڕای گەورەی موسڵمانان وایە کە سەرت بتاشین!"

کاتێ سەرمان تاشی، زیاتر جوان بوو.

---

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| هـل من سبيل الى خمر فأشربهـا | أم من سبيل الى نصر ابن حجاج |
| الى فتـى مـاجد الأعـراق مقتبل | سهل المحيا كـريم غير ملجـاج |
| تهنيه أعـراق صـدق حين تنسبه | أخي وفاء عن المكروب فـراج |
| انظر الى السحر يجري في نواظره | وانظر الى دعج في طرفه الساجي |
| وانظر الى شعرات فـوق عـارضه | كـأنها نمـال دب في عـاجي. |

بۆ شەوی دواتر گوێم لە هەمان ئافرەت بوو دەیگوت:

سەریان تاشیوە ناشیرین ببێ

هەنگ کاتی بڕین شیلەی لێ دەردێ

ڕوومەت وەک مانگی گیراوی ژێر زوڵف

کە سەریان تاشی مانگەشەو هەڵدێ[1]

بۆیە بە نەصرم وت: "بە خوا نابێ من و تۆ لە یەک شاردا دانیشین."

وتی: "دەی قوربان من تاوانم چییە؟"

وتم: "هەر ئەوەی کە پێت دەڵێم."

ناردم بۆ بەصرە.

- یانی بەبێ هیچ تاوانێک دوورتخستەوە بۆ بەصرە؟

- ئەو هیچ تاوانێکی نەبوو، بەڵام دەبێ بزانی بۆچی وام کرد! دەی گوێ لە پیاوی دادوەر و بڕیاربەدەست و سیاسی بگرە!

- گوێم گرتووە قوربان فەرموو!

- ئەوەی کە من کردم، پێشخستنی مەسڵەحەتی گشتی بوو بە سەر مەسڵەحەتی تاکە کەسیدا، زیاندان لە مەسڵەحەتی تاکە کەسی لە پێناو بەرژەوەندیی گشتیدا شتێکی ڕێگەپێدراوە، یەکێکیشە لە دەستوورە گشتییەکانی ئوصولی فیقهـ هەروەها تێگەشتنی تەواو لە ئیسلام ئەوەیە کە ئەگەر هیچ چارەیەکت نەما، ئەوا بە تاوانێکی بچووک تاوانێکی گەورە پاڵ پێوە بنێی. دیسان لە شەریعەتی ئیسلامدا دەستوورێکی گشتی هەیە کە ئەگەر هاتوو مرۆڤ کەوتە نێوان دوو تاوانەوە و بە ناچاری دەبوو یەکیان بکات، ئەو کاتە دەبێ تاوانە بچووکەکە هەڵبژێرێ، ئەگەریش لەنێوان دوو چاکەدا سەرپشک کرا و نەیتوانی هەردووکیان بکا، ئەوا چاکە گەورەکە

[1] عەرەبیەکەی ئاوایە:

حلقوا راسه ليكسب قبحا     غيرة منهم عليه وشحا

كان صبحا عليه ليل بهيم     فمحوا ليله و أبقوه صبحا

هەڵبژێـرێ. جـا ئەگەر دوو چـاکەیش دژ بە یەک بـوون، ئەوا چـاکە گەورەکە هەڵدەبژێرین و چاکەی بچووک وازلێ دەهێنین.

ــ قسـەیەکی جـوانە گەورەم! تەواو و ڕاسـتە و هـیچ جێـی گومـان نیـیە! بەڵام دوورخستنەوەی ئەم کوڕە بۆ بەصرە چ مەسڵەحەتێکی تیا بوو؟

ـ کوڕم! دادوەر بۆی هەیە کە خەڵک دوور بخاتەوە بۆ مەسڵەحەتی گشتی، نەک وەک حەد و سزا. کاتی خۆی لە مەدینەیش بلە ژنانییەک هەبوو نـاوی هیتە بـوو، پێغەمـبەرﷺ دووری خسـتەوە. منـیش نەصـرم لەبەر بەرژەوەنـدیی گشـتی دوور خسـتەوە، خـۆ جـوانێتی وا ناکـا مـرۆڤ دوور بخـرێتەوە، بەڵام ئەوە بەرژەوەنـدیی گشتییە کە وا دەکا دوور بخرێتەوە!

ـ قوربان بەرژەوەندی لە کوێدایە؟

ـ تا پێت بڵێم بەرژەوەندییەکە لە کوێدایە، شـاری مەدیـنە شـاری تێکۆشـەران و جیهادکەرانە، بەو مانایە زۆربەی زۆری پیاوەکانی شـاری مەدیـنە لە مـاڵ نەبـوون، بەڵکو لە جیهاد بوون، بـۆیە زۆربەی ژنەکـانیش لە مـاڵەوە بـێ مێـرد بـوون. بـۆیە لەسەر حاکم پێویستە هەر شتێ ببێتە هۆی تاوان لەسەر ڕێ، لایببا. بێگومان چـۆن پیاو بێتاقەتی بۆ ژنەکەی دەکا، ئاوایش ژن بیری مێردەکەی دەکـاتەوە و بێتـاقەتیی دەکا. بوونی کوڕێکی وەها جوانیش لە کۆمەڵگایەکی ئاوادا، لەوانە بوو خراپەی لـێ بکەوێـتەوە! جـا دوورخسـتنەوەی هەرچەنـد زیـانی تـاکە کەسـی تیـا بـوو، بەڵام لەولایشەوە بەرژەوەندیی گشتی تیایە. من ژنەکانی مەدینە تۆمەتبار نـاکەم، پەنـا بە خوا لە کارێکی ئاوا، بەڵام ئیتر بەو شێوە نەبێ، مرۆڤ ناتوانێ ڕێگە لەو سروشتەی بگرێ کە لەسـەریەتی! بـۆیە مـن بە باشـم زانـی لە پێنـاو پاراسـتنی بەرژەوەنـدیی گشتیدا، زیان لە بەرژەوەندیی تاکە کەسێکی وەک نەصر بدەم.

- بە خوا ئەمە بۆچوونێکی تەواو جوانە قوربان! ئەمە نابێ ئەم بەسەرهاتە وەک تانە و تەشەر بۆ تۆ باس بکرێت، بەڵکو دەبێ وەک شانازییەک باس بکرێت، بەڵام من پرسیارێکی گرنگم هەیە.

- چییە؟

- تۆ لەبەر ئەوەی هیچ ژنێکی شاری مەدینە تووشی گوناه نەبێ، نەصر دوور دەخەیتەوە بۆ بەصرە، یانی ئەم ترسەت لە شوێنێکەوە گواستەوە بۆ شوێنێکی تر! ئەی ئەگەر ژنانی بەصرە تووشی تاوان ببن، ئەو کات چی؟ جگە لە گواستنەوەی مەترسییەک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، بەرهەمەکەی چی بووە؟

- پرسیارەکەت زۆر جوانە و وەڵامەکەیشی زۆر ئاسانە!

- وەڵامەکەی چییە گەورەم؟!

- یەکەم: باری کۆمەڵایەتیی بەصرە لەگەڵ مەدینەدا جیاواز بوو، وەک پێم وتی: شاری مەدینە شاری تێکۆشەران بوو، پیاوەکان بەزۆری لە جەنگدا بوون، بەڵام شاری بەصرە شاری نیشتەجێبوون بوو، پیاوەکان زۆربەی زۆرینەیان لە ماڵدا بوون، بۆیە هەم ژنان و هەم پیاوان کەمتر جێی مەترسی بوون.

دووەم: کەسێکی ئاوارە و دوورەوڵات وەک کەسێکی خۆیی نییە. مرۆڤی ئاوارە لەو شوێنەی کە لێیەتی خەریکی خۆژیاندن دەبێ، خەریکی پەیداکردنی ڕزق و ڕۆزی و بژێوی دەبێ. بۆی ناکرێ هەروا بە بەلاش و حەلاش لێی بسووڕێتەوە، بۆی ناکرێ زۆر خەریکی خۆی بێت و بێ کار بۆی دابنیشێ. ئێستە ئێمە جۆرە ڕەقی و ستەمێکمان بەرانبەر نەصر کردووە، ڕاستە، بەڵام دەبێ ئێمە تەماشای بەرژەوەندیی تاکە کەسی نەکەین، دەبێ بەرژەوەندیی گشتی لە بەرچاو بگرین، بەپێی شەرع و قانون، ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی گشتی لە پێشترە تا ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی تاکە کەسی!

- بە خوا بیر و بۆچونەکانت هەموویان زۆر تەواون! تۆ شتی وا هەست پێ دەکەی، خەڵکی تر نایانزانێ! ڕاستە وتوویانە: "هەموومان چاومان هەیە، بەڵام هەموومان شتەکان نابینین!"

- دەی ئەم باسە تەواو بوو؟

- بەڵێ قوربان تەواو.

- هیچی تری وەک ئەمە هەیە بپرسی؟

- زۆر هەیە قوربان.

- دەی بڵێ بزانم چییە؟

- قوربان دەڵێن: "گوایە تۆ و ئەبوو بەکری سددیق هێرشتان بردووە بۆ ماڵی عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب و عەلی خۆی لە ماڵ نەبووە، بەڵام بە هەردووکتانەوە لە فاتمەتان داوە، پەراسووتان شکاندوە، بە منداڵێکەوە دووگیان بووە، منداڵەکەی لەبار چووە، دواییش هەر بە هۆی ئەو لێدانەوە کۆچی دوایی کردووە؟

- ئای باوکە ڕۆ لەو درۆ زلە! بە خوا دیسان دەڵێم: " حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكِيلُ، خوام بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە."

دواتر ددەڵێم: کاتێ پرسیاری عەبدوڕڕەحمانت لێ کردم، وەڵامم دایتەوە: پرسیاری نەصرت لێ کردم، باسی بەرژەوەندیی تاکە کەسی و گشتیم بۆ کردی؛ بەڵام بە خوا ئەمە کە تۆ دەیڵێی، ئەمە یەکەم جارە و لە دەمی تۆی دەبیسم! نازانم چی بڵێم! من هێرش بکەمە سەر کچی پێغەمبەری خوا ﷺ! لەگەڵ چ کەسێکیشدا؟ ئەبوو بەکری سددیق! باشترین پیاو، باشترین مرۆڤ لە دوای پێغەمبەران! کورە بە خوا پیاو نازانێ لە داخا چی بڵێ!

- بە خوا دەزانم تۆ لەو تۆمەتەوە دووری! بەڵام وا دەڵێن چی بکەم؟

- نازانم ئەو کەسەی ئەم قسەیەی هەڵواسیوە مەبەستی ناشیرنکردنی من و ئەبوو بەکرە یان ناشیرینکردنی عەلی؟!

- عەلی بۆ؟ خۆ ئەو لە ژنەکەی دراوە، بۆچی ناشیرین دەکرێت؟

ـ بە خوا بەو قسە، ئەوەندەی مەبەستی ناشیرینکردنی عەلییان بووە کە هیچکەس بەو جۆرە ناشیرین نەکرابێ!

- چۆن قوربان تێمبگەیەنە؟

- کورە کوڕم ئەوە تۆ چی دەڵێی؟! عەرەب لە سەردەمی نەفامیدا خاوەن حەیا و حورمەت و غیرەت بوون، هەرگیز قەبوڵیان نەکردووە تەعەدایان لێ بکرێت! بە تایبەتی لە ژن و منداڵیان! جاری وابووە چەند ساڵێک لەنێوان دوو هۆزدا لەسەر ئەسپسوارییەک شەڕ بووە، پێیان شەرم بووە بڵێن: "دۆڕاین،" ئیتر چۆن لە ژنیان بدرێ قسە ناکەن؟!

- نا بە خوا شتی وا نابێ!

- دەی ئەوە لە سەردەمی نەفامیدا وابووە، ئەی دەبێ لە سەردەمی ئیسلامدا چۆن بێ! ئایینی ئیسلام بۆ پاراستنی کەرامەت و ڕێز و شکۆی خەڵک هاتووە. عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب ئەو پیاوە دلێر و دلاوەرە، ئەو شێرەی خوا، ئەو کەسەی کە خۆی کردە فیدایی بۆ ئیسلام، ئەو کەسەی کە لە جێگەکەی پێغەمبەردا نووست بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە دەست کافرەکان دەرباز ببێ، ئەو کەسەی لە غەزای بەدردا وێنەی نەبوو، ئەو کەسەی لە غەزای خەندەقدا شاڵاوی دەبرد، ئەو کەسەی وەک شێر لە غەزای خەیبەردا ئاڵا بەدەستی ئیسلام بوو! ئا ئەو کەسە لە ژنەکەی بدرێ و قسە نەکا؟! ئاخر ئەمە عەقڵێ چ گەوجێ ئەمە قبوڵ دەکا؟!

کوڕم! خوا لە بارەی ژنانەوە بە پیاوانی فەرموە: ﴿فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ البقرة: ٢٢٩ واتە: "یان بە ڕێک وپێکی و بەباشی بە یەکەوە بن، یان بە حەیا و حورمەتەوە دەستیان لێ بەردەن!"

دەی ئەگەر من و ئەبوو بەکر پەراسووی فاتمە بشکێنین و عەلی دەنگ نەکا، منداڵی لەبار ببەین و عەلی دەنگ نەکا، بێڕێزی پێ بکەین و هەر دەنگ نەکا و،

هەروا بۆ خۆی بێخەم بسووڕێتەوە! ئەوە کەی بەڕێکوپێکی لای خۆی فاتمەی هێشتووەتەوە؟! ئەوە ئیتر ئازایەتی و جوامێری و شێرایەتیی عەلی لە کوێیە؟! تەعەدا لەوە زیاتر چییە؟! عەلی و تەعەدا قەبوڵکردن!

ـ بە خوا ڕاست دەکەی قوربان!

ـ با پێت بڵێم: بە خوا ئەو قسە و قسەڵۆکانە تەنیا گاڵتەکردن بە کەسایەتی عەلی نییە! بەڵکو گاڵتەکردن بە کەسایەتی تەواوی بنەماڵەی پێغەمبەرە! دوور لە ڕووی عەلی، دوور لە ڕووی عەلی! با بڵێین: عەلی پیاوێکی ترسەنۆک و بێدەسەڵاتە! کە هەرگیز وانەبووە - بە خوا زیرەکترین و بوێرترین پیاو بوو - باشە ئەمە عەلی هیچ! ئەی ئەو هەمووە پیاوە دلێرەی بنەماڵەی هاشم چی! عەبباس چی! خۆ بۆم باسکردی عەبباس خانوویەکی بە من نەدا، ئەی ئیتر چۆن بەرابەر بێڕێزیکردن بە برازاکەی بێدەنگ دەبێ، باشە عەبباس بۆ خانووە قوڕینەیەک بەرانبەر من دەوەستێتەوە، بەڵام لە لێدانی فاتمەدا نایەتە دەنگ؟! ئاخر ئەمە چ بێڕێزیکردنێکە بەرابەر عەبباس! ئەی عەقیل لەکوێ بوو؟! حەسەن و حوسەین لەکوێ بوون؟! خۆ ئەو سەردەمەی کۆتایی خەلافەتی من حەسەن و حوسەین تەمەنیان بیست ساڵ بەرەو سەرتر بوو، گەنج و لاو و بەهێز، لە هەرەمەی هێز و گەنجیدا بوون، دەی بۆ هیچیان بەرابەر عومەرێکی بە ساڵاچووی لاواز نەکرد؟! ئەوانیش غیرەتیان نەبوو؟! ئەها کوڕم! ناڵێم ئەوە پێش ئەوەی بێڕێزیکردن بە من و ئەبوو بەکر بێ، بێڕێزیکردنە بە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ!

ـ بەڵێ بە خوا ڕاست دەفەرمووی وایە!

ـ کورە ئەم قسە لەوە دەرچووە هەر بێغیرەتی بێت، بە خوا سەردەکێشێ بۆ جۆرە گەوادییەکیش پەنا بەخوا. تو خوا چۆن پیاوێک قەبوڵ دەکا من بچمە ماڵەکەی تێر لە ژنەکەی بدەم، منداڵەکەی لەبار ببەم، بیکوژم! دواتریش بچم بۆ داوای کچی ئەو پیاوە و کچەکەی خۆی بدا بە من! ئەی من زاوای عەلی نیم!

ئەی ئوم کەلسومی ژنم کچی فاتمە و عەلی نییە؟! ئەی ئوم کەلسوم چۆن بەرابەر ئەو هەمووە بێڕێزیکردنە بێدەنگ بوو؟! ئەی خوانەخواستە ئەگەر وابێ، کوا غیرەت و پیاوەتی و مەردایەتیی بنەماڵەی پێغەمبەرﷺ ؟!

ئەو کارە ئەگەر بەرابەر پیاوێکی بێدین و بتپەرست و خوانەناسیش بکرێ، قەبوڵی ناکا، چونکە دژی سروشتی مرۆڤە، چ جای ئەوەی بەرابەر زاتێکی لەخواترس و بەغیرەتی وەک عەلی؟!

- بە خوا ڕاست دەفەرمووی، عەلی ئەوەندە بێغیرەت نییە.

- حاشا عەلی ئاوابێ کە ئەوانە دەیڵێن! حاشا ئەبوو بەکر و منیش ئەوەندە ستەمکار و ناپاک بین. کورە ئەوە قسەی شەیتانە، لە کەللەسەری ئەوانەدا هێلانەی کردووە و ئەو قسانەی پێ وتوون، لێیان گەڕێ و با واز لەم مەسەلە بێنین. ئەمە ئاوێکی لێڵ و بۆگەنە!

- فرمان فرمانی تۆیە گەورەم!

- دەی بزانم لەم بارەوە هیچی ترت لایە؟

- قوربان دەڵێن: "عومەر بە پێچەوانەی قورئانەوە جوڵاوەتەوە، هەستاوە ئەو ناوچانەی عێراق کە ڕزگار کراون، هەمووی کردووەتە وەقف بۆ موسڵمانان و لەنێوان جەنگاوەرانی ئیسلامدا بەشی نەکردوون، خوا دەفەرمووێ: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ﴾ الأنفال: ٤١ واتە: '(ئەی ئیمانداران) ئاگاداربن و بزانن: بەڕاستی هەرچیەکتان دەستکەوت (لە جەنگی بێ باوەڕاندا) ئەوە بێگومان پێنجیەکی بۆ خوا و پێغەمبەر و خزمانی نزیکی پێغەمبەر و هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانە، چوار بەشەکەی تریشی بۆ ئەو موجاهیدانەیە کە لەو غەزایەدا بەشدارییان کردووە.' ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێنجیەکی ئەو دەستکەوتانە بۆ ئەو کەسانەیە کە لە ئایەتەکەدا باس کراون و و چوار بەشەکەی تری دابەش دەکرێت بە سەر جەنگاوەرەکاندا! ئەوەیش

بە گوێرەی ئایەتی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر. کاتێک خەیبەریش ڕزگار کرا، پێغەمبەر بەو جۆرە بەشی کرد، کە وا بوو ئەو کارەی پێغەمبەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پیویستە دابەش بکرێ، بەڵام عومەر بە پێچەوانەی قورئان و و سوننەتەوە ڕەفتاری کردووە و بە ڕای خۆی کاری کردووە." قوربان تۆ لەم بارەوە چی دەفەرمووی؟

- یەکەم: ئەوەی کە دەڵێن: "عومەر پێچەوانەی دەقی قورئانەوە جولاوەتەوە." ئەو قسە لە نەشارەزاییی خۆیان لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە، قورئان نەیفەرمووە: ئەو دەسکەوتانە چ دەسکەوتی گوازراوە بێ وەک کەلوپەل، یان نەگوازراوە بێ وەک زەوی زار، دەبێ بەش بکرێن. بەڵکو ئەو ئایەتە کە ئەوان کردوویانە بە بەڵگە، باسی پێنجیەکی دەسکەوتەکان دەکا کە چۆن و بۆ کێ خەرج بکرێن، دابەشکردنی چوار بەشەکەی تر لە قورئاندا باس نەکراوە، بەڵکو لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺدا هاتووە کە ئەو بەشی کردووە. ئایەتەکە بە هێماوە فەرموویەتی چوار بەشەکەی تر بدرێ بە جەنگاوەران، نەک بە ڕاشکاوی! ڕێک وەک ئەو ئایەتە کە دەفەرمووێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾ النساء: ١١ واتە: "ئەگەر مردووەکە منداڵی نەبوو و، دایک و باوکی میراتبەری بوون، ئەوە سێیەکی میراتەکە بۆ دایکییەتی."

کەوابوو بەشی باوکێک لە میراتی ئەو کوڕەی کە مردووە و ژن و منداڵی نییە، دوو سێیەکە، چونکە دایکی سێیەکی بردووە و ئەوی تر ماوەتەوە بۆ باوک! کە وا بوو ئایەتەکە شتەکەی بە یەکجاری نەبڕاندووەتەوە، بەڵکو بە گومان وا دادەنرێ کە چواربەشەکەی تر بۆ جەنگاوەران بێ. لە بنەماکانی تەفسیردا یاسایەک هەیە دەڵێ: "فام و تێگەیشتن لەو ئایەتانەی کە بە کورتی و هێما شتەکان دەگەیەنن، وەک تێگەشتنی ئەو ئایەتانە نییە کە بە ڕاشکاوی مەبەستەکە دەدەن بە دەستەوە!" دیسان مانای پەنامەکی ئایەتێک ناتوانێ وەک مانای ئاشکرای ئایەتەکە ڕێگا نیشان

بدا، قسەی بە تویکڵ و هێما و ئیشارە وەک ڕێک و بێ پێچ و پەنا قسەکردن نابنە بەڵگە. ئەگەر کەسێ بڵێ: "وەڵلا بەشی باوک لەو ئایەتە هەر دوو سێیەکە و شتەکە براوەتەوە،" ئەوە بە گوێرەی تێگەشتنی خەڵک شتەکەی براندووەتەوە نەک خودی ئایەتەکە!

هەرچی بەڵگە هێنانەوەیشە بە کرداری پێغەمبەرﷺ لە غەزای خەیبەردا، ئەوە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی کە هەر شوێنێ ئازاد کرا، ئیتر دەبێ بەش بکرێ. چونکە ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ لەوانەیە بۆ سوننەت بێ نەک بۆ واجب. ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ ئەوە دەردەخا کە دابەشکردن دروستە یان لای ئەوپەڕی سوننەتە نەک واجب. پێغەمبەرﷺ زۆر حەزی لە حەڵوا بوو، دەی ئەگەر کەسێ حەزی لە حەڵوا نەبێ، پێچەوانەی سوننەتی کردووە؟!

ـ نەوەڵلا قوربان!

ـ دەی ئیتر ئەو قسەیان لەکوێ هێناوە کە واجبە دابەش بکرێ؟ دواتر، ئەگەر لایەنی سوننەتی یان دروستێتی کارەکە زاڵ بکەین، ئەوە کارێکمان کردووە بەبێ ئەوەی بەڵگە و بنەمای هەبێ، ئا لەبەر ئەوە هەر کاتێک شوێنێک ئازاد کرا، بڕیار بڕیاری سەرۆک و خەلیفەیە کە چی لەو شوێنە بکا و چۆنی لێ بکا، ئەوەی کە بە مەسڵەحەتی دەزانێ، ئاوای لێ دەکا. ئەوەتا پێغەمبەرﷺ شاری مەککەی ڕزگار کرد و بەشیشی نەکرد، کە وا بوو ئەو ناوچانەی ڕزگار دەکرێن، دروستە بەش بکرێن و دروستە وەک خۆیان دەستکاری نەکرێن. ئەو کارەی پێغەمبەر لە خەیبەر، مانای ئەوەیە کە دروستە نەک واجب، ئەگەر مانای واجب بووایە، مەککەیشی دابەش دەکرد!

دیسان کارەکانی پێغەمبەرﷺ هەموویان بۆ یەک مەبەست نەبوون، کاری وای هەبووە بە مانا واجب بووە، هەبووە بە مانا سوننەت و هەبووە بە مانای ئەوەی کە دروستە بکرێ، ئیتر نە سوننەتە و نە واجب. کاتێ دەزانین فلان کاری بۆ واجب

بووه و فلان سوننەت، کە بەڵگەیەکمان هەبێ! لێرەیش هیچ بەڵگەیەک نییە تا شتەکە یەکلایی بکاتەوە.

- قوربان قسە و بەڵگەکانت زۆر جوانن، بەڵام تۆ فەرمووت: "ئەو شتانەی دەگوازرێنەوە و ئەوانەیشی کە ناگوازرێنەوە،" جیاوازی چییە لە نێوانیاندا؟

- ئاها! مەبەستەکە ئا لێرەدایە.

- چۆن؟

- سەرچاوەی هەڵەکە ئا لەوێوە دروست بووە کە جیاوازییان نەکردووە لەنێوان ماڵی گوازراوە و نەگوازراوە. ئەوانە وا دەزانن کە ماڵی گوازراوە وەک پارە و زێڕ و زیو چ بڕیارێکی هەیە، هەمان بڕیار بۆ ماڵی نەگوازراوەیش وەک زەویوزار بەکار دێ و ئیتر جیاواز نین! بۆیە وا دەزانن من پێچەوانەی دەقی قورئان و سوننەت جوڵاومەتەوە!

بەڵام بەو جۆرە نییە کە ئەوان لێی تێگەشتوون! هیچ گومان لەوەدا نییە ئەو شتانەی کە گوازراوەن وەک زێڕ و زیو، دەبێ دابەش بکرێن، بەڵام ماڵی نەگوازراوەی وەک زەویوزار، یەکدەنگی لەسەر نییە کە چی لێ بکرێ، زوبەیر و بیلال پێیان وایە دەبێ بەش بکرێ، من و عەلی و ئەبوو عوبەیدە و مەعازیش پێمان وایە بەش ناکرێ. هۆکاری بۆچوونەکەی ئێمەیش ئەوە بوو وتمان: "ئەگەر ئەم زەویوزارانە دابەش بکرێن، ئەوا دەدرێن بە خەڵکێکی کەم و زۆربەی خەڵک دەستی لە بنی هەمانەوە دەردەچێ." دوای ئەوەی کە گفتوگۆیەکی زۆرمان لەو بارەوە کرد، خوای گەورە ئەوەی خستە دڵمەوە کە دابەش نەکرێ، بەڵگەی ئایەتی قورئانیشم بۆ ڕاکەی خۆم دەسکەوت!

- بەڵگەکە چییە قوربان؟

- ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ الحشر: ٠٧، واتە: "ئەو دەستکەوتانەی

خوا بەخشینی بە پێغەمبەرەکەی لە خەڵکی دێهات و شارەکانی جوو، ئەوە خوا بڕیاری لەسەرداون کە بۆ پێغەمبەر و خزمانیەتی، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانیشە." دوایی دەفەرمووێ: ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ الحشر: ٨ واتە: "هەروەها لەو دەستکەوتانە، بەشی کۆچبەرانی هەژار دەبێت بدرێت، ئەوانەی لە شوێنەوار و سامانیان دوور خراونەتەوە و دەرکراون، ئەوانە بە تەمای بەخششی خوا و ڕەزامەندیی ئەون و، بەبێ هیچ تەماعێک پشتیوانی لە خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، هەر ئا ئەوانە ڕاستگۆ و ڕاستانن." تا دەگاتە ئەوێ کە دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ﴾ الحشر: ٩ واتە: "ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و، دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بەئیمان." مەبەستی خوای گەورە ئەنصارییەکانە. دوایی دەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ﴾ الحشر: ١٠ واتە: "ئەوانەیش کە بە شوین کۆچبەران و پشتیواناندا هاتن."

خوای گەورە هەموو موسڵمانانی دەوێ هەتا ڕۆژی قیامەت. من پێم وایە ئەم ئایەتانە هەموو موسڵمانان دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی.

دوایی پێم وتن: "ئێوە دەتانەوێ ئەوانەی کە دوای خۆماندا دێن هیچیان نەبێ؟! ئەی ئەگەر ئەم زەوی و زارانە بەش بکەین، ئەوان چی بکەن؟ ئەگەر لەبەر چینی دوای خۆمان نەبووایە، ئەوا هەرچییەکم دەستکەوتایە وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ خەیبەری بەش کرد، ئاوا بەشم دەکرد، بەڵام ئەو زەوی و زارانە هەر بۆ بەیتولماڵ دەمێننەوە، بەروبووم و قازانجەکەیان بۆ خەزێنەی گشتی دەگەڕێتەوە. جا هەموو موسڵمانێکی ئێستە و داهاتوو، حازر بێ یان غایب هەر بەشی هەیە!"

- بە خوا گەورەم ڕایەکی زۆر زۆر جوانت هەیە!
- دەی کوڕم! لەم قسانەی من سەرنجی خاڵێکی گرنگت دا؟

ـ نازانم! ئایا ئاماژەت بە هیچ شتێکی پەنهان داوە و، من پێی نەزانم؟

ـ مادەم گفتوگۆ و پرسیار و وەڵام لەنێوان من و تۆدا ڕووی داوە لە بارەی بەشکردنی زەویوزارەوە، ئەوە ئیتر خۆی بۆ خۆی بەڵگەیە کە ئەو ئایەتەی پێشوو کە باسمان کرد، بەڕاشکاوی بەڵگە نییە بۆ دابەشکردنی ئەو زەویوزارانە و، جیاوازن لەو شتانەی کە ماڵی گوازراوەن. ئەگەر وانەبا، ئەوە دەبووە خراپە بۆ هەموو هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ نەک تەنیا عومەر! دەزانی بۆ؟

ـ بۆچی گەورەم؟

ـ چۆن هاوەڵان گفتوگۆ لە بارەی ئایەتێکەوە دەکەن کە گفتوگۆ هەڵنەگرێ؟ کە وا بوو ئەو گفتوگۆیەی نێوانمان کە ئایا ماڵی گوازراوە و نەگوازراوە وەک یەکن یان جیان و، هەروەها بە بەڵگەی ئەو دابەشکردنەی کە پێغەمبەرﷺ لە خەیبەر کردی کە بۆ ئەوە نەبووە کارەکە واجبە، بەڵکو سوننەتێکی پێغەمبەر بوو، ئەوە دەردەخا کە ئەو دابەشکردنە واجب نییە! ئەو شوێنانەی کە بە جەنگ ئازاد کراون، زەویوزارەکەی بۆ سەرکردەی ئیسلام جێ دەهێڵرێت، چۆنی بە باش بزانێ ئاوای لێ دەکا. دابەشی دەکا یان دەیکا بە موڵکی دەوڵەت، ئەوە ئیتر بەپێی بڕیاری خەلیفە و سەرکردە دەبێ. منیش ئەو زەویوزارانەم دا بە بەیتولماڵ و هیچم بۆ خۆم نەبووە. من تەنیا پارێزەری مافی خەڵکم، من تەنیا خەم بۆ ئەوانەی ئێستا ناخۆم، بەڵکو خەم بۆ ئەوانەی داهاتوویش دەخۆم، بۆ ئەوانەی کە هێشتا لەدایک نەبوون، ئەوانە بێن و ببینن کە هەموو ئەو زەویوزارانە بە دەست کەمینەیەکی کەمەوەن، ئیتر ئەوانیش هەر لە دوورەوە بڕوانن! ئەو کارەی من کردم، دەبوو وەک شانازییەک بۆ من باس بکرێ نەک لە دژی من باس بکرێت!

ـ بە خوا تۆ بلیمەتی گەورەم! بە خوا وایە، ئەوە شانازییە بۆ تۆ! پیاوێک بەزەیی بەو کەسانەدا بێتەوە کە هێشتا لەدایک نەبوون، بە هیچ شێوەیەک ستەم لەوانە ناکا کە هاوڕێ و هاوسەردەمی خۆی بن. پاک و بێگەردی بۆ ئەو کەسەی

ئەوەندە زانیاری و حیکمەتی بە تۆ بەخشیوە، هەقی خستووەتە سەر زمان و نێو دڵت.

- دەی بزانم هیچ شوبهە و دوودڵیەک ماوە لێم بپرسی؟

- قوربان دەڵێن: "عومەر نەک جارێ، بەڵکو چەند جارێ دژی قورئان و سوننەت وەستاوەتەوە، ئەو بەشی ئەو مسوڵمانە نوێیانەی گیر دابوو کە هێشتا ئیمان بە تەواوی لە دڵیاندا نەچەسپابوو. لەگەڵ ئەوەی کە قورئان دەفەرمووێ بەشیان بدەن، بەڵام عومەر بەشی نەدان. دەی عومەر چۆن دەتوانێ بەرابەر دەقێکی سەریحی قورئان بوەستێتەوە؟ دژی کاری پێغەمبەرﷺ و ئەبوو بەکر بێت؟"

قوربان تۆ وەڵامت بۆ ئەوانە چییە؟ ئەو تۆمەتانە چۆن ڕەت دەکەیتەوە؟

ـــ ئەو تۆمەتانە ئەوەندە بێبنەما و لاوازن کە ڕەتکردنەوەیان لە ئاو و دۆخواردنەوە ئاسانترە.

- چۆن قوربان، من گوێبیستی جەنابتم!

- ئەوەی کە من کردم نابێتە دژایەتیی کار و کردەوەی پێغەمبەرﷺ و ئەبوو بەکر و، نابێتە پەکخستنی دەقێکی قورئانی، دیسان نابێتە ئاوڕنەدانەوە لە شەریعەت. ئەوەی کە لە ئایەتەکەدا باس کراوە کە زەکات بدرێ بەو کەسانەی لە شەرعدا پێیان دەوترێ ﴿وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ ﴿٦٠﴾﴾ التوبة، واتە: "ئەوانەی کە تازە ئیمانیان هێناوە و بە تەواوی لە دڵیانا نەچەسپاوە." ئەوە من دڵنیام خوای گەورە ئەو بەشەی بۆ ئەوان دیاری کردووە و بەستوویەتی بە شتێکەوە، وەک ئەو هۆزانەی کە پێشەوای موسڵمانان بترسێ تووشی شەڕیان بکەن، بەو زەکاتپێدانە دڵیان بێننەوە جێ و ئارامیان بکەنەوە، با ئەوانەیش پێویستیان بە زەکات نەبێ، بەڵام هەر پێیان دەدرێت، چونکە ئەوانە پێویستە دڵیان ڕابگیردرێت. ئەوەیش لە بارودۆخێکی تایبەتیدا دەبێ، بە زۆری لەوکاتانەی کە دەوڵەت لاوازە و کەمدەسەڵاتە، سەرۆکی دەوڵەت بیەوێ بەو زەکاتە بەڵا و شەڕ لە کۆڵ دەوڵەت بکاتەوە، بەڵام هەرکات

دەوڵەت بەهێز بوو، کەس پێی نەوێرا، ئەو کاتە پێویست ناکا لە شەڕی کەس بترسێ، پێویست ناکا بە بڕە زەکاتێک ئیمان لە دڵی خەڵکدا گیربدا!

ئەو ناوەیش کە ناوی "مؤلفة قلوبهم"ـە، هەتا ڕۆژی قیامەت کەس بەو ناوەوە نامێنێ، وەک چۆن مرۆڤ هەمیشە هەر فەقیر یان مسکێن نییە، هیچ کەسێکی ژیر نالێت: "ئەگەر کەسێکی فەقیر هەبوو و زەکاتمان پێ دا و دوایی دەوڵەمەند بوو، دەبێ هەر بیدرێتێ، چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان ناوی فەقیر بووە." کەس ئەم قسەیە ناکا، بەخشین بەسراوە بە فەقیری، بە مسکێنی، هەرکات فەقیری و مسکێنی نەما، ئیتر بەخشینیش کۆتایی دێت. ئەم مەسەلەی موئەللەفەیەیش هەروایە، هەرکات ناوەکە نەما، زەکاتیش نامێنێت. لە سەردەمی پێغەمبەرﷺدا چینێک تازە موسڵمان بوون، خۆ تا سەردەمی ئێمەیش هەر بە تازە موسڵمانی نامێننەوە. من کە بینیم بارودۆخ گۆڕا و ئیسلام هێز و گوڕی گرت، ئەو تازە موسڵمانانە هەموویان لەسەر ئایین دامەزران، ئیتر وتم پێویست ناکا ئێستەیش هەر زەکاتیان پی بدرێ. تازە ئەو وەسفەی کە ئەو کاتە هەیانبوو، ئێستە نیانە، ئەو کاتە تازە موسڵمان بوون، دڵیان دانەمەزرابوو؛ ئێستە کۆنە موسڵمانن و دڵ دامەزراون! کە وا بوو من نە ئایەتم پەک خستووە و نە قورئانم هەڵوەشاندووەتەوە! بڕیارەکە وەک خۆی ماوە، هەرکات چینە موسڵمانێکی نوێ پەیا بوون، ئەو کاتە دڵیان ڕاگیر دەکرێ و زەکاتیان پێ دەدرێ، ئیتر کوا ئایەت پەک خراوە؟ تەنانەت ئایەتەکە و حوکمی ئایەتەکە نوێ دەبێتەوە!

- بە خوا ئا ئەوە تێگەشتنی تێر و تەواوە لە قورئان و شەرع! ئەگەر ئێمە لە هۆکاری پشت ئایەتەکەوە بڕوانین کە بۆچی دەبەخشێ و بۆچی نابەخش، ئەوە بەکارخستنی ئایەتە نەک پەکخستن!

- ڕاست دەکەی کوڕم! ئەو دەقە وەک دەبینی هۆکاری لە پشتە نەک بە ڕەها بێت، منیش تەماشای هۆکارەکەم کردووە نەک ڕواڵەتی ئایەتەکە. دەمزانی بۆیە ئەوانە زەکاتیان پێ دەدرێ، چونکە تازە موسڵمانن، لاوازن، بۆیە دوای ئەوەی دڵیان

دامەزرا و ئیسلامیش بەهێز بوو، ئیتر پێویست ناکا زەکات بەو چینە بدرێ. قورئان ناوی هیچ کەس و چینێکی نەبردوە کە هەتا هەتایە هەر زەکاتیان پێ بدەین! بەڵکو باسەکە باسی بارودۆخە، چەند بارودۆخێکە هەرکەس لەو بارودۆخانەدا بوو، زەکاتی پێ دەشێ، هەرکات لەو بارودۆخانەدا نەما، زەکاتیشی پێ ناشێ - منیش هەروام کرد. دوو پیاو هەبوون ناویان عویەینەی فەزاری و ئەقرەعی کوڕی حابس بوو، ئەبوو بەکر نامەیەکی نووسیبوو کە ئەمانە لە بەشی مؤلفة قلوبهم بەشدارن، ئەو کاتە هەم ئیسلام لاواز بوو، هەمیش ئەوان دڵیان دانەمەزرابوو. دوای وەفاتی ئەبوو بەکر و بەهێزبوونی ئایینی ئیسلام، نامەکەم لێ سەندنەوە و شۆڕیمەوە و وتم: "پێغەمبەر ﷺ بۆیە بەشی بۆ ئێوە بڕیبووەوە، چونکە ئێوە تازە موسڵمان بوون، ئێستە هەم ئیسلام بەهێزە و هەم ئێوەیش دڵتان لەسەر ئیسلام دامەزراوە، بۆیە چیی تر پێویست ناکا زەکاتتان پێ بدرێت، بڕۆن بۆ خۆتان ئیش و کار بکەن و نان پەیدا بەکەن!

- یانی تۆ پێش ئەوەیش ببی بە خەلیفە، هەر هەمان ڕای ئێستات هەبوو؟
- بەڵێ هەمان ڕای ئێستام هەبوو.
- ئەی چۆن ئەبوو بەکر پێش تۆ هەمان ڕای تۆی نەبوو؟
- ئەگەر ئەو سەر زەوییە پڕ ببێ لە عومەر، ئەوا ئەبوو بەکر بە تەنیا لەو هەموو عومەرە باشترە. من هەرگیز لافی ئەوە لێنادەم بڵێم: "لە ئەبوو بەکر زاناتر و شەرعزانترم." بەڵام ئیتر ئەوە ڕاوبۆچوونە، منیش ڕاوبۆچوونم هەیە، جاری وا هەیە دەیپێکم و جاری وایش هەیە وا دەرناچێ، ئەبوو بەکریش هەروەها. من کاتی خۆی لەگەڵ ئەوەدا نەبووم جەنگ لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا بکەین، بەڵام ئەبوو بەکر هەر سوور بوو، دەیوت: "لەگەڵیان دەجەنگم." دەی ڕاو بۆچونی ئەو ڕاست دەرچوو، من وەک ئەو نەمپێکا، ئەو هۆکارێکی بەدی دەکرد کە من بەدیم نەدەکرد. ئەو کاتەیش کە بۆ مەسەلەی ئەو دوو کەسە پێم وت با ئیتر زەکاتیان پێ نەدەین، من هۆکارێکم بەدی دەکرد، ئەو بەدیی نەدەکرد، دوای ئەوەیش کە بۆچوونەکەی خۆم بۆ شی

کردەوە، پەسەندی کرد. هەروەها منیش هەرکات بۆچوونێکم هەبووایە و هاوەڵەکانم بۆچوونێکی باشتریان لەوەی من هەبووایە، وازم لەوەی خۆم دەهێنا. ئەمە هیچ عەیبە و کەمایەتییەکی تیا نییە، بەڵکو مایەی شانازیشە، چونکە مرۆڤ دەبێ شوێن هەق بکەوێ؛ هەق لە هەموو شتێ شیاوترە بۆ شوێنکەوتنی. ئەگەر ئەبوو بەکریش ڕاکەی منی بە باش نەزانیایە، پەسەندی نەدەکرد و کاری پێ نەدەکرد. زووتریش پێم وتی کە لە بارەی لەکارلادانی خالیدی کوڕی وەلیدەوە زۆر قسەم لەگەڵدا کرد، بەڵام بە گوێی نەکردم و هەر لەسەر بۆچوونی خۆی سوور بوو، مافی ئەوەی بە مندا کە ڕای خۆم دەرببڕم و، مافی بە خۆیشی دا کە لەسەر بۆچونی خۆی سوور بێ. خۆ ئەگەر ئەبوو بەکر سوور بووایە لەسەر زەکاتدان بەو دوو کەسە، ئەوا پێی دەدان، بەڵام ڕاوبۆچوونەکەی منی پەسەند کرد.

- ئەی ئەو هاوەڵانەی تری پێغەمبەرﷺ کە زانیارییان هەبوو، ئەوان چی؟

- من خۆم ویستم باسی ئەوانیش بکەم، بەڵام پێش ئەوەی من باسیان بکەم، تۆ پرسیارت لەبارەوە کردن. ئەوانیش ڕاکەی منیان پەسەند کرد، یەکدەنگیی هاوەڵان لەسەر ڕاکەی من، ئەوە دەگەیەنێت کە بە کۆی دەنگ کارەکەی منیان پەسەند کردووە. هەروەها بە کۆی دەنگ تێگەشتنی منیان پەسەند کردووە. خۆ ئەو یەکدەنگییە یەکدەنگی نەبوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئایەتێکی قورئان!

دوای ئەوەی ئەقرەع و عویەینە ئەو دەنگوباسەیان بیست کە بۆم باسکردی، هاتن بۆلای ئەبوو بەکر، پێیان وت: "تۆ خەلیفەی یان عومەر؟"

ئەبوو بەکریش وتی: "ئەگەر عومەر بیەوێ، ئەوا ئەو خەلیفەیە!"

مەبەستی ڕۆژەکەی سەکۆی سەقیفە بوو، دەستی هێناو وتی بە من: "دەستت بێنە با بەیعەتت پێ بدەم ببی بە خەلیفە." بەڵام من ڕازی نەبووم پێشە ئەبوو بەکر بکەوم!

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا ژیاون، ئەوانە لە ڕووی زمانزانی و ڕەوانبێژیەوە لە هەموو کەس شارەزاترن، هەموو هاوەڵان بە ئەبوو بەکریشەوە بە بۆچوونەکەی من ڕازی بوون. خۆ ئەگەر دژایەتیی مانا و مەبەستی قورئانی بکردایە، ئەوا بە هیچ جۆرێک ڕازی نەدەبوون. ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ڕاکەی من ڕایەکی بەهێز بوو، بۆیە هەموویان بە یەکدەنگی پەسەندیان کرد. من وا لەو ئایەت تێدەگەم کە هەتا ئەو کاتەی پێویست بێ دڵی خەڵک ڕابگرین، ئەوە مۆللەفەن، بەڵام کە پێویست نەبوو، ئەوانیش لە مۆللەفەیی دەردەچن! بۆیە بەشیشیان نامێنێ.

- بۆچوونێکی تەواو و یەکلاکەرەوە و پڕبەپێستە، هەموو شک و گومانەکان دەڕەوێنێتەوە.

- بەڵێ وایە! دەی بزانم هیچ پرسیاری ترت لەم بارەوە هەیە؟

- قوربان وەڵامەکانت تەواو تینوێتیی مرۆڤ دەشکێنن، بۆیە لەبارەی ئەو شک و گومانانەوە هیچ پرسیارێکم نییە.

- ئەی جگە لەم باسە، هیچ پرسیاری ترت هەیە؟

- بەڵێ گەورەم! هەمە.

- دەی پرسیار بکە.

- قسەیەکی تر هەیە و دەڵێن گوایە: "جەنابت پێچەوانەی مانای سەریحی قورئان جوڵاویتەوە، خوا دەفەرمووێ:

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾ المائدة: ٥

واتە: 'لەمڕۆوە هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵ کراوە و، خواردنی ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش حەڵاڵە بۆ ئەوان، ئافرەتانی داوێن پاک لە ئیمانداران و ئافرەتانی داوێن پاک لەوانەی

کتێبیان پێ دراوە پێش ئێوە(بۆتان حەڵاڵە) کاتێک مارەییان پێ بدەن.' دوای ئەوە بەپێی ئایەتی قورئان هاوسەرگیری لەگەڵ کچانی جولەکە و گاور ئیسبات کراوە، کەچی تۆ حەرامت کردووە! نەتهێشتووە هاوەڵان ژنی غەیرە موسڵمان بێنن! بەوەیش نەوەستاوی، بەڵکو فرمانت کردووە هەرکەس ژنی غەیرە موسڵمانی هەیە، تەڵاقی بدا!" تۆ چۆن بڕیارێکی ئاوا دەر دەکەی؟خەلیفە چۆن دەتوانێ حەڵاڵێکی قورئانی حەرام بکا، لەم بارەوە چی دەڵێی؟

ـ کاکە گوێ بگرە! جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەوەی کە بڵێین: "عومەر نەهیی کردووە کە موسڵمانان کچانی گاور و جولەکە مارەبکەن." لەگەڵ ئەوەی کە بڵێین: "حەرامی کردووە." نەهیکردن شتێکە و حەرامکردن شتێکی تر.

ـ یانی بە کورتیەکەی مەنعت کردووە؟

ـ بەڵێ مەنعم کردووە، بەڵام حەرامم نەکردووە.

ـ ئەی قوربان مەنعکردن هەر حەرامکردن نییە؟ شتێک خوا حەڵاڵی کردووە، کەچی تۆ مەنعی دەکەی! مەنعیش وەک حەرام نییە؟

ـ نەخێر، بە هیچ شێوەیەک وەک یەک نین! پەلە مەکە با بە دوور و درێژی بۆت باس بکەم!

ـ قوربان لە خزمەتتدام! فەرموو تۆ بڵێ و، من گوێ دەگرم.

ــ ئەو تۆمەتەی کە داویانەتە پاڵ من، گوایە حەرامم کردووە، ئەوە لە گفتوگۆکەی نێوان من و حوزەیفەی یەمانیدا دەردەکەوێ.

ـ کام گفتوگۆ؟

ـ لە سەردەمی خەلافەتی مندا حوزەیفە ژنێکی جولەکەی هێنا.

پێم وت: "تەڵاقی بدە! ئەو ژنە ئاگرە ئاگر."

وتی: "ژنی جولەکە بێنم حەرامە؟"

وتم: "نەخێر."

ئەوکاتە تەڵاقی نەدا، بەڵام دوای ماوەیەک تەڵاقی دا.

پێیان وت: "ئەی ئەو کاتە عومەر پێی وتی تەڵاقی بدە، بۆ تەڵاقت نەدا؟"

وتی: "من پێم ناخۆش بوو کە خەڵک پێم بزانێ کارێکی کرێت و ناحەزم کردووە!"

ئەم ڕووداوە خۆی بۆ خۆی دەریدەخا کە من حەرامم نەکردبوو، بەڵکو مەنعم کردبوو. من چۆن دەتوانم شتێک حەرام بکەم کە خوای گەورە حەڵاڵی کردبێ؟

ئەگەر بە وردی تەماشای ئایەتەکە و مانای ئایەتەکە بکەی، خوا فرمانی نەکردووە کە موسڵمانان ژنی غەیرە موسڵمان بێنن، یانی واجبی نەکردووە. ئەگەر واجبی بکردایە، ئەو کاتە من ئایەتێکی قورئانم لەکار خستبوو، بەڵام وا نییە!

مانای ئایەتەکە ئەوپەڕی ئەوەیە کە خوای گەورە حەڵاڵی کردووە و موسڵمان دەتوانێ بیهێنێ و، دەتوانێ هەر بیریشی لێ نەکاتەوە! یانی سەرپشکە لەنێوان هێنان و نەهێنان‌دا، ئەوەیش نابێتە هۆی گوناه و تاوان. کە وا بوو، ئەو بڕیارەی من لەنێو بازنەی ڕەوایەتی خۆی دەبینییەوە، نە واجب، نە حەرام. سەرکردەیش بۆی هەیە مەنعی خەڵک بکا لەو کارانەی کە کردن و نەکردنیان وەک یەکە، بەو مەرجەی سەرکردە بەپێی ڕاوبۆچوونی خۆی پێی وابێ کردنەکەی زیانی هەیە.

- قوربان ئەمە گوێنەدان بە ڕاوبۆچونی خەڵکی تر نییە؟

- هەرگیز وا نییە. ئەوە بەپێی حەز و گوێنەدانە ڕای بەرانبەر نییە، بەڵکو یەکێک لە قەواعید و یاساکانی شەریعەت ئەوەیە کە مەسڵەحەتی گشتی پێشترە لە مەسڵەحەتی تاکە کەسی، ئەمەیش شتێکی ڕوون و ئاشکرایە و هیچ گومانی تیا نییە!

ئەوەی کە لەنێوان من و حوزەیفەیشدا ڕووی دا، خۆی بۆ خۆی ئەوە دەسەلمێنێ کە من نەهیم لەو کارە کردووە، مانای ئەوە نییە کە حەرامم کردبێ، بەڵکو نەهیم لە شتێک کردووە کە کردن و نەکردنی یەکسانە. دەی ئەگەر سەرۆک و ئیمامی خەڵک نەتوانێ شتێکی ئاوا مەنع بکات، ئیتر کەی سەرۆکە و کامەیە سەرکردایەتییەکەی؟

ئیتر خەڵک چۆن گوێڕایەڵی دەبن؟ ئایا حەڵاڵم حەرام کردووە؟ یان حەرامم حەڵاڵ کردووە؟ بێگومان نەخێر! بەڵکو وەک وتم نەهیم لە شتێک کردووە کە کردن و نەکردنی وەک یەکە، نە واجبەو نەحەرام! ئەوەیش بزانە کە جیاوازی زۆرە لەنێوان حەرامکردنی کارێکی حەڵاڵ و مەنعکردنی ئەو کارە لەبەر بارودۆخێکی تایبەتی و لە شوێنێکی تایبەتدا.

- قوربان حەز دەکەم بزانم چ مەسڵەحەتێک هەبوو لەو سەردەم و شوێنەدا کە تۆ مەنعی مارەکردنی کچانی غەیرە موسڵمانت کرد؟

- هۆکارەکان یەک و دووان نەبوون، زۆر بوون.

- قوربان چی و چی بوو؟

- من تەنیا حوزەیفەم لەو کارە مەنع نەکرد، خەڵکی تریشم مەنع کرد. ئەو هۆکارەی کە حوزەیفەم پێ مەنع کرد، جیاوازە لەوەی کە کەسێکی ترم پێ مەنع کرد، یانی هۆکاری هەر کەسەو جیاوازە، هەر کەسەو، لەبەر هۆکارێکی تایبەتی!

ئەو کاتەی حوزەیفەم مەنع کرد، پێم وت: "ئەو ژنە ئاگرە ئاگر" ئاگریش ماڵ دەسوتێنێت. مەبەستم ئەوە بوو کە حوزەیفە زوو زوو دەڕۆشت بۆ غەزاکردن، ماڵەکەی جێ دەهێشت، ژنێکی غەیرە ئیسلام لە ماڵی پیاوێکی ئیسلامدا لەگەڵ منداڵەکانیدا بەبێ مێردەکەی بژی، ئەمە بقەیە و کاریگەریی خراپی لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکان دەبێت! لەوانەیە بیروباوەڕیان بگۆڕێت! منداڵ زیاتر پەیوەستە بە دایکییەوە، بە تایبەتی کچان! جا پاراستنی بیروباوەڕی منداڵانی موسڵمانان فەرزێکی سەرشانی سەرکردەی موسڵمانانە! جگە لە بیروباوەڕ چی بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە، سەرکردەیەک گوێ بە بیروباوەڕی خەڵکەکەی خۆی نەدا، ئیتر کەی سەرکردەیە؟!

جگە لەوەیش، دەترسام ئەگەر هاوەڵە مەزنەکان ژنە جولەکە و فەلە بێنن، ئەوا خەڵکی تریش دەیهێنێنن و بازاڕی کچە موسڵمانان کز دەبێ! ئا ئەمەی کە دەڵێم: "بەرژەوەندیی گشتی لە پێش بەرژەوەندیی تاکە کەسە."

شتێکی تریش هەیە با پێت بڵێم: زیاتر ئەو هاوەڵانە ژنی غەیرە موسڵمانیان دەهێنا کە لە وڵاتە تازە ڕزگارکراوەکاندا بوون و تێکەڵی ئاگرپەرەستەکان بوون. ترسام ئەو کەسانەی کە تازە موسڵمانن و زۆر ئاگاداری شەریعەتی ئیسلام نین، وابزانن هێنانی کچە ئاگرپەرەستیش وەک کچە جولەکە و فەلە دروستە! بەو پێیە کە هەم ئاگرپەرەست و هەم جولەکە و فەلە بە کافر لە قەڵەم دەدرێن!

- قوربان ئەو هۆکارانەی باست کردن هەموویان هۆکاری جوان و لۆژیکین! بە خوا تۆ پیاوی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی، خەمخۆریت بۆ پاراستنی بیروباوەڕی موسڵمانان و هەروەها بۆ بەرژەوەندیی کچانی موسڵمانان، ئەوە زیرەکی و زانیاریی تۆ دەردەخات!

- ئەمە میهرەبانی و ویستی خوای گەورەیە.

- خوای گەورە زۆری پێ بەخشیوی، گەورەم.

- ئەمە بیروباوەڕی باشی خۆتە کوڕم!

- بە خوا تۆ شایانی ئەو باوەڕپێبوونەی.

- دەی زۆرت پەسن کرد، من ئەو جۆرە پەسنانەم پێ خۆش نییە، وازی لێ بێنە. پێم بڵێ دیسان پرسیارت هەیە لە بارەی ئەو قسە و قسەلۆکانەوە کە بە منیان وتووە؟

- بەڵێ قوربان دانە و دووان نین، زۆرن!

- دەی بیڵێ بزانم چییە؟

- باشە قوربان.

دەڵێن: "خوای گەورە لە قورئاندا سەرانەی لەسەر جولەکە و گاور فەرز کردووە، ئەوەتا دەفەرمووێ: ﴿حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ التوبة: ٢٩ واتە: 'هەتا ئەو کاتەی (گاور و جوو) بەناچاری باج پێشکەش بەدەوڵەتی ئیسلام دەکەن. (لەجیاتی ئەوەی گیان و ماڵ و سامانیان پارێزراوە و بەشداری جەنگ ناکەن.)' جا هۆزی تەغەللوب لە سەردەمی خەلافەتی تۆدا زۆربەیان گاور بوون، ئەوان پێیان وتووی کە بە ناوی سەرانەوە پارە نادەن! بەڵکو ئامادەن دووبەرابەر پارە بدەن، بەڵام بە ناوی خێر و خێرات! پێیان ناخۆش بووە عەرەب بن و سەرانەش بدەن! تۆیش پەسەندت کردووە." دەی چۆن داواکارییەک پەسەند دەکەیت کە پێچەوانەی بڕیاری خوا بێ، خوا دەفەرمووێ: "سەرانە بدەن،" تۆ ناوت ناوە خێر و خێرات!

- کورە هەرکەسێ بە قەد سەرە دەرزییەک من بناسێ، ئەو قسانە ناکا. ئەوە هیچ، هەر هیچ شارەزاییەکی لە ئایینی ئیسلامدا نییە، شارەزای یاسا گشتی و مەبەستە سەرەکییەکانی ئیسلام نییە، شارەزای شەرع و بەڵگە و گفتوگۆیش نییە!

- چۆن گەورەم؟! دەکرێ ڕوونتر بیڵێی؟

- ڕاستە هۆزی تەغەللوب داوایەکی وایان پێشکەش کرد، منیش وتم: "کەیفی خۆتانە، ئێمە سەرانەمان دەوێ، ئیتر ئێوە خۆتان هەر ناوێکی دەنێن، کەیفی خۆتانە." من وتم: "دەبێ هەر بیدەن." ئەگەر من حیسابی خێر و خێراتم بۆ ئەو باج و سەرانەیە بکردایە، چۆن خەڵکم دەنارد بە ناچاری لێیان بسێنن؟! خۆ خۆت دەزانی خێر و خێرات هەموو کەس بە ئارەزووی خۆی دەیدا، کەس ناتوانێ بە زۆر لە کەسی بسەنێت! خەلیفە نوێنەر نانێرێ کۆی بکاتەوە، خەلیفە نوێنەر بۆ گلێرکردنەوەی زەکات و سەرانە دەنێرێ. خێر هەرکەسەو بە ئارەزووی خۆی دەیدا، بەڵام موسڵمانان دەبێ زەکات بدەن و گاور و جوویش سەرانە! من دەمگوت: "ئەو گێلانە ڕازین سەرانەکە بدەن، بەڵام پێیان ناخۆشە بڵێن: سەرانەیە." خۆیان دەیانگوت: "خێرە!" با خۆیان لەناو خۆیاندا چی دەڵێن بیڵێن، چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێ؟

دوای ئەوەی تەغەللوب ئەو داوایەیان پێشکەش کرد، من ڕاوێژم بە هاوەڵانیش کرد، هەروا لە خۆمەوە بڕیارم نەدا! نوعمانی کوڕی زەرعە وتی: "دەی بە ناوی خێرەوە سەرانە و باجیان لێ وەرگرە!"

منیش وتم: "ئێوە کەیفی خۆتانە ناوی چی لێ دەنێن، بەڵام لای ئێمە هەر باج و سەرانەیە." تاکە هاوەڵێکیش لەم کارەی من ناڕازی نەبوو، بەوەیش کۆدەنگی لەنێوان هاوەڵاندا ڕووی دا، ئوممەتی پێغەمبەریش ﷺ هەموویان لەسەر کارێکی ناشەرعی یەکدەنگ نابن! هەرگیز هاوەڵان هەموویان بە یەکەوە لەسەر ڕەوایەتیدان بە کارێکی حەرام کۆ نابنەوە! هەرکەسیش ئەمە بزانێ، ئیتر لۆمەی عومەر ناکا و قسە و قسەلۆکیش بۆ عومەر و هاوەڵانی تر هەڵناواسێ!

لەوەش زیاتر، با پێت بڵێم: زەرورەتی شەرعی ئەم ڕایە تەئکید دەکاتەوە.

- مەبەستت چییە قوربان؟

- تەغەللوب هۆزێکی گەورە و زۆر بوون، لەگەڵ ڕۆمدا هاوسنوور و هاوئایین بوون، لە ڕووی هێزیشەوە بەهێز بوون. لەوانەبوو لە ڕووی سەربازییەوە ببنە مەترسی بۆ سەر موسڵمانان، منیش وام بە باش زانی دوژمن بۆ خۆمان نەسازێنین. دەوڵەتی ئیسلامیش ئەو سەرانەو باجەیان لێ وەربگرێ و لە ئەندازەی خۆی کەم و زیاد نەبێ، ئیتر ئەوان بۆ خۆیان چ ناوێکی لێ دەنێنێن، با هەر بینێنێن! ئێمە سەرانە و باجمان بە تەواوی لێ دەسەندن، باجمان لە منداڵ و ژن و نەخۆش نەدەسەند، چونکە باج و سەرانە لەو جۆرە کەسانە ناسەنرێ!

لە قورئان وسوننەتیشدا بەڵگەی زۆر هەن کە جاری وا هەیە لەبەر بارودۆخێکی تایبەت، شتی حەرام حەڵاڵ دەبێ. پێشەوا و سەرکردەیش بۆی هەیە لەبەر بارودۆخی تایبەتی هەندێ جار جۆرە کارێک بکا کە پێشتر حەڵاڵ نەبووە، کەسیش ناتوانێ بڵێت: سەرکردەی موسڵمانان کارێکی ناڕەوا و حەرامی حەڵاڵ کردووە! بەڵکو سەرکردە هەر بە شوێنکەوتەی قورئان و فەرمووده دەژمێردرێ و زەرورەت

وای کردووە لەو دەقە پیرۆزانە لابدا - ئەوەیش بۆ ماوەیەکی کاتی! وەک لە ئوصولی فیقهیشدا قاعیدە و یاسایەک هەیە دەفەرمووێ: شتی حەرام لەبەر زەرورەت حەلال دەبێ، جا ئەم دەستەواژەی "زەرەورەت"ـە هەموو شتێک دەگرێتەوە و ئەوەیش کاتییە وەک وتم.

ئەو کارانەیش کە من کردوومن و بە ئاگاداری هەموو هاوەڵان بوون، ئەوە دەچنە ئەو خانەوە کە باسمان کرد. جا لابردنی ناوی سەرانە و وەرگرتنی سەرانەکە لەژێر ناوی خێر و خێراتدا زەرەورەتێکە و کاتیە، بە شەرعیش دروستە. پێغەمبەریش ﷺ کاری وەهای کردووە، لە غەزای خەندەقدا بڕیاریدا سێیەکی بەروبوومی مەدینە بدا بەو فەرماندانەی کە مەیدانی جەنگ چۆڵ دەکەن و بەرابەر موسڵمانان ناجەنگن. یان سوپای کافران لەق و دوو شەق بکەن، چونکە عەرەب هەموویان ڕوویان کردبووە مەدینە و گەمارۆی موسڵمانانیان دابوو، پێغەمبەر ﷺ بەو کارە ویستی سام و هەیبەتی کافرەکان بشکێنێ!

خۆ ئەگەر ڕاستیت بوێ، شتبەخشین بە موشریک و کافر دروست نییە، چونکە زەلیلی و زەبوونیی ئیسلام دەردەخا، پێغەمبەریش ﷺ لە هەموو کەس باشتر ئەوەی دەزانی، بەڵام ئەوە زەرورەت بوو، دەبووا وای بکردایە: ئەوە تاکتیکی جەنگە! ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سەرکردەی موسڵمانان بۆی ڕەوایە کە لە کاتی زەرورەتدا بەرابەر کافر نەرمی بنوێنێ، ئیتر ئایا بە پێدانی سەروەت و سامان و شتێکی تر بێ وەک ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ کردی، یان بە گۆڕینی ناوی شتێک وەک ئەوەی من کردم!

- بە خوا قوربان، ئەوە ڕێک تێگەشتن و سیاسەت و زانیاریی ڕاستەقینەیە کە تۆ کردووتە، ئەوە مایەی شانازییە بۆ تۆ نەک لەسەرت بکەوێ. سیاسەت بریتیە لە کارکردن بە گوێی فرمانەکانی شەریعەت. لە کاتی فەرحانی و خۆشیدا هەموو بابەتەکان دەبێ وەک خۆیان بن، بەڵام لە کاتی تەنگانە و ناڕەحەتیشدا شەرع

کارئاسانی دەکا بۆ بەندەکان، خوای گەورەیش داوای شتێک ناکا کە لە هێز و تاقەتی بەندەکانیدا نەبێت.

- ڕاست دەکەی کوڕم! وایە.

- قوربان ئەو قسانەی من کردنم، هەر قسەکانی جەنابت بوون، بەڵام کەمێک دەستەواژەکانم گۆڕی، مەبەستیشم پشتگیری بوو لە ڕاوبۆچوونە جوانەکانی جەنابت!

- دەی خوا سەربەرزت بکا.

- خوای گەورە تۆیش سەربەرز بکا، ئەی زانای کارزان!

- دەی ئێستە پیم بڵێ: ئەم باسە کۆتایی هات؟

- بەڵێ قوربان!

- دەی بزانم هیچ گومان و شتی تر هەیە وەڵامت بدەمەوە؟

- بەڵێ قوربان! قسە و قسەلۆکی تریشیان کردووە.

- بیڵێ، با بزانم چییە تا وەڵامت بدەمەوە.

- باشە قوربان فرمانتە.

دەڵێن: "لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوو بەکردا سێبەسێ تەڵاقخواردن هەر یەک تەڵاقی پێ کەوتووە. دوای ئەوەی تۆ هاتیتە سەر کورسی دەسەڵات، بڕیارەکەت گۆڕی و فەتوای ئەوەتدا کە هەرکەس سێ تەڵاقەتەی بە جارێ خوارد و تەڵاقەکەی کەوت، ئەوا هەرسێ تەڵاقەکەی دەکەوێ و ئیتر ناتوانێ ژنەکەی بباتەوە!" چۆن تۆ بڕیارێکی ئاوەهات دەرکردووە؟ چۆن شەرعی سەردەمی پێغەمبەر ﷺت گۆڕیوە؟ بۆ کارئاسانیت کردووە بە بارگرانی؟ وەڵامت چییە، گەورەم؟

ــ ئەو کارەی من پێچەوانەی سوننەت و شەرع نەبوو، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا کەس سێبەسێ تەڵاقی نەدەخوارد، بەڵکو وشەی (البتة)یان بەکار دەهێنا، ئەو وشەیە بە گوێرەی نیەتی تەڵاقخۆرەکە هەم یەک تەڵاق دەگرێتەوە و

هەم سێ تەڵاقیش، یان سێ جار دەیانگوت: "تەڵاقم کەوتبێ." مەبەستیان ئەوەنەبوو سێ جار بێ، بەڵکو وەک تەئکیدکردنەوە بەکاریان دەهێنا، یانی سێ جار دەیانگوت تەڵاقێکم داوە، ئەوانیش لەو سەردەمەدا لەخواترس بوون، خۆیان قسەی ڕاستیان دەکرد، ئەگەر مەبەستیان سێ بووایە، لای قازی و دادوەردا دەیانگوت مەبەستمان سێ بووە، ئەگەریش مەبەستیان یەک یان دوو بووایە، ڕاستیەکەیان دەوت. بەڵام دوای ئەوەی هاوەڵان بەرەبەرە کەم دەبوونەوە و خەڵکی تازە موسڵمان پەیدا دەبوو و، خەڵک زیاتر فێری تەڵاقخواردن بووبوو، تەڵاقخواردنیان لا سووک و ئاسان بووبوو، منیش بڕیارمدا هەرکەس سێبەسێ تەڵاق بخوا، هەرسێکەی لەسەر حساب بکرێ و بکەوێ، ئەوەیش وەک تەعزیرێک بۆ ئەو کەسانەی کە بایەخ بۆ تەڵاقخواردن دانانێن و بە سووک چاوی لێ دەکەن!

- تەعزیر چییە قوربان؟

- تەعزیر بریتیە لە تەمێکردنی کەسێک لەلایەن دەسەڵاتدارەوە لەسەر کارێکی خراپ کە کەسێک کردوویەتی و لە شەرعدا حەد و حدودی بۆ دانەنراوە. شەریعەت دەفەرمووێ: "هەر تاوان و گوناهێک کە حەد یان کەفارەتی بۆ دانەنرا، ئەوە تەعزیر دەیگرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر کوڕێک کچێکی بە حەرامی ماچ کرد، ئەوە شەرع حەدی بۆ دانەناوە کە داری لێ بدرێ، دیسان کەفارەتیشی بۆ دانەناوە، کارەکە حەواڵەی دادوەر دەکرێ کە چۆن تەمێی ئەو کوڕە بکا کە کچێکی بەناڕەوایی ماچ کردووە، چی بە بەرژەوەندی بزانێ ئەوە دەکا. جا جاری وا هەیە لێدانە، جاری وا هەیە تەمێکردنە، جاری وا هەیە تەریق کردنەوەیە، یان زیندانیکردنە....

- یانی تۆ شتێکت نەشەرعاندووە، بەڵکو بەرژەوەندیی خەڵکت ڕەچاو کردووە و ئەوەت کردووە کە سەرکردە یان دادوەر بۆی هەیە لە پێناو بەرژەوەندیی خەڵکدا بیکا!

- بەڵێ ڕێک وایە کە تۆ دەیڵێی! من هەر ئەوەم کردووە، ئەگەر ئیمام و سەرکردە ئاگای لە حاڵی خەڵک نەبێ، نەزانێ لە چی خۆیان دەپارێزن، خەریکی چ حەرامێک دەبن، چ شتێکیان کردووە بە دین، چ عادەتێکیان کردووە بە عیبادەت، چ عیبادەتێکیان کردووە بە عادەت، ئیتر سەرکردایەتی و ئیمامەتەکەی لە کوێدایە؟ ئیتر شەریعەت چۆن بۆ هەموو کات و سەردەمێک دەشێ؟ ئیتر چۆن دەتوانێ گۆڕانکارییەکان بە کێشانەی شەرع بپێوێ و بڕیاریان لەبارەوە بدات؟

- بەڵێ ئەگەر سەرکردە وانەبێ، خەڵک بە لایەکدا و سەرکردەیش بەلایەکی تردا دەڕۆن، گوریس لە سەرەتاوە لێی هەڵدەوەشێتەوە، ئەگەر گرێ نەدرێتەوە، دەیداتە بەر و بە تەواوی تێک دەچێ! دەی منیش بۆیە وام کرد، ڕیسەکە نەبێتەوە بە خوری و، گوریسەکە نەبێتەوە بە موو!

- بە خوا کارێکی باشت کردووە، گەورەم!

- دەی ئەم باسە تەواو؟

- بەڵێ قوربان تەواو.

- هیچی تر هەیە لە بارەی ئەو قسە و قسەلۆکانە؟

- بەڵێ گەورەم هێشتا ماوە!

- بیڵێ بزانم چییە؟

- باشە قوربان.

دەڵێن: "عومەر نەیدەهێشت خەڵک فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بنووسێتەوە، ئایا ئەمە سووکایەتی نییە بە فەرموودە؟ ئەمە مایەی مەترسی نەبوو بۆ لەناوچوونی فەرموودە؟ چۆن کەسێکی وەک تۆ فایل و سجیلی تایبەتیت دانابوو ناوی ورد و درشتی ئەو خەڵکەی تیا نووسرابوویەوە، بەڵام فەرموودەنووسین قەدەغە بوو." ئەمە گوێنەدان بە فەرموودە نییە؟ چی لەم بارەوە دەڵێیت؟

- بیرۆکەی نووسینەوەی فەرمووده لە سەردەمی دەسەڵاتی مندا سەری هەڵدا، بە منیان وت، منیش وتم: "با ئیستیخارەیەکی بۆ بکەم." مانگێک ئیستیخارەم دەکرد. دوایی بەیانییەک بە خەڵکم وت: "من ویستم فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ بنووسمەوە، دوایی بیرم لەوە کردەوە کە لەسەردەمانی پێشوو فەرمووده و قسەی نەستەق و شتی لەو بابەتانەیان نووسیبووەوە و بەو هۆیە خەڵک کتێبە ئاسمانییەکانی فەرامۆش کرد، بە خوا من قورئان بە هیچ شتێک ناگۆڕمەوە!"

ئیتر فەرموودەمان نەنووسیەوە، لەبەر ئەوەی نەکا خەڵک وەک قورئان چاوی لێ بکاو قورئان پشت گوێ بخرێ. بۆچوونی زۆر هاوەڵی تریش وەک ئەم بۆچوونەی من وابوو. قورئان تازە دابەزیبوو، خەڵکانێکی زۆر تازە بووبوونە موسڵمان، ئەگەر فەرموودەکان بنووسرانایەتەوە و بە وڵاتاندا بڵاوەیان پێ بکرایە و خەڵک لەبەریان بکردنایە و گرنگییان پێ بدانایە، ئەوا قورئان پشت گوێ دەخرا، زۆر کەسیش قورئان و فەرموودەی پێغەمبەریﷺ لێک جیا نەدەکردەوە. ئەم ڕایەی من بۆ سووکایەتیکردن یان لەناوبردنی فەرمووده نەبوو، خەڵک زۆربەیان چاک و پاک بوون، بیر و هۆشیان بەهێز بوو، دەیانتوانی فەرموودەکانی پیغەمبەریانﷺ لەبیر بێ و وەک خۆی بیانگەیەنن، ئەمەیش وەک وتم، تەنیا ڕای من نەبوو، زۆر هاوەڵی تریش لەگەڵ من هاوڕا بوون!

تەنانەت ئەبوو نەزرە بە ئەبوو سەعیدی وتبوو: "بۆ فەرموودەمان بۆ نانووسی؟ ئێمە فەرموودەمان لە بەر نییە."

ئەبوو سەعید وتبووی: "نابێ فەرموودەتان بۆ بنووسین، با لەگەڵ قورئاندا تێکەڵی نەکەن، ئێوەیش وەک ئێمە فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ لەبەر بکەن!"

- یانی ترسی ئەوەت هەبوو تێکەڵی قورئان ببێ، بۆیە نەتهێشت بنووسرێتەوە؟ نەک وەک ئەوانە دەڵێن: دژی وەستابیتەوە؟!

- کوڕم! من خۆم زۆر جار دەمگوت: "خۆتـان لە ڕادەربـڕین بپـارێزن، نەکەن بە ڕای خۆتان قورئان لێک بدەنەوە، ئەوانەی بە ڕاو بۆچونی خۆیان ئایەت و فەرمووده لێک دەدەنەوە، ئەوە دوژمنی دینن." من خۆم وشیارم دەکردنەوە بۆ ئەوەی فەرمووده لەبەر بکەن!

زۆر جار دەمگوت: "لە پاشەڕۆژدا کەسانێک پەیدا دەبن لە بارەی ئەو ئایەتانەی کە موتەشـابیهن پرسـیارتان لـێ دەکەن، ئـا لەو کـاتەدا دەسـت بە فەرموودەکـانی پێغەمبەر ﷺ ەوە بگـرن، ئەوانەی کە فەرموودەیـان لەبەرەو فەرموودەناسـن زیـاتر لە قورئان شارەزان."

دەی توخوا پێم بڵێ، ئەو قسانە قسەی کەسێکە دوژمنی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێ؟ یان قسەی کەسێکە فەرمـوودەی خۆشـبوێ، بەڵام ترسـی ئەوەی هەبـێ لەگەڵ قورئاندا تێکەڵ ببێ؟

ـ بە خـوا گەورەم، ئەوە مەبەسـتت گەورەیـی فەرمـوودەیە نەک بەکەم زانینـی، پاراسـتنی فەرمـووده و تێکەڵاونەکردنـی لەگەڵ قورئانـدا دیسـان بە گەورە زانینیـی فەرموودەیە، سوننەتیش هاوڕێ و هاوبیری قورئانە!

- ئەم باسە تەواو یان ماوە؟

- نەخێر قوربان تەواو نەبووە، ماوە!

- چیتر هەیە بۆم بڵێ؟

- دەڵێن: "عومەر نەیهێشـتوە خەڵـک فەرمـووده ڕیـوایەت بکـا و وتـوویەتی: 'بە تەنیا قورئان بەسە و پێویسـتمان بە فەرمـووده نییە!' " جەنابـت لەم بـارەوە چـی دەفەرمووی؟

- پاک و بێگەردی بۆ خوا! ئەوە بوختانە و بۆ منی دەکەن! ئەوە درۆهەڵواسینە بە ناوی منەوە و هیچ بەڵگەیەکیشیان نییە! ئەوە هەر قسـە فڕەدانە! مـن هەرگیـز نەمگوتووە: فەرمووده ڕیـوایەت مەکەن. تەنـانەت خەڵکم هانـداوە بـۆ لەبەرکردنـی فەرمووده. هیچ عەیـبەیەک سەرشـانی خەلـیفە نـاگرێتەوە ئەگەر بـیەوێ خەڵـک بە

بەڵگەوە فەرموودەی بۆ ڕیوایەت بکەن بۆ ئەوەی فەتوا و بڕیاری پێ دەربکا، بەڵکو هەر واجبیشە. ئەگەر وانەبێ، ئەوە هەرکەسەی بۆ خۆی فەرموودەیەک هەڵدەواسێ و بە قازانجی خۆی بەکاری دەهێنێ. ئەگەر من داوای بەڵگە و بەرچاوڕوونی بکەم لە کەسێک کە فەرمووده ڕیوایەت دەکا، ئەوە بە مانای گاڵتەکردن بە فەرمووده نییە، بەڵکو بۆ پاکوخاوێنڕاگرتنی فەرموودەیە، بۆ بەهێزکردنی فەرموودەیە، دەبێ قەزاوەت و بڕیاردان بە بەڵگە و فەرموودەی بەهێز بکرێت، وەک ئەو کاتەی کە ئەبوو موسای ئەشعەری فەرموودەیەکی ڕیوایەت کرد، منیش داوای شایەتێکم کرد کە ئەویش ئەو فەرموودەیەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستبێ، ئوبەی کوڕی کەعب هات و شایەتیی بۆ دا کە ئەویش هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە.

منیش وتم: "پاک و بێگەردی بۆ خوا! من فەرموودەکەم لە ئەبوو موسا بیست. بەڵام ویستم زیاتر لێی بکۆڵمەوە." دوایی وتم: "ئەی ئەبوو موسا! من متمانەم بە تۆ هەیە، بەڵام ترسی ئەوەم هەیە کە دوایی خەڵک فێر ببن و، بێ شایەت هەرکەسەی فەرموودەیەک لە قازانجی خۆی دابتاشێ."

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە من دژی فەرمووده وەستابێتمەوە و نەمویستبێ خەڵک فەرمووده ڕیوایەت بکا؟

- نەوەڵڵا قوربان!

- ئەوەیش کە وتوویانە: "عومەر ویستویەتی تەنیا کار بە قورئان بکا و فەرمووده پشت گوێ بخا، ئەوەیش هەر تۆمەتە و درۆیە. پەنا بە خوا من چۆن قسەی وا دەکەم؟ ئەگەر لە قورئاندا وەڵامی پرسیارێکم دەست نەکەوت، ڕوو بکەمە کوێ؟!

من جارێک ویستم بەرەو شام بڕۆم، بیستم کە نەخۆشیی تاعوون لەوێ بڵاو بووەتەوە، پرسم بە خەڵک کرد کە بڕۆین یان بگەڕێینەوە؟

هەندێک وتیان: "با بڕۆین." هەندێکیش وتیان: "با بگەڕێینەوە."

منیش پێم باش بوو بگەڕێینەوە، بەڵام بڕیارم نەدا، تا گەشتم بە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، ئەو فەرموودەیەکی پێغەمبەری ﷺ بۆ ڕیوایەت کردین، وتی: "پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: 'ئەگەر نەخۆشیی تاعوون لە شوێنێک بڵاو بووەوە، مەچن بۆ ئەو شوێنە. ئەگەر لەو شوێنەیش بڵاو بووەوە کە ئێوەی تیایە، لەو شوێنە دەرمەچن.' "

با شتێکی تریشت بۆ بڵێم: من ئەگەر ویستم دادوەرییەک بکەم و بەڵگەی قورئان و فەرموودەم دەست نەکەوت، تەماشا دەکەم بزانم ئەبوو بەکر شتێکی لەو جۆرەی نەکردووە، فەتوایەکی هاوشێوەی ئەو فەتوایەی نییە؛ منیش وەک ئەو بکەم. ئیتر چۆن دەڵێم: پێویستمان بە فەرموودەی پێغەمبەر نییە؟!

- وەڵڵا قوربان پێویستمانە و ئەو قسانەش هەموویان درۆن و بەدەم جەنابتەوە کراون. وایان زانیوە بەو درۆ و دەلەسانە لە شان و شکۆی تۆ کەم دەکەنەوە، بەڵام نەیخۆن تاڵە! تۆ بەو قسانەی ئەوان ناشکێی! تۆ بە ڕێچکەی ئەوانەی پێش خۆتدا ڕۆشتووی و ڕێچکەت بۆ ئەوانەی دوای خۆت شکاندووە!

- دەی کوڕم ئەمە گومانباشیی خۆتە!

- بە خوا قوربان هەروایە!

- دەی با واز لەمە بێنین، شتی تریان بە دەم منەوە هەڵواسیوە وەڵامت بدەمەوە؟

- کورە قوربان ئەرەوەڵڵا.

- دەی بڵێ بزانم چییە؟

- باشە قوربان!

دەڵێن: "عومەر هەتا ئەو ڕۆژەی لە جێگەدا کەوت و مرد، هەر بەرابەر خوا و پێغەمبەر ﷺ وەستایەوە، شەرمی لە خوا و پێغەمبەر ﷺ نەکرد! کاتێک کە بریندار کرا، وەسێتی کرد یەکێک لەو شەش پیاوە بکرێ بە خەلیفە کە خۆی دیاریی کردن. دوایی بە بیانووی ئەوەی کاروباری موسڵمانان بپارێزێ، فرمانی کردووە بەسەر بیلالی حەبەشیدا کە: 'ئەگەر ئەم شەش کەسە ناکۆک بوون و بوون بە دوو

دەستەوە، بزانە کام دەستەیان کەمە، بیانکوژە!' " مەبەستیان ئەوەیە کە تۆ ویستوتە پێی بڵێی: ئەگەر بوون بە دوو بەشەوە و، بەشێکیان دوو کەس بوو، بەشێکیان چوار کەس، ئەوا دوو کەسەکە بکوژە! ئەگەر پێنج بە یەک بوون، یەکەکە بکوژە! گوایە بیلالیش ئەو قسەیەی تۆی پی سەیر بووە و وتوویەتی: "بیانکوژم قوربان!"

تۆیش وتووتە: "بیانکوژە! من نامەوێ دووبەرەکی لەنێوان موسڵماناندا هەبێ."

قوربان لەم بارەوە چی دەڵێی ؟

ـ هەر ئەوەندە دەڵێم: حسبي الله و نعم الوكيل! هەرگیز شتی وا ڕووی نەداوە! ئەوە هەڵواسراوی ناحەزانە، من لەو قسەیە بێئاگام، هەرگیز شتی وا بە خەیاڵمدا نەهاتووە، ئەوانە قسەی هەقی من و، قسەی ناهەقی شەیتان و نەفسی خۆیان تێکەڵ کردووە، ئەوانە دڵ ڕەش و عەقڵ گەنیون!

ـ دەی قوربان حەز دەکەم ڕاستییەکەم بۆ بگێڕیتەوە!

ـ ئەو ڕۆژەی لێم درا و، خەڵک زانییان ئیتر دەمرم، هاتن بۆلام، وتیان: "گەورەمان وەسیّتێک بکە! کەسێک بکە بە خەلیفە با جێگرەوەی تۆ بێت."

منیش وتم: "من کەس هێندەی ئەو کەسانە شایانی خەلیفایەتی نازانم کە پێغەمبەر ﷺ هەتا وەفاتی کرد لەوان ڕازی بوو."

دوایی ناوی عوسمان و عەلی و زوبەیر و تەڵحەو عەبدوڕڕەحمان و سەعدم برد...

دوایی وتم: "با عەبدوڵلای کوڕم وەک شایەت و حەکەم لەنێوانتاندا بێ، بەڵام خۆی بە هیچ شێوەیەک بۆی نییە ببێ بە خەلیفە."

ـ ئەی دوایی چی کرا؟

ـ وتم بە خەڵک: "ئەو شەش کەسەم بۆ بانگ بکەن."

تەنیا عوسمان و عەلی لەماڵدا بوون.

وتم بە عەلی: "ئەی عەلی! لەوانەیە ئەو خەڵکە تۆ هەڵبژێرن، چونکە تۆ خزمی نزیکی پێغەمبەرﷺی، پیاوێکی زانا و لێهاتووی. ئەگەر بووی بە خەلیفە، هەمیشە ترسی خوات لە دڵدا بێ، کەسووکاری خۆت بەسەر خەڵکدا پێش نەخەی."

بە عوسمانیشم وت: "ئەی عوسمان! ئەو خەڵکە دەزانن تۆ زاوای پێغەمبەرﷺ بووی، دەزانن پیاوێکی دونیادیدە و بەڕێزی. ئەگەر تۆیان کرد بە خەلیفە، هەمیشە ترسی خوات لە دڵدا بێ، کەسووکاری خۆت بەسەر خەڵکدا پێش نەخەی."

دوایی وتم: "صوهەیبم بۆ بانگ بکەن."

صوهەیب هات، فرمانم پێ کرد بەرنوێژی بکا بۆ خەڵک.

- دوایی چی ڕووی دا قوربان؟

- فرمانم کرد ئەو شەش کەسەی ناوم بردن لەگەڵ عەبدوڵلادا لە شوێنێکدا کۆ ببنەوە، بەڵام عەبدوڵلا تەنیا چاودێر بێ، خۆیان لەناو خۆیاندا خەلیفەیەک هەڵبژێرن!

دوایی وتم: "ئەگەر بە کۆی دەنگ کەسێکتان بوو بە خەلیفە، هەرکەسێک دژایەتیی کرد، لەناوی ببەن."

- یانی مەبەستت لەوە کەسانێک بووە کە دژایەتیی ئەو شەش کەسە بکا؟ نەک خودی ئەو شەش کەسە و عەبدوڵلای کوڕت؟

- بەڵێ وایە، من وتوومە ئەگەر هەموویان بە کۆی دەنگ خەلیفەیەکیان هەڵبژارد، ئەوا هەرکەسێک یەکڕیزیی موسڵمانانی تێک دەدا، لەناوی ببەن.

- بۆچی ئەوەت وت؟

- چونکە خەلیفەهەڵبژاردن بەشێکی ئایینە، خوا و پێغەمبەری خوا وایان فرمان کردووە. من خۆم ڕۆژێکیان گوێم لێ بوو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "هەرکەس بوو بە گەورە و سەرکردەتان و هەمووتان پێی ڕازی بوون، دوایی یەکێک پەیدا بوو دەیویست یەکڕیزیی موسڵمانان تێک بدا، ئەوە لەناوی ببەن."

- یانی ئەوە فرمانی پێغەمبەری خوایە؟

- بەڵێ بە خوا ئەوە فرمانی خودی پێغەمبەرەﷺ، لاوازی لەوێوە دەست پێ دەکا کە کۆمەڵێک لەناو یەکدا دژایەتیی یەک بکەن، یان دژایەتیی ڕابەرێک بکەن کە بە کۆی دەنگ کراوە بە ڕابەر، هەموویان بەڵێنیان پێدابێ گوێڕایەڵی بن، دژایەتیکردنی ڕابەرێکی ئاوا، دژایەتیکردنی فرمانی خوایە نەک خودی ڕابەر یان خەلیفەکە. کاروباری موسڵمانان بە دووبەرەکی و ناتەبایی ڕێک نابێ، بەوە ڕێک نابێ کە دژایەتیی غەیری بەرنامەی شەیتان بکەن!

- ئەی بۆ شەش کەست بۆ خەلیفایەتی دیاری کرد؟

- من پێشتر ئاماژایەکم پێ دا، ئەو شەش کەسە شەش کەسی پاک و لەخواترس و دەست و دڵ خاوێن بوون، شەش کەس بوون کە هەر لە سەرەتای ئایینی ئیسلامەوە ئیمانیان هێنا بوو، زانا بوون، پێغەمبەرﷺ تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد لە هەر شەشیان ڕازی بوو!

- ئەی بۆ یەکێکیانت دیاری نەکرد؟

- لە دڵی خۆمدا وتم: "ئەگەر کەسێک دیاری بکەم، ئەوە وەک ئەبوو بەکرم کردووە، ئەگەر کەسیش دیاری نەکەم، ئەوە وەک پێغەمبەرﷺم کردووە." هەرچەند پێغەمبەرﷺ بە ناڕاستەخۆ و بە ئاماژە ئەبوو بەکری دیاری کردبوو بەڵام بە زمان نەیفەرموو کێ بێت، منیش پێم ناخۆش بوو خۆم کەسێک دیاری بکەم، بۆیە ئەو شەش کەسە باشترین کەسانی نێو موسڵمانان بوون، دیاریکردنی کەسێکیانم حەواڵەی خۆیان کرد!

- ڕەحمەتی خوات لێ بێ چەندە خۆپارێزی! خۆ ئەگەر ناوی کەسێکیشت بردبا، ئەوا ناوی یەکێکت دەبرد کە خوا و پێغەمبەری خواﷺ لێی ڕازی بن. ئەو شەشە هەر هەموویان شیاو بوون، بەڵام تۆ ئەوەندە خۆپارێزی، پیاو سەرسام دەکەی!

- بە خوا من ویستم کەسێکی زۆر شیاو هەڵبژێرن و، دوایی لە قیامەتدا ئەگەر پاداشت نەکرێم، لانی کەم سزایش نەدرێم!

- بە خوا تۆ کەسانێکی وەهات دیاری کردووە، هەرکەسێکیان ببایە بە خەلیفە، هەر پاداشتت بەر دەکەوت!

- دەی ئەمە گومانباشیی خۆتە!

- نا، بەخوا قوربان تۆ شایانی لەوەیش زیاتری!

- دەی واز لەو قسانە بێنە! پێم بڵێ، بۆت ڕوون بووەوە و هەقت بۆ دەرکەوت یا نا؟

- ئەرێ وەڵڵا، ئەوەنە جوان دەرکەوت هەر مەپرسە!

- هیچی تر هەیە پرسیاری لەبارەوە بکەی؟

- نەخێر قوربان!

- دەی لەبارەی قسە و قسەڵۆکەوە چی! هیچ ماوە؟

- بەڵێ قوربان ماوە!

- چییە؟

- دەڵێن: "ڕۆژێک عومەر لەگەڵ برادەکانیدا دانیشتبوو، کەمێک پێکەنی و پاشان کەمێک گریا!

برادەرەکانی وتیان: 'ئەوە چییە گریان و پێکەنینت تێکەڵ کردووە؟ خێرە؟' تۆیش وتووتە: 'ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا بە خورما بتمان دروست دەکرد، دەمانپەرەست، دوایی دەمانخوارد، بیرم لەوە دەکردەوە پێکەنین گرتمی، دوایی شتێکم بیر کەوتەوە، من کاتی خۆی کچێکم هەبوو، ویستم زیندەبەچاڵی بکەم، لەگەڵ خۆمدا بردم، چاڵێکم بۆ هەڵکەند، ئەویش تەپ و تۆزی سەر ڕیشی منی دەتەکاند، دوایی بە زیندوویی خستمە نێو چاڵەکەوە، دامپۆشیەوە، ئەوەم بیر کەوتەوە؛ گریام.' " قوربان شتی وا ڕووی داوە؟

- یەکەم: لەبارەی بتە خورماینەکە، ئەوە ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا بووین، خوای گەورە پێغەمبەری ﷺی بۆ ناردین بۆ ئەوەی واز لە بتپەرستی بێنین و ڕوو بکەینە خواپەرستی. جا هەندێکمان ئیمانمان هێنا، هەندێکیش ئیمانی نەهێنا. خوای

گەورە ئەو منەتەی خستە سەرم کە ئیمانم هێنا بەم بەرنامە جوانەی ئیسلام. هەرکەسێکی کافریش هات و موسڵمان بوو، هەر وتی: "اشهد ان لا الـه الا اللـه و اشهد ان محمدا رسول اللـه" ئیتر خوای گەورە لە هەرچی گوناهی هەیە خۆش دەبێ و، ئەو کەسە وەک ئەوە وایە ئەو ڕۆژە لە دایک بووبێ.

دووەم: باسی کچ زیندە بە چاڵکردن! بە خوا ئێستە لەتۆی دەبیسم!

ـ یانی تۆ کاری وەهات نەکردووە؟

ـ نا بەخوا! ئەگەر ئەو کارەیشم کردبێ، ئەوە هیی سەردەمی نەزانی بووە، خوا لێی خۆش دەبێ، ئیسلام گوناهی پێش خۆی دەشواتەوە، هیچ موسڵمانێک لەسەر گوناهی پێش موسڵمانبوون سزا نادرێت. بەڵام بە خوا من ئەو کارەم نەکردووە، یەکەم ژنێ من هێنابێتم زەینەبی کچی مەزعوون بوو، لە زەینەب حەفصە و عەبدوڵلا و عەبدوڕڕەحمانی گەورەم بوو. حەفصە پێنج ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ببێ بە پێغەمبەر لە دایک بووە، ڕێک لەو سەردەمەدا کە قورەیشیەکان کەعبەیان نۆژەن دەکردەوە، حەفصە کچی گەورەی منە، تەنانەت ناسناوی من ئەوەیە پێم دەڵێن: باوکی حەفصە! ئەگەر من حەفصەی کچە گەورەی خۆمم زیندەبەچاڵ نەکردبێ، ئیتر چۆن کچی دوای ئەو زیندە بەچاڵ دەکەم؟

با شتێکی تریشت پێ بڵێم: هەرچەند لە سەردەمی نەفامیدا زیندەبەچاڵکردنی کچان لەنێو عەرەبدا باو بوو، بەڵام لەناو بنەماڵەی ئێمەدا کە پێمان دەڵێن بنەماڵەی عەدی، هەرگیز شتی وا ڕوووینەداوە. بەڵگەیەکی تریشم بیر کەوتەوە، فاتمەی خوشکم، ئەو خوشکی من بوو، ژنی سەعید بوو؛ من بە هۆی فاتمە و سەعیدەوە موسڵمان بووم. ئەگەر ئێمە کچمان زیندەبەچاڵ بکردایە، فاتمە بە منداڵی زیندەبەچاڵ دەکرا و گەورە نەدەبوو.

ـ وەڵامێکی پڕبەپێست و دەمکوتکەرە قوربان! بە بەڵگەی مێژوویی شتەکەت ڕوون کردەوە!

- دەی ئیتر تەواو؟

- بەڵێ قوربان ئەمەیش تەواو! پێویست ناکا زیاتری لەسەر بڕۆین!

- بەڵێ وایە، دەی پێم بڵێ قسە و قسەڵۆک هێشتا ماوە؟

- بەڵێ قوربان، دەڵێن: "کاتێ پێغەمبەرﷺ نەخۆشیی مردن زۆری بۆ هێنا، فەرمووی: 'کاغەز و قەڵەمێک بێنن با ئامۆژگارییەکتان بۆ بنووسمەوە کە دوای خۆم گومڕا نەبن.' بەڵام گوایە تۆ وتووتە: 'وازی لێ بێنن وڕێنە دەکا، ئێمە قورئانمان هەیە ئیتر پێویستمان بە هیچ شتێ نییە.' " وەڵامت چییە قوربان؟

- ئای برا ڕۆ لەو درۆ گەورە! دیسان درۆ! دیسان تێکەڵکردنی هەق و ناهەق! چۆن عومەر بێئەدەبی وا بەرابەر پێغەمبەری خواﷺ دەکا؟! عومەر بڵێ: "پێغەمبەر وڕێنە دەکا!" کورە درۆ نەما تا نەپێچنە ئەم درۆیە؟! مەوزوعەکە وانییە، بەڵکو جۆرێکی ترە.

- چۆنە قوربان؟

- پێغەمبەرﷺ نەخۆش کەوت، فەرمووی: "با شتێکتان بۆ بنووسم، دوای من گومڕا نەبن."

منیش تەماشای پێغەمبەرﷺم کرد، ئازار تەواو تینی بۆ هێنابوو. منیش زۆر بەزەییم پیا دەهاتەوە، بۆیە وتم: "کورە واز بێنن ئەزیەتی مەدەن! ئازاری زۆر زۆرە، خۆ ئێمە قورئانمان هەیە، ئیشەڵڵا گومڕا نابین."

ئەوانە هەستاون دۆ و دۆشاویان تێکەڵ کردووە، قسەیەکی ڕاستەقینە دەهێنن و دەیشێوێنن و، دە قسەی درۆی لەگەڵدا تێکەڵ دەکەن و دەیکەن.

- ئەی دوایی چی ڕووی دا؟

- ئامادەبووانی ئەوێ بوون بە دوو دەستەوە، یەکیان دەیوت: "کاغەز بێنن بزانین چی دەفەرمووێ." یەکێکیان دەیوت: "عومەر ڕاست دەکا ئەزیەتی مەدەن."

ئیتر بوو بە ژاوەژاو و دەنگە دەنگ، پێغەمبەرﷺ بەو دەنگە دەنگە بێتاقەت بوو، فەرمووی: "هەستن لای من چۆڵ بکەن."

- قوربان بەزەیی تۆ جێی خۆی، شتێکی باشە، بەڵام کێ ناڵێ پێغەمبەرﷺ وەحی و سروشی بۆ نەهاتبێ؟

ـ داوای قەڵەم و کاغەزکردن پەیوەندیی بە وەحی و سروشی تازەوە نەبوو، چونکە پێغەمبەر بۆ وەحیوەرگرتن پێویستیی بە قەڵەم و کاغەز و نووسینەوە نەبوو، خوا خۆی کارێکی وای کرد کە پێغەمبەرﷺ هیچ ئایەتێکی لە بیر نەچێتەوە و بە ئێمەی ڕابگەیەنێ. خوا خۆی دەفەرمووێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾﴾ القيامة: ١٦ — ١٧ واتە: "زمانت مەجوڵێنە و لە خوێندنەوەی سرووشدا پەلە مەکە. بە ڕاستی (ئێمە بەڵێنمان داوە،) بێگومان بە خۆمان قورئان دەخەینە نێو سنگی تۆ و لە سنگتدا کۆی دەکەینەوە." دیسان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ المائدة: ٦٧ واتە: "ئەی پێغەمبەر! هەرچیی فەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیووە لەلایەن پەروەردگارتەوە (بێ دوودڵی، بێ ماتڵی) ڕای بگەیەنە، خۆ ئەگەر بەو کارە هەڵنەسایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەیت (بەتەواویی) نەگەیاندووە. (دڵنیایش بە کە) خوا دەتپارێزێت لە شەڕ و خراپەی خەڵکی."

جا ئەگەر من نەمهێشتبێ پێغەمبەرﷺ ئایەتێک بە خەڵک بگەیەنێت، ئەوە پەنا بە خوا وا دەگەیەنێت کە نە خوا پێغەمبەری پاراستووە و نە پێغەمبەریشﷺ پەیامەکەی بە تەواوی گەیاندووە.

دیسان داوای قەڵەم و کاغەزکردن پەیوەندیی بە شەرعێکەوە نەبوو کە نەبیسرابێ و دوایی لەبەر ژاوەژاویک وازی لێ بێنن!

- چۆن دەزانی قوربان؟

- بە چەند بەڵگەیەک:

یەکەم: ئەو ڕووداوە ڕۆژی پێنج شەممە بوو، پێغەمبەرﷺ ڕۆژی دوشەممە وەفاتی کرد، یانی چوار ڕۆژ دوای ئەو ڕۆژە. ئەگەر وەحی یان شەرعێکی تازە بایە، ئەوا لە ماوەی ئەو چوار ڕۆژەدا هەر دەنووسرایەوە، بەکەسێکی تری دەفەرموو بینووسێتەوە! مادەم بە کەسی نەفەرموو بینووسێتەوە، کەواتە وەحیی نوێ نەبووە.

دووەم: خوای گەورە وەسفی پێغەمبەر بەوە دەکات کە هەموو پەیامەکانی وەک خۆی گەیاندووە. دیسان خوای گەورە منەتی ئەوەی بەسەر خەڵکدا کردووە کە ئەم دینی ئیسلامە کامڵ بووە و هیچ کەمایەتی و نوقسانیی تیا نییە. جا ئەگەر بڵێین ئەو شتەی کە پێغەمبەرﷺ ویستی بنووسرێتەوە وەحی یان شەرعێکی تازە بوو، ئەوە تۆمەتبارکردنی پێغەمبەرە، یانی پەیامێکی نەگەیاندوە، ئایەتێکی قورئانی شاردووەتەوە. دیسان بەدرۆخستنەوەی فەرموودەی خوایە، خوا دەفەرمووێ: "ئەم دینی ئیسلامە کامڵ بووە و هیچ ناتەواوی تیا نییە." کەچی ئەوانە دەڵێن: "نەخێر ئایەتێک ماوە؟!"

سێیەم: جیاوازیی بیروڕای ئێمە لە مەڕ تێگەشتن لە فرمانی پێغەمبەرﷺ و مانا و مەبەستی فرمانەکەی، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە پەیوەندیی بە وەحییەوە نەبوو. ئەگینا هەموومان دەسبەجێ فرمانەکەمان جێبەجێ دەکرد، ئێمە جارێکیان لەناو نوێژدا بینیمان کە پێغەمبەرﷺ نەعلەکانی لە پێ داکەند، ئیتر ئێمەیش هەموومان بەبێ دواکەوتن دامانکەند، بەبێ ئەوەی خۆی فرمانمان پێ بکا. دەی ئێمە بۆ شتێکی ئاوا ئاسایی هەموومان دەسبەجێ شوێن پێغەمبەرﷺ بکەوین، قابیلە گوێ نەدەینە وەحی؟

- قسەیەکی جوانە قوربان! بەڵام شتێک ماوە بیپرسم، ئایا دروستە لە خزمەت پێغەمبەرﷺدا ئێوە ڕاوبۆچونی جیاوازتان هەبێ؟

- جیاوازیی ڕاوبۆچون لە خزمەت پێغەمبەرﷺدا لە بارەی کارێکەوە کە خۆی فرمانی پێ بکا و خۆی ساغ و سەلامەت بێ، ئەوە هەرگیز قابیلی قەبوڵ نییە، ئەوە قوڕبەسەرییە، بەڵام ئەوکاتە کاتێکی تر بوو، جیاواز بوو، پێغەمبەرﷺ زۆر نەخۆش

بوو و ئازاری زۆر بوو، من دەمویست لەوە زیاتر ئازاری نەدەین، چونکە من دەمزانی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیویست پێمان بڵێ، ئەوە شتێک نەبوو فەرز بێ لەسەرمان، بەڵکو هەر زیادە ئامۆژگاری بوو، بە بەڵگەوە ئەوەم بۆ سەلماندی کە زیادە ئامۆژگاری بوو، بۆیە منیش حەزم نەدەکرد ئازاری بدەین؛ دەمویست پشوو بدات!

لە بارەی ئەو نووسینەوە کە پێغەمبەر ﷺ ویستی بینووسین بیروڕای جیاواز دروستە، چونکە ئێمە دەمانزانی ئەو فرمانەی پێغەمبەر ﷺ فرمانی واجبی نەبوو، بەڵکو وەک وتم تەنیا بۆ زێدە ئامۆژگاری بوو. کەسیش نەیوت فرمانەکەی فرمانێکی واجبە نەک زیادە ئامۆژگاری. خۆ پیاوی وەک ئەبوو بەکر و عوسمان و عەلی لەوێ بوون، ئەگەر من بەرم لە کارێکی واجب بگرتایە، ئەوان چۆن قەبوڵیان دەکرد؟ دیسان وەک وتم پێغەمبەر ﷺ چوار ڕۆژ دواتر وەفاتی کرد، لە ماوەی ئەو چوار ڕۆژەدا جارێکی تر داوای قەڵەم و کاغەزی نەکردەوە، ئەگەر واجب بووایە، ئەوا بە تەئکید جارێکی تر داوای دەکردەوە و تا بۆمان نەنووسیایە وازی نەدەهێنا! پێغەمبەر ﷺ ویستی ئەو ئامۆژگارییانە بنووسین، دوایی وازی لەوە هێنا کە بینووسینەوە، پێغەمبەریش هەمیشە لەنێوان دوو کاردا کارە باشەکەی هەڵبژاردووە، کەواتە بۆی دەرکەوت کە نەنووسینەوە باشترە. لەوەیش زیاتر، چۆن پێغەمبەر ﷺ لەبەر خاتری قسەی من واز لە کاریکی واجب دەهێنێ؟ ئەوە لەبەر قسەی من نەبوو، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ خۆی وای بەباش زانی، ئەگەریش جارێکی تر داوای بکردایە، بێگومان من یەکەم کەس بووم بۆم دەنووسییەوە!

- ئاخر هەندێ کەس دەڵێن: "ویستوویەتی بنووسن کە دوای ئەو عەلیی کوڕی ئەبوو تالیب ببێ بە خەلیفە."

- شتێک نەوتراوە و نەنووسراوە، چۆن زانراوە؟ ئەوانە کاغەزی سپی دەخوێننەوە؟ غەیب دەزانن؟ دڵی پێغەمبەریان توێ توێ کردووە؟ لەوەش زیاتر، با وای دانێین کە ویستوویەتی ناوی خەلیفەی دوای خۆی بنووسن، بۆچی پێغەمبەر ﷺ

ویستویەتی کە عەلی ببێ بە خەلیفە؟ بۆچی نالێن؛ ویستویەتی ئەبوو بەکر یان فلان یان فیسار بکا بە خەلیفە؟

- ئەوانە دەڵێن: "پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی غەدیردا بە ڕاشکاوی عەلیی کردووە بە خەلیفە و جێگرەوەی خۆی." تۆ چی دەڵێی؟

- دەی ئەگەر وایە، ئیتر بۆچی ویستوویەتی بنووسرێتەوە؟

- وەڵڵا نازانم!

ـ منیش نازانم، بەڵام وەک دەزانی ئەوانە فیشەک بە تاریکیەوە دەنێن! ئەو قسەی کە دەڵێن: پێغەمبەرﷺ بە ئاشکرا لە ڕۆژی غەدیردا عەلیی کردووە بە خەلیفە، ئەوە تاوانبارکردنی هەموو هاوەڵانی پێغەمبەرە! یانی ئەو هەمووە هاوەڵە پیاوێکیان تیا نەبوو ڕاستیەکەی بڵێن؟! هەموویان بەیعەتیان دا بە ئەبوو بەکر و ئەو ڕاستییەیان شاردەوە؟! ئەگەر وا بووایە، ئەی ئەنصارییەکان چۆن لە سەکۆی بەنی ساعیدەدا کۆ دەبوونەوە بۆ ئەوەی خەلیفە دیاری بکەن؟! خۆ ئەگەر وابێ، ئەوە تاوانبارکردنی خودی عەلییە. یانی عەلی غیرەتی نەبووە قسەی ڕاست بکا و قسەی پێغەمبەرﷺی شکاندووە و بەیعەتی بە ئەبوو بەکر داوە. دواتریش بەیعەتی بە عومەر داوە. حاشا عەلی ئەوەندە ترسەنۆک بێ!

ئەگەر من یان هەرکەسێکی تر تاوانبار بکرێت بە شکاندی قسەی پێغەمبەرﷺ و بەیعەتنەدان بە عەلی، ئەوا خودی عەلییش وەک ئەو خەڵکە و بگرە زیاتریش تاوانبارە! ئەگەر عومەر هەڵە بێ، عەلییش هەڵەیە، ئەگەر منیش ڕاستم پێکابێ، عەلییش ڕاستی پێکاوە!

- ڕاست دەکەی قوربان وایە!

- دەی ئەم باسە تەواو؟

- بەڵێ تەواو.

- دەی بزانم قسە و قسەلۆکی تر ماوە؟

- قوربان ماوە.

دەڵێن: "عومەر هەمیشە لە جێبەجێکردنی فرمانی پێغەمبەر ﷺ خۆی دزیوەتەوە. لە ڕۆژی حودەیبیەدا پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی نووسی بۆ قورەیش، پێی وتن کە بۆ جەنگ نەهاتووین و، بە تۆی فەرمووبوو بۆیان ببەی، - بەڵام بە قسەی ئەوان - تۆ لە ترسا بۆت نەبردوون و وتووتە با عوسمان بیبا. دیسانەوە لە غەزای ئەحزابدا شتێکی وا ڕوییداوە، پێغەمبەر ﷺ سێ جار فەرموویەتی: 'کێ دەتوانێ فلان کارم بۆ بکا؟' کەس نەیوتووە من! ئەی عومەر لە کوێ بووە؟ بووە هەڵنەساوە بڵێ: من؟ ئەو عومەرەی بە ئاشکرا کۆچی کرد، چی وای لێ کرد بترسێ؟" قوربان وەڵامت چییە بۆ ئەم قسانە؟

- کێشەی ئەوانە ئەوەیە کە ڕووداوێکی ڕاستەقینە باس دەکەن و بە ئارەزووی خۆیان درۆ و دەلەسەی تێکەڵ دەکەن، دەیکەن بە بەڵگەیەکی بۆگەن بۆ خۆیان. لە پێشەوە وا دەزانی قسەکانیان تەواوە و جوانە؛ بەڵام پاشتر وەک تراویلکە دەردەچێ!

- مەبەستت چییە قوربان؟

- ئەوە ڕاستە ڕۆژی حودەیبیە پێغەمبەر ﷺ ویستی نامەیەک بە مندا بۆ قورەیش بنێرێ، منیش پێم وت: "قوربان! دەترسم قورەیش شتێکم لێ بکەن، تۆ دەزانی چ دوژمنایەتییەکی سەخت لەنێوان من وقورەیشدا هەیە. کەسوکاریشم لە مەککە نەماون تا لەسەرم بکەنەوە. ئەگەر هەر دەیشفەرمووی، بەسەرچاو دەڕۆم! بەڵام کەسێکی ترت نیشان دەدەم لە من باشترە، کەسوکاری زۆرە، پێی ناوێرن: عوسمانی کوڕی عەففان."

- ئەی پێغەمبەر ﷺ چیی کرد؟

- ڕاکەی منی پەسەند کرد و بانگی عوسمانی کرد، پێی فەرموو: "بڕۆ بۆلای قورەیش و پێیان بڵێ: 'ئێمە بۆ جەنگ نەهاتووین، بەڵکو هاتووین زیارەتی کەعبە دەکەین و دیارییشمان لەگەڵ خۆمان هێناوە، ڕێزێکی زۆرمان بۆ کەعبە هەیە، وشتر

و وڵاخ و ئاژەڵمان هێناوە، لەوێ سەریان دەبڕین و؛ زیارەتی خۆمان دەکەین و دەگەڕێینەوە."

- دەی خۆ ئەم ڕووداوە نە خۆدزینەوەی تیا بوو نە ترسان و نەهیچ شتێکی خراپ، ئەوە تەنیا ڕاوێژ و ڕاپرسیە. پێغەمبەرﷺ ڕایەکی هەبووە و گوێی لە ڕای خەڵکیش گرتووە، دوایی ئەگەر ویستی ڕاکەی خۆی جێبەجێ دەکا و، ئەگەر بە باشی زانی، ڕای بەرانبەر جێبەجێ دەکا! ڕێک وەک غەزای بەدر! ئەو ڕۆژەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ سوپاکەیدا بە نیازی جەنگ لە شوێنێکدا دابەزین....

حەبابی کوڕی مونزیر وتی: "ئەم شوێنە خوا و پێغەمبەرﷺ دیارییان کردووە یان هەر ڕاوبۆچوونی خۆتە؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "ئەمە ڕای خۆمە، پێم وایە ئەم شوینە باشە(هەقی بە سرووش و پێغەمبەرایەتییەوە نییە.)"

حەبابیش وتی: "دەی من پێم وایە ئێرە جێگەی جەنگکردن نییە، با بیرە ئاوەکانی بەدر بخەینە پشت سوپاکەوە و، ئێمە دەستمان بە ئاو بگا و، ئەوان دەستیان پێی نەگا."

پێغەمبەریشﷺ بە گوێی حەبابی کرد.

ڕاست دەکەی کوڕم! هەر ئەوە ماوە بڵێین: حەباب بە گوێی پیغەمبەریﷺ نەکرد! نەیوێرا لەو جێگایە دانیشێ کە پێغەمبەرﷺ دیاریی کرد! وەک ئەو درۆ و دەلەسانەی بۆ منیان هەڵواسیوە!

- دوور نییە ئەوەیش بڵێن!

- دەی چۆن بۆم گێڕایەتەوە ئاوا بوو. من قسەی پێغەمبەرﷺم نەشکاند. ئەو دەمە دەمی سیاسەت و لێکگەیشتن بوو، من ڕایەکم هەبوو، ڕاکەی خۆم بە بەڵگەوە عەرزی پێغەمبەرﷺ کرد، بۆیە ئەویش پەسەندی کرد. هاکا ڕەخنەیان لە پێغەمبەرﷺیش گرت و وتیان: چۆن پێغەمبەرﷺ بە قسەی تەمەڵێکی ترسەنۆکی

کرد! من دوای ئەوەیش ڕاکەی خۆم دەربڕی، دیسان خۆم فیدایی کرد و وتم: "ئەگەر هەر دەیشفەرمووی من بڕۆم، ئەوا سەرم پێوە نییە و دەڕۆم."

- بە خوا ئەوە ئەوپەڕی دلێری و بوێرییە. تۆ وەک سەربازێکی خاوێن و زیرەک جوڵاویتەوە، ئەوەی تۆ پاکێتی و ڕادەبڕین و گوێڕایەڵییە. پێغەمبەرﷺ ڕاکەی تۆی پەسەند کرد و، تۆیش ئامادە بووی خۆت بکەی بە قوربانی و بڕۆی.

قورەیشیەکان تۆیان بە سێیەم پیاوی ئیسلام دەژمارد، یەکەم: پێغەمبەر، دووەم: ئەبوو بەکر و سێیەم: تۆ. ڕۆژی جەنگی ئوحود ئەبوسوفیان وەستابوو هاواری دەکرد: "موحەممەدتان لەگەڵدایە؟!"

پێغەمبەرﷺ ئاماژەی کرد کە وەڵامی نەدەنەوە.

دوایی هاوری کرد و وتی: "ئەبوو بەکرتان لەگەڵدایە؟ عومەرتان لەگەڵدایە؟"

ئەبوسوفیان پیاوە گەورەکانی ئیسلامی باش دەناسی: پێغەمبەرﷺ، ئەبوو بەکر وەزیری دەستە ڕاستی پێغەمبەر، عومەر وەزیری دەستەچەپی پیغەمبەر! تەنیا پرسیاری ئەو سێ کەسەی کرد، ناوی کەسیتری نەبرد.

دواتر تۆ لە بەر خۆشەویسیی پێغەمبەرﷺ خۆت بۆ نەگیرا و هاوارت کرد: "کورە دوژمنی خوا! ئەرەوەڵلا بە کوێرایی چاوت، ئەوانەی ناوت بردن هەموویان ساغ و سەلامەتن."

- ڕاست دەکەی کوڕم وابوو!

- ئەی ئەو قسەیە چییە کە لە بارەی غەزای ئەحزابەوە دەیلێن؟

- ئەو ڕووداوە بە خوا بۆ ئەوە نابێ تەنها عومەر بە ترسنۆک بزانن و هاوەڵانی تر هیچ! ناڵێم: با هەموویان بە ترسونۆک بزانن! بەڵام دەڵێم: منیش وەک ئەو سێ هەزار کەسە! بۆ بە تەنیا عومەر ترسنۆکە!

- ئەی ئەو قسانە چییە؟

- ئێمە لە کاتی ئەحزابدا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا بووین، سەرمایەکی زۆر سەیر رووی تێ کردین.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەوە کەسێک هەیە بتوانێ دەنگوباسی ئەوانەم بۆ بێنێ و، منیش موژدەی ئەوەی بدەمێ کە لە رۆژی قیامەتدا لەگەڵ مندا بێت؟"

ئێمە هەموومان بێدەنگ بووین، کەس سرتەی لێوە نەهات!

دووبارە فەرمووی: "ئەوە کەسێک هەیە بتوانێ دەنگوباسی ئەوانەم بۆ بێنێ و، منیش موژدەی ئەوەی بدەمێ کە لە رۆژی قیامەتدا لەگەڵ مندا بێت؟"

دیسانەوە هەموومان بێدەنگ بووین و سرتەمان لێوە نەهات!

بۆ سێیەم جار فەرمووی: "ئەوە کەسێک هەیە بتوانێ دەنگوباسی ئەوانەم بۆ بێنێ و، منیش موژدەی ئەوەی بدەمێ کە لە رۆژی قیامەتدا لەگەڵ مندا بێت؟"

دیسانەوە هەموومان بێدەنگ بووین و سرتەمان لێوە نەهات!

پێغەمبەر ﷺ خۆی فەرمووی: "ئا حوزەیفە هەست برۆ و دەنگوباسێکم بۆ بێنەوە!"

حوزەیفە رۆشت و، خوای میهرەبان کارەکەی بۆ ئاسان کرد. خۆ ئەگەر لە جیاتی حوزەیفە، من یا ئەبوو بەکر یا عەلی یا عوسمان یا سەعدی بانگ بکردایە، بێ سێ و دوو دەرۆیشتین، بەڵام چیرۆکەکە ئاوا بوو کە بۆم باس کردی! ئیتر بۆ بە تەنیا ناوی من دەهێنن؟

- کورە وەڵڵا قوربان نابێ بە تەنیا بیخەنە ئەستۆی تۆ، نابێ سەرکۆنەی کەسی تریش بکرێت، ئێوەیش مرۆڤن! سەرماتان دەبێ، تینوتان دەبێ، برسیتان دەبێ، ناکرێ کەسێک لە ماڵدا پاڵی لێبداوەتەوە و بە خراپە باسی ئەو جەنگاوەرانە بکا کە خوا لەبارەیانەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ ﴾ الأحزاب: ١٠ واتە: "دڵەکان گەشتبوونە گەروو". ناکرێ ئەو کەسەی لە ماڵە، بۆ خۆی دەخوا و دەخەوێ، سەرکۆنەی جەنگاوەرێک بکا کە لە سەنگەرەکاندا سەرما هەڵیچۆقێنێ، رەشەبا بیشەکێنێ؛ شەو تا بەیانی لەبەر رەزامەندیی خوا پاسەوانی بکێشێ!

ـ دەی ئەمەیە قسەی پیاو! ئەمە قسەی مرۆڤی دادگەر و وشیارە. بەڵام لەگەڵ ئەو خەڵکە نەفامە ناتێگەشتووەدا چی دەڵێی؟ لەگەڵ ئەوانە چی دەڵێی کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیانەوە فەرموویەتی: "فەرموودەیەکی پێغەمبەرانی پێشوو هەیە بە ئێمە گەشتووە، فەرموویانە: 'ئەگەر شەرم و حەیا ناکەی، چی دەکەی بیکە!' "

ـ دەی قوربان تۆ خۆت منت فێر کرد، منیش وەک تۆ دەڵێم: تەنیا ئەو قسەیەی حەزرەتی ئیبراهیم دەڵێمەوە کە فەرمووی: "حسبی الله و نعم الوکیل."

ـ منیش هەروا دەڵێم.. دەی بڵێ هێشتا درۆ و دەلەسەی ئەوانە کۆتایی نەهاتووە؟

ـ نەوەڵڵا قوربان کۆتایی نەهاتووە، بەڵام من هەر ئەوەندەم بیستووە، دەزانم ئەوانە دڵیان نەخۆشە و بە هەزاران قسە دەتاشن و دروستی دەکەن. لە خوا ناترسن، شەرمی قیامەت لە ناوچەوانیاندا نییە، لەو کاتە ناترسن کە ڕووبەڕووی پێغەمبەر ﷺ دەکرێنەوە؛ نالێن: ئەو دەمەی گەشتین بە عومەر، چۆن وەڵامی بدەینەوە؟

ـ دەی من پێم خۆشە ئەم باسە کۆتایی پی بێنین.

ـ باشە قوربان چی دەفەرمووی با وابێ.

ـ دەی هیچ پرسیارت ماوە؟

ـ قوربان حەز دەکەم دوور لە سیاسەت و دادگەری و ئەوانە، پرسیارێکت لێ بکەم بۆ ئەوەی هەم خۆم و هەم ئەوانەیش کە دەیبیسن، بزانن چەندێ گرنگیت بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ داوە و چەندە ئەو کەسانەت خۆش ویستووە کە پێغەمبەر ﷺ خۆشی ویستوون. باسی پیاوێک کە بە چاوی سەر پێغەمبەر ﷺی نەدی، بەڵام بە چاوی دڵ هەمیشە لە خزمەتیدا بوو - باسی وەیسی قەرەنی، چۆن بینیت؟ داوای چیت لێ کرد؟

ـ باشە بۆت باس دەکەم:

ڕۆژێک پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووین: "پیاوێک لە یەمەنەوە دێت بۆ ئێرە و پێی دەڵێن: 'ئووەیس.' لە یەمەن تەنیا دایکە پیرەیەک زیاتر، هیچ کەس و شتێکی نییە. پەڵەیەکی سپی بە پێستیەوەیە(تووشی نەخۆشیی بەڵەکی بووە،) لە خوا پاڕاوەتەوە و خوا چاکی کردووەتەوە، تەنیا بەقەد دینارێکی پێوە ماوە، هەرکەس پێی گەشت، با داوای دۆعای خێری لێ بکا."

جا بۆ ئەوەی وەیس ببینم، هەموو جارێک پرسیاری وەیسم لە وەفدەکان دەکرد تا جارێک ڕێم لە وەیس کەوت، پێم وت: "تۆ وەیسی؟"

وتی: "بەڵێ."

وتم: "لە هۆزی مورادی؟"

وتی: "بەڵێ."

وتم: "قەرەنیت؟"

وتی: "بەڵێ."

وتم: "پەڵەیەکی سپیت پێوەیە؟"

وتی: "بەڵێ."

وتم: "دایکە پیرەیەکت هەیە؟"

وتی: "بەڵێ."

وتم: "ددی پێغەمبەرﷺ باسی تۆی بۆ کردووم و فەرموویەتی: 'ئەگەر سوێند بخوا کە خوا کارێکی بۆ بکا، خوا سوێندەکەی ناشکێنێ و کارەکەی بۆ دەکا.' دیسان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: 'داوای لێ بکەن لای خوای گەورە داوای لێخۆشبوونتان بۆ بکا.' منیش دەمەوێ لای خوا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکەی."

ئەویش داوای لێخۆشبوونی بۆ کردم، پاشان پێم وت: "بۆ کوێ دەچی؟"

وتی: "بۆ کوفە."

منیش وتم: "با نامەیەک بۆ والیی کوفە بنووسم ئاگای لێت بێ."

وتی: "ناوەڵلا با کەس نەمناسێ، ئاوا باشترە."

ساڵی دوایی وەفدێکی کوفە هاتن بۆ مەدینە. پێم وتن: "کەستان تیایە قەرەنی بێ؟ پیاوێک هات و وتی: "من قەرەنیم." تەمز ئەم پیاوە هەموو جارێ گاڵتە بە وەیس دەکا. منیش فەرموودەکەی پێغەمبەرمﷺ بۆ گێڕانەوە. دوای ئەوەی ڕۆشتنەوە بەرۆکی وەیسیان گرتبوو دۆعای خێریان بۆ بکا، پاشان وەیس خۆی لە خەڵکەکە شاردەوە.

- بە خوا سەیرە قوربان! بۆچی خۆی شاردەوە و خۆی ئاشکرا نەدەکرد؟

- کوڕم! ئەوانەی کە بە تەواوی خۆیان بۆ خوا ساغ کردووەتەوە، پێیان خۆش نییە دەرکەون.

- ڕاست دەفەرمووی قوربان!

- دەی کوڕم هیچ پرسیاری ترت هەیە بیکەی یا بڕۆم. قسەکانمان درێژەی کێشا!

- داوای لێبوردن دەکەم قوربان سەبارەت بەو هەموو پرسیار و قسانەی کە کردنم. هەموویان لە خۆشەویستییەوە سەرچاوەیان گرتووە. بە خوا تۆ وەک ئاوێکی فێنک و ڕووناک و پاکی لە سارایەکی گەرم و چۆڵدا. جا مرۆڤ هەرچەندە لای ئاوێکی ئاوادا بمێنێتەوە، ناهەقی نییە!

- دەی قەیناکا کوڕم! بەڵام تۆ وەڵامت نەدامەوە، پرسیارت ماوە یا نە؟

- بەڵێ قوربان ماومە، یەک شتم ماوە و دواتر بۆ جیابوونەوەت تێر دەگریم.

- چییە بیپرسە؟

- پێم خۆشە باسی کۆتایی ژیانی خۆت بکەی.

- چ لایەنێکت مەبەستە؟

- باسی یەکەم مزگێنیم بۆ بکە کە پێغەمبەرﷺ پێی داوی سەبارەت بەوەی کە شەهید دەبی.

- ئەو مزگێنییە کۆنە. دوای ئەوەی ئایینی ئیسلام بەهێز بوو، خەڵک پۆل پۆل دەهاتن موسڵمان دەبوون، من و ئەبوو بەکر و عوسمان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دا ڕۆشتینە سەر کێوی ئوحود، کێوی ئوحود لەرییەوە!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەی ئوحود! جێگیر ببە، مەجوڵێ! پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیەک و دوو شەهیدت لەسەرە!"

دیارە پێغەمبەرەکە کێیە، دەک خۆم و دایک وباوکم بە قوربانی بین، دیسان ڕاستگۆکەیش دیارە ئەبوو بەکرە - ئەوە هیچ گومانی تیا نییە، ئەو پیاوێک بوو پلەیەک لە خوار پێغەمبەرانەوە و پلەیەک لە سەرووی هەموو مرۆڤەکانی ترەوە بوو.

- دەمێنێتەوە دوو شەهیدەکە: من و عوسمان بووین! ئیتر ئێمە زانیمان بە شەهیدی دەڕۆین، چونکە پێغەمبەر ﷺ لەخۆوە قسە ناکات، قسەکانی هەموو وەحی خودایییە، ئەمە یەکەم مزگێنی بوو بۆ من!

- ئەی باسی ئەو دەرگایەی کە دەشکێ، ئەوە چییە؟

- حوزەیفەی کوڕی یەمان نهێنیپارێزی پێغەمبەری خوا بوو. پێغەمبەر ﷺ چەند شتێکی نهێنی لای ئەو نەبێ، لای کەس باس نەکردبوو.

من ڕۆژێک وتم: "کامتان فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەزانن لە بارەی ئەو ئاژاوە و پشێوییەی کە ڕوو دەدات؟"

حوزەیفە وتی: "من."

وتم: "دەی باسی بکە، تۆ پیاوێکی دلێری و بوێری."

وتی: "پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: 'لە ئاخر زەماندا ماڵ و منداڵ و دراوسێ دەبنە ئاژاوە و گێچەڵ بۆ مرۆڤ! نوێژکردن و سەدەقە و ئەمر بەچاکە و نەهی لە خراپە دەبنە کوژاندنەوەی ئەو گێچەڵ و ئاژاوانە!' "

وتم: "مەبەستم ئەوە نییە. ئەو ئاژاوەیەی کە وەک دەریا شەپۆل دەدا. ئەوەم مەبەستە!"

وتی: "تۆ زەرەری تیا ناکەی، لەنێوان تۆ و ئەو ئاژاوەیەدا دەرگایەکی داخراو هەیە."

وتم: "ئەو دەرگایە دەکرێتەوە یان دەشکێنرێ؟"

وتی: "دەشکێنرێ."

وتم: "واتە بۆ جارێکی تر داناخرێتەوە!"

- ئەی قوربان دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

- خەڵک ویستیان لە حوزەیفە بپرسن، بزانن دەرگاکە کێیە یان چییە؟ بەڵام زاتیان نەکرد بپرسن، بۆیە مەسروقیان ڕاسپارد لێی بپرسێ.

مەسوورق وتی: "حوزەیفە! ئەو دەرگایە کێیە؟"

وتی: "عومەرە."

پێیان وت: "عومەر خۆی دەیزانی ئەو دەرگا ئەوە و، دواییش دەشکێنرێ؟"

وتی: "بەڵێ، دەیزانی!"

- ئەی تۆ مەبەستت چی بوو لە : "دەکرێتەوە یان دەشکێنرێ"؟

- من دەمزانی کە خۆم ئەو دەرگایەم کە بوومەتە لەمپەر لەنێوان خەڵک و ئاژاوە و گێچەڵدا، بەڵام نەمدەزانی ئایا بە مردنی ئاسایی دەمرم یان دەمکوژن و بە شەهیدی دەگەڕێمەوە خزمەت پەروەردگار! دوای ئەوەی حوزەیفە وتی: "دەشکێنرێ." ئیتر زانیم کە من دەکوژرێم!

- ئەی قوربان پێشتر پێغەمبەر ﷺ مژدەی شەهیدبوونی نەدایتێ؟ مەبەستم ئەو ڕۆژەیە کە کێوی ئوحود لەرزی!

- وتم: لەوانەیە هەر شەهیدبوون بێ و کوژران نەبێ!

- ئەی بۆ قوربان دەکرێ مرۆڤ نەکوژرێ و شەهیدیش بێ؟

- بەڵێ، دەبێ.

- چۆن شتی وا دەبێ؟

- ڕۆژێک پێغەمبەرﷺ بە ئێمەی فەرموو: "ئێوە کێ بە شەهید دەزانن؟"
وتمان: "قوربان هەرکەسێ لە پێناوی پەروەردگاردا بکوژرێت، شەهیدە!"
فەرمووی: "دەی کەوابێ شەهیدانی ئوممەتی من کەمن!"
وتمان: "ئەی کێ شەهیدە قوربان؟!"
فەرمووی: "ئەو کەسەی لێی بدرێ و بمرێ، شەهیدە؛ ئەو کەسەی بە زگئێشە بمرێ، شەهیدە؛ ئەو کەسەی لە ئاودا بخنکێ، شەهیدە؛ ئەو کەسەی بە سووتان بمرێ، شەهیدە؛ ئەو کەسەی دیوار یا شتێکی تر بەسەریدا بڕوخێ، بمرێ؛ شەهیدە."
- یانی شەش جۆر شەهید هەیە، پێنجیان ئەوانەن کە پێغەمبەرﷺ باسی کردن و، ئەو کەسەیش کە لە غەزادا شەهید دەبێ، ئەمە شەش!
- نە! خوای گەورە بەرابەر موسڵمانان زۆر بەسۆزە. شەهید لەوە زیاترە. پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەی تردا باسی کردوون!
- کێی ترە قوربان؟
- هەرکەس بە نەخۆشیی تاعون بمرێ، شەهیدە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "تاعون پلەی شەهیدییە بۆ هەموو موسڵمانێک."
هەرکەس لە پێناوماڵەکەیدا بمرێ، شەهیدە؛ هەرکەس لە پێناو شەرەف و ناموسیدا بمرێ، شەهیدە. پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا! ئەگەر پیاوێک هات و ویستی ماڵەکەم داگیر بکا، چی بکەم؟"
فەرمووی: "ماڵەکەتی مەدەرێ."
وتی: "ئەی ئەگەر لەگەڵمدا کردی بە شەڕ؟"
فەرمووی: "شەڕی لەگەڵدا بکە!"
وتی: "ئەی ئەگەر منی کوشت؟"
فەرمووی: "ئەوە تۆ شەهیدی!"

وتی: "ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت!"

فەرمووی: "ئەو دەچێتە ناو ئاگرەوە!"

- ئەی قوربان کێی تر شەهیدە؟

- ئەو ژنەی بەسەر منداڵەوە دەڕوا، ئەوەیش شەهیدە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "ئەو ژنەی بە هۆی منداڵبوونەوە دەمرێت، منداڵەکەی ڕای دەکێشێ بۆ ناو بەهەشت!"

هەرکەس بە نەخۆشی سیل بمرێ، ئەوەیش شەهیدە. پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: "هەرکەس بە نەخۆشیی سیل بمرێ، پلەی شەهیدیی هەیە!"

بە خۆم و دایک و بابمەوە بە قوربانی پێغەمبەر بین، دیسان فەرمووی: "هەرکەس لەسەر وڵاخ بکەوێتە خوارەوە و بمرێ، شەهیدە؛ ئەو ژنەی دووگیانە و بە هۆی دووگیانییەوە بمرێ، ئەوەیش شەهیدە."

- قوربان ئەوانە هەموویان یەک پلەیان هەیە؟

- نەخێر! شەهید هەیە هەم شەهیدی دونیایە هەم شەهیدی قیامەتە، ئەوە ئەو موسڵمانانەن کە لە جەنگی نێوان کافر و ئیسلامدا شەهید دەبن، یان کافر لە وڵاتی خۆیان ئەو موسڵمانانە دەکوژن هەر لەبەر ئەوەی کە موسڵمانن. شەهیدی وایش هەیە کە لە دونیادا پێی ناوترێ شەهید، بەڵکو شەهیدی قیامەتە، ئەوەیش ئەو چینانەن کە باسم کردن، ئەوانە لەم دونیایەدا وەک کەسی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، لە زەویدا دەڕزێن، وەک خەڵکی تر دەشۆردرێن، کفن دەکرێن... بەڵام لە قیامەتدا لە ڕیزی شەهیدانن.

- باشە قوربان تێگەشتم، شەهادەت پیرۆز بێ لەو دەرگایەی کە دەشکێنرێ، ئەوە شەهیدی پلە یەکە!

- ئەوە سۆز و بەزەیی خوایە!

- قوربان هیچت بەسەردا هاتووە کە هەست بکەی مردن لێتەوە نزیکە؟

- لە تەمەنی شەستوسێ ساڵیدا حەجم کرد، خۆم سەرقافڵە بووم، خێزانەکانی پێغەمبەرﷺیش لەو کاروانەدا بوون. دوای ئەوەی حەجمان تەواو کرد، هەستم کرد ئەم کارە لەسەرم گرانە.

- کامە قوربان؟

- خەلافەت، سیاسەت و کاروباری خەڵک. هەردوو دەستم بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و وتم: "خوایە! پیر بووم، هێزم کەم بووەتەوە، خەڵکیش زۆر بووە، خوایە بمبەرەوە دیوانی خۆت، مەمفەوتێنە."

- قوربان دۆعای مردنت لە خۆت کردووە؟

- کوڕم! دوای ژیان، تەنیا مردن هەیە. مردن جامێ ئاوە، دەبێ هەموو کەس بینۆشێ. پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد! پێغەمبەرانی پێشوو وەفاتیان کرد! بە تەمای عومەر نەمرێ! باشترین شت بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە بە ئاخرخێری بمرێ. زێدەڕەوی لە کاروباریدا نەکردبێ. منیش پێم خۆش بوو بەو جۆرە بچمەوە بارەگای خوا.

- ئەی باسی ئەو خەوەم بۆ بکە کە ماوەیەک پێش ئەوەی شەهید ببی، بینیت!

- ئەوە ڕۆژی هەینی بوو، ئاخر هەینیی من بوو لەسەر دونیا. چوومە سەر مینبەر و سپاس و ستایشی خوام کرد، دوایی صەڵاواتم لەسەر پێغەمبەرﷺ دا، دۆعای خێرم بۆ ئەبوو بەکر کرد، دوایی بە خەڵکم وت:

"لە خەودا بینیم کەڵەشێرێک دوو دەنووکی لە سەرم دا."

ئەسمای کچی عومەیس وتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان! ئەوە مانای وایە کە پیاوێکی عەجەم دەتکوژێ!"

- ددی وابوو؟

- ئەو کارە دەبوو ببێ. قەزاو قەدەرە، دەبێ بێتە جێ!

- چی لەنێوان تۆ و ئەو پیاوە عەجەمەدا گوزەرا قوربان؟

- ئێستە پێت دەڵێم!

ـ ئەمە یەکەم جارە قسەی تۆ نارەحەتم بکا، بە خوا هەر لەسەرتاوە لەوە دەترسام! ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە پێم خۆشە باسی خۆت لە خۆتەوە ببیسم، ئەوا گوێم نەدەگرت! با باسی ئەو ناخۆشییەت بۆ من نەکردایە و باسەکەم دەپێچایەوە، بەڵام وەک خۆت فەرمووت: "ئەوە قەزاو قەدەرە،" دەی فەرموو قوربان باسی بکە!

ـ سپاس بۆ خوا کە بە دەستی پیاوێکی غەیرە دین کوژرام!

ـ بۆچی قوربان؟

ـ پەلە مەکە، ئێستە خۆت دەیزانی!

ـ باشە قوربان پەلە ناکەم.

ـ من هەرگیز ڕێگەم نەدەدا هیچ دیلێکی باڵغ کە کرابوو بە کۆیلە، بێتە ناو شاری مەدینەوە. ڕۆژێک موغەیرەی کوڕی شوعبە کە والیی کوفە بوو، نامەیەکی بۆ من نارد، باسی کوڕێکی کردبوو کە پیشەساز بوو، داوای لێ کردبووم بیهێنێتە ناو مەدینەوە.

وتی: "پیشەی زۆر دەزانێ، خەڵک دەتوانن سوودی زۆری لێ ببینن، ئاسنگەرە، وێنەکێشە، دارتاشە..."

منیش ئیزنمدا بینێرێ بۆ مەدینە.

ـ دوای ئەوە چی قەوما قوربان؟

ـ دوای ئەوەی هاتە ناو شاری مەدینەوە،موغەیرەی پێی وت: "دەبێ هەموو مانگێ سەد دینار بدەی بە من، ئەگەر لە سەد دینار زیاترت پەیدا کرد، بۆ خۆت بێ."

هات بۆلای من و سکاڵای لە موغەیرە بوو، دەیگوت: "سەد دینار زۆرە!"

منیش وتم: "چ کارێک بە باشی دەزانی؟"

باسی زۆری کرد. منیش بۆم دەرکەوت کە لە سەد دینار زیاتر پەیدا دەکات و، موغەیرە ستەمی لێ ناکا.

بۆیە پێم وت: "دەی خۆ موغەیرە داوای پارەی زۆرت لێ ناکا!"

بە دەم پرتەوبۆڵەوە منی جێ هێشت.

- دواتر چی قەوما قوربان؟

- چەند ڕۆژێک تێپەڕی، ڕۆژێک دای بەلای من و چەند هاوڕێیەکمدا کە پێکەوە بووین، بانگم کرد.

وتم: "ئەوە تۆ ئەو ڕۆژە وتت: 'دەتوانم ئاشێک دروست بکەم بۆ ئارد کە بە با ئیش بکا'؟"

بە ڕوویەکی گرژەوە ڕووی تێ کردم.

وتی: "ئاشێکت بۆ دەنێمەوە خەڵک باسی بکا."

دوایی لێیدا و ڕۆشت.

وتم: "هاوڕێیان، ئەو کوڕە هەڕەشەی لێ کردم!"

- دوایی چی قەوما؟

- دوای دوو ڕۆژ ڕۆشتم بۆ مزگەوت بۆ بەرنوێژیکردنی نوێژی بەیانی. پێش کەوتم بۆ بەرنوێژی، بە خەڵکەکەم وت: "ڕێک ڕاوەستن با بۆشایی و لارولێری لەنێوانتاندا نەبێ." دوایی **الله اکبرم** کرد و نوێژم دابەست. دوای فاتیحە، دەستم کرد بە خوێندنی سوورەتی یوسف. من لە ڕکاتی یەکەمی نوێژی بەیانیدا ئەو سوورەتانەم دەخوێند کە درێژ بوون، بۆ ئەوەی خەڵک فریای یەکەم ڕکاتیش بکەون.

ـ کوڕە قوربان تۆ هیچ شتێک لە کیس نادەی، خەفەت بۆ ورد و درشتی کاروبارەکانت دەخۆی! نوێژ درێژە پێ دەدەی بۆ ئەوەی خەڵک فریای جەماعەتەکە بکەوێ! بە خوا تۆ زانا و لێزانی.

ـ دەی ئەوە ڕەحم و سۆزی خوایە.

ـ باشە قوربان دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

ـ هێشتا لە سەرەتای سوورەتی یوسفدا بووم، ناپیاوێک هێرشی کردە سەر من و چەند خەنجەرێکی لێ دام. ئەوەی لەژێر زگمی دابوو، لە هەموویان خراپتر بوو. هەستم کرد ڕیخۆڵەکانم هەمووی ڕژاوەتە سەر زەوی.

وتم: "ئەو دوژمنەی خوا منی کوشت!"

ئەو کاتە مزگەوت تاریک بوو، ئەوانەی پێشەوە نەبێ، کەس ڕووداوەکەی نەبینی. ئەوانەی دواوە پەیتا پەیتا دەیانوت: **سبحان الله... سبحان الله**، چونکە من دەنگم نەمابوو.

دوایی ئەو کەسەی کە لە منی دا، ویستی هەڵبێ و من نەزانم کێیە، خەڵکیش هەوڵیاندا بیگرن. ئا لەبەر ئەوە، دەیدا بەلای هەرکەسدا خەنجەرێکی لێ دەدا، بەم شێوە نۆ کەسی کوشت. پیاوێک جوببەکەی خۆی دا بەسەری دا و گرتی. ئەویش زانیی گیراوە، یەکسەر خۆی کوشت.

ـ ئەی تۆ چیت کرد قوربان؟

ـ دەستی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفم گرت و بردمە پێشەوە بۆ ئەوەی بەرنوێژیەکە بکا بۆ خەڵکەکە.

ـ یا ئەڵلا! بەو هەمووە برینەوە، بە ڕیخۆڵەی ڕژاوەوە، نوێژەکەت لەبیر نەچوو؟

ـ کوڕم! ئەوە ئامۆژگاریی پێغەمبەرﷺە، کۆتا ئامۆژگاریی پێغەمبەرﷺ لەبارەی نوێژ و ژنانەوە بوو! دەیفەرموو: "نوێژ! نوێژ! ئاگاداری ژنەکانتان بن."

ـ ئەی قوربان دواتر چی قەوما؟

ـ ئەوەندە خوێنم لێ ڕۆیی، بورامەوە. کاتێ بەهۆش خۆم هاتمەوە، لە ماڵ بووم و خەڵک چواردەوری گرتبووم.

ـ دوای ئەوەی بە ئاگا هاتیتەوە، یەکەم شت باسی چیت کرد؟

ـ وتم: "ئەو خەڵکە نوێژەکەیان کرد؟"

وتیان: "بەڵێ!"

منیش وتم: "هەرکەسێ نوێژ نەکا، لە ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە."

دوایی داوای ئاوی دەسنوێژم کرد، دەسنوێژم گرت، نوێژم کرد. دوای ئەوەی لە نوێژ بوومەوە، تەماشای دەوروبەری خۆم کرد، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم بینی. وتم: "عەبدوڵڵا، بڕۆ بپرسە بزانە کێ وای لە من کرد؟"

عەبدوڵڵا ڕۆشت بۆ مزگەوت، خەڵک لە مزگەوت خڕ بووبوونەوە.

عەبدوڵڵا وتی: "کێ وای لە گەورەی موسڵمانان کردووە؟"

وتیان: "دوژمنی خوا، ئەبولوئلوئەی کۆیلەی موغەیرە، چەند کەسێکی تریشی کوشتووە و پاشان خۆیشی کوشتووە!"

عەبدوڵڵا هاتەوە و وتی: "فەیرۆز بووە، کۆیلەکەی موغەیرە."

وتم: "ئەو پشەسازەکە؟"

وتی: "بەڵێ."

وتم: "خوا لەناوی ببا! بە خوا چاکە نەبێ، هیچ زیانێکم بۆی نەبووە. سپاس بۆ خوا کە کوژرانی من بە دەستی کەسێک بوو کە یەک سەجدەیشی بۆ خوا نەبردوە تا لە ڕۆژی قیامەتدا بیکا بە بەڵگە و پاکانە بۆ خۆی."

- کورە قوربان، ئەم دەنگوباسە دڵ هەڵئەقرچێنێ! بە خوا من ئەوەندە تۆم خۆش دەوێ، دەڵێی لە خۆمی داوە، وا هەست دەکەم زگم بەر خەنجەر درابێ. خۆم و دایک و باوک و ماڵ و منداڵم بە قوربانت بین!

- کوڕم! هەموو ئاکام و ئەجەلێک نووسراوە و دێتە جێ. سپاس بۆ ئەو خوایەی منی گەیاندە پلەی هەرە بەرزی شەهادەت. بەڵێن و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هاتە جێ، فەرمووی: "ئوحود! خۆڕاگربە، پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیەک و دوو شەهیدت لەسەرە!"

- دەی ئەو شەهادەتەت پیرۆز بێ قوربان! تەنیا ئەوە تۆزێک لە ئازاری ئێمە کەم دەکاتەوە. داوا دەکەم خوای گەورە پاداشت بە چاکە بداتەوە و سەبووریی ئێمەیش بدا. بە خوا تۆ دەرگایەک بووی بەڕووی ئاژاوە و فیتنە و گێچەڵدا داخرابووی. دوای ئەوەی تۆ شەهید کرای و دەرگاکە شکێنرا، ئێمە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو دوا پاشەکشە دەکەین.

- کوڕم! خوای گەورە موسڵمانان و خواناسان نافەوتێنێ. ئەگەر لەدەستدانی من خەفەتە بۆتان، یادی لەدەستدانی پێغەمبەری خوا بکەنەوە، گەورەترین لەدەستدان، لەدەستدانی پێغەمبەری خوایە!

- **صلی الله علیه وسلم**، بەس بە خوا، گەورەم تۆیش لەدەست چووی!

- کورە ئەو دوژمنەی خوا هەر قەزا و قەدەری جێبەجێ کرد. سپاس بۆ خوای گەورە.

- ئەی قوربان دوای ئەوە چی ڕووی دا؟

- دوای ئەوە کەمێک ئاویان بۆ هێنام، خواردمەوە، ئاوەکە هەمووی لە خوار زگمەوە ڕژایە دەرەوە. دواتر شیریان هێنا، ئەویشم خواردەوە، دیسان ڕژایە دەرەوە. ئیتر خەڵکەکە زانییان دەمرم!

دوایی پیاوێک هات و وتی: "قوربان موژدەت لێبێ. موژدەی خوا! تۆ هاوڕێ و هاودڵی پێغەمبەرﷺ بووی، ئەوەی بۆت کرا بە ئیسلامت پێشکەش کرد، بووی بە کاربەدەست، دادگەر بووی، شەهیدیش کرای!

منیش وتم: "بە خوا! خواخوامە سەربەسەر لە دونیا دەربچم. خوا دەکا ئەو پلە و پۆستەی هەمبوو، بە زیانم ناشکێتەوە، قەینا با قازانجیشی بۆم نەبێ."

پیاوەکە ڕۆشت، چاوم لێ بوو پۆشاکەکانی بەسەر زەویدا دەخشان.

وتم: "ئەو پیاوەم بۆ بانگ بکەنەوە."

گەڕایەوە، پێم وت: "برازا! با پۆشاکەکانت بەسەر زەویدا نەخشێن، با هەم پاک و خاوێن بن و، هەم خێریشت دەست بکەوێ!"

- قوربان! ئا بەو حاڵەوە هێشتا ئامۆژگاریی خەڵکت دەکرد؟!

- ئەی دەتەوێ لەو دەمەی گیانم دەردەچێ، خراپەیەک ببینم و لێی بێدەنگ بم؟!

- نا بە خوا قوربان چاکەی تۆ نەبێ، هیچم ناوێ!

- دەی خوا سەربەرزت بکا کوڕم!

ـــ ئەی قوربان ئەو خەڵکە، دوای ئەوەی ئاو و شیر لە گەدەت نەوەستا و هەمووی ڕژایە خوارەوە و زانییان کە دەمری، چییان کرد.

- دەستیان کرد بە گریان.

منیش وتم: "مەگرین! هەرکەس دەگری، با بڕواتە دەرەوە! گوێتان لێ نەبووە کە پێغەمبەر ﷺ چیی فەرمووە؟"

وتیان: "چیی فەرمووە؟"

وتم: "مردوو بە هۆی شین و شەپۆڕی خزم و کەسوکارییەوە ئازار دەچێژێ."

ـــ کوڕە قوربان بە خوا ئەگەر جیاتی فرمێسک، خوێنیان لە چاو بهاتایە، ناهەقیان نەبوو!

- نا قسەی وا مەکە. با کۆتایی دیدارەکەمان بەو جۆرە نەبێ. خۆت دەزانی من وەسف و پیاهەڵدانم پێ خۆش نییە!

- باشە قوربان، تۆ چی دەفەرمووی با وا بێ.

- دەی خوا سەرکەوتووت بکا.

- خوای گەورە تۆیش سەرفەراز بکا! ئەی قوربان دوای ئەوە چیت کرد؟

- بانگی عەبدوڵلای کوڕم کرد، پێم وت: "بڕۆ بۆلای دایە عایشەی خێزانی پێغەمبەری ﷺ، پێی بڵێ: 'عومەر سەلامت لێ دەکا!' نەڵێی: 'گەورەی موسڵمانان،'

چونکە ئیتر من لەمەولا گەورەی موسڵمانان نیم! پێی بڵێ: 'عومەری کوڕی خەتتاب داوات لێ دەکا لە خزمەت پێغەمبەر و ئەبوو بەکردا بنێژرێ!' "

عایشە وتی: "بە خوا! ئەو جێگە قەبرەم بۆ خۆم دانابوو، ئەوا بەخشیم بە عومەر."

عەبدوڵلا گەڕایەوە، خەڵک وتیان: "ئا ئەوە عەبدوڵلایە هاتەوە."

وتم: "ڕاستم بکەنەوە."

پیاوێک ڕاستی کردمەوە.

وتم: "ها عەبدوڵلا، چی بوو؟"

وتی: "بە دڵی تۆ قوربان، وتی: 'باشە.' "

منیش وتم: "ئەی سپاس بۆ خوا! هیچم بە ئەندازەی ئەوە بەلاوە گرنگ نەبوو. ئەگەر مردم، هەڵمگرن، دوایی سەلام بکە لە عایشە و پێی بڵێ: 'عومەر داوای هاتنە ژوورەوە دەکا.' ئەگەر ئیزنی دا، بمبەنە ژوورەوە، ئەگەرنا بمگەڕێننەوە و لە گۆڕستانی موسڵماناندا بمنێژن!"

- بۆچی داوا لە عایشە بکەن؟

- چونکە پێغەمبەر ﷺ و ئەبوو بەکر لە ماڵەکەی ئەودا نێژرابوون. پێغەمبەران لە هەر شوێنێکدا مردن، هەر لەو شوێنە دەنێژرێن. پێغەمبەریش ﷺ لە ماڵی عایشەدا وەفاتی کرد، دواتریش ئێمە ئەبوو بەکرمان لای ئەو ناشت.

- ئەی بۆچی دوای مردنی تۆ، دیسان داوا لە عایشە بکەنەوە؟

- وتم: لەوانەیە لە ڕووی نەهاتبێ من زیندوو بم و داواکارییەکەم ڕەت بکاتەوە، با دوای مردنیشم دووبارە داوای لێ بکەن، ئەگەر ڕووگیری من نەبووبوو، ئەوا ڕازی دەبێ من لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەبوو بەکردا بنێژرێم.

- ئەی سڵاوی خوات لێ بێ! شتێک هیی خۆت نەبێ، ناتەوێ نە بە زیندوویی و نە بە مردووییش دەستت بکەوێ.

- دەی کورم هەق لە پێش هەموو شتێکە.

- ڕاست دەکەی قوربان! ئەی کۆتا کاتی تۆ لەسەر دونیا چۆن بوو؟

- حەفصەی کچم هات بۆلام، هاتە ژوورەوە و ماوەیەک لای من مایەوە، بە کوڵ دەگریا. منیش داوام کرد خۆڕاگربێ و لە خوا بترسێ. ئەو ڕۆشتە دەرەوە و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس هاتە ژوورەوە، وتی: "ئەی گەورەی موسڵمانان! ئەو کاتەی خەڵک زۆربەی زۆرینەیان کافر بوون، تۆ موسڵمان بووی؛ ئەو کاتەی کە خەڵک دژی پێغەمبەرﷺ وەستانەوە، تۆ لەگەڵیدا بووی؛ بۆ سەرکەوتنی پێغەمبەرﷺ جەنگای. بە شەهیدیش دەمری! پێغەمبەرﷺ زۆر لێت ڕازی بوو. کەس گومانی لە باشی و چاکی تۆدا نییە."

وتم: "ئادەی چیت وت دووبارەی بکەرەوە!"

دووبارەی کردەوە.

منیش وتم: "لووت بەرز ئەو کەسەیە کە ئێوە لوت بەرزی دەکەن! بە خوا پێم خۆشە هەرچیم هەبووبێ لە پێناو خوادا خەرجم بکردایە."

سەرم لە کۆشی عەبدوڵڵای کوڕمدا بوو.

وتم: "سەرم بخە سەر زەوی!"

وتی: "فەرقی چییە لەسەر کۆشی من بێ یان لەسەر زەوی؟"

منیش وتم: "دایکت ڕۆ ڕۆت بۆ بکا! سەرم بخە سەر زەوی، بەڵکو خوا بە چاوی بەزەیی چاوم لێ بکا. ئیتر هەموو شتێ پێچرایەوە و تەواو بوو."

- قوربان ژیانی تۆ کتێبێکی پرشنگدار بوو، ئەوەندە پڕە لە چاکە ئەگەر کێوەکان لەسەر شانی خۆیانی بنێن، نایتوانن! پیرۆزت بێ، پیرۆزت بێ ئەو هەمووە تێکۆشانە لە پیناو خوا و ئاییني خوادا.

- دەی واز بێنە قسەکەمان درێژەی کێشا! وادەزانم کاتی ڕۆشتنە، هیچ پێویستیەکت بە من هەیە؟

ـ کوڕە قوربان هەموومان پێویستیمان بە تۆ هەیە: ئەو خەڵکە داماوەی کە دادگەرییەکەی تۆیان بە سەرەوە نەماوە! ئەو ڕێگاوبانانەی کە چاوە چاوی نەخشە و پلانە جوانەکانی تۆن! ئەو مینبەرەی کە ماوەیەکی زۆرە گوێی لە دەنگە زوڵاڵەکەی تۆ نەبووە! ئەو منداڵە هەتیوانەی کەسیان نییە! ستەملێکراوان، ئەوانەی کەس نییە بۆیان بێتە وەڵام! ئەو هەژارانەی چاوەڕوانی یارمەتی تۆن! هەموو شتێ تۆی لە دەست داوە، گەورەم! تاجی سەرم!

ـ ئەوانەی تۆ وتنت هەرهەمویان بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە! دەی سڵاوی خوات لێ بێ، من ئیتر دەڕۆم.

***

چۆن هات ئاوا ڕۆیشت.

بەژن و باڵای هێندە بەرز بوو دەتگوت خزمی دار چنارە...

هێند پتەو بوو، دەتگوت پارچەی کەژ و کێوە...

دەستی چەپی گاڵۆکێکی پێ گرتبوو، بۆ وەی نەبوو خۆی بە گۆچان ڕاگیر بکا، وەها دەیچەقاند بە خاکا، وەك بیەوێ سووری زەوی بووەستێنێ...

ADHAM SHARKAWI

پێش هەمو شت :

لە دور ڕا هات ...

بەژن و باڵای هێندە بەرز بو دەتگوت خزمی دار چنارە ...

هێند پتەو بو، دەتگوت پارچەی کەژ و کێوە ...

دەستی چەپی گاڵۆکێکی پێگرتبو، بۆ وەی نەبو خۆی بە گۆچان ڕاگیر بکا، وەها دەیچەقاند بە خاکا وەك بیەوێ سوڕی زەوی بوەستێنێ ...

ڕیشی پڕ و ماش و برنج... تاڵی ڕەشی هێندە ڕەش بوو وەک ڕەشی بەردە ڕەشەکە... سپیەکەی هێندە سپی بو، وەك پشتەماڵی حاجیان ...

پۆشاکی هێندە کۆنە بو دەتگوت عارەبی هەژارە ...

دەم وچاوێکی نورانی و ناوچاوی گەش، سیمای وەك گۆڕەپانی جەنگ لێکردبو دەزانی بۆ !؟ بریسکەی هەردو چاوانی دەتگوت تیشکی تیژی خۆرە کاتێ لە مەیدانی جەنگا لە شمشێری دەبان ئەدا ....

ئا لەم ڕەنگە کەم کەس هەبو، مرۆڤێکی وەها نەبو هەمو جارێ لە وێنەی ئەو بەدی بکەی ...

هەرچی پەسن و مەدحی هەبو نوێنەری چیرۆکێك بون، بگرە چەند چیرۆکی جیا جیا ...

وردە وردە لێم نزیك بو، گەشتە لای من، ویستم پرسیاری لێ بکەم: قوربان تۆ کێی !؟






07501269689
07701932749
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com



٨٠٠٠ هەزار دینار